JOSTEIN GAARDER

# جیهانا سۆفیایێ

رۆمانەك دەربارەی دیرۆکا فەلسەفێ

وەرگێران ژ ئینگلیزی

دیان جەمیل



یوستاین گاردەر

# جیهانا سۆفیایێ

رۆمانەك دەربارەی دیرۆكا فەلسەفێ

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

**دیان جەمیل**

بناڤێ خودایێ مەزن و دلوڤان

# جیهانا سۆفیایێ

رۆمانەك دەربارەی دیرۆکا فەلسەفێ


- ناڤێ پەرتووکێ ب زمانێ نەرویجی (زمانێ رەسەن): Sofies verden
- ناڤێ پەرتووکێ ب ئینگلیزی: Sophie’s world
- وەرگێران بۆ ئینگلیزی: Paulette Miller
- وەرگێران ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
- پێداچوونا زمانی: مسلم عصمت
- دیزاینا بەرگی: فەرسەت زوبێر
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: دیان جەمیل
- تیراژ: 1000 دانە

ل رێڤەبەریا پەرتووکخانەیێن گشتی ل پارێزگەها دهۆکێ ژمارا سپاردنێ (D-2081\17) یا سالا 2017 پێ هاتیە دان

**ئەو کەسێ نەشێت مفای ژ سەربۆرێن سێ هزار سالێن بوری وەربگریت، دێ هەر دناڤ تارِیاتییێ دا مینیت.**

گوتە

نڤیسەر و فەیلەسۆفێ ئەلمانی

# تو کی؟

# جیهان چەوا پەیدابوویە؟

ئەڤە ئەو هەردوو پرسیارن یێن کچەکا چواردە سالی ب ناڤێ سۆفیا پشتی ژ قوتابخانێ دزڤڕیت ل سەر کارتەکێ دناڤ سندۆڤا پۆستەیێ بەر دەرگەهێ مالا خوە دا دبینیت کو ژ لایێ فەیلەسۆفەکێ نەدیار ڤە بۆ وێ هاتبوونە هنارتن. ل دەستپێکێ سۆفیا حێبەتی دمینیت و بەردەوام دگەل ناخێ خوە دانوستاندنێ ل دور ڤان پرسیاران دکەت هەتا ل ڕۆژا ل دووڤ دا ئەڤ فەیلەسۆفە نامەیەکا دی بۆ فرێدکەت و ب درێژاهی بەحسێ دیرۆکا پەیدابوونا فەلسەفێ بۆ دکەت. ب ڤی ڕەنگی سۆفیا دگەل مامۆستایێ خوە دەست ب گەشتەکێ بۆ ناڤ جیهانا فەلسەفێ دکەن.

ئەڤە کورتیا چیرۆکا ڕۆمانا "جیهانا سۆفیایێ" یە کو ژ لایێ نڤیسەرێ نەرویجی "جوستاین گاردەر"ی ڤە هاتیە نڤیسین و ل سالا 1991ێ ب زمانێ نەرویجی هاتیە بەلاڤکرن. ل دووڤ دا بۆ هژمارەکا مەزن یا زمانێن جیهانێ هاتیە وەرگێڕان و بوویە یەك ژ هەرە باشترین شاکارێن جیهانی و پەرتووکا فەلسەفی ب تایبەت بۆ تەخا گەنجان و ئەو کەسێن بۆ یەکەم جار بابەتێن فەلسەفی دخوینن.

د ڤێ ڕۆمانێ دا، گاردەر د چوارچۆڤەیەکێ فەلسەفی یێ بالکێش دا و ب زمانەکێ ئەدەبی یێ سادە چەندین مژارێن فەلسەفا ڕۆژئاڤای هەر ژ پەیدابوونا ئەفسانەیان و فەیلەسۆفێن گریکی یێ کەڤن هەتا سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆکە شرۆڤە دکەت، ب تایبەت مژارێن گرێدای بنیاتێ پەیدابوونا گەردوونی و هەبوونا خودای و ئەگەرێن ئافراندنا مرۆڤان ل سەر ڕوویێ ئەردی، زێدەباری مژارا ئەقلێ مرۆڤی و بنەمایێ هزرکرنەکێ و حەز و خواستێن مرۆڤی یێن ئازاد.

خواندنا بیاڤێ فەلسەفێ ل دەڤ تاکێ کورد هەتا نوکە تشتەکێ کووڤی یە، ژبەر هندێ ب رێکا وەرگێڕانا ڤێ ڕۆمانێ مە بزاڤ کریە ڤی بیاڤێ هەرە گرنگ ل بەر خواندەڤانێ کورد کەهی بکەین، ب تایبەت تەخا گەنجان، داکو ئەڤ بابەتە ل دەڤ وان نەمینیت تشتەکێ سەیر و غەریب بەلکو ئێدی بشێن ب بستەیی ڤە دووڤچوونا مژارێن فەلسەفی بکەن و ب وێرەکانە و ل سەر بنەمایەکێ زانستی یێ دروست دانوستاندنێ دگەل دەردورێن خوە بکەن.

گەلەك بابەت و مژارێن ئالۆز د ئەقلێ مە دا دبنە جهێ پرسیارێ و بەردەوام ئەم دکەڤینە هزر و خەیالان، لێ ئەم نزانین ل ڤی دەمێ هزرکرنێ ئەم یێن د گاڤەکا فەلسەفی دا دژین، ژبەر هندێ ئەڤ ڕۆمانە باشترین ئامرازە ئەم باشتر خوە بنیاسین و هندەك بەرسڤێن کەتواری و بەرئاقل ژ بۆ ڤان پرسیاران ببینین.

هەژی ئاماژەپێکرنێ یە کو ناڤێ ڕەسەن یێ ڕۆمانێ "جیهانا سۆفییێ" یە کو سۆفی ناڤی کچەکێ یە و قارەمانا ڤێ ڕۆمانێ یە، لێ داکو ناڤێ سۆفی دگەل بابەتێ سۆفیگەرییێ تێکەل نەبیت، د وەرگێڕانا کوردی دا مە ناڤێ "سۆفیا" بکارئینایە.

ژ لایەکێ دی ڤە، ڕاستە ڕۆمان ل دور فەلسەفێ هاتیە نڤیسین، لێ ب شێوەیەکێ تێروتەسەل بەحسێ چەندین بابەتێن دیرۆکی و زانستی و دەروونی و بایۆلۆژی و فەلەکی هاتیە کرن، ئەڤە ژی باشترین دەلیڤەیە خواندەڤان پێزانینێن باش د ڤان بیاڤان ژی دا وەربگریت.

دیان جەمیل

1ی گولانا 2017

# باخچەيێ عەدەن

*...د دەمەكێ دەستنيشانكرى دا، پێدڤيە تشتەك ژ نەبوونێ پەيدابيت...*

سۆفيا ئاموندسن ژ قوتابخانێ زڤرى، بۆ ماوەيەكى ب رێكێ ڤە دگەل هەڤالا خوە جوانايێ بەحسێ مرۆڤێن رۆبوت دكر. جوانايێ هزردكر مەژيێ مرۆڤى وەكو سيستەمەكێ رێكخستى و پێشكەفتى يە، لێ سۆفيايێ هەستپێدكر ئەو دگەل بۆچوونا وێ يا هەڤرا نينە. چ پێنەڤێت مرۆڤ ژ پرتەكا ئاميرەكێ رەق پترە.

دەمێ ئەو گەهشتينە نێزيكى سۆپەرماركێتەكێ، ئەو ژێكڤەبوون و هەر يەك چوو سەر رێكا خوە. سۆفيا ل كولانەكا دوماهيا دەوروبەرێن باژێرى يا ئاكنجى بوو و رێكا مالا وێ دووجاركى هندى مالا جوانايێ ژ قوتابخانێ يا دوور بوو. چ مالێن دى ب رەخ باخچەى مالا وان ڤە نەبوون، ژبەر هندێ دا بێژى مالا وان يا ل دوماهيا دنيايێ. چونكى پشتى ب دوماهى هاتنا باخچەى مالا وان، دارستانێ دەستپێدكر.

سۆفيا بەرەڤ تاخێ كلۆڤەر زڤرى، ل دوماهيا وى تاخى چەپەكا ل سەر شێوەيێ گوشەيەكا تيژ دكەفتە بەر سينگێ وێ كو دگوتنێ "چەپا قوپتانى" و كەس زوو ب زوو تێرا نەدبورى ب تنێ ل رۆژێن بێهنڤەدان نەبيت.

ئەڤرۆ دەستپێکا هەیڤا گولانێ یە. دناڤ هندەك باخچەیان دا، گول نێرگزێن زەر بەژنا خوە ل دور دارێن فێقی ئالاندبوو. بەلگێن دارێن بێتولایێ* ژی هێشتا د کەسك بوون.

ب ڕاستی یا سەیرە کا چەوا هەر تشتەك د ڤی دەمێ سالێ دا سەر و ژنوو دپشکڤیت! ئەرێ ئەو چ تشتە وەل ڤان کومێن شینکاتی و داروباران دکەت ژ عەردێ هشك و ڕەق سەرێن خوە بینن دەرێ و دەست ب گەشەکرنێ بکەن، ب تنێ ژبەرکو سەڤا یێ گەرم بووی و دوماهیك شوونوارێن بەفرێ یێن بەرزە بووین؟

دەمێ سۆفیایێ دەرگەهێ باخچەیێ مالا خوە ڤەکری، چاڤێ وێ ب سندوقا پۆستەی کەفت کو پتریا جاران یا پڕبوو ژ بەلاڤۆکێن ڕیکلامان و هندەك زەرفێن تایبەت بۆ دایکا وێ، لەوڕا وێ ژی ئەڤ تشتە هەموو د دانانە سەر مێزا د لێنانگەهێ ڤە بەری کو بچیتە د ژوورا خوە ڤە و دەست ب خواندنا وانەیێن قوتابخانێ بکەت.

جار بۆ جارێ ژی، هندەك نامە ژ بەنکێ بۆ بابێ وێ دهاتن، لێ بابێ وێ نە وەکو هەموو بابان بوو. بابێ سۆفیایێ کاپتن بوو ل سەر پاپۆرەکا ڤەگۆهاستنا نەفتێ یا مەزن و ڤی کارێ وی وەلێکربوو پتریا ڕۆژێن سالێ ل مال نەبیت. د هەیاما وان حەفتیێن کێم یێن تێدا سەرەدانا خێزانا خوە دکری، ئەو ل دور خانی دزڤڕی و پێکۆل دکر دەمەکێ خوش دگەل سۆفیایێ و دایکا وێ ببورینیت، لێ دەمێ دچوویە د پاپورێ دا، کەسایەتیا وی ب تەمامی دهاتە گوهۆڕین.

ئەڤرۆکە ب تنێ یەك نامە د سندوقا پۆستەی دا بوو، ئەو ژی ب ناڤێ سۆفیایێ هاتبوو. ل سەر زەرفێ سپی یێن نامێ ئەڤ ناڤونیشانە هاتبوو نڤیسین: "سۆفیا ئاموندسن، تاخێ کلۆڤەر 3". ئەڤە هەموو تشت بوون. نەگوتبوو کا ژ لایێ کێ ڤە هاتیە فرێکرن و هەتا چ پول ژی پێڤە نەبوون. هەر زوو سۆفیا چوو د ژورا خوە ڤە و دەرگەهـ ل پشت خوە دائێخست و زەرف ڤەکر. لێ وێ چ تشت تێدا نەدیتن ب تنێ نامەیەکا بچووك نەبیت کو ڕۆبەرێ وێ ژ یێ زەرفی مەزنتر نەبوو و ب تنێ یەك ڕستە ل سەر هاتبوو نڤیسین:

***تو کی؟***

---

* بێتولا Birch جۆرەکێ دارانە کو تا ڕادەیەکی وەکو دار چنارانە لێ پیچەکێ بچووکترن.

د وێ نامێ دا چ تشتێ دی نەهاتبوو نڤیسین، بەلکو ب تنێ ئەڤ هەردوو پەیڤە ب خەتێ دەستی دگەل هێمایەکێ پرسیارکرنێ یێ مەزن ل سەر هاتبوونە نڤیسین.

وێ دووبارە تەماشەی زەرفێ نامێ کر. ئەرێ باشە ئەگەر ئەڤ نامە بۆ وێ هاتبیتە هنارتن، ئەرێ پا کێ ئەو هاڤێتیە د سندوقا پۆستەی دا؟

سۆفیا بەرەڤ وی خانیکێ بچووك ڤە چوو یێ کو ب دارێ سۆر هاتیە دروستکرن. لێ وەکو هەرجار، بەری ئەو دەرگەهێ وێ ب کلیلێ بدائێخیت، پشیکا وێ "شیریکان"ێ خوە هاڤێتە بەر سینگێ وێ و بەری وێ گەهشتە سەر دەرەجکان و شیا خوە بکەتە د ژوور ڤە.

دەمێ گێولێ دایکا سۆفیایێ یێ نەخوش بایە یان ژ تشتەکێ یا تۆرەیە بایە، دا کەتە هەوار و بێژیت مالا مە یا بوویە باخچێ گیانەوەران. ل ڤێرێ مەرەما وێ ژ باخچەی گیانەوران کومەکا گیانەوەرێن کەهی بوو یێن دناڤ مالێ دا دهاتنە بخوەدانکرن. سۆفیایێ ژی کومەکا ڤان گیانەوەران هەبوو و گەلەك یا پێ کەیفخوش بوو. ل دەستپێکێ وێ حەوزەکا شووشەی کری بوو و سێ ماسیێن سۆر ژ جۆرێ ماسیێن زێرِی Goldfish کربوونە تێدا و پاشی جۆرەکێ دی ب ناڤێ جاکا رەش کربوو تێدا. ل دووڤ دا وێ دوو بەبەغاییێن ب ناڤێن "سمیت" و "سمۆێل" ژی کریبوون و پاشی کیسەلێ جوفیندا و پشیکا وێ شیریکان.

وێ ئەڤ گیانەوەرە هەموو ژبەر هندێ بۆ خوە ئینابوون، چونکی پتریا جاران دایکا وێ ئێڤاریەکا درەنگ ژ سەر کاری دزڤرِی و بابێ وێ ژی ل وەلاتەکێ دوور و ل لایێ دی یێ دنیایێ کار دکر.

سۆفیایێ چانتێ خوە یێ قوتابخانێ دانا رەخەکی و خوارن دا پشیکا خوە شیریکانێ و پاشی ل سەر کورسیکەکێ د لێنانگەهێ ڤە رِوونشت و ئەو نامەیا ژێدەرێ وێ نەدیار هێشتا ددەستان دا بوو. **"تو کی؟"**.

ئەڤە چ پرسیارەکا بێ رِامانە؟ رِاستە ئەو سۆفیا ئاموندسنە، لێ ئەرێ پا سۆفیا کیە؟ ئەو هێشتا گەلەك تشتان ب هویری نزانیت. ئەرێ ئەگەر وێ ناڤەکێ دی هەبایە دا چ رِوودەت؟ بۆ نموونە ئان کنوتسن، ئەرێ ئەو دا بیتە کەسەکا دی؟

ژ نیشکەکێ ڤە بیرا وێ هات کو بابێ وێ دڤیا ناڤێ وێ بکەتە "لێلیمۆر". وێ دەستێ خوە درێژ کر و هزرا خوە دکر کا ڕەوشا وێ دا یا چەوا بیت ئەگەر ناڤێ وێ لێلیمۆر ئاموندسن بایە. نەخێر نە، ڕەوشا وێ ب ڤی ڕەنگی نەدبوو. ئەو دا کچەکا دی بیت.

وێ خوە بلند کر و بەرەڤ سەرشوویێ ڤە چوو و هێشتا نامەیا نەدیار ددەستێ وێ دا بوو. ل بەر خودیکێ ڕاوەستیا و ڕاستەخو تەماشەی چاڤێن خوە کر و گوت: "ئەز سۆفیا ئاموندسنم."

ئەو کچکا د خودیکێ دا بەرسڤا وێ نەدا، هەتا خو پەیڤەك ژی ژ دەڤێ وێ نەدەرکەفت. سۆفیایێ خو چ کربا، وێ کچکا د خودیکێ ژی هەمان ئەو تشت دکر. سۆفیایێ دڤیا وی٘ مەندەهوش بکەت و بلەزاتیەکا زێدە خو بلڤلڤینیت، لێ ئەوا د خودیکێ ژی دا ب هەمان لەزاتی خوە دلڤلڤاند.

سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: "تو کی؟"

وێ دیسان چ بەرسڤ وەرنەگرتن ژ بەرسڤێن هەمان کارێن بەری نوکە وێ ل بەر خودیکێ کرین. بۆ ماوەیەکێ گەلەکێ کێم، بەشەکی چ چرکێ، وێ نەزانی کا کێ ئەو پرسیار کر، وێ یان ژی ئەو کچا د خودیکێ دا؟

سۆفیایێ تبلا خوە یا بەرانی دانا سەر دفنا وێنێ وێ کچکا د خودیکێ دا و گوتێ: " تو، ئەزی."

دەمێ وێ چ بەرسڤ ب دەست خوە ڤە نەئینایین، وێ ئەو ڕستە بەروڤاژی لێکر و گوت: "ئەز، تومە."

سۆفیایێ هەمموو گاڤان حەز ژ وێنەیێ خوە نەدکر، پتریا جاران کەسێن دی دگوتێ کو چاڤێن وێ وەکو باهیڤان د درێژن، لێ وان ئەڤ چەندە پتر ژبەر هندێ دگوتێ چونکی وێ دفنەکا بچووك و جوان هەبوو و دەڤێ وێ ژی پیچەکێ یێ مەزن بوو، زێدەباری گوهێن وێ کو گەلەك نێزیکی چاڤێن وێ بوون. لێ یا ژ هەمموویێ خراپتر پرچا وێ یا ڕاست و سەرح بوو کو چ مودێل و تەسریح ژێ نەدهاتن.

هندەك جاران بابێ وێ دەستێ خوە دكرە دناڤ پرچا وێ ڕا و دگوتێ: ئەی خوەدانا پرچا زەر" د بەڕا ستڕانەكا "كلود دیبوسی بۆ دگوت. ئەڤ ئاخفتنە بۆ وی یا ب سانەهی بوو چونكی ب درێژاهیا ژیانا خوە نەڕازیبوونا خوە ل سەر پرچەكا هۆسا یا درێژ و نەرم نەدایە كرن. چ كرێم و كەرەستەیێن جوانكارییێ ژی نەدشیان پرچا وێ ڕەق بكەن یان ل سەر تەسریحەكێ بڕاوەستینن.

وێ هزركر سەرێ وێ گەلەك پێ كرێتە تا وی ڕادەی هندەك جاران پرسیار ژ خوە دكر و دگوت: تو بێژی دەمێ ئەز ژ دایكبوویم من كێماسیەكا زكماكی هەبیت. هەرچەندە دایكا وێ جارەكێ گوتبوویێ كو ژ دایكبوونا وێ گەلەك یا ب زەحمەت بوو، لێ ئەرێ ما تو بێژی شێوازێ ژ دایكبوونا مە، ڕوخسارێ مە بۆ هەتا هەتاییێ دەستنیشان بكەت؟

ئەرێ ما نە جهێ پرسیارێ یە كو هێشتا ئەو نزانیت ئەو كیە؟ ئەرێ مانە نەدادپەروەری یە كو ئەم نەشێین ڕۆخسارێ خوە پێ ژ دەرڤە بهەلبژێرین؟ بەلكو ئەڤ ڕۆخسارە پێ ل سەر مە هاتیە سەپاندن. ئەم دشێین هەڤالێن خوە بهەلبژێرین لێ ئەم نەشێین خوە ب خوە بهەلبژێرین. هەتا وی ڕادەی ئەو نەشیایە خوە وەك بونەوەرێ مرۆڤ بهەلبژێریت.

- "ئەرێ بونەوەرێ مرۆڤی كیە؟"

سۆفیایێ دووبارە سەحكرە چاڤێن وێ كچكا د خودیكێ دا و داخوازا لێبورینێ ژێ كر و گوت: "ئەز دبێژم ئەز دێ چمە ڤاتێ سەری داكو ئەركێن خوە یێن ڤوتابخانێ یێن بابەتێ زیندەوەرزانیێ بخوینم."

پشتی بێهنەكێ ئەو ژ هۆلێ دەركەفت و دووبارە هزرێن خوە كرن و گوت: "نەخێر، ئەز دبێژم یا باشترە ئەز بچمە ناڤ باخچەی."

- "بس، بس، بس"

سۆفیایێ پشیك پالدا سەر دەرەجكان و دووبارە دەرگەهێ مال ل پشت خوە دائێخست...

دەمێ ئەو گەهشتیە سەر ڕێکا بەران یا دناڤ باخچەی دا، هێشتا ئەو نامەیا نەدیار د دەستێ وێ دا بوو. ژ نیشکەکێ ڤە هەستەکێ سەیر ل دەڤ پەیدابوو: وێ هزرکر هەتا نوکە ئەو بووکەکا لاستیکی بوو و لێدانەکا دارێ سێرێ هات ب وێ کەفت و هاڤێتە د ژیانێ دا.

دا چەند بۆ وێ یا سەیر بیت هەکە نوکە خوە دناڤ جیهانێ دا ببینیت و تێدا دەست ب گەشتەکا بالکێش بکەت؟

شیریکانێ خوە ل سەر ڕێکا بەران بەران هاڤێت و چوو پشت هندەك دارێن مژمژان خوە ڤەشارت. ئەو پشیکەکا زیرەك و زیندی یە، هەر ژ بچووکترین داڤا سپی یا دناڤ سەرێ وێ دا هەتا کوریا وێ یا ل دوماهیا لەشێ وێ یێ نەرم. ئەو ژی دناڤ باخچەی دا بوو، لێ ئەڤ جارە نە وەکو سۆفیایێ بوو.

سۆفیایێ هەرچەند پتر هزرا خوە د هەبوون و ژیانێ دا دکر، پتر ئەو بیرۆکە ژی ل دەڤ پەیدادبوو کو هەتا هەتایێ ئەو نامینتە ساخ. وێ تەماشەی خوە کر و د دلێ خوە دا گوت: "ڕاستە نوکە ئەز یا هەیم، لێ ڕۆژەك دێ هێت، ئەز ل ڤێ جیهانێ نامینم و من هەبوونا خوە نابیت."

ئەرێ پشتی مرنێ ژیانەکا دی هەیە؟ ئەڤە پرسیارەکا دی بوو کو چ پێنەڤێت بەرسڤا وێ ل دەڤ پشیکا وێ ژی نەبوو.

دەمەکێ درێژ نەبوری بوو دەمێ داپیرا سۆفیایێ وەغەرکری، لێ دگەل هندێ ژی سۆفیایێ هەموو ڕۆژان، بۆ ماوەیێ نێزیکی شەش هەیڤان، هەستپێدکر ئەو گەلەك یا ژ داپیرا خوە غەریب بووی. ئەرێ ما نەحەقی نینە کو هۆسا مرۆڤ ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان بمریت.

سۆفیا بۆ ماوەیەکی ما دناڤ باخچەی دا و هزرێن خوە دکرن، وێ پێکۆل دکر بۆ خوە قەناعەتێ چێکەت کو ئەو سۆفیا ب خوەیە، داکو ب ڕێکا وێ هزرکرنێ بیرۆکەیا مرنێ ژ مەژیێ خوە بینتە دەرێ، لێ هندی دهاتێ نەدشیا ڤێ چەندێ بکەت.

هەردەمێ هزرا خوە د هەبوون و ژیانا خوە یا نوکە دا دکر، هزرا ب دوماهی هاتنا ژیانا وێ ژی خوە ل سەرێ وێ ددا. بەروڤاژی ڤێ چەندێ ڕاستە: دەمێ وێ ب کووراتی

هەستپێدکر کو تشتەکێ بەرئاقلە ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ئەو د ژیانێ دا نامینیت، ل وی دەمی ب تەمامی دێ ڕامانا مەزن یا ژیانێ بۆ وێ دیار بیت.

ئەڤ چەندە وەکو دوو لایێن پارەیەکێ ئاسنی دهاتە پێشچاڤێن وێ دەمێ دگەل خوە هەلدگرتی، دەمێ تشتەك ل سەر ڕەخەکی یێ دیار و ئاشکەرا بیت، ئەو چەندە لایێ دی ژی ب هێز دکەت. ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێین بێژین ژیان و مرن ژی وەکو هەردوو ڕوویێن پارەیێ ئاسنی پێکڤە د گرێداینە.

گەلەك یا ب زەحمەتە ئەم هەست پێ بکەین کو ئەم دساخین ئەگەر ئەم هزرا خوە د هندێ ژی دا نەکەین کو ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دێ مرین ژی. د هەمان دەم دا، ئەگەر هزرا خوە د تایبەتمەندی و هەبوونا ژیانێ ژی دا نەکەین، ل وی دەمی گەلەك یا ب زەحمەتە بشێین هزرا خوە د مرنێ ژی دا بکەین.

ئاخفتنەکا نێزیکی ڤی بابەتی یا داپیرا سۆفیایێ هاتە بیرا وێ، دەمێ نوشداران گوتییێ نەخوشیا تە یا کوژەکە، داپیرا وێ گوتبوو: "من ئاگەهـ ژ ژیانێ نەبوو، لێ نوکە، ژ نوو من زانی ژیان چەند یا جوان و ب بهایە."

ئەرێ ما نە جهێ داخێ یە پتریا مرۆڤان پێدڤیە تووشی نەخوشیان ببن داکو بهایێ ژیانێ بزانن؟ یان ل سەر وان ژی پێدڤیە نامەیەك ژ دەڤ کەسەکێ نەنیاس بگەهیتە وان و ڕامانا ژیانێ بۆ شرۆڤە بکەت!

ڕەنگە ل سەر وێ یا پێدڤی بیت نوکە بچیت ل سندوقا پۆستەی بگەڕیت کا چ تشتێ دی تێدا نینە؟ سۆفیا بەرەڤ دەرگەهی ڤە چوو و سندوقا کەسك ڤەکر. زەرفەکێ وەکو زەرفێ بەری نوکە کەفتە بەر چاڤێن وێ. ئەڤ جارە ب تەمامی ئەو حێبەتی ما. سۆفیا یا پشتڕاست بوو کو دەمێ زەرفێ یەکێ بۆ وێ هاتی، وێ سندوقا پۆستەی هەموو ڤالا کربوو و چ تشت نەهێلابوونە تێدا.

دیسان ناڤێ سۆفیایێ ل سەر ڤێ نامێ ژی یێ نڤیسای بوو. سۆفیایێ زەرف ڤەکر و پارچەکا کاغەزێ ژێ ئینا دەرێ. ل سەر ڤێ پارچەیا کاغەزێ، ئەڤ پرسیاری ل سەر هاتبوو نڤیسین:

## "جیهان چەوا پەیدابوویە؟"

سۆفیایێ د دلێ خوە دا گوت: "ڤێجا ما ئەز چ دزانم، کەس نەشێت بەرسڤا ڤێ پرسیارێ ب دروستاهی بدەت. هەرچەندە وێ بەرسڤ نەدزانی، لێ دگەل هندێ هەستپێدکر پرسیارەکا بەرئاقلە و پێدڤی ب هزرکرنێ یە. بۆ یەکەم جار د ژیانا خوە دا سۆفیایێ هزرا هندێ دکر کو یا ب زەحمەتە ئەم دناڤ جیهانەکێ دا بژین، هەر چ نەبیت، بێ کو پرسیارا دروستبوونا وێ بکەین.

ڤان نامێن نهێنی سۆفیا گەلەك حێبەتی کربوو، ژبەر هندێ وێ بڕیار دا بچیتە د کۆلکێ خوە ڤە و بمینتە ب تنێ.

ئەڤ کۆلکە جهێ نهێنی یێ خوە ڤەشارتنا سۆفیایێ بوو. ئەو ب تنێ ل وان دەمان دچوو وێرێ دەمێ یا دامایی و پۆسیدە یان ژی یا تۆڕە و بێهن تەنگ بایە. هندەك جاران دەمێ گەلەك یا کەیفخوش ژی بایە، لێ ئەڤرۆکە مەژیێ وێ یێ ئالۆزە و هەموو تشت ل بەر وێ یێن گران بووین.

★ ★ ★

خانیێ وان یێ داری یێ ڕەنگ سۆر دناڤ باخچەیەکێ مەزن دا هاتبوو ئاڤاکرن. دناڤ وی باخچەی دا گەلەك داروبار و گول و گولزار و دارێن فێقی یێن جودا جودا هاتبوونە چاندن. ژ بلی ڤان تشتان، باخچەیەکێ بەرفرەهـ ژی ل بەر سینگێ وێ بوو کو هێسك و جۆلانکەکا بچووك تێدا بوون. باپیرێ وێ بۆ داپیرا وێ دروست کربوو دەمێ زارۆکان خوە یێ یەکێ پشتی چەند ڕۆژان ژ دایکبوونا وی، ژ دەستدای. ل وی دەمێ وان ناڤێ ڤێ زارۆکێ کربوو ماری و ل سەر کێلیا گورێ وێ ئەڤ گوتنی نڤیسابوو: "ماری یا بچووك هاتە دەڤ مە، سلاڤ کرە مە، پاشی سێ پێنگاڤ هاڤێتن و وەغەر کر."

ل دوماهیا باخچەی و د کوژیەکێ وی دا، ل پشت کومەکا دارێن توویان، ، تراشێن چڕ و بوش بلند ببوون، نە تووی ل سەر شین دبوون و نە گول و شتلێن داران. ل پشت وێ ژی پەرژانەکێ کەڤن هەبوو کو باخچە ژ دارستانێ جودا دکر، لێ دگەل هندێ ژی ببوو پەرژانەکێ ژ ڕاستی و کەس نەدشیا دناڤ ڕا دەرباز ببیت، چونکی ئەو نێزیکی بیست سالان بوو کەسێ چاڤێ خوە نەدایێ.

داپیرا سۆفیایێ گوتبوویێ ئەڤ پەرژانە ل سەردەمێ شەڕی، وەکو ڕێگرەکی بوو ل هەمبەری ڕیڤیان داکو هێرشێ نەکە سەر مریشکان یێن کو ب ئازادی دناڤ باخچەی دا دچەریان.

ژ بلی سۆفیایێ، هەموو کەسێن دی هزر دکر کو ڤی پەرژانی چ مفا تێدا نینە. ب دیتنا وان ئەو ژی وەکو وی کۆلکێ کێڤریشکان بوو یێ دناڤ کوژیەکێ باخچەی دا. وان ب ڤی ڕەنگی هزردکر، چونکی وان نەدزانی کا نهێنیا سۆفیایێ دگەل ڤی پەرژانی چیە. سۆفیایێ دزانی کونەکا بچووك دناڤ ڤی پەرژانی دا هەیە کو تێرا وێ دکەت خوە تێرا بخشینیت و بگەهیتە لایێ دی یێ دارستانێ یێ بەرفرەهـ. دا بێژی ئەو گژوگیایێ بلند و چڕ وەکو کۆلکەکێ ڕاستەقینەیە. ل ڤی جهی، ئەو یا پشتڕاست بوو کەس ب جهێ خوە ڤەشارتنا وێ ناکەڤیت یان ژێ دەربێخیت.

سۆفیا دناڤ باخچەی ڕا بوری و هێشتا ئەو هەردوو زەرف د دەستێ وێ دا بوون، دەمێ گەهشتیە نێزیکی پەرژانی ژی، دەست و پێن خوە نێزیکی خوە کرن و د وێ کونا بنێ پەرژانی ڕا خوە خشاند. کۆلکێ وێ هند یێ مەزن بوو کو تێرا وێ بکەت ڕابیتە ژ پێرڤە. لێ ئەڤرۆکە وێ حەز دکر ل سەر ڕهێن مەزن یێن دارەکێ بڕوونتە خوارێ. ل ڤی جهی، ئەو دشێت ب ڕێکا وان ڤالاهی و کونێن دناڤبەرا بەلگ و چەقێن داران دا، زێرەڤانیا هەموو تشتان بکەت. هەرچەندە خو قەبارەیێ یەك ژ ڤان ڤالاهیان ژ قەبارێ پارەیەکێ ئاسنی مەزنتر نەبوو لێ تێرا وێ دکر ئەو ب باشی باخچەی هەموویێ ببینیت.

دەمێ ئەو یا بچووك و دهاتیە دناڤ ڤی کۆلکێ بچووك دا و خوە دڤەشارتی، هەست ب خوشیێ دکر دەمێ ددیتی دایك و بابێن وێ یێ ل پشت داران ل وێ دگەڕیێن.

سۆفیایێ هزر دکر باخچەی مالا وان ب خوە ژی بۆ وێ جیهانەکا تایبەتە. هەردەمێ وێ گوهێ خوە ددا بەهەشتا عەدەن و چەوانیا ئافراندنا بەهەشتێ و مرۆڤان، وێ دئینا پێشچاڤێن خوە کو ئەو ژی دناڤ کۆلکێ خوە یێ بچووك دا یا ڕوونشتیە و زێرەڤانیا بەهەشتا خوە یا تایبەت دکەت.

- "ئەڤ جیهانە ژ کیڤە هاتیە؟"

ئەڤە چ پرسیارە! سۆفیایێ دزانی کو ئەرد ب تنێ وەکو تەپەکا بچووکە دناڤ دلێ ڤی گەردوونێ بەرفرەهـ دا. لێ، ئەڤ جیهانە ژ کیڤە هاتیە؟

گومان تێدا نینە کو ئەو پشتا خوە ب وێ مگرتیێ گەرم دکەت یا دبێژیت گەردوون هەر ژ دەستپێکێ هەبوویە، ل وی دەمی دێ بۆ وێ یا ب سانەهی بیت ڤی پرسیارێ ژ بنی ڕەت بکەت و هزرا خوە د بەرسڤا وێ دا نەکەت. لێ ئەرێ یا بەرئاقلە کو هەموو تشت هەر ل دەستپێکێ هەبووینە؟ وێ هەستپێکر کو ئەو دگەل ڤێ بیروکێ یا هەڤڕا نینە. پێدڤیە هەر تشتەکی دەستپێکا خوە هەبیت. مانە هۆسایە؟ ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە کو گەردوون ژی ژ تشتەکێ دی یێ پەیدابووی.

لێ ئەگەر ژێدەرێ گەردوونی ژ تشتەکێ دی هات بیت، ئانکو ئەو تشت ژی ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان بەری هینگێ ژ تشتەکێ دی پەیدابوویە. سۆفیایێ ئاگەهـ ژ هندێ هەبوو کو ئەو ب تنێ یا تشتەکی بۆ تشتەکێ بەری وی ڤەدگەڕینیت بێ کو بەرسڤا پرسیارێ ب دەست وێ بکەڤیت. چ پێنەڤێت، ل دەمەکی ژ دەمان، تشتەك ژ چنەیێ پەیدابوویە لێ ئەرێ ئەڤ چەندە یا بەرئاقلە؟ ئەرێ ما ئەڤ بیرۆکە ژی نەتشتەکێ مەحالە هەروەکو بیرۆکەیا کو جیهان هەر ل دەستپێکێ هەبوویە؟

ل قوتابخانێ، ئەو هاتبوو فێرکرن کو خودای جیهان یا ئافراندی. وێ پێکۆل دکر دلێ خوە ئارام بکەت و باوەریێ بۆ خوە چێکەت کو ئەڤ مگرتیە باشترین بەرسڤە بۆ ڤان هەموو پرسیاران. لێ پشتی هینگێ بێهنا وێ نەهات و دەست ب هزرکرنێ کر. ئەوێ باوەر دکر کو خودای جیهان یا ئافراندی؟ لێ باشە پا خودا؟ ئەرێ تو بێژی وی خوە ژ چنەیێ چێکریە؟ هەلبەت ئەڤ چەندە ژی بۆ وێ نە یا ڕۆهن بوو. ئەگەر ئەم بێژین کو خودا دشێت هەر تشتێ وی بڤێت بئافرینیت، پێدڤیە بەری هینگێ تشتەك هەبیت هەتا وی خوە پێ دابیت، چونکی ژ ناڤێ وی دیارە کو وی ب خوە یا خوە دای. ل ڤێرێ ب تنێ چارەسەریەك بۆ ڤێ پرسیارێ دمینیت:

خودا هەموو گاڤان هەبوویە. لێ هەر ژ دەستپێکێ سۆفیایێ پشتا خوە ب ڤێ چەندێ گەرم نەکر، بەلکو ئەو هەر ل دووڤ وێ بیروکێ دچوو کو پێدڤیە هەر تشتەکی دەستپێکا خوە هەبیت. جارەکا دی وێ هەردوو نامە ڤەکرن و خواندن.

- "تو کی؟"
- "ئەڤ جیهانە ژ کیڤە هاتیە؟"

ئەڤە چ پرسیارێن سەیرن! لێ ئەرێ ئەڤ هەردوو نامەیە ژ کیڤە هاتینە؟ ئەڤ چەندە ژی نهێنیەك بوو. ئەرێ ئەو کی یە سۆفیا ژ ژیانا وێ یا ئارام و رۆژانە پالدای و هاڤێتیە بەرامبەر ڤان پرسیار و سحبەتان ل دوور گەردوونێ مەزن؟

بۆ جارا سیێ سوفیا چوو سەحکەتە سندوقا پۆستەی. هۆسا دیارە پۆستەچی بەری نوکە یێ د وێرێ ڕا بوری. وێ دەستێ خو درێژ و کومەکا ڕۆژنامە و نامیلکەیێن ڕیکلامان و هندەك نامێن هنارتی بۆ دایکا خوە دیتن، زێدەباری پۆستکارتەکێ کو وینەیێ کنارێن باکوری ل سەر بوو. وێ تەماشەی پشتا کارتێ کر دیت پولا نەرویجی و جهێ هنارتنێ ل سەر نڤیسابوو: "بەتەلونیا نەتەوەیێن یەکگرتی". ئەرێ ژ دەڤ بابێ وێ هاتیە؟ بەلێ پا ئەو یێ ل لوبنانێ. خو هەکە ئەو ل جهەکێ دی ژی بیت، بەلێ دەستخەست ژی نە دەستخەتێ بابێ وێ یە.

دلێ سۆفیایێ بلەز خوە دقوتا دەمێ ناڤێ وێ کەسێ دخواندی یا ئەڤ نامەیە بۆ هاتیە فرێکرن: "هێلد موللەر کناگ" ب رێکا "سۆفیا ئاموندسنێ، کولانا کلوڤەر، ژمارە 3"

پشکا مایی ژ ناڤونیشانی هەموو یێ دروست بوو. سۆفیایێ نامە خواند.

*خوشتڤیا من هێلد*

*ئەز جەژنا ژ دایکبوونا تە یا پازدە سالیێ پیروز دکەم. هەروەکو تو دزانی کو ئەز یێ ڕژدم دیاریەکێ بۆ تە فرێکەم کو پێ مەزن ببی. ل من ببورە ئەگەر من پۆستکارت بۆ سۆفیایێ هنارت بیت چونکی ئەڤ چەندە گونجایترە.*

*دگەل رێزێن من بۆ تە*

*بابێ تە*

سۆفیایێ بلەز کرە غار و هاتە مال و یەکسەر چوو د لێنانگەهێ ڤە،

ئەرێ ئەڤ هێلدە کی یە یا ژیێ وێ بوویە پازدە سال، ل دەمەکی کو ب تنێ هەیڤەك یا مایی ئەو ژی جەژنا ژ دایکبوونا خوە یا پازدێ بکەت؟

سۆفیایێ دەفتەرا هژمارەیێن تێلەفۆنان ئینا دەرێ. وێ گەلەك کەس ب ناڤێ موللەر دیتن، ناڤێ هندەکان ژی کناگ دگەل بوو، لێ دناڤ وێ دەفتەرا مەزن و پڕی هژمارەیێن تێلەفۆنان، وێ چ ناڤ ب هێلد موللەر کناگ نەدیتن.

جارەکا دی ژی وێ ب تێروتەسەلی تەماشەی پۆستکارتێ کر. بەلێ ئەو کارتەکا ژ ڕاستا بوو و مۆر و پول ژی ل سەر بوون.

مەرەما بابێ هێلدێ چیە کارتا پیرۆزباهیا جەژنا بوونا کچا خوە بۆ سۆفیایێ بهنێریت، ل دەمەکی کو ئەو دزانیت پێدڤی بوو وی بۆ جهەکێ دی فرێکربایە؟ ئەو کیژ بابە ئەڤ هزرا خراب چوویە د سەرێ وی دا و ڤیایە کچا خوە بخاپینیت و کارتا پیرۆزباهیا جەژنا بوونا وێ بۆ ناڤونیشانەکێ دی فرێکەت؟ هەروەسا بۆچی ئەڤ چەندە یا گونجایترە. یا ژ هەموویێ گرنگتر، سۆفیا چەوا دێ ل هێلدێ گەڕییێت و نیاسیت؟

چ پێنەڤێت نوکە سۆفیا یا تووشی ئاریشەکێ بووی و یا پێڤە هاتیە گرێدان. دگەل هندێ ژی پێکۆل دکر سەر و ژ نوو هزرێن خوە ڕێك بێخیت و ل سەر خوە زالێ بیت.

د ماوەیێ دوو دەمژمێرێن پشتی نیڤرو دا، ئەو کەفتە بەرامبەر سێ بابەتێن گرنگ و هەستیار. بابەتێ یەکێ ئەو بوو کا کێ ئەو هەردوو نامێن کورت کرینە دناڤ سندوقا وان یا پۆستەی دا؟ یا دووێ: پرسیارێن ب زەحمەت یێن دناڤ وان نامەیان دا بوون، یا سیێ ژی: ئەرێ هێلد موللەر کی یە و بۆچی کارتا پیرۆزباهیا ڕۆژا ژ دایکبوونا وێ کچا نەنیاس بۆ سۆفیایێ هاتیە هنارتن؟

سۆفیا یا پشتڕاست بوو کو ب هەر ڕێکەکا هەبیت ڤان هەرسێ بابەتان پەیوەندی دگەل یەك هەیە. چونکی هەتا ئەڤرۆکە ژی ئەو د ژیانەکا ئاسایی دا دژیا و ژ نیشکەکێ ڤە ئەڤ چەندە ڕوودا.

# کولاڤێ درێژ

***...ساخلەتا یەکانە داکو مرۆڤ ببیتە فەیلەسۆفەکێ باش ئەوە شیانێن مەندەهوشیێ هەبن...***

سۆفیا یا پشتڕاست بوو کو خوەدانێ وان هەردوو نامێن نهێنی دێ جارەکا دی ژی پەیوەندیێ ب وێ کەت. ژبەر هندێ وێ بڕیار دا هەتا وی دەمی بەحسێ نامەیان بۆ چ کەسان نەکەت.

ل قوتابخانێ، ئەو هەر یا مژوول بوو و نەدشیا گوهێ خوە بدەتە وانەیان، چونکی ب دیتنا وێ مامۆستا ب تنێ بەحسێ بابەتێن بێ ڕامان دکەن. ئەرێ بۆچی بەحسێ سروشتێ مرۆڤی ناکەن؟ یان بەحسێ جیهانێ و چەوانیا پەیدابوونا وێ ناکەن؟

بۆ یەکەم جار وێ هەست ب هندێ کر کو خەلك ل قوتابخانە و هەموو جهێن دی ب تنێ مژوولی بابەتێن بەروەخت و لاوەکی نە، ل دەمەکی کو گەلەك ئاریشە و پرسیارێن ئالۆز و ب زەحمەت هەنە و پێدڤی ب شرۆڤەکرنێ نە.

ئەرێ کەسەك هەیە بەرسڤا وان پرسیاران بدەت یان هزرا خوە تێدا بکەت؟ سۆفیایێ هەستپێدکر هزرکرن د ڤان پرسیاران دا گەلەك ژ هندێ گرنگترە مرۆڤ وەختێ خوە ب ژبەرکرن و دووبارەکرنا هندەك بابەتێن بێ مفا ڤە ببورینیت.

دەمێ زەنگا ب دوماهی هاتنا وانەیا دوماهیێ هاتیە لێدان، یەکسەر وێ چانتێ خوە هەلگرت و بەرەڤ مال چوو. هەڤالا وێ جوانا نەچاربوو ل دووڤ دا بکەتە غارێ داکو ڤێرا بگەهیت.

پشتی ماوەیەکێ کێم، جوانایێ گوت: "ئەرێ تە دڤێت ئێڤاری یاریا پەرکانێ بکەین؟"

سۆفیایێ ملێن خوە لێ هەژاندن و گوت: "ئەز دبێژم ئێدی من زەوقا کرنا یاریا پەرکانێ نەمایە." جوانایێ باوەر ژ گوهێن خوە نەدکر کو سۆفیا یا تشتەکێ هۆسا دبێژیت.

- "چەوا؟ تە زەوقا وێ نینە؟ باشە تو چ دبێژی بچین یاریا بادمینتونێ* بکەین؟"

بەرێ سۆفیایێ ل جادا ڤێرێ بوو، پاشی سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی هەڤالا خوە کر و گوتێ: "ئەز دبێژم ئێدی یاریا بادمینتونێ ژی بۆ من چ خوشی تێدا نینە؟"

- "ئەز دبێژم تو یا ترانا دکەی؟"

سۆفیایێ هەست ب بێهیڤیبوونەکێ د تونا دەنگێ جوانایێ دا کر.

- "باشە تو دێ شێی بێژیە من کا چ تشت بۆ تە یێ گرنگە؟"

سۆفیایێ دیسان سەرێ خوە لێ زڤراند و گوت: "ئەڤ چەندە نهێنیەکە ل دەڤ من؟"

- "ئاها! ئەز دبێژم تو یا عاشق بووی!"

پشتی هینگێ ئەو هەردوو کچ بێ تشتەکی بێژن، بۆ ماوەیەکێ درێژ ب رێکێ دچوون. دەمێ گەهشتینە یاریگەها تەپا پێی، جوانایێ گوت: "ئەز دێ دناڤ یاریگەهێ را چم."

چ پێنەڤێت دناڤ یاریگەهێ دا نێزیکترین رێك بوو ژ بۆ مالا جوانایێ، لێ ئەو ب تنێ ل وی دەمی دناڤ یاریگەهێ را دچوو مال دەمێ یا بلەز بایە. بۆ نموونە دەمێ وان مێهڤان هەبانە یان ژی ڤانێ سەرەدانا نوشدارێ ددانان هەبایە.

---

* بادمینتون Badminton یارییەکا وەرزشی یە کو وەکو یاریا تەنسێ یە ل شوونا بکارئینانا تەپەکا بچووك، تەپەکا بچووك یا پەڕان دهێت بکارئینان.

سۆفیایێ پێ نەخوشبوو کو بوویە ئەگەر هەستێن جوانایێ بهێنە بریندار کرن، لێ ئەرێ ئەو دشیا چ بۆ بێژیت؟ ئەرێ گوتبایێ کو ژ نیشکەکێ ڤە مژوولی هزرکرنا هندێ یە کا ئەو ژ کیڤە هاتیە و جیهان چەوا پەیدابوویە؟ یان ژی گوتبایێ من دەمێ کرنا یاریا بادمینتونێ نینە؟ ئەرێ تو بێژی هەڤالا وێ د ڤێ چەندێ گەهشتبایە ئەگەر بۆ گوتبایە؟"

ئەرێ بۆچی دڤێت گرنگیدانا وێ ب ڤان پرسیارێن گرنگ کو د هەمان دەم دا پرسیارێن گەلەك ب سانەهینە ژی، هند ژیانا وێ ئالۆز کربیت؟

سۆفیا گەهشتە بەر دەرگەهێ مال و دەمێ چووی دا سندوقا پۆستەی ڤەکەت، هەستپێکر دلێ وێ یێ خوە بلەز دقوتیت. ل دەستپێکێ نامەیەکا بەنکێ کەفتە بەر چاڤێن وێ و پاشی هندەك زەرفێن دی یێن مەزن و ڕەنگ قەهوائی کو بۆ دایکا وێ هاتبوون. سۆفیا ل هیڤیا هندێ بوو نامەیەکا دی ژ دەڤ وی کەسێ نەنیاس بۆ وێ بهێت.

پشتی وێ دەرگەهێ سندوقێ گرتی، ژ نیشکەکێ ڤە چاڤێ وێ ب پشتا یەك ژ وان زەرڤێن مەزن کەفت کو ناڤێ وێ ل سەر بوو. ل پشتا نامێ ئەڤ دێرە ل سەر هاتبوو نڤیسین: "کورسێ فەلسەفێ، دڤێت تو گەلەك ب هشیاری سەرەدەریێ دگەل بکەی."

سۆفیا بلەز ل سەر ڕێکا بەران یا دناڤ باخچەی ڕا بوری و چانتێ خوە هاڤێتە سەر دەرەجکان. نامێن دی ژی دانانە بن مەحفیرکا ل بەر دەرگەهی و ل دووڤ دا بەرەڤ پشتا باخچەی کرە غارێ و خوە گەهاندە د کۆلکێ بچووك ڤە، چونکی وێ دڤیا زەرڤێ مەزن ئەوێ بۆ وێ هاتی ل وێرێ ڤەکەت.

پشیکا وێ شیریکانێ ژی ل دووڤ کرە غارێ، لێ سۆفیایێ چ گرنگی پێ نەدا چونکی دزانی پشیك نەشێت چ تشتان ل دور ڤێ نهێنیا وێ بۆ کەسێ بێژیت.

دناڤ زەرفی دا، سێ پەڕێن مەزن و چاپکری تێدابوون و ب کلیبسەکێ پێکڤە هاتبوونە گرێدان. سۆفیایێ دەست ب خواندنا وان کر.

# فەلسەفە چیە؟

سوفیایا هێژا،

خەلکی گەلەك ئارەزوویێن جۆراوجۆر هەنە. هندەك کەس پارەیێن کەڤن بۆ خوە کووم دکەن و هندەکێن دی ژی پولێن پۆستان و هندەك ژی مژوولی ئەنجامدانا کارێن دەستی نە. هندەك خەلکێ دی ژی پترِیا دەمێ خوە یێ ڤالاٚ ب ئەنجامدانا وەرزشەکا تایبەت ڤە دبورینن.

گەلەك کەس ژی حەز ژ خواندنا پەرتووکان دکەن، لێ هەر یەك حەز ژ جۆرەکێ پەرتووکان دکەت. هندەك ب تنێ ڕۆژنامەیان دخوینن و هندەکێن دی ب تنێ چیرۆکێن وێنەدار دخوینن و هندەك ژی حەز ژ خواندنا ڕۆمانان دکەن. ل دەمەکی هندەك کەسێن دی دبینن باشترە ئەو پەرتووکێن هەمەڕەنگ بخوینن وەك پەرتووکێن ل دور ستێران و ژیانا گیانەوەرێن کیڤی، یان ژی بابەتێن جۆراوجۆر ل دور نووترین داهێنانێن تەکنولوژی.

بەلێ ئەگەر بۆ نموونە ئەز حەز سوواربوونا هەسپان یان خرڤەکرنا بەرێن گرانبەها بکەم، نابیت ئەز داخواز ژ هەموو کەسێن دی بکەم وەکو من حەز ژ سوواربوونا هەسپان یان خرڤەکرنا بەرێن گرانبەها بکەن. یان ژی ئەگەر ئەز ب خوشیەکا مەزن ڤە تەماشەی پرۆگرامێن وەرزشی بکەم، ئێدی نابیت ئەز ڕێکێ بدەمە خوە ڕەخنێ ل وان کەسان بگرم یێن هزر دکەن وەرزش کارەکێ بێ مفا و نەخوشە.

ئەرێ ل ڤێ دنیایێ تشتەك هەیە کو جهێ گرنگیپێدانا هەموو کەسان بیت؟ ئەرێ تشتەك هەیە پەیوەندی ب ژیانا هەموو مرۆڤان ڤە هەبیت، هەلبەت بێ کو تو هندێ ل بەرچاڤ وەربگری کا ئەو مرۆڤ کینە و ل کیژ پارچا دنیایێ دژین؟ بەلێ سۆفیایا عەزیز، هندەك پرسیار هەنە دڤێت جهێ گرنگیدانا هەموو مرۆڤان بن. ئەڤ کورسە ژی دەربارەی وان جۆرێن پرسیارایە.

ئەرێ گرنگترین تشت د ژیانێ دا چیە؟

ئەگەر ڤێ پرسیارێ ژ کەسەکێ برسی بکەی، دێ بێژیت خوارنە. هەمان پرسیارێ ژ کەسەکێ دی بکەی کو هەست ب سەرمایێ بکەت دێ بێژیت گەرماتی یە. هەردیسان

ئەگەر ڤێ پرسیارێ ژ کەسەکێ ب تنێ بکەی یێ کو هەست ب تنێبوونێ دکەت، چ پێ نەڤێت ئەم دشێین پێشبینیا هندێ ژێ بکەین کو بەرسڤا وی ئەو بیت گرنگترین تشت ئەوە مرۆڤ دگەل خەلکی بژیت.

بەلێ ئەگەر ئەڤ تشتێن بنەڕەت هاتنە بجهئینان و هەر کەسەك گەهشتە وی تشتێ بۆ وی گرنگ، ئەرێ هێشتا دێ تشتەك مینیت کو هەموو مرۆڤان پێدڤی پێ هەبیت؟ فەیلەسۆف یێ د وێ باوەریێ دا کو تشتەك هەیە. ئەو دبێژن مرۆڤ ب تنێ ب خوارنێ ناژیت. ڕاستە هەموو کەسان پێدڤی ب خوارن و حەژێکرن و سوزداریێ هەیە، لێ ژ بلی ڤان هەموو تشتان هێشتا تشتەك هەیە هەموو مرۆڤان پێدڤی پێ هەیە. نوکە ئەم دێ کەڤینە بەرامبەر ڤێ پرسیارێ: ئەم کینە و بۆچی دژین؟

ڤەدیتنا بەرسڤا ڤێ پرسیارێ ژی ئەو تشتە یێ مە هەموو مرۆڤان پێدڤی پێ هەی. ئانکو دەمێ مە دڤێت بزانین بۆچی ئەم دژین، وەکو ئارەزوویا خرڤەکرنا پولان نینە یا ژ نیشکێ ڤە ل دەڤ مرۆڤی پەیدادبیت. ئەو کەسێ مژوولی کرنا ڤان پرسیاران بیت، دێ مژوولی تشتەکی بیت کو مرۆڤایەتیێ ب درێژاهیا هەبوونا خوە ل سەر ڕوییێ ئەردی گەنگەشە ل سەر کریە. پرسیارکرن دەربارەی چەوانیا پەیدابوونا گەردوونی و ئەردی و ژیانێ ل سەر ڕووییێ ئەردی، گەلەگ گرنگتر و مەزنترە ژ وێ پرسیارا دبێژیت کا کیژ یاریکەری پتر مەدالییێن زێڕی د دوماهیك بەریکانا ئۆلومپیاتێ دا ب دەست خوە ڤە ئینایینە.

باشترین ڕێك مە نێزیکی فەلسەفێ بکەت، کرنا هندەك پرسیارێن فەلسەفی یە.

چەوا جیهان هاتیە ئافراندن؟ ئەرێ مەرەمەك یان ڕامانەك ل پشت دروستبوونا وێ هەیە؟ ئەرێ پشتی مرنێ ژیان هەیە؟ ب شێوەیەکێ گشتی ژی دێ چەوا بەرسڤا ڤان پرسیاران ب دەست ڤە ئینیت؟ یا ژ هەموویێ ژی گرنگتر چەوا ژیانا خوە ب ڕێڤە ببەین؟ مرۆڤان ب درێژاهیا دیرۆکێ ئەڤ پرسیارە کرینە. ل دنیایێ چ کەلتور نینن کو گرنگی ب نیاسینا مرۆڤی یان ڤەدیتنا چەوانیا دروستبوونا گەردوونی نەدابیت.

د ڕاستی دا، گەلەك پرسیارێن فەلسەفی یێن جۆراوجۆر نینن کو مرۆڤ بشێت ئاڕاستە بکەت. گرنگترین پرسیار ئەو بوون یێن بەری نوکە مە کرین، بەلێ دیرۆك ل

بەرامبەر هەر پرسیارەکێ کومەکا بەرسڤێن جۆراوجۆر ددەتە مە. ژبەر هندێ ئاڕاستەکرنا پرسیارێن فەلسەفی، گەلەك ژ بەرسڤدانا وان ب سانەهیترە.

ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە ژی پێدڤیە هەر کەسەکی بەرسڤا خوە یا تایبەت بۆ وان پرسیاران هەبیت. بۆ نموونە ئەگەر مە بڤێت بزانین کا ب دروستاهی خودا یێ چەوایە یان ژی ئەگەر مە بڤێت بزانین کا پشتی مرنێ جارەکا دی ژیان هەیە یان نە، دبیت ئەم تەماشەی فەرهەنگان یان هندەك پەڕتووکان بکەین، لێ د هەمان دەم دا دڤێت وێ چەندێ ژبیر نەکەین فەرهەنگێن گشتی ڕێکا ژیانێ نیشا مە نادەن و چەوانیا ب ڕێڤەبرنا ژیانێ ژی بۆ مە ڕۆهن ناکەن. دەمێ مە بڤێت ئەم ببینە خوەدانێن بۆچوونێن خوە یێن تایبەت، ڕەنگە خواندنا وان تشتان یێن کەسێن بەری مە هزر تێدا دکری د هاریکار بن و وەك ڕێنیشاندەرەکی بن.

ئەم دشێین لێگەریانا فەیلەسۆفان ل دور ڕاستییێن دگەل پولیسەکێ نهێنی یێ د چیرۆکان دا هەڤبەر بکەین. بۆ نموونە دبیت هندەك کەس هزر بکەن "ئاندەرسەن" زەلامێ کوژەك بوو، هندەك دی ژی هزر بکەن "نیلسون" یان "یانسون" زەلامکوژ بوو، لێ دەمێ ئەم بەحسێ نهێنیا ڤەدیتنا تاوانەکا ڕاستەقینە دکەین، ڕەنگە پولیسێ نهێنی بشێت ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان تاوانبارێ ڕاستەقینە دیار بکەت. لێ ڕەنگە یا ب زەحمەت بیت ئەو بشێت بچیتە د ناخێ بابەتی دا و هەموو هوردەکاریان بزانیت، بەلێ د هەموو کاودانان دا ڤێ نهێنیێ هەر چارەسەریەك هەیە.

ب هەمان شێوە، هەرچەند بەرسڤادانا پرسیارەکێ یا ب زەحمەت بیت، لێ دگەل هندێ وێ پرسیارێ ب تنێ یەك بەرسڤا ڕاستەقینە هەیە. بۆ نموونە پشتی مرنێ، یان دووبارە ژیان یا هەی یان ژی ڕەنگە نەبیت.

زانستی هێدی هێدی هندەك مەتەل و نهێنییێن کەڤن بۆ مە شرۆڤە کرینە. بۆ نموونە هەکە ل سەر دەمەکی خەلك هەموو مژوولی هندێ بن کا ڕوویێ هەیڤێ یێ چەوایە و بۆ وان وەکو نهێنیەکێ بیت و هندی گەنگەشە کربیت و نەگەهشتبنە چ ئەنجامان هەتا ل دوماهیێ بەرسڤا خوە هێلایە ب هیڤیا ئاشوپا کەسەکی ب تنێ ڤە، بەلێ ل سەر دەمێ

زانستی ئەو نهێنی نەمایە و ئێدی کەس باوەر ژ هندێ ناکەت کو هندەك مرۆڤ ل سەر ڕوویێ هەیڤێ دژین یان ڕوویێ هەیڤێ وەکو پرتەکا پەنیرێ کەسکە*.

یەك ژ فەیلەسۆفێن یونانی یێن کەڤن کو بەری دوو هزار سالان ژیایە، بۆچوونا وی ئەو بوو کو فەلسەفێ ژ ئەنجامێ هەستکرنا مرۆڤی ب تشتێن سەیر یێن دەوروبەر یا سەرهلدای. وی دگوت ل دەڤ مرۆڤی یا سەیرە ل سەر ئەردی دژیت و هەبوونا خوە هەیە. ئەڤ مەندەهوشیە وەل پرسیارێن فەلسفی دکەت ئەو ب خوە بهێنە ئاڕاستەکرن.

ئانکو وەکو هندێ یە دەمێ تەماشەی سێرەبەندەکێ دکەین، ئەم نەشێین مایێ خوە د چەوانیا کارێ وێ دا بکەین، ژبەر هندێ ئەم دێ پرسیارا خوە ب ڤی جۆری داڕێژن: ئەرێ ئەو سێرەبەند چەوا دشێت هژمارەکا دەستمالێن پەمبی یێن سپی بکەتە کێڤریشکەکا زیندی؟

پتریا خەلکی د وێ باوەرێ دانە کا چەوا تێگەهشتنا کارێ سێرەبەندەکێ یێ ب زەحمەتە دەمێ کێڤریشکەکا زیندی ژ کولاڤەکێ درێژ و ڤالاً دا دئینتە دەرێ، ئاها هۆسا تێگەهشتنا جیهانێ ژی یا ب زەحمەتە.

دەمێ ئەم بەحسێ سێرەبەندێ دکەین، ئەم د پشتڕاستین ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگان وێ سێرەبەندێ ئەم یێن خاپاندین و د هەمان دەم دا ئەم هەموو حەز دکەین ئەو چەوانیا سێرا خوە بۆ مە ئاشکەرا بکەت. لێ دەمێ ئەم بەحسێ جیهانێ دکەین، پیچەکێ جوداهی دکەڤیتە بابەتێ مە چونکی ئەم دزانین ئەڤ جیهانە ب سێرەبەندی و خاپاندنێ نەهاتیە ئافراندن. بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ژی ئەوە نوکە ئەم ب خوە دناڤ ڤێ جیهانێ دا دژین و بەشەکین ژ وێ.

د بنیات دا، ئەم وەکو وێ کێڤریشکا سپی نە یا دناڤ کولاڤێ ڤالاً دا دهێتە دەرێ. جوداهی دناڤبەرا مە و کێڤریشکێ دا ل ڤێرێ ب تنێ ئەوە کو وێ کێڤریشکێ ئاگەهـ ژ هندێ نینە یا بەشداریێ د کارێ سێربەندەکێ دا دکەت، لێ بابەت ل دەڤ مە یێ جودایە.

---

* ڕوویێ هەیڤێ وەکو پرتەکا پەنیرێ کەسکە The moon is made of green cheese، ئیدیەما زمانێ ئینگلیزیێ یە بۆ هندێ دهێتە بکارئینان دەمێ پەنیر هێشتا یێ تەڕ و کەڤن بووی کو ڕەنگێ وی یێ سپی یە و شێوەیێ وی یێ گرۆڤرە.

ئەم د پشتڕاستین ئەم یێ بەشداریێ د کارەکێ گەلەك نهێنی دا دکەین و دخوازین هەموو تشت بۆ مە ڕۆهن ببن.

ڕەنگە یا باشتر بیت ئەگەر ئەم کێڤریشکا سپی بدانینە جهێ هەموو گەردوونی. ئەم مرۆڤێن ل سەر ڕوویێ ئەردی ژی وەکو هندەك مێریێن بچووك بین کو دناڤ بنێ فەروویێ وێ دا دژین. لێ داکو فەیلەسۆف بشێن ب دروستاهی تەماشەی ناڤچاڤێن وی سێرەبەندی بکەن، پێکۆلێ دکەن داڤەکا زراڤ یا فەروویێ وێ کێڤریشکێ بلڤلڤینن.

تو تێگەهشتی سۆفیا؟ دێ کورسێ مە یێ بەردەوام بیت.

سوفیا بێدەنگ بوو. ئەرێ تو بێژی ئەو تێگەهشت بیت؟ ب ڕاستی ژی ل بیرا وێ نەبوو دەمێ ئەو نامە دخواندی کا بێهنا خوە د هەلکێشا یان نە.

ئەرێ کێ ئەو نامە هنارتیە؟ کێ؟ باوەرنەکە هەمان ئەو کەس بیت یێ بەری نوکە کارتا پیرۆزباهیێ بۆ هێلد موللەرێ فرێکری. چونکی وێ کارتێ مور و پول ل سەر هەبوو. لێ ئەڤ زەرفێ مەزن یێ ڕەنگ قەهوای، هەردوو نامێن سپی یێن بەری هینگێ، کەسەکی ڕاستەخو یێن هاڤێتینە دناڤ سندوقا وان یا پۆستەی دا

سۆفیایێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر. چارێکەك مابوو بۆ دەمژمێر سێ. ڕامانا ڤێ چەندێ ژی ئەوە هێشتا دوو دەمژمێر یێن ماین هەتا دایکا وێ ل سەر کارێ خوە بزڤریت.

سۆفیا ژ ناڤ کۆلکی دەرکەفت و خو زك و زك ل بن پەرژانی خشاند و هاتە ناڤ باخچەی، پاشی بلەز بەرەڤ سندوقا پۆستێ ڤە چوو. ڕەنگە نامەیەکا دی تێدابیت. بەلێ زەرفەکێ دی یێ قەهوای تێدا بوو و ناڤێ وێ ل سەر پشتا وێ ژی یێ نڤیسایی بوو. وێ تەماشەی هەرچوار لایێن خوە کر، لێ وێ کەس نەدیت. سۆفیا بەرەڤ لێڤا دارستانێ ژی چوو و تەماشەی ڕێکا وێ دکر، لێ دیسان کەس د ڕێکێ ژی دا نەدیت.

ژ نیشکەکێ ڤە، وێ گوهـ ل قرچ قرچا هندەك لقێن هشك یێن داران بوو. هەرچەندە ئەو یا پشتڕاست نەبوو، بەلێ هەکە خوە ل دووڤ وی دەنگی کربایە غارێ ژی یا بێ مفابوو، چونکی یا دیاربوو ئەو تشتێ دەنگ ژ پێن وی هاتی ب هەموو هێز و شیانێن خوە ڤە دکرە غار و ژ وێرێ دوور دکەفت.

سۆفیا زڤڕی مال و چانتا خوە و نامێن دایکا خوە دانانە د ژوور ڤە و پاشی بلەز بەرەڤ ژوورا خوە چوو. قودیکا کێکا خوە یا مەزن ئینا دەرێ کو هەموو بەرێن خوە یێن جوان و گرانبها دکرنە تێدا. هەموو بەر هاڤێتنە سەر ئەردی و ل شوونا وان هەردوو زەرفێن مەزن کرنە تێدا. قودیکا خوە دانا بن ملێ خوە و بەرەڤ باخچەی چوو، لێ ل سەر ڕێکا خوە خوارنا پشیکان بۆ شیریکانێ دانا جهێ وێ یێ تایبەت.

- "پش، پش، پش!"

دەمێ گەهشتیە دناڤ کۆلکێ خوە دا ڤە، هندەك کاغەزێن دی یێن چاپکری ئینانە دەرێ و دەست ب خواندنا وان کر.

## بونەوەرەکێ سەیر

دیسان ئەڤە جارەکا دی ئەم گەهشتینە هەڤدوو! هەروەکو تو دبینی ئەڤ کورسێ فەلسەفێ یێ بچووك ب چەند بەشێن گونجای یێ دگەهیتە دەستێن تە. ل دەستپێکێ دا ب چەند تیبینیێن دەستپێکی بچینە دناڤ بابەتی دا.

ئەرێ بەری نوکە من گوتبوو تە کو ئەگەر مرۆڤ ب چاڤەکێ حێبەتی تەماشەی جیهانێ بکەت دێ شێت بیتە فەیلەسۆفەکێ ژێهاتی؟ ئەگەر من نەگوت بیت، دێ نوکە بێژم: **ساخلەتا یەکانە داکو مرۆڤ ببیتە فەیلەسۆفەکێ باش ئەوە شیانێن مەندەهوشیێ هەبن.**

هەموو زارۆکان شیانێن ڤێ چەندێ هەنە، ئەڤ چەندە ژی پێدڤی ب چ بەلگەیان ناکەت. زارۆك پشتی چەند هەیڤەکان دهێنە دناڤ ڕاستیەکا زیق دا. لێ هێدی هێدی دگەل مەزنبوونا وان ژی، شیانێن مەندەهوشیا وان ب ڤێ جیهانێ کێم دبن. ئەرێ بۆچی ئەڤ شیانێن وان کێم دبن؟ ئەرێ سوفیا ئاموندسنێ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ هەیە؟

هەرچەوا بیت، ئەگەر زارۆکەکێ ساڤا شیانێن ئاخفتنێ هەبانە، دا یەکسەر بەحسێ وێ جیهانا سەیر کەت یا ئەو ژ نوو هاتیە دناڤ دا. هەرچەندە ئەو زارۆك نەشێت باخڤیت، لێ ئەم دبینین کا چەند ب پەرۆش ڤە دەستێ خوە بۆ چوار لایێن خوە درێژ دکەت و پێکۆلێ دکەت تشتان ب دەستێن خوە بگریت.

دەمێ دگەل بورینا وەختی فێری ئاخفتنێ ژی دبیت، هەر جارا سەیەکی دبینیت دێ ڕاوەستیت و بێژیتێ "عەو، عەو". دێ دناڤ عەرەبانکا خوە دا هێتە دەرێ یان خوە بلند کەت و دەستێ خوە درێژ کەتە سەی و بێژیتێ "عەو، عەو". ڕەنگە ئەم کەسێن مەزن ژبەر ڤێ جوش و پەرۆشا زارۆکی بواستیێن یان تۆرەبین و بێژینێ: "بەلێ تو ڕاست دبێژی، ئەو عەو عەوە، ب تنێ تو ب ئارامی دناڤ عەرەبانکا خوە دا بروونە خوارێ."

ئەم وەکو وی هند ب پەرۆش نینین ژ بۆ دیتنا وی گیانەوەری، چونکی بەری هینگێ مە گەلەك یێن دیتین. ڕەنگە دیتنا سەیەکی یان فیلەکی یان هەسپەکێ دەریای سەدان جاران بۆ زارۆکی دووبارە ببیت هەتا ل دەڤ وی ببیتە تشتەکێ ئاسایی و ب ئارامی دبەرا ببوریت. لێ بەری زمانێ زارۆکی تەمام بیت و فێری هزرکرنەکا فەلەسەفی ببیت، جیهان ل دەڤ وی دبیتە تشتەکێ ئاسایی و ڕاهاتی.

سۆفیایا ئەزیز، هیڤیا من ئەوە تو ژ وان کەسان نەبی یێن ب نەچاری پێشوازیێ ل جیهانێ دکەن. بۆ هندێ ئەم پشتڕاست بین، بەری کو دەست ب کورسێ خوە یێ فەلسەفی بکەین، ئەم دێ گەنگەشێ ل سەر دوو تاقیکرنێن هزری کەین.

هزر بکە ڕۆژەکێ تو یا دناڤ دارستانەکێ دا پیاسەیان دکەی و ژ نیشکەکێ ڤە پاپۆرەکا ئەسمانی کەفتە بەر چاڤێن تە. ل دووڤ دا بونەوەرەکێ خەلکێ مەریخێ ژ وێ پاپۆرێ هاتە خوارێ و ڕك تەماشەی چاڤێن تە کر، ئەرێ هینگێ دێ هزرا خوە د چ دا کەی؟ هەرچەندە نە یا گرنگە کا ل دوماهیێ دێ چ هزر کەی، لێ ئەرێ تو هزرا هندێ ناکەی کو تو ژی بونەوەرەکا مەریخێ بای؟

ئەم دانپێدانێ ب هندێ دکەین کو شیانێن ڤەدیتنا هندەك بونەوەران ل سەر ئەختەرەکا دی، ڕەنگە ل سەردەمێ نوکە پێشبینیەکا لاواز بیت، دگەل هندێ ژی ئەم نزانین کا ئەرێ ژیان ل سەر ئەختەرێن دی هەیە یان نە لێ ئەم دشێین هزر بکەین کو دبیت ڕۆژەکێ ل بەرامبەری خوە براوەستی و ب تەمامی خوە ب شێوەیەکێ دی یێ نوو ببینی. دوور نینە ئەڤ چەندە ل وی دەمی ڕووبدەت دەمێ تو دناڤ دارستانێ دا پیاسەیان دکەی. ل وی دەمی دێ د دلێ خوە دا بێژی: "ئەز بونەوەرەکا سەیرم، ئەز گیانەوەرەکا ئەفسانەیی مە."

دبیت ل ڤی دەمی تو وەکو وێ خاتینێ بی یا د چیرۆکا ناڤدار "خاتینا نقستی دناڤ دارستانێ" دا بی دەمێ ژ خەوەکا کوور و درێژ هشیار دبی. ل وی دەمی دێ پرسیارێ ژ خوە کەی: "ئەرێ ئەز کیمە؟" ل وی دەمی ب تنێ دێ زانی کو تو بونەوەرەکی دناڤ ڤی گەردوونی دا، لێ ڕەنگە پرسیارێ ژ خوە بکەی ئەرێ پا گەردوون چیە؟ ئەگەر تو خوە ب ڤی شێوەی ببینی، ل وی دەمی دێ تشتەکێ گەلەك سەیر بینی کو وەکو دیتنا بونەوەرێ مەریخێ یا سەیرە.

نوکە تو تێگەهشتی سۆفیا؟ دا تاقیکرنەکا هزری یا دی ژی بکەین.

ل سپێدەیەکێ دایك و باب و تۆماسێ برایێ تە یێ سێ سالی ل سەر مێزا خوارنێ ڕوونشینە و یێ تێشتێ دخون. دایکا تە پیچەکێ ژ مێزێ دوورکەفت، لێ ژ نیشکەکێ ڤە بابێ تە بلند بوو و دناڤ بای دا لەرزی، تۆماسێ برایێ تە ژی هەر ل جهێ خوە یێ ڕوونشتیە و تەماشەی بابێ تە دکەت.

ئەرێ ب بۆچوونا تە دێ تۆماس چ بێژیت؟ ڕەنگە تبلا خوە بۆ بابێ خوە درێژ بکەت و بێژیت: "بابو یێ دفریت!"

ڕاستە دێ تۆماس حێبەتی مینیت، لێ ل دەڤ وی هند تشتەکێ سەیر نینە. ئەو گەلەك زوو ب تشتێن دەروبەری خوە حێبەتی دمینیت. هەرچەوا بیت، بابێ تە چەندین کار و ڕەفتارین جودا جودا بۆ تۆماسی دکەت، ئەڤ فڕینا وی ژی ل سەر مێزا خوارنێ ب دیتنا تۆماسی چ سەیراتی تێدا نینە. هەموو گاڤان بابێ تە ب ماکینەکا سەیر ڕهێن خوە ل پێشچاڤێن تۆماسی دتراشیت، هندەك جاران دچیتە سەر بانی و ئەریالێ تێلەڤزیونێ دگوهۆڕیت و هندەك جاران ژی سەرێ خوە دکەتە دناڤ مەکینا ترۆمبێلێ دا و دەمێ سەرێ خوە دئینتە دەرێ، سەروچاڤێن وی یێن ڕەش بووین.

نوکە ژی گەڕا دایکا تەیە. وێ گوهـ ل ئاخفتنێن تۆماسی بوو و هەر یەکسەر ل پشت خوە زڤڕی. ئەرێ ب دیتنا تە ئەو دێ چ کەت دەمێ دبینیت هەڤژینێ وێ ژ سەر مێزا خوارنێ یێ بلندبووی و مایە ل هەوا. چ پێنەڤێت دێ شووشەیا مرەبێ یا دناڤ دەستێن وێ دا کەڤیتە سەر ئەردی و کەتە ڤێژی و هەوار. ڕەنگە پشتی بابێ تە دهێتە خوارێ و ل سەر کورسیکێ دڕوونتە خوارێ، ڕەوشا وێ تێکبچیت و پێدڤی ب نوشدارەکێ بیت.

ب بۆچوونا ته بۆچی دایکا ته گەلەك جوداتر ژ تۆماسی ڕەنگڤەدانا ڤێ ڕوودانێ کر؟ ئەڤێ چەندێ پەیوەندی ب ڕاهاتنێ ڤە هەیە، وەك تیبینی ڤێ چەندێ باش ژبەر بکە. هەلبەت چونکی دایکا ته دزانیت مرۆڤان شیانێن فڕینێ نینن، لێ تۆماس هێشتا زارۆکە و فێری هندێ نەبوویە کا مرۆڤ د ژیانێ دا دشێت چ بکەت و چ نەکەت.

لێ ئەرێ سۆفیا دەربارەی جیهانێ ب خو ئەم چ دزانین؟ ئەرێ تو دبینی کو ئەو ژی یا هۆسایە؟ ئانکو ئەو ژی وەکو بابێ تە دناڤ ئەسمانی دا یا هەلاویستی یە؟ مخابن، ئەم مرۆڤ دگەل مەزنبوونا خوە، گەلەك زوو دگەل تشتێن دەوروبەری خوە ڕادهێن و ئێدی هەموو تشتان ب سروشتی وەردگرین.

دگەل بورینا ژیێ مە، ئێدی چ تشت مە حێبەتی ناکەن. ل ڤێرێ ئەم تشتەکێ گرنگ و بنەڕەتی ژ دەستددەین کو فەیلەسۆف هەموو گاڤان پێکۆلێ دکەن وی تشتی د ناخێ مە دا هشیار بکەن، دەنگەك د ناخێ مە دا دکەتە هەوار و دبێژیت: "جیهان نهێنیەکا مەزنە." ئەڤ چەندە تشتەکە بەری کو هزرا خوە تێدا بکەین، مە یا هەستپێکری ژی.

ب کورتی دێ بێژم: "هەرچەندە پرسیارێن فەلسەفی پەیوەندی ب هەموو مرۆڤان ڤە هەنە و ژ هەموویان دگرن، لێ هەموو کەس نابنە فەیلەسۆف. ژبەر هندێ پتریا خەلکی هند ب ژیانا خوە یا ڕۆژانەڤە دهێنە گرێدان، ئێدی وان دەمێ هزرکرنێ د ژیانێ دا نامینیت. هەروەکو وان مێرییێن هوور یێن ل سەر بنێ فەرۆیێ کێڤریشکێ ڕوونشتینە خوارێ و جهێ وان یێ گەرمە ژبەر هندێ ب درێژاهیا ژیانا خوە ل وێرێ دمینن.

ژیان ب هەموو تشتێن دناڤ دا، ل دەڤ زارۆکان جهێ حێبەتیێ یە، لێ ل دەڤ کەسێن دانعەمر ب وی ڕەنگی نینە بەلکو جیهان ل دەڤ پتریا خەلکی تشتەکێ ئاسایی یە و چ حێبەتی تێدا نینە.

ل ڤێرێ، فەیلەسۆف هندەك کەسێن بژارەنە. ساخلەتا وان یا باش ئەوە ئەو چ جاران دگەل جیهانێ ڕاناهێن ڤێجا چ ژن یان زەلام بیت، بەلکو بەردەوام ب چاڤەکێ حێبەتی تەماشەی جیهانێ دکەن و ژیانێ ب تشتەکێ نەڕۆهن و ئاشکەرا دبینن. بەلێ، وەکو تشتەکێ سەیر و پڕی نهینێ دهێتە پێشچاڤێن وی. ب ڤی شێوەی، زارۆك و فەیلەسۆفان

ساخلەتەکا هەڤپشك هەیە. ئەم دشێین بێژین پیستێ فەیلەسۆفی ب درێژاهیا ژیانێ وەکو پیستێ زارۆکی هەر ب نەرمی و نازکی دمینیت.

نوکە ژی سۆفیایا ئەزیز هەلبژارتن یا د دەستێ تە دا. ئەرێ تو خوە دبینی زارۆك و هێشتا هند مەزن نەبوویە کو دگەل ژیانێ ڕابهێی؟ یان ژی تو فەیلەسۆفەکی و دشێی سووند بخوی کو چ جاران دگەل ژیانێ ڕانەهێی؟

ئەگەر تو سەرێ خوە بهەژینی و نەزانی کا خوە وەك زارۆك یان فەیلەسۆفەك بدەیە نیاسین، ئانکو تو ژی هند دگەل ژیانێ یا ڕاهاتی کو ئێدی چ تشت بۆ تە د سەیر نینن. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی جهێ مەترسیێ یە. هەر ژبەر ڤێ چەندێ من ئەڤ کورسێ فەلسەفی بۆ تە یێ هنارتی چونکی من نەڤێت تو کەسەکا سست و بێئاگەهـ بی ژ ژیانێ، بەلکو من دڤێت تو ب چاڤێن ڤەکری تەماشەی ژیانێ بکەی.

ڤی کورسی هەموویێ دێ ب هەروە بۆ تە فرێکەم. هەر ژبەر هندێ ئەگەر تو کورسی تەمام نەکەی ژی، چ پارە ژ تە ناهێنە وەرگرتن و تو خوسارەت نابی. ئەگەر هەر جارەکا تە ڤیا کورس بهێتە ڕاوەستاندن، تو دشێی بڕیارێ بدەی. تو دشێی پەیامەکێ بۆ من بێخیە دناڤ سندوقا پۆستەی دا. بۆ نموونە بەقەکا زیندی بکە دناڤ سندوقا پۆستەی دا. یا باشتر ئەوە ڕەنگێ وێ ژی وەکو یێ سندوقا پۆستەی یێ کەسك بیت داکو پۆستەچی نەترسیت.

ب کورتی، سێرەبەند کێڤریشکەکا سپی دناڤ کولاڤەکێ ڤالا یێ درێژ دا دئینتە دەرێ، لێ ژبەرکو ئەو کێڤریشك گەلەك یا مەزنە، ملیاران سال دێ پێڤەچن هەتا ئەو سێرەبەند دشێت وێ کێڤریشکێ هەموویێ ژ کولاڤی بینتە دەرێ. هەموو زارۆکێن مرۆڤان ل سەر سەرکێن داڤێن فەرووویێ کێڤریشکێ ژ دایك دبن، ژبەر هندێ حێبەتی دمینن ژبەر دیتنا وان کارێن سێرەبەندی، لێ دگەل مەزنبوونا خوە، هێدی هێدی دێ بەرەڤ کووراتیا دناڤ فەرووی دا چنە خوارێ و دێ ل وێرێ مینن.

ل وێرێ دێ ژیانەکا خوش بورینن ژبەر هندێ قەت هزرا هندێ ناکەن جارەکا دی سوواری سەرکێن داڤێن فەرووویی ببنەڤە. ل ڤێرێ ب تنێ فەیلەسۆف دوێرن د وێ ڕێکا پڕی مەترسی دا دەرباز ببن.

هندەك ژ وان فەیلەسۆفان دكەڤنە خوارێ و هندەكێن دی ژی ب هێز خوە ب داڤێن فەروویی ڤە گرێددەن و گازی دكەنە خەلكێ دی یێ ل خوارێ ئەوێن مژوولی خوارن و ڤەخوارنێ.

- "خوشك و برایێن هێژا، ئەم یێ دناڤ ڤالاهیێ دا هاتینە هەلاویستن."

ئەو دێ ڤان ئاخفتنا بێژن، لێ كەس ژ خەلكێ ل خوارێ ل دووڤ دەنگێ وان ناهێت و گوهێ خوە نادەتێ، بەلكو دێ بەرسڤان وان ئەڤە بیت: "ئوف، وان مەژیێ مە برەڤە و ئارامیا مە تێكدا."

پاشی ئەو دێ بەردەوامیێ دەنە سحبەتێن خوە یێن بەری نوكە وان دكرین.

- "ئەرێ دێ پەنیری و نیڤشكی ئینی؟ ئەرێ تە نەزانی كا ئەڤرۆ ل بۆرسێ بهایێ پارەی چەند بلند بوویە؟ ئەرێ باجانك ب چەندێ نە؟ ئەرێ تە زانیە شاهژن دیانا جارەكا دی یا ب دووگیان كەفتی؟"

دەمێ ئێڤاری دایكا وێ هاتیە مال، سۆفیا گەلەك یا پۆسیدە بوو. نامێن فەلسەفی یێن ژێدەرێ وان نەدیار كربوونە دناڤ ڤودیكێ دا و دناڤ كۆلكی دا ڤەشارتبوون. پشتی هینگێ پێكۆل دكر وانەیێن خوە بخوینیت لێ یا بێ مفابوو. ب بێدەنگی ڕوونشت و ب کووری هزرا خوە د نڤیسینا دناڤ نامەیان دا دكر.

ئاخ بۆ وان هەموو تشتان یێن هەتا بەری نوكە سۆفیایێ هزرا خوە تێدا نەكری. ئێدی ئەو زارۆك نەبوو، لێ د هەمان دەم دا هند مەزن ژی نەببوو. نوكە یا هەستپێدكەت ئەو ژی هێدی هێدی یا بەرەڤ ناخێ فەروویێ كێڤریشكێ ڤە دچیت ئەوا ژ كولاڤێ گەردوونی دەركەفتی.

لێ ژ نیشكەكێ ڤە فەیلەسۆفەك هات و ئەو ڕاوەستاند و نەهێلا دناڤ داڤێن فەرووی دا نقووم بیت. یان ژی ئەم دشێین بێژین وی چنگلێ سۆفیایێ گرت و بەرەڤ سەرێ فەروویێ ڤە بلند كر و برە وی جهی یێ ل دەمێ زارۆكینیێ یاری ل سەر دكرن. جارەكا دی، سەر و ژنوو وەكو یەكەم جار وێ جیهان دیتەڤە.

چ پێنەڤێت فەیلەسۆفەکی ئەو ڕزگار کر. ئەو نڤیسەرێ نەدیار یێ نامە بۆ دهنارتن، ئەو ژ ژیانەکا بێ ئاگەهـ یا ڕۆژانە قورتالکر.

دایکا وێ نێزیکی دەمژمێر پێنج هاتبوو مال، سوفیایێ دەستێ وێ گرت بوو و هەردوو د هۆلێ ڤە ل سەر کورسیکان ڕوونشتبوونە خوارێ.

- "دادێ، ب دیتنا تە ژیان یا سەیر نینە؟

دایکا وێ حێبەتی ما ژ ڤێ پرسیارێ و نەزانی دێ چ بەرسڤ دەتێ. چونکی ڕۆژێن بەری نوکە دەمێ ئەو دهاتیە مال، وێ ددیت سۆفیا مژوولی خواندنا وانەیێن خوە بوو.

- "ئاهـ، بەلێ هندەك جاران... "

- "هندەك جاران؟ مەرەما من ئەوە کو ب شێوەیەکێ گشتی هەبوونا ڤێ جیهانێ ل دەڤ تە یا سەیر نینە؟

- "کچا من ئەز دبێژم باشترە تو ب ڤی ڕەنگی هزرا خوە تێدا نەکەی!"

- "بۆچی نە؟ ڕەنگە جیهان ل دەڤ تە تشتەکێ گەلەك ئاسایی بیت؟"

- "بەلێ، تا ڕادەیەکی یا ئاسایی یە."

وی فەیلەسۆفی ڕاست دگوت. کەسێن مەزن جیهانێ ب شێوەیەکێ سادە دبینن و ژ نەچاری وەردگرن. هەموو ب یەکجاری و بۆ هەتا هەتایێ و ب بێدەنگی یێن چووینە دناڤ خەوا ڕۆژانە یا کوور دا.

- " تا وی ڕادەی تو دگەل جیهانێ ڕاهاتیە، ئێدی چ تشت بۆ تە د سەیر نینن."

- "ئەڤە تو بەحسێ چ دکەی؟"

- "ئەز یا دبێژم تو ژ مێژە یا بێزار بووی. ب ڕەنگەکی دی بێژم کو تو وەکو ماسیەکا گێژ یا لێهاتی."

- "نەخێر، ئەز ناهێلم تو ب ڤی شێوەی دگەل من باخڤی."

- "باشە دێ ب ڕەنگەکی دی بۆ تە بێژم، تە جهێ خوە یێ گەرم دناڤ داڤێن فەروویێ کێڤریشکا سپی ئەوا دناڤ کولاڤێ گەردوونی دا دەرکەفتی یێ کری. نوکە تو دشێی پتاتان بکەلینی و ڕۆژنامەیان بخوینی و پشتی نیڤ دەمژمێرا دی بێهنا خوە ڤەدەی و تەماشەی دەنگوباسان بکەی."

خەمگینیەك ل سەر دێمێ دایكا وێ دیاربوو. هەر یەكسەر بەرەڤ لێنانگەهێ ڤە چوو و پتات دانانە سەر ئاگری و پشتی ماوەیەكی هاتە دەڤ سۆفیایێ ڕوونشت و گوتێ: "من دڤێت بابەتەكی دگەل تە ڤەكەم."

سۆفیایێ ژ تونا دەنگێ وێ دزانی دایكا وێ دڤێت بابەتەكێ گرنگ دگەل ڤەكەت.

- "خوشتڤیا من بۆ من بێژە تە كەرەستەیێن بێهوشكەر بكارنەئینایینە؟"

سۆفیایێ تیق تیق ب دایكا خوە كرە كەنی و زانی كا بۆچی نوكە وێ بەحسێ كەرەستەیێن بێهوشكەر كر.

- "ئەرێ تو یا ڕژدی ل سەر وان ئاخفتنێن تە گوتین؟ ئەگەر هۆسا نەبیت من نەباوەرە ئەڤ ئاخفتنە ژ دەڤێ تە دەركەڤن."

ل وێ ئێڤاری، پشتی هینگێ وێ بەحسێ كەرەستەیێن بێهوشكەر و كێڤریشكا سپی نەكرەڤە.

# ئەفسانە

*...هەڤسەنگیەکا دژوار دناڤبەرا هێزا باشیێ و هێزا خراپیێ دا...*

رۆژا دی سپێدێ چ نامە بۆ سۆفیایێ نەهاتن. ل قوتابخانێ ژی، ب درێژاهیا ڕۆژێ هەست ب پۆسیدەیێ دکر و یا بێزار بوو. ل دەمێ بێهنڤەدانان، سۆفیایێ پیچەکێ نەرمتر ڕەفتار دگەل هەڤالا خوە جوانایێ دکر. دەمێ ژ قوتابخانێ زڤڕین، بەحسێ گەشتەکێ بۆ ناڤ دارستانێ دکر و بڕیار دا هەردەمێ دارستان هشك بیت و سەقا یێ گونجای بیت ئەو بچنە دناڤ دا و بۆ خوە چادرەکێ ڤەدەن.

سۆفیا گەهشتە مال و ل بەر سندوقا پۆستەی ڕاوەستیا و نامێن وێ ئینانە دەرێ. ل دەستپێکێ وێ نامەیەکا بچووك ئینا دەرێ کو بابێ وێ ژ مەکسیکێ بۆ هنارتبوو و بەحسێ غەریبیا وەلاتی دکر. هەردیسان د نامەیا خوە دا گوتبوو کو بۆ یەکەم جار وی یاریا شەترەنجێ ژ سەروکێ گشتی یێ پاپۆرا خوە بر. زێدەبارێ خواندنا هەموو وان پەڕتووکێن د بێهنڤەدانا زڤستانا بوری دا وی دگەل خوە برین

پشتی هینگێ سۆفیایێ ناڤێ خوە ل سەر زەرفەکێ قەهوائی یێ مەزن دیت. هەر یەکسەر چانتە و پۆستێن دی دانانە مال و بلەز بەرەڤ کۆلکێ خوە ڤە چوو و ئەو زەرف ڤەکر کو کومەکا پەڕێن چاپکری تێدابوون. سۆفیایێ دەست ب خواندنا وان کر.

## وێنەیێ ئەفسانەیی یێ جیهانێ

دەمباش سۆفیا خان! مە گەلەگ کار یێ هەی، ژبەر هندێ ئەز دبینم یا باشترە بێ گیروبوون ئەم یەکسەر دەست پێ بکەین.

مەرەم ژ زاراڤێ فەلسەفێ، ئەو پەیڤە یا دهێتە گوتن بۆ شێوازێ هزرکرنا مرۆڤی کو نێزیکی 600 سالان بەری زاینی ل یونانێ دەستپێکریە کو ل وی دەمی ب شێوەیەکێ بنەڕەتی زاراڤەکێ نوو بوو. بەری هینگێ، هندەك ئاینێن ئەسمانی بەرسڤا هەموو وان پرسیاران ب ستۆیێ خوە ڤە گرتبوو یێن ژ لایێ خەلکی ڤە دهاتنە کرن. هندەك ژ ڤان لێکدانێن میتولوژی ژ نفشەکی بۆ نفشەکێ ل دووڤ دا ل سەر شێوێ ئەفسانەیان دهاتنە ڤەگوهاستن.

ئەفسانە، کو چیرۆکە بابەتێ وێ یێ سەرەکی ل سەر خوداوەندایە، پێکۆلێ دکەت دیاردەیێن سروشتی و مرۆڤایەتی شرۆڤە بکەت.

ب درێژاهیا هزاران سالان، پێلا لێکدانێن ئەفسانەیێ ل دور پرسیارێن فەلسەفی ل سەرانسەری جیهانێ گەلەك پێشکەفت هەتا فەیلەسۆفێن یونانی هاتین و ب بەلگە بۆ خەلکی دیارکر کو نابیت ئەو باوەر ژ ڤان چیرۆك و سەرهاتییێن ئەفسانەیی بکەن.

داکو بشێین ب دروستاهی د ڕەوشتێ فەیلەسۆفێن دەستپێکی بگەهین، پێدڤیە ئەم تێبگەهین کا وێنەیێ ئەفسانەیی یێ جیهانێ ل وی دەمی یێ چەوا بوو. ل ڤێرێ ئەم دشێین چەند نموونەیان ل سەر ئەفسانەیێن باکوری بینین "یا باشترە ئەز ل سەر وان ئەفسانەیان باخڤم یێن من پێزانینێن باش ل سەر هەین".

گومان تێدا نینە نوکە تە گوهـ ل ناڤێ ئەفسانەیا تۆر Thor و چەکوچێ وی بوویە. بەری هاتنا مەسیحی، خەلکێ نەوریج د وێ باوەرێ دا بوون کو تۆر ب ڕێکا عەرەبانکا خوە یا دوو بزن ڕادکێشن، دشێت ل ئەسمانی بفڕیت، هەردەمێ چەکوچێ خوە ژی لێکدابا، باروۆڤە و بریسی پەیدادبوون. پەیڤا "توندەر-Thunder" ئانکو باهۆز د زمانێ نەڕویجی و پەیڤا "تۆردۆن-Thordon" ئانکو "گێلەشوکا تۆر"ی د زمانێ دانیمارکی. د زمانێ سویدی ژی دا، پەیڤا باهۆز دهێت "ئوس-ئاکا" کو ڕامانا وێ حەرفی ژی دبیتە "گەشتا خودای" ل ئەسمانان.

گەنگەشەکرن ل دوور بریسی و گورمێنا عەوران، مەرەم ژی گەنگەشەکرنە ل دور بارانێ. ئەڤ هەمموو کارە ل سەر دەمێ چەتەیێن دەریایی دا "سەردەمێ ڤایکنز" د گرنگ و زیندی بوون. ژبەر ڤێ چەندێ تۆر وەك خوداوەندێ پیتاندنێ دهاتە پەرستن.

هەر هەمان ئەفسانە دبێژیت کو تۆری ب رێکا لێکدانا چەکوچێ خوە باران بۆ سەر ئەردی دباراند، هەلبەت دەمێ باران ژی دباریت دێ هەمموو تشت شین بن و بەرهەممەکێ باش پێڤە هێت.

چەوانیا شینبوون و گەشەکرنا بەروبومێن چاندنێ ل دەڤ خەلکی تشتەکێ ئاشنا نەبوو و ئەو تێنەدگەهشتن، لێ هەرچەوا بیت جوتیاران دزانی کو شینبوونا داروباری پەیوەندی ب بارینا بارانێ ڤە هەیە. هەروەسا، هەمموو مرۆڤ د وێ باوەرێ دا بوون کو بارینا بارانێ پەیوەندی ب تۆری ڤە هەیە. هەر ژبەر ڤێ چەندێ، تۆر ببوو یەك ژ خوداوەندێن هەرە مەزن یێن باکوری.

ئەگەرەکێ دی ژی هەبوو کو تۆر ل دەڤ خەلکی یێ گرنگ بیت، ئەو ژی پەیوەندی ب رێکخستنا جیهانێ ڤە هەبوو.

ل دووڤ بۆچوونا چەتەیێن دەریایی، ئەو بەشێ ئەردی یێ خەلك ل سەر دژین، گزیرتەکە و بەردەوام گەف ژلاییێ هندەك هێزێن دی یێن ژ دەرڤەی وێ گزیرتێ ل سەر دهێنە کرن. وان دگوتە ڤی بەشێ ئەردی "میدگارد" کو رامانا وێ "شانشینا ناڤەراست"ێ یە. دناڤ ڤێ شانشینێ دا دەڤەرەك هەبوو دگوتنێ "ئەسگارد" ئانکو بنگەهێ خوداوەندان.

ل سەر لێڤێن شانشینێ ژی دەڤەرەکا دی هەبوو دگوتنێ "ئاوتگارد" ئانکو شانشینا دکەڤیتە ژدەرڤە کو ل وێرێ دەهبەیێن دڕندە لێ دژیان و دڤیا ب سێربازی و فێلبازیان دیمەنێ جیهانێ ژناڤ ببەن. دگوتنە ڤان بونەوەرێن خراب و ئەهریمەن "هێزا تێکدانێ".

ژبەر ڤێ چەندێ، خەلکی د ئەدەبێ نەرویجی یان ئەدەبێ وەلاتێن دی دا هەست ب هەڤسەنگیەکا دژوار دناڤبەرا هێزا باشیێ و هێزا خرابیێ دا دکر.

یەك ژ رێکێن کو ڤان هێزێن تێکدەر دشیان شانشینا ناڤەراست ژناڤ ببەن، ئەو بوو خوداوەندا پیتاندنێ یا ب ناڤێ "فرایا"یێ بدزن. هەر دەمێ ئەو شیان ڤی کاری بکەن،

ئێدی چ تشت ل سەر ڕوویێ ئەردی شین نابن و ئێدی ژن نەشێن ب دووگیان بکەڤن. ژبەر هندێ یا پێدڤی بوو خوداوەندێن باش ب تەمامی چاڤدێریا ڤان دەهبەیێن دڕندە بکەن.

ل ڤێرێ تۆری ڕۆلەکێ گرنگ هەبوو. چەکوچێ وی باران ب تنێ نەدباراند، بەلکو وەکو چەکەکێ کوژەك ژی دژی هێزێن تێکدەر بکاردئینا. چەکوچێ وی هێزەکا ڕادەبەر دابوویێ. بۆ نموونە ئەو دشیا چەکوچێ خوە د دەهبەیان وەربکەت و بکوژیت بێ کو ترسا ژ دەستدانا چەکوچێ خوە هەبیت چونکی بەردەوام ئەڤ چەکوچە بۆ خوەدانێ خوە دزڤڕی.

ئاها ب ڤی شێوەی، ئەفسانەیان ئەگەرێ ڕوودانا دیاردەیێن سروشتی و شەڕێ بەردەوامێ دناڤبەرا هێزا باشی و خڕابیێ دا شرۆڤە دکر، فەیلەسۆفان ژی هەر یەکسەر پێکۆل دکر ب هەموو ڕەنگان وان جۆرە شرۆڤەکرنان ڕەت بکەن.

بەلێ ل ڤێرێ تشتەکێ خڕابتر ژ ڤان هەموو شرۆڤەکرن و ناکوکیان هەبوو.

دەمێ پەیدابوونا هشکاتیێ یان ل دەمێ ڕوودانا شەڕەکی، چێنەدبوو خەلك دەستێن خوە داهێلن و ل هیڤیا خوداوەندێن خوە بن هەتاکو تشتەکی بۆ وان بکەت، بەلکو یا ل سەر وان پێدڤی بوو بەشداریێ د شەڕێ دژی هێزێن تێکدەر و خڕاب دا بکەن و ئەڤ بەشداریا وان ژی ب شێوازێن جودا جودا بوو وەك ڕێوڕەسمێن ئاینی و جەژنان.

ڕێوڕەسمێن ئاینی یێن هەڕە بەربەلاڤ ل دەڤ گەلێن ئەسکەندەناڤی یێن کەڤن، قوربانیدان بوو. ئانکو وان قوربانەك پێشکێشی خوداوەندێن خوە دکر داکو هێزا وی پتر لێ بهێت. ژبەر هندێ ل سەر مرۆڤان یا پێدڤی بوو ئەو قوربانەکی بۆ خوداوەندێ باشیێ بدەن داکو بشێت سەرکەفتنێ ل سەر هێزا تێکدەر تومار بکەت. ژ بۆ ڤێ مەرەمێ، وان گیانەوەرەك بۆ خوداوەندێ تۆر دکرە قوربان کو پتریا جاران بەرانەك یان میهەك بوو، لێ بۆ خوداوەندێ "ئودین"ی وان هندەك جاران مرۆڤەك دکرە قوربان.

ئەفسانەیا هەڕە بەربەلاڤ ل نەڕویجێ ب ڕێکا هوزانەکێ گەهشتیە مە یا ب ناڤێ "ڕەوشا تریمی". د ڤێ هوزانێ دا دبێژیت کو ڕۆژەکێ تۆر ژ خەو هشیاربوو و دیت چەکوچێ وی یێ ژێ هاتیە دزین، گەلەك تۆڕەبوو و دەستێن وی لەرزین و ڕیهێن وی وەریان. پشتی هینگێ دگەل هەڤالێ خوە "لۆگە"ی دچنە دەڤ خوداوەندا فڕایایێ داکو

پەڕێن وێ ژێ ڤەر بکەن هەتاکو ب ڤی ڕەنگی لۆگە بشێت بفڕیت و بچیتە دەڤەرا "جوتونهایمەن"ێ و ل دووڤ چەکوچێ تۆری بگەڕییێت.

دەمێ ئەو دگەهیتە وێ دەڤەرێ، چاڤێ وی ب "تریم"ێ پاشایێ دەهبەییێن خراب دکەڤیت و ئەو ژی ب شانازی ڤە دبێژتێ بەلێ ڕاستە من چەکوچێ تۆری یێ دزی و دناڤ کووراتیا هەشت میلێن ئاخێ دا یێ ڤەشارتی. ل دووڤ دا مەرجێ خوە بۆ زڤراندنا چەکوچی دیار دکەت و دبێژیتێ هەتاکو فرایا نەبیتە هەڤژینا من، خو خوداوەندەك نەشێت وی چەکوچی ب دەستخوە ڤە بێخیت.

ئەرێ تو دشێی ڤی دیمەنی بینیە پێشچاڤێن خوە، سۆفیا؟

خوداوەندێن باش ژ نیشکەکێ ڤە دیت ئەو یێن کەفتینە د ئاریشەکێ دا کو ئەو ژی ڕاگرتنا بارمتەیەکێ یە. نوکە دەهبەییێن خراب دشێن دەستهەلاتێ ل سەر خوداوەندێن باش بکەن و دەستێ خوە دانایە سەر گرنگترین چەکێ بەرەڤانیکرنێ. ئانکو ب ڕاستی ژی ئەو یێن کەفتینە د ڕەوشەکا مەترسیدار دا. هندی چەکوچێ تۆری د دەستێ دەهبەیان دا بیت، دەستهەلاتا وان ژی دێ ل سەر خوداوەندێن باش و مرۆڤان دا بیت و ل شوونا ڤەگەڕاندنا چەکوچی ژی یێ داخوازا فرایایێ دکەن.

لێ ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ مەحالە. ئەگەر خوداوەندێن باش، خوداوەندا پیتاندنێ ژ دەستبدەن ئەوا کو هەموو ژیانێ دپارێزیت، ڕامانا وێ ئەوە ئەو دێ کەسکاتی و داروبارێن ناڤ بیستانان هێنە ژناڤبرن و مرۆڤ و خوداوەند ژی دێ ژناڤچن. هەر ژبەر ڤێ چەندێ هەموو ڕێکێن ڕزگاربوونێ هاتینە گرتن.

"چ ژ دەستێ تە ناهێت و دێ نەچاربی خوە ب دەست گرۆپەکێ تیرۆرستان ڤە بەردەی دەمێ گەفێن پەڤاندنا بۆمبەکێ ل ناڤەڕاستا پاریس یان لەندەنێ دکەن ئەگەر هات و تو داخوازییێن وان یێن مەترسیدار بجه نەئینی. نوکە تو د مەرەما من دگەهی کا ئەز چ دبێژم."

پتی هینگێ لۆگە زڤڕی شانشینا خوداوەندان و داخواز ژ فرایایێ کر کراسێ بووکینیێ بکەتە بەر خوە داکو شوو ب پاشایێ دەهبەیان بکەت. (هەی ژارێ فرایا). فرایا

گەلەك تۆڕەبوو و ڕازی نەبوو شوو ب دەهبەیەکی بکەت چونکی وێ دزانی خەلك ئێدی دێ بەحسێ وێ ب خراپی کەن و بێژن ئەو یا ب دووڤ ڕەگەزێ زەلامان کەفتی.

ل ڤێرێ خوداوەندێ "هیمدال" هاتە دناڤ ئاریشێ دا و بیرۆکەیەکا پەسەند و هەرەباش پێشنیار کر. وی گوتی ل شوونا فرایایێ، بلا تۆر جلکێن ژنان بکەتە بەر خوە و وەکو بووکەکێ خوە بخەملینیت. بلا پرچا وی وەکو یا ژنان شانە بکەن و ل شوونا مەمکان ژی دوو بەرێن خڕ و مەزن بدانە سەر سینگێ وی. هۆسا دێ وەکو ژنان خویا کەت. هەرچەندە ئەڤ بیرۆکەیە گەلەك ب دلێ تۆری نەبوو لێ ژ بۆ دووبارە ب دەستڤەئینانا چەکوکێ خوە، ئەو یێ نەچارە گوهێ خوە بدەتە شیرەت و پێشنیارێن هیمدالی.

هەرچەوا بیت، ل دوماهیێ وان تۆر وەکو بووکەکێ خەملاند و لۆگە ژی بۆ بەربووکا وی. پاشی لۆگەی گوت: "نوکە ئەم ژن دێ بەرەڤ جوتونهایمەنێ ڤە چین."

ئەگەر ئەم ب زمانەکێ سەردەمیانەتر باخڤین، ئەم دشێین بێژین کو تۆری و لۆگی "تیپا دژی تیروری" پێکئینا. ب خەملاندنا خوە ل سەر ڕەنگێ ژنان دێ شێن چنە دناڤ کەلها بلند یا پاشایێ دەهبان دا ژ بۆ ڤەگەڕاندنا چەکوچێ تۆری.

دەمێ ئەو گەهشتینە جوتونهایمەنێ، دەهبەیان یەکسەر دەست ب ڕێکخستنا ڕێوڕەسمێن دەهواتێ و بەرهەڤکرنا سفرا خوارنێ کر. لێ تۆری ب تنێ گایەکێ تەمام و سێ ماسیێن سەلەمون خوارن و سێ بەرمیلێن بیرێ ب سەردا کرن. ئەڤ چەندە ببوو جهێ حێبەتیا تریمی. چ نەمابوو ڕاستیا تیپا دژی تیرورێ ئاشکەرا بیت ئەگەر هەر زوو لۆگی مایێ خوە تێنەکربایە و هێجەتەك ژ پێش ڤە نەگرتبایە دەمێ گوتی ژ کەیفێن هاتنا وێ بۆ جوتونهایمەنێ، ئەڤە هەشت ڕۆژە فرایایێ چ خوارن نەخواری.

تریمی پێچە ل سەر دێمێ بووکێ ڕاکر، لێ ئەو حێبەتی ما ژ ئاورینێن تۆری یێن تۆڕە و دژوار. هەر وی دەمی ژی لۆگی هاتە دناڤ سحبەتێ دا و گوتی ئەڤە هەشت ڕۆژە فرایا ژ کەیفێن هەڤژینیا دگەل شاهێ دەهبەیان نەنڤستیە. دەمێ تریم پشتڕاست بووی، داخواز کر چەکوچی بۆ بینە وێرێ داکو د ماوەیێ ڕێوڕەسمێن دەهواتێ دا بدانتە بەر پێن بووکێ.

دبێژن تۆری دەست ب کەنیەکا وەکو دینان کر دەمێ دیتی دەهبەیان چەکوچ دانایە بەر پێن وی. هەر یەکسەر وی دەست هاڤێتە چەکوچی و تڕیم و هەموو ئەندامێن خێزانا وی کوشتن و ب ڤێ ڕەنگی چیرۆکا خەمگین ب دوماهیەکا ب کەیف ب دوماهی هات. جارەکا دی "باتمان" یان ژی "جێمس بوند"ێ خوداوەند ل سەر هێزا خراببیێ دا ب سەرکەفت.

سەرهاتیا ڤێ ئەفسانێ ب ڤی ڕەنگی یە، سۆفیا، لێ ڕامانا وێ یا ڕاستەقینە چیە؟

چ پێ نەڤێت ئەڤ ئەفسانەیە ب تنێ بۆ خوشی نەهاتیە نڤیسین، ڕەنگە ڤێ ئەفسانێ دڤێت پەیامەکێ بگەهینتە مە کو ئەم دشێین ب ڤی ڕەنگی شرۆڤە بکەین:

دەمێ هشکاتیێ ب سەر وەلاتەکی دا دگرت، خەلکی دڤیا ئەگەرێن نەبارینا بارانێ بزانن. ئەرێ ئەم دشێین ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ هندێ بزڤڕینین کو دەهبەیان چەکوچێ تۆری دزی بیت؟

ڕەنگە ڤێ ئەفسانێ پێکۆلا شرۆڤەکرنا ئەگەرێن گوهۆڕینا وەرزێن سالێ دابیت. ل وەرزێ زڤستانێ ئەرد و سروشت دمریت چونکی چەکوچێ تۆری یێ ل جوتونهایمەنێ. بەلێ ل بهارێ دشێت جارەکا دی چەکوچێ خوە بزڤڕینتەڤە. ب ڤی ڕەنگی ئەفسانە بەرسڤا پرسیارەکێ ددەت کو خەلك تێناگەهیت.

بەلێ ڕۆلێ ئەفسانێ د شرۆڤەکرنا بابەتەکی ب تنێ دا نەبوو، چونکی ل وی دەمی خەلکی چەندین ڕێوڕەسمێن ئاینی یێن جودا جودا یێن کو پەیوەندی ب ئەفسانەیان ڤە هەی ئەنجام ددان. بۆ نموونە وان گەنجەکێ گوندی ب جلوبەرگێن بووکان دخەملاند و دوو بەرێن خڕ ددانانە سەر سینگێ وی داکو بچیت چەکوچێ تۆری بزڤڕینیت. وان هەستپێدکر ئەو یێ کارەکی دکەن داکو باران بباریت و زەڤیێن چاندنێ ئاڤ بدەت.*

ئەم دشێین گەلەك نموونەیێن دی بینین کو خەلك ل گەلەك جهێن دی یێن جیهانێ ڕادبوون ب زارڤەکرنا ئەفسانەیێن وەرزێن سالێ ژ بۆ بلەزئێخستنا کریارێن سروشتی.

* ئەڤ نەریتە هەتا بەری چەند سالان دناڤ ملەتێ مە ژی دا یێ بەربەلاڤ بوو. دەمێ سالەکێ باران نەباری بایە دا بووکەکا داری خەملینن و چنە بەر دەرگەهێن مالان و سترانا "بووکا مە باران دڤێت" بێژن و خەلك دا ئاڤێ ب سەرێ وێ دا کەن و دیاریان دەنە وان کەسێن ب ڤی کاری ڕابووین.

ل ڤێرێ ب تنێ مە چاڤخشاندنەکا بلەز ل سەر جیهانا ئەفسانەیێن باکوری کر، لێ د ڕاستی دا هژمارەکا بێ وێنە یا ئەفسانەیان ل سەر تۆری و ئودین و فرای و فرایا و هیودەر و بالدەری و چەندین خوداوەندێن دی هاتینە گوتن. ڤی جۆرێ هزرکرنێ ل سەرانسەری جیهانێ ڤەگرتبوو هەتا فەیلەسۆف هاتین و مایێ خوە د ڤان ئەفسانەیان کری.

هەردیسان یونانیان ژی ل دەستپێکا سەرهلدانا فەلسەفەیا خوە، وێنەیەکێ ئەفسانەیی یێ جیهانا خوە هەبوو کو ب درێژاهیا سەدان سالان ژ بەرەبابکەکی بۆ یەکێ دی بەحسێ خوداوەندێن خوە ڤەدگێڕان.

ل یونانێ، چەندین خوداوەند هەبوون وەك "زیوس" و "ئوپۆلون" و "هیرا" و "ئەسینا" و "دیونیوس" و "ئەسکلیپۆس" و "هیراکلیس" و "هیفایستۆس". ل ڤێرێ ب تنێ ئەم دێ ناڤێ هندەك خوداوەندێن وان ئینین ژبەرکو د ڕاستی دا وان هژمارەکا مەزن یا خوداوەندان هەبوون.

نێزیکی 700 سالان بەری زاینی، پتریا ئەفسانەیێن یونانێ ژ لایێ "هۆمیر" و "هێسیود"ی ڤە هاتبوونە نڤیسین. ڤێ چەندێ ژی ڕەوشەکا نوو ئافراند، ژبەرکو هەر زوو پشتی نڤیسینا ڤان ئەفسانەیان، ئێدی بوارێ گەنگەشکرنێ ل سەر پەیدابوو و خەلك دشیا ڕەخنێ لێ بگریت.

فەیلەسۆفێن یونانی یێن دەستپێکێ ڕەخنە ل وان خوداوەندان دگرت یێن هومیروسی بەحسکرین و دگوتی کو هەتا ڕادەیەکێ مەزن خوداوەند وەکو مرۆڤانە و مرۆڤ خوە ژی د سروشتێ خوە دا جهێ باوەریێ نینن. بۆ یەکەم جار ژی هندەك فەیلەسۆفان دیاکر کو ڕەنگە خوداوەند و ئەفسانەیێن وان ب تنێ مەزنکرنا هندەك کەسان و سەرهاتیێن وان بیت نەك زێدەتر.

ئەم دشێین نموونەیا یەکەم ڕەخنەیا ل ئەفسانەیان هاتیە گرتن ل دەڤ فەیلەسۆف "زەینۆفانیس"ی ببینین. ئەڤ فەیلەسۆفە ل نێزیکی سالا 570 بەری زاینی ژیایە. وی دگوت: "خەلکی خوداوەند ل سەر شێوێ خوە یێن دروستکرین. هەردیسان ئەو هزر دکەن خوداوەند ژی وەکو مە ژ دایك دبن و وەکو مە لەش هەنە و جلوبەرگان دکەنە بەر خوە و وەکو مە دئاخڤن."

مرۆڤێن ئەسیوبی د وێ باوەرێ دانە کو خوداوەندێن وان د ڕەشن و دفنا وان یا پەحنە، لێ تراکەر دبێژن خوداوەندێن وان د چاڤ شین و پرچ سورن. چ پێ نەڤێت ئەگەر هەسپ و گا و شێران ژی شیانێن کێشانا وێنەیان هەبانە، ئەو ژی دا وێنەیێن خوداوەندێن خوە ل سەر شێوەیێ هەسپ و گا و شێران وێنەکەن.

هەر ل وی دەمی، گریکیان چەندین باژێر ل یونانێ و مێتانگەهێن* یونانی ل ژوویا ئیتالیا و ئاسیا بچووك دامەزراندن. بۆ ڤێ چەندێ ژی، وان هەموو کارێن خوە ب بەندەیان ددانە کرن و خەلکێ ئازاد ژی دەمێ خوە ب کاروبارێن سیاسی ڕەوشەنبیری ڤە دبوراند.

د ڤان باژێران دا، گوهۆڕینەکا مەزن ل سەر هزروبیرێن خەلکی دا هات. بۆ نموونە کەسەك دشیا ب ئازادی پرسیارەکێ دەربارەی چەوانیا ڕێکخستنا جڤاکی بکەت. هەر ژ بەر ڤێ چەندێ، هەر کەسەك بێ کو پەنایێ ببەتە بەر ئەفسانەیێن سەردەم، شیانێن پرسیارکرنەکا فەلسەفی ژی هەبوون.

ئەم دشێین بێژین پێشکەفتنەکا بەرچاڤ د شێوەیێ هزرکرنا ئەفسانەیی دا بەرەڤ شێوازێ هزرکرنەکا ئاڤاکری ل سەر بنەمایێ تاقیکرن و مەژی دا پەیدابوو. د ڕاستی دا، ئارمانجا فەیلەسۆفێن گریکی یێن دەستپێکێ، ڤەدیتنا ئەگەرێن سروشتی ژ بۆ دیاردەیێن سروشتی بوو.

سۆفیا دناڤ باخچەی مەزن دا دهات و چوو و پێکۆل دکر هەموو ئەو تشتێن ل قوتابخانێ فێربوویێ ژبیربکەت ب تایبەت ئەو تشتێن ل دور زانسێن سروشتی بۆ وێ هاتینە گوتن.

* مێتانگەهـ Colony کو ب عەرەبی دبێژنێ "مستعمرة" ئەو وەلاتن یێن سەربەخویا خوە یا سیاسی و ئابوری نەی و د هەموو کاروبارێن خوە دا ل بن دەستێ دەولەتەکا دی ڤەیە. ئەو دەولەت ژی مفای بۆ خوە ژ کەرەستەیێن وێ یێن خاڤ وەردگریت، ژبەر هندێ زاراڤێ کوردی ب هەمان رامان هاتیە، ئانکو خێروبێرین وی وەلاتی دمێژیت.

ئەگەر ئەو ل ناڤ ڤی باخچەی مەزن بایە بێ کو تشتەکی ژ سروشتی بزانیت، ئەو دا چەوا زانیت وەرزێ بهارێ دێ کەنگی هێت؟

ئەرێ ئەو دا ڤێ سیناریویێ هەموویێ ئینتە پێشچاڤێن خوە ل دور شرۆڤەکرنا ئەگەرێن باران بارینێ؟ یان دا شێت چیرۆکەکێ ژ دەڤ خوە ل دور ئەگەرێن بەرزەبوون و حەلیانا بەفرێ ئافرینیت یان ژی هەلاتنا ڕۆژێ یا بەردەوام ل ئەسمانی؟

چ پێ نەڤێت، ئەو ب ڤێ چەندێ یا ڕازی بوو. ل ڤێرێ وێ هەفسارێ خەیالێن خوە گرت.

زڤستانێ هەموو وەلات ئێخستبوونە ژێر دەستێ خوە یێ بەستیێ، چونکی "موری"ێن خراپکار خاتینا جوان "سیکیتا" دناڤ ڤەشارگەهەکا بەستیگرتی دا ڤەشارتبوو، لێ میرێ چەلەنگ "براڤاتو"ی شیا وێ ڕزگار بکەت.

پاشی سیکیتا گەلەك کەیفخوەش بوو و ژ کەیفان دا دناڤ باخچەی دا دەست ب سەمایێ کر و ئەو هوزان خواند یا وێ ل ڤەشارتگەها بەستیگرتی ڤە ڤەهاندی، ب ڤی ڕەنگی هەستێن داروبار و ئەردی لڤلڤین و هەموو بەفر حەلیا و بوونە ڕۆندك. باڵندەیان ژی زاری شێوازێ ڤەگێڕانا هوزانا سیکیتایێ کر و زارڤەکرنێن وان بوونە ئاواز. ل وی دەمێ خاتینا جوان پرچا خوە یا وەکو زێڕی دلڤلڤاندی، چەندین داڤێن پرچا وێ کەفتنە دناڤ باخچەی و بوونە گول سەوسەن.

سۆفیایێ هزر دکر وێ چیرۆکەکا باش یا ڤەهاندی، ئەگەر وێ چ ڕاستییێن دی ل دور گوهۆڕینا وەرزێن سالێ نەزانیبانە، دا باوەر ژ چیرۆکا خوە کەت.

پاشی بۆ سۆفیایێ دیاربوو مرۆڤ هەموو گاڤان پێدڤی ب هێجەتەکێ بوون داکو دیاردەیێن سروشتی پێ شرۆڤە بکەن. ڕەنگە بێ هەبوونا وان شرۆڤەیان، مرۆڤان شیانێن ژیانێ نەمابانە. هەر ژبەر هندێ ژی دەمێ هێشتا زانست و زانین نەی، وان ئەڤ ئەفسانە بۆ هەڤدوو دڤەگێڕان.

# فەیلەسۆفێن سروشتی

*...چ تشت ژ دەڤ خوە پەیدانابن...*

دەمێ دایکا وێ ل پشتی نیڤرۆ ژ سەر کاری زڤڕیە مال، سۆفیا دناڤ باخچەی مالێ دهات و چوو و پێکۆل دکر پەیوەندیەکێ دناڤبەرا وانەیێن فەلسەفێ و هێلد موللەر کناگێ، ئەو کچا چ جاران نامێن پۆستێ یێن ژدەڤ بابێ وێ بۆ هاتینە فرێکرن وەرنەگریت، دیار بکەت.

ژ دوور ڤە دایکا وێ گازی کرێ و گوتێ: "سۆفیا نامەیەك یا بۆ تە هاتی."

سۆفیا د جهێ خوە دا لەرزی، نوکە دایکا وێ ب دەستێ خوە نامە ژ سندوقا پۆستەی ئینانە دەرێ و چ پێ نەڤێت ئەڤ نامەیا ژ دەڤ وی فەیلەسۆفێ نەدیار یا بۆ وێ هاتی، ئەرێ ئەو نوکە چ بکەت و چ بێژیتە دایکا خوە؟

سۆفیایێ باخچە بجه هێلا و بەرەڤ دایکا خوە چوو داکو نامێ ژێ وەربگریت.

- "ها سۆفیا خێرە، چ پول ل سەر وێ نامێ نینن. ئەز دبێژم نامەکا ئەڤینیێ یە."

سۆفیایێ نامە ژێ وەربگرت بێ کو بەرسڤا وێ بدەت.

- "چیە ما تو ناڤەکەی؟"

سۆفیا دیسان بێدەنگ بوو، ئەرێ ما ئەو دێ شێت چ بێژیت؟

- "ئەرێ ما تە کەسەك دیتی یە نامێن خوە یێن ئەڤینیێ ل پێشچاڤێن دایکا خوە ڤەکەت؟"

چ نینە، دایکا وێ چ هزرکەت بلا بکەت. هەرچەندە سۆفیایێ هەست ب دلگرانیێ دکر کو دایکا وێ هزر دکەت ئەوێ ئەڤیندارەك هەیە و نامەیان بۆ وێ فرێ دکەت، لێ ئەڤ چەندە باشترە، چونکی ئەگەر دایکا وێ زانیبایە ئەو کورسەکێ فەلسەفێ ژ دەڤ کەسەکێ نەنیاس وەردگریت و یاریان دگەل وێ دکەت، ڕەوشا وێ دا گەلەك یا خراپتر بیت ژ نوکە.

ئەڤ نامەیا نوکە ژی بۆ وێ هاتێ، یەك بوو ژ وان زەرفێن مەزن یێن تەمامکەرێن کورسێ وێ یێ فەلسەفی. سۆفیا چوو د ژوورا خوە ڤە و ئەو زەرف ڤەکر. ل سەر وێ کاغەزا دناڤ زەرفی دا سێ پرسیار هاتبوونە نڤیسین.

*"ئەرێ کەرەستەیەکێ دەستپێکی هەیە کو هەموو تشت ژێ پەیدا ببن؟"*

*"ئەرێ ئاڤ دشێت بهێتە گوهۆڕین بۆ مەیێ؟"*

*"چەوا ئاخ و ئاڤ دشێن بهێنە گوهۆڕین بۆ بەقەکا زیندی؟"*

ل دەستپێکێ سۆفیایێ هزرکر ئەڤ پرسیارە ب تنێ هندەك پرسیارێن تەمسار و بێ ڕامانن، لێ ب درێژاهیا وێ شەڤێ ژ سەرێ وێ نەدهاتنە دەرێ. ل ڕۆژا پاشتر ل قوتابخانێ، وێ دووبارە دەست ب هەڵسەنگاندنا پرسیاران کر، پرسیارەك ل دووڤ پرسیارەکا دی.

ئەرێ کەرەستەیەکێ بنەڕەتی هەیە کو هەموو تشتێن دی یێن ل سەر ڕوویێ ئەردی ژێ دروست بووینە؟ ئەگەر ئەم هۆسا هزر بکەین کو هەموو تشتێن ل سەر ڕوویێ ئەردی ژ کەرەستەیەکێ دەستنیشانکری یێن پێکهاتین، ئەرێ چەوا ژ گەردێن ڤی کەرەستەیی ب تنێ گولەك یان فیلەك پەیدابوویە؟

هەمان تیبینی ل سەر پرسیارانا دووێ ژی دهێتە چەسپاندن.

چ پێنەڤێت بەری نوکە سۆفیایێ گوهـ ل چیرۆکا حەزرەتێ مەسیحی ببوو دەمێ ئاڤ دگوهارتی بۆ مەیێ، لێ وێ ئەڤ چەندە د بنەکوکا وێ دا وەرنەگرتبوو، چونکی ئەگەر

حەزرەتێ مەسیحی ژ ڕاستا شیابیت ئاڤێ بکەتە مەی، ئەڤ چەندە وەکو موعجیزەکێ بوو د کەتواری دا چ ڕێك ناچنێ و تشتەکێ مەحالە.

هەردیسان ڕاستە مەی ژ ڕێژەیەکا هەڕە مەزن یا ئاڤێ پێکدهێت، لێ هەموو تشتێن دی یێن دناڤ سروشتی ژی ب ڤی ڕەنگی نە و گەلەك ئاڤ یا دناڤ پێکهاتنا وان دا. بۆ نموونە پێکهاتنا خیاری نێزیکی 95٪ ئاڤە. ژبەر هندێ دڤێت تشتەك هەبیت کو ئەو کربیتە خیار نەك ئاڤ ب تنێ بوویە ئەگەر ئەو خیار بیت.

دەربارەی پرسیارا سیێ ژی ل سەر بەقا زیندی، هۆسا دیارە مامۆستاییێ وێ گەلەك حەز ژ خوەدانکرنا بەقان دکەت. ل دوماهییێ سۆفیا شیا باوەرییێ بۆ خوە چێکەت کو بەق ژ ئاخێ و ئاڤێ دروستبوویە، لێ ل ڤێرێ نابیت ئەڤ ئاخە ژ کەرەستەیەکێ ب تنێ پێکهاتبیت. ئەگەر ئاخ ژ هژمارەکا کەرەستەیێن جودا جودا پێکهاتبیت، ئەم دشێین بێژین کو ڕاستە بەقەکا زیندی ژ یەکگرتنا ئاخ و ئاڤێ دروستبوویە بێ کو ژبیربکەین کو پێدڤیە ئەڤ بەقە د قۆناغا هێکێ و سەرەمێکوتێ دا دەربازبیت. ژبەر هندێ بەق ب خوە دناڤ باخچەیەکێ کەسك دا گەشە ناکەت خو هەکە مرۆڤ چەند چاڤێ خوە ژی بدەتێ.

پشتی نیڤرۆ دەمێ ئەو زڤڕیە مال، دیسان زەرفەکێ سپی یێ مەزن بۆ وێ دناڤ سندوقا پۆستەی دا هاتبوو دانان. وەکو هەموو جارێن دی، سۆفیاییێ بلەز ئەو زەرف دگەل خوە بر و خوە گەهاندنە دناڤ کۆلکێ خوە یێ بچووك دا.

## پرۆژەیێ فەیلەسۆفان.

ئەڤە دیسان ئەم گەهشتینە هەڤدوو.

ئەڤرۆکە یەکسەر دێ دەست ب وانەیا خوە کەین بێ کو جارەکا دی سحبەتا کێڤریشکێن سپی یان هەر پێشەکیەکا دی ژ ڤی جۆری بکەین.

د وانەیان ئەڤرۆکە دا دێ ب درێژاهی بۆ تە بەحسێ وان ڕێکان کەم یێن مرۆڤان هەر ژ کەڤن دا و هەتا نوکە هزرا خوە پێ د بابەتێن فەلسەفی دا دکر، لێ هەر تشتەکی دێ هێلین بۆ وەختێ وی.

ڕەنگە ئەو فەیلەسۆف ل سەردەمەکێ دی ژیابن، هەتا ڕەنگە دناڤ جڤاك و ڕەوشەنبیریەکا دی دا ژیابن کو ب یەکجاری ژ سەردەم و ڕەوشەنبیریا مە یا جودا بیت، ژبەر هندێ نە یا ب سانەهی یە ئەم پێکۆلێ بکەین پرۆژەیێ هەر یەك ژ وان دەستنیشان بکەین.

لەوڕا دێ پێکۆلێ کەین ئاماژێ ل سەر ناڤەندێن گرنگیپێدانێ ل دەڤ فەیلەسۆفان کەین کا هەر یەك ژ وان گرنگی ب چ تشتێ گرنگ و دەستنیشانکری ددا. بۆ نموونە فەیلەسۆفەکی گرنگی ددا بنیاتێ ڕووەك و گیانەوەران، فەیلەسۆفەکێ دی ژی گرنگی ددا هەبوونا خودای یان نەمریا گیانێ مرۆڤان.

دەمێ ئەم گەهشتینە وێ خالێ بشێن پرۆژەیێ تایبەت یێ هەر فەیلەسۆفەکی دەستنیشان بکەین، ل وی دەمی دێ ب سانەهی شێین د شێوازێ هزرکرنا وی فەیلەسۆفی گەهین، ژبەرکو فەیلەسۆفەکێ دەستنیشانکری، د هەمان دەم دا مژوولی شرۆڤەکرنا سەرجەم پرسیارێن فەلسەفی نینە.

من ل ڤێرێ گوت "کەسەکێ فەیلەسۆف" نەك "کەسەکا فەیلەسۆف"، چونکی د دیرۆکا فەلسەفێ دا ب تنێ زەلام تێدا ددیارن، ژبەرکو ژن وەك ڕەگەز و وەك بونەوەرەکا هزرکەر ب هەموو ڕەنگان یا پشتگوهـ هاڤێتێ بوو. چ پێ نەڤێت ئەڤ چەندە ژی جهێ داخێ یە چونکی ب ڤی ڕەنگی گەلەك ئەزمون و سەربۆرێن گرنگ یێن ژنان ژ دەستێن مە چووینە. ل ڤی چەرخێ دوماهیێ ژ نوو هێدی هێدی ژن یا پێنگاڤان بەرەڤ جیهانا فەلسەفێ ڤە دهاڤێژیت.

- "من نەڤێت ئەرکێ مال بدەمە تە داکو پێڤە مژوول بی. هەرچەوا بیت چ پرسیارێن هۆسا ب زەحمەت وەکو پرسیارێن بابەتێ بیرکاریێ د کورسێ مە دا نینن. هەردیسان ئەز گەلەك یێ دوورم ژ وان فرمانێن ئینگلیزی یێن دەمێ دگوهۆڕی بۆ ڕابردویی یێن ل دیڤ چ یاسان نەچن. لێ هندەك جاران دێ داخوازێ ژ تە کەم هندەك ڕاهێنانێن بچووك ئەنجام بدەی."

ئەگەر تو یا ب ڤان مەرجان ڕازی بی، دێ نوکە دەست ب کورسێ خوە کەین.

## فەیلەسۆفێن سروشتی

دگوتنە فەیلەسۆفێن گریگی یێن دەستپێکێ، فەیلەسۆفێن سروشتی، چونکی ئەو بەری هەموو تشتان مژوولی سروشتی و وان دیاردەیان بوون یێن دناڤ سروشتی دا ڕوودداین.

بەری نوکە ژی مە پرسیارەك ل دوور بنیاتێ هەموو تشتێن د جیهانێ دا کر.

پتریا خەلکی ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە دا هزر دکەن بەری نوکە و د دەمەکێ دەستنیشانکری دا تشتەك ژ نەبوونێ یێ پەیدابووی. لێ ئەڤ بۆچوونە ل دەڤ گریکیان یا بەربەلاڤ نەبوو چونکی ئەو ل سەر هندێ د کوك بوون کو هەر ژ دەستپێکا پەیدابوونا دنیایێ تشتەك هەبوویە.

ل دەڤ وان، بابەتێ چەوانیا پەیدابوونا هەموو تشتان ژ چنەیێ، ئاریشەیەکا هەرە مەزن نەبوو. بەرامبەری هندێ ئەو مژوولی هندێ بوون کا چەوا ئاڤ دهێتە گوهۆڕین بۆ ماسیەکا زیندی، چەوا دناڤ ئەردێ هشك و ڕەق دا دارەك شین دبیت و چەوا مالبچووکێ ژنێ مرۆڤەکی دناڤ خوە دا بەرهەم دئینیت.

ڤان فەیلەسۆفان ب چاڤێن خوە ئەو گوهۆڕینێن بەردەوام د سروشتی دا پەیدادبووین ددیتن، لێ وان نەزانی دێ چەوا ڤان گوهۆڕینان شرۆڤە کەن. بۆ نموونە ئەرێ چەوا کەرەستەیەك دشێت سروشتێ خوە بگوهۆڕیت و ب یەکجاری بهێتە گوهۆڕین بۆ تشتەکێ دی یێ جودا؟

هەموو فەیلەسۆفێن دەستپێکێ ل سەر هندێ د هەڤڕا بوون کو کەرەستەیەکێ بنەڕەت دەست دگەل هەموو گوهۆرینان هەیە.

پێدڤیە ئەو بەرسڤێن جودا جودا یێن فەیلەسۆفێن دەستپێکی گەهشتینێ، ئەم هند ب گرنگی ڤە نەوەرگرین چونکی یا گرنگ بۆ مە ل ڤێرێ ئەوە ئایا وان چ پرسیار ژ خوە دکرن و چەوا پێکۆل دکر بگەهنە بەرسڤا ڤان پرسیاران و وان دڤیان چ جۆرێ بەرسڤێ بۆ ڤان پرسیاران بدەستخوە ڤە بێخن؟

ئانکو شێوازێ هزرکرنا وان بۆ مە یێ گرنگە نەك کا ناڤەرۆکا هزران وان چ بوویە.

ئەم دشێین خوە پشتڕاست بکەین کو وان پرسیار دەربارەی گوهۆڕینێن بەرچاڤ یێن سروشتی ژ خوە دکرن و پێکۆلا دیارکرنا هندەك یاسایێن هەتا هەتایێ یێن سروشتی کریە. بێ کو ئەو پشتا خوە ب ئەفسانەیان گەرم بکەن، پێکۆل دکر خوە د ڕوودانێن سروشتی بگەهینن. یا ژ هەموویێ ژی گرنگتر، وان پێکۆل دکر ژ سروشتی ب خوە، خوە د هەموو پرۆسێس و گوهورینێن وێ بگەهینن. هەلبەت ل ڤێرێ وان هندەك بەرسڤێن یەکجار جودا بدەستخوە ڤە دئینان ل شوونا ئەگەرێن هاتنا باران و بەفرێ و گورمێنا عەوران و هاتنا زڤستان و بهارێ و ڕوودانێن دی یێن جیهانێ ب جیهانا خوداوەندان ڤە گرێبدەن.

ب ڤی ڕەنگی، فەلسەفێ خوە ژ ئاینی ئازاد کر. ئەم دشێین بێژین کو فەیلەسۆفێن سروشتی یەکەم پێنگاڤا خوە بەرەڤ هزرکرنەکا زانستی ڤە هاڤێت و بوونە پێشەنگ و دامەزرێنەرێن دەستپێکا هەموو زانستێن سروشتی یێن پشتی هینگێ.

دگەل بورینا وەختی، پتریا دەستخەت و نڤیسین و گوتنێن فەیلەسۆفێن دەستپێکی یێن سروشتی ژناڤچوون. ئەڤ پێزانینێن کێم یێن بۆ مە ماین ژی ئەون یێن ب ڕێکا نڤیسینێن ئەریستۆتالیسی بۆ مە ماین کو ئەو ژی نێزیکی دوو سەد سالان، پشتی فەیلەسۆفێن دەستپێکی یێ ژیای.

ئەریستۆتالیسی ب تنێ پوختەیەك ل دور وان ئەنجامان نڤیسابوو یێن فەیلەسۆفێن بەری وی گەهشتینێ، ژبەر هندێ ئەم نزانین کا ئەو چەوا و ب چ شێواز گەهشتینە ڤان ئەنجامان. لێ دگەل ڤێ چەندێ، ئەم دشێین بێژین گوهۆڕینێن سروشتی و بابەتێ کەرەستەیێ سەرەکی، پرۆژەیێ یەکەمین فەیلەسۆفێن گریکی بوو.

## سێ فەیلەسۆفێن دەڤەرا میلتوس

یەکەم فەیلەسۆفێ ناڤێ وی دهێتە بەر گوهێن مە، تالیسە و خەلکێ دەڤەرا میلتوس بوو کو ل وی دەمی مێتانگەهەکا یونانی بوو ل وەلاتێ ئاسیا بچووك. تالیسی گەلەك گەشت بۆ دەڤەرێن جودا جودا یێن جیهانێ کربوون. یەك ژ سەرهاتیێن ل دور وی

دهێنه ڤەگێڕان ئەو بوو یا دبێژیت کو وی بلنداهیا یەك ژ هەڕەمێن مسڕی ب ڕێکا پیڤانا سیبەرا خوە پیڤا بوو. ئەڤ کاره هینگێ ئەنجامدابوو دەمێ درێژاهیا سیبەرا وی هندی بەژنا وی لێ هاتی. هەردیسان دبێژن بەری هینگێ ژی وی پێشبینیا ڕۆژگیرانا سالا 585ێ بەری زاینی کربوو.

تالێس د وێ باوەرێ دا بوو کو ئاڤ ژێدەرێ سەرەکی یێ هەموو تشتانه، لێ ب دروستاهی نەهاتیه زانین کا مەرەما وی ژ ڤێ بۆچوونێ چیه. دبیت مەرەما وی ئەو بیت کو هەموو جۆرێن ژیانێ دناڤ ئاڤێ دا دروست دبن و بنیاتێ هەموو تشتان بۆ ئاڤێ ڤەدگەڕیت.

دەمێ ئەو ل مسرێ، وی تیبینیا هندێ کربوو کو ئەو بەرمایکێن ڕووبارێ نیلی ل پاش خوە دهێلیت، دبیته ئەگەر ئاخا دەشتێن دەوروبەری ڕووباری پتر یا پەیت و گونجای بیت ژ بۆ چاندنێ. دبیت وی تیبینیا هندێ ژی کربیت کو پشتی بارینا بارانێ، بەق و کرمێن دناڤ ئاخێ دا هاتبنه دناڤ ژیانێ دا. دبیت وی تیبینیا هندێ ژی کربیت دەمێ ئاڤ دبیته بەفر و هەلم و پاشی جارەکا دی سەر و ژ نوو دبیته ئاڤ ڤە.

بەری ڤان بۆچوونان ژی، بۆچوونا "هەموو تشت دپڕن ژ خودای" هەر بۆ تالێسی دهێته زڤڕاندن. ل ڤێرێ ژی ب دروستاهی ئەم نزانین کا مەرەما وی چیه. ڕەنگە وی ئاخا ڕەش یا مسرێ وەکو ژێدەرێ هەموو تشتان دیت بیت، هەر ژ گولان هەتا زەڤیێن گەنمی تا دگەهیته مێشومور و سیسرکان.

هەردیسان وی هزر دکر ئەرد یێ پڕە ژ دندکێن "تۆڤێ ژیانێ" یێن بچووك و نەدیتی. هەرچەوا بیت یا گرنگ ل ڤێرێ ئەوە کو وی ب چ ڕەنگان باوەری ب خوداوەندێن هومیروسی نەبوو.

دووەم فەیلەسۆفێ ناڤدار یێ دەڤەرا میلتوس، ناڤێ وی "ئەناکسیماندەر" بوو. ب دیتنا وی، جیهانا مە یەکە ژ هژمارەکا مەزن یا جیهانان ئەوێن دناڤ تشتەکێ "ڕەها" یان ژی "نەدیار" دا دروست دبن و پاشی ژناڤ دچن.

یا ب زەحمەته ئەم بزانین کا مەرەما وی ژ پەیڤا نەدیار چیه، لێ یا وی وەکو تالێسی ئاماژە ب چ کەرەستەیێن دەستنیشانکری نەکریه. بێگومان وی دڤیا خوە بگەهینته

وێ یا دبێژیت کو هەر تشتەکێ هاتیە ئافراندن، پێدڤیە ژ ئافرینەرێ خوە یان ژی خالقێ خوە یێ جودا بیت. ئانکو ل دووڤ ڤێ گوتنێ، ئەم نەشێن بێژین ئەڤ کەرەستەیێ بنەڕەت ب تنێ ئاڤە، بەلکو دبیت تشتەکێ نەدیار ژی بیت.

سێیەم فەیلەسۆفێ ناڤدار یێ دەڤەرا میلتوس، ناڤێ وێ "ئەناکسیمینس" بوو کو دناڤبەرا سالێن 570 هەتا 526ێ بەری زاینی دا ژیایە. ب دیتنا وی، کەرەستەیێ سەرەکی یێ پەیدابوونا هەر تشتەکی ڕەنگە "با" یان "مژ" بیت.

چ پێنەڤێت ئەناکسیمینسی ئاگەهـ ژ تیورا تالیسی هەبوو ل دور ئاڤێ، ئەرێ پا ئاڤ ژ کیڤە هاتیە؟ ب دیتنا ئەناکسیمینس، ئاڤ ب خوە ژی بایەکێ چڕکری یە. بەلگەیێ وی ژی ل سەر ڤێ چەندێ ئەو بوو کو ل دەمێ باران بارینێ، ئەم دبینین کا چەوا ئاڤ ژ بای دەردکەڤیت و دەمێ پتر فشار ل سەر دهێنە کرن، دبیتە ئاخ. هەردیسان وی هزردکر دەمێ بەفر دحەلییێت، دهێتە گوهۆڕین بۆ خیزی و ئاخێ. هەر ب دیتنا وی، ئاگر ژی ب تنێ بایەکێ سڤکە نەك زێدەتر. ب ڤی ڕەنگی، ئەم دشێین بێژین پوختەیا بۆچوونا وی ئەو بوو کو ئاڤ و ئاخ و ئاگری یەك بنیات هەیە ئەو ژی بایە.

دووراتیا دناڤبەرا ئەردی بۆ ئاڤێ و بۆ ناڤ داروباری و کەسکاتی دا، دووراتیەکا مەزن نینە، ژبەر هندێ ڕەنگە ئەناکسیمینسی هزر کربیت ئەرد و با و ئاگر و ئاڤ د پێدڤینە ژ بۆ دەستپێکرنا ژیانێ ل سەر ڕوویێ ئەردی، لێ دگەل هندێ ژی کەرەستەیێ هەرە سەرەکی دبیت ب تنێ با یان مژ بیت. ب ڤی ڕەنگی، ئەو یێ هەڤڕا بوو دگەل بۆچوونا تالیسی کو کەرەستەیەك هەیە و بنیاتێ پێکهاتنا هەموو شێوەیێن ژیانێ یە ل سەر ڕوویێ ئەردی.

## چ تشت ژ چنەیێ پەیدانابن

ڤان هەرسێ فەیلەسۆفێن میلتوس باوەری ب هندێ هەبوو کو کەرەستەیەك بنیاتێ پەیدابوونا هەموو تشتانە ل سەر ڕوویێ ئەردی. لێ پرسیار ل ڤێرێ ئەوە چەوا

کەرەستەیەکێ ب تنێ دشێت بهێتە گوهۆڕین بۆ ڤێ هژمارا مەزن یا تشتێن جودا جودا؟ ئەم دێ مژارێ ناڤکەین ب مژارا گوهۆڕینێ.

نێزیکی سالا 500ێ بەری زایینێ، کومەکا فەیلەسۆفان ل میتانگەها "ئیلی" یا یونانی ل باشورێ ئیتالیا دژیان. ڤان فەیلەسۆفێن ئیلی بەردەوام ئەڤ پرسیارە دکرن. ناڤدارترین فەیلەسۆفێ ل ڤێ دەڤەرێ، دگوتنێ "پارمینیدس" کو دناڤبەرا سالێن 540 هەتا 480ێ بەری زایینی دا ژیایە.

ب دینا ڤی فەیلەسۆفی، هەر تشتەکێ د هەبوونێ دا هەی، هەر ژ دەستپێکێ هەبوویە. ئەڤ بیرۆکە ب شێوەیەکێ هەرە مەزن دناڤ یونانیان دا یا بەربەلاڤ بوو. وان هەبوونا تشتێن هەتا هەتاییێ د جیهانێ دا ب شێوەیەکێ ئاسایی ددیت. هەر ب دیتنا پارمینیدسی، چ تشت ژ چنەیێ پەیدانابن و هەر تشتەکێ د هەبوونێ دا هەی، شیانێن ژناڤچوونێ نینن.

لێ پارمینیدسی پێنگاڤێن مەزنتر ژ فەیلەسۆفێن دی دهاڤێتن. وی دگوت چ گوهۆڕینێن ڕاستەقینە پەیدانابن، چونکی نە یا بەرئاقلە هەر تشتەکی کو شێوەیێ خوە یێ ڕاستەقینە هەبیت، بهێتە گوهۆڕین بۆ شێوەیەکێ دی یان تشتەکێ دی.

چ پێنەڤێت پارمینیدسی ئاگەهـ ژ هندێ هەبوو کو سروشت بەردەوام یێ د گوهۆڕینێ دا. هەستێن وی ئاگەهـ ژ ڤان گوهۆڕینان هەبوو لێ ئەقلێ وی تشتەکێ دی دگوتە وی. دەمێ ئەو هاتیە نەچارکرن کو ب تنێ تشتەکی دناڤبەرا هەست و ئەقلی دا بهەلبژێریت، وی ئەقلێ خوە هەلبژارت.

تو وێ گوتنێ دزانی یا دبێژیت: "باوەر ژ چ تشتان نەکە هەتا تو ب چاڤێن خوە نەبینی."

ئەڤ چەندە ل دەڤ پارمینیدسی تشتەکێ بێ ڕامان بوو. چونکی ب دیتنا وی هەستێن مرۆڤی وێنەیەکێ درەو یێ جیهانێ نیشا مە ددەن و ئەڤ وێنەیە قەت دگەل وی تشتی ناگونجیت یێ ئەقل دبێژیت. ژبەر ڤێ چەندێ وی هەموو کارێن خوە وەك فەیلەسۆف بۆ هندێ تەرخان کربوون کو خیانەتا هەستان ب هەموو ڕەنگێن وێ ڤە ئاشکەرا بکەت.

ئەڤ باوەریا مەزن ب ئەقلێ مرۆڤی دهێته نیاسین ب "فەلسەفا ئەقلی یان ژی ڕاشیونالیوم" و ڕاشیونالیست ژی ئەو کەسە یێ باوەری ب هندێ هەی کو ئەقلێ مرۆڤی ژێدەرێ سەرەکی یێ هەموو زانینا جیهانێ یە.

## هەموو تشت د پێکۆل و بەردەوامیێ دانە

فەیلەسۆفەکێ دی ژی ل هەمان سەردەم یێ پارمینیدس لێ دژیا. ناڤێ وی "هیڕاکلیتس" بوو و دناڤبەرا سالێن 540 هەتا 480ێ بەری زاینی دا ژیایە و د بنەڕەت دا خەلکێ دەڤەرا "ئیفیسۆس" یێ وەلاتێ ئاسیا بچووك بوو.

ب دیتنا هیڕاکلیتسی، هەموو تشتێن د سروشتی دا بەردەوام د گوهۆڕینێ دانە. ژبەر ڤێ چەندێ، هەر ل دەستپێکێ ئەم دشێین بێژین کو هیڕاکلیتسی پتر ژ پارمینیدسی باوەری ب هەستان هەبوو.

هیڕاکلیتسی دگوت: "هەموو تشت بەردەوام یێ د پێکۆل و گوهۆڕینێ دا و هەموو تشت بەردەوام دلڤلڤن و چ تشتێ جێگیر و هەتا هەتایی د دنیایێ دا نینە. ژبەر هندێ ئەم نەشێین دوو جاران بچینە سەر یەك ڕووبار ژ بۆ سەرشووشتنێ، چونکی ل جارا دووێ هەم ڕووبار و هەم مرۆڤ هاتیە گوهۆڕین."

هەردیسان هیڕاکلیتسی تەکەز ل سەر هەڤڕکیێن هەڤدژ و بەردەوام یێن د جیهانێ دا دکر. ئەگەر چ جاران ئەم نەخوش نەبین، ئەم قەت نەشێین بزانین کا ڕامانا ساخلەمیێ چیە. هەردیسان ئەگەر چ جاران برسی نەبین، چ جاران کەیفا مە ب هندێ ناهێت دەمێ خوارنێ دخوین. ئەگەر شەڕ و دوژمنکاری ژی نەبان، چ جاران مە بهایێ ئازادی و تەناهیێ نەدزانی و ئەگەر وەرزێ زڤستانێ ژی نەبایە قەت کەیفا مە ب هاتنا وەرزێ بهارێ و ڤەبوونا کولیلکێن داروباران نەدهات.

کارێن باش ژی وەکو کارێن خڕاب ڕۆل د ڕێکخستنا هەموو تشتان دا هەیە. هەر ژ بەر ڤێ چەندێ هیڕاکلیتس د وێ باوەرێ دا بوو کو بێ هەبوونا ڤێ یاریا ژ نەچاری دناڤ ڤان تشتێن هەڤڕك دا، ژیانێ چ هەبوونا خوە نەدبوو.

- "خودا ڕۆژ و شەڤە، هاڤین و زڤستانە، شەڕ و ئاشتی یە، برس و تێربوونە."

هێراكلیتس ب ڤی ڕەنگی بۆچوونا خوە شرۆڤە دكەت، لێ ل ڤێرێ بكارئینانا پەیڤا "خودا" ب ڕامانا هندێ نەدهات كو مەرەما وی خوداوەندێن ئەفسانەیان بوون، بەلكو ب دیتنا وی خودا یان خوداوەند ئەو تشت بوو یێ جیهان هەموو ب خوە ڤە دگرتی و ل دەمێ پەیدابوونا گوهۆڕینێن سروشتی د هەڤڕكیێن خوە یێن هەڤدژ دا، خوە دیار دكەت.

گەلەك جاران ل شوونا پەیڤا خودا، پەیڤا لۆگۆس یا گریگی دهێتە بكارئینان و ڕامانا وێ ژی ئەقلە. هەرچەندە ئەم مرۆڤ هەموو وەكو یەك هزر ناكەین یان ژی ئاستێ بیرتیژیا مە هەموویان هندی یەك نینە، لێ دگەل هندێ ژی ب تنێ یەك شێوێ "ئەقلێ گەردوونی" هەیە كو كونترۆلێ ل سەر هەموو وان شتان دكەت یێن دناڤ سروشتی دا ڕوودەدەن.

ب دیتنا هێراكلیتسی، ئەڤ ئەقلێ گەردوونی یان ژی یاسایا گەردوونی، بۆ هەموو مرۆڤان یێ هەڤپشكە و هەموو مرۆڤ دشێن پەیرەو بكەن، لێ پا دگەل ڤێ چەندێ ژی مرۆڤ هەر ل دووڤ ئاستێ بیرتیژیا ئەقلێ خوە دژیت.

هەروەكو تو دبینی سۆفیا، هێراكلیتسی چ گرنگی و ڕێز ل بۆچوونێن خەلكێ دی نەدگرت، وی دگوت: "بۆچوونێن پتریا مرۆڤان وەكو یارییێن زارۆكانە."

ل پشت ڤان هەموو گوهۆڕین و هەڤدژیێن د سروشتی دا، هێراكلیتسی باوەری ب هەبوونەكا یەكانە یان گشتی هەبوو و ئەڤ تشتێ یەكانە ژی كو ل دەڤ وی بنیاتێ هەموو تشتان بوو، وی ناڤكربوو ب خودا یان لۆگۆس.

## چوار توخمێن بنەڕەتی

پارمینیدس و هێراكلیتسی دوو مگرتیێن هەڤدژ و ژێكجودا دانابوون. ل دووڤ ئەقلێ پارمینیدسی، چ تشتان شیانێن گوهۆڕینێ نینن، لێ ئەزموونێن هەستان ل دەڤ هێراكلیتسی دیاردكر كو سروشت بەردەوام یێ د گوهۆڕینێ دا. ئەرێ كیژ ژ وان یێ دروستە؟

ئەرێ ئەم باوەر ژ وی تشتی بکەین یێ ئەقلێ مە دبێژتە مە یان ژی باوەر ژ هەستێن خوە بکەین؟"

وان هەردووکان جەخت ل سەر دوو بیرۆکەیان دکر.

پارمینیدسی دگوت:

1. چ تشت ناهێنە گوهۆڕین.
2. ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ، هەست مە دخاپینن.

لێ هیراکلیتسی بەرەڤانی ژ ڤێ چەندێ دکر:

3. هەموو تشت دهێنە گوهۆڕین "هەموو تشت یێن د پێکۆلەکا بەردەوام دا."
4. هەستێن مە جهێ باوەریێ نە.

گەلەك یا ب زەحمەتە دوو فەیلەسۆف ژ ڤێ چەندێ پتر د بۆچوونێن خوە دا د هەڤدژ بن، بەلێ پا ل ڤێرێ کیژ ژ وان ڕاست دبێژیت؟

ئیمپیدۆکلیس، فەیلەسۆفێ دەڤەرا سیسیلیان، دناڤبەرا سالێن 494 هەتا 434ێ بەری زاینی دا ژیایە، شیا ڤێ گرێکا ب زەحمەت ڤەکەت. ب دیتنا وی هەر یەك ژ پارمینیدس و هیراکلیتسی د بۆچوونێن خوە دا د ڕاست بوون، لێ هەردوو ژی د خالەکێ دا د شاش بوون.

ب دیتنا ئیمپیدۆکلیسی، هەڤڕکیا هەرە مەزن یا ڤان هەردوو فەیلەسۆفان د هندێ دا بوو کو وان دگوت ب تنێ کەرەستەیەکێ بنەڕەت هەیە. ئەگەر ئەڤ چەندە ڕاست بیت، کەواتە ئەو ڤالاهیا دناڤبەرا وی تشتێ ئەقل دبێژیت ژلایەکی ڤە و ئەو تشتێ ئەم ب چاڤێن خوە دبینین ژلایەکێ دی ڤە، وەکو تشتەکێ بێ ڕامان و نەبەرئاقل خویا دکەت.

گومان تێدا نینە کو نە یا بەرئاقلە ئاڤ بهێتە گوهۆڕین بۆ ماسی یان پەلاتینکەکێ. ئانکو ب شێوەیەکێ گشتی چ گوهۆڕین ب سەر ئاڤێ دا ناهێن و ئاڤا پاقژ هەتا هەتاییێ دێ هەر وەك خوە مینیت ئاڤەکا پاقژ. ب ڤی ڕەنگی، پارمینیدس د وێ خالێ دا یێ ڕاست بوو دەمێ گوتی "چ تشت ناهێنە گوهۆڕین."

ژلایەکێ دی ڤە، ئیمپیدۆکلیس یێ هەڤڕا بوو دگەل هیڕاکلیتسی ل سەر باوەریا وی ب هەستان. ل سەر مە پێدڤیە ئەم باوەر ژ وی تشتی بکەین یێ دبینین. ئەم ب چاڤێن خوە یێ دبینین کا چەوا سروشت یێ د گوهۆڕینەکا بەردەوام دا.

ل ڤێرێ ئیمپیدۆکلیس گەهشتە دەرئەنجامەکی کو بیرۆکەیا هەبوونا کەرەستەیەکێ بنەڕەت بۆ هەموو تشتێن د ژیانێ دا ڕەت دکر. با ب تنێ و ئاڤ ب تنێ نەشێن بهێنە گوهۆڕین بۆ گولەکێ یان پەلاتینکەکێ، ژبەر هندێ تشتەکێ مەحالە سروشت ل سەر کەرەستەیەکێ ب تنێ هاتبیتە ئاڤاکرن. ئیمپیدۆکلیس وێ باوەریێ دا بوو کو سروشت ژ چوار کەرەستەیێن سەرەکی پێکدهێت کو وی ناڤ دکرن ب "ڕەگ". ئەو هەر چوار ڕەگ ژی ئەڤەبوون: "ئاخ، ئاڤ، با و ئاگر."

هەر تشتەکێ ل سەر ڕوویێ ئەردی، د بنەڕەت دا ژ تێکەلکرنا ڤان هەر چوار کەرەستەیێن سەرەکی پێکدهێت، ئانکو هەر تشتەکێ ل سەر ڕوویێ ئەردی ژ ئاخ و ئاڤ و با و ئاگری پێکدهێت لێ ب تنێ جوداهی د ڕێژەیا هەر یەك ژ ڤان کەرەستەیان دا هەیە.

مرنا گیانەوەرەکی یان گولەکێ، مەرەم ژێ ئەوە جارەکا دی ئەڤ هەر چوار کەرەستەیە ژێکڤەدبن و ئەم دشێین ب چاڤێن خوە زێرەڤانیا ڤێ چەندێ بکەین. لێ د هەمان دەم دا ئاخ و ئاڤ و با و ئاگر ب چ ڕەنگان ناهێنە گوهۆڕین بەلکو ئەو ژ ڤان هەموو گوهۆڕینان د ڤەدەرن. نەیا ڕاستە ئەگەر بێژین "هەموو تشت دهێنە گوهۆڕین"، چونکی د بنەڕەت دا چ تشت ناهێنە گوهۆڕین، بەلکو ئەو گوهۆڕینا پەیدادبیت ئەوە کو ئەڤ هەر چوار کەرەستەیە هەڤدوو دگرن و پاشی ژێکڤەدبن و پاشی سەر و ژ نوو جارەکا دی هەڤدوو دگرنەڤە.

ئەم دشێین ڤێ چەندێ ب کارێ نیگارکێشەکی هەڤبەر بکەین. ئەگەر ب تنێ یەك ڕەنگ د دەستێ وی دا بیت، بۆ نموونە ڕەنگێ سۆر ب تنێ، مەحالە ئەو بشێت داروبارێن کەسك وێنە بکەت. لێ هەکە هەر چوار ڕەنگێن زەر و کەسك و شین و ڕەش ل بەر سینگێ وێ بن، ئەو دێ شێت ب سەدان ڕەنگێن جودا جودا ژێ پەیدا بکەت ب تنێ دەمێ ل هەرجارەکێ ڕێژەیا تێکەلکرنا ڤان ڕەنگان دگوهۆڕیت.

نموونەکا دی، د لێنانگەهێ ڤە، دڤێت ئەز کەسەکا سێرەبەند بم هەتا بشێم کێکەکێ ژ ئاری ب تنێ دروست بکەم، لێ هەکە هێك و شیر و ئار و شەکر ل بەر دەستێ من بن، دێ شێم چەندین جۆرێن کێکێن جۆراوجۆر ژ ڤان کەرەستەیێن بنەڕەت بەرهەڤکەم.

چ پێ نەڤێت ئیمپیدۆکلیسی ژ نیشکەکێ ڤە ژ دەڤ خوە نەگوتیە کو ئەڤ هەر چوار "ڕەـ"ێن سروشت پێکدهێن ژ ئاڤ و ئاگر و با و ئاخێ. بەری وی گەلەك فەیلەسۆفێن دی خەباتەکا مەزن دکر داکو بسەلمینن کو کەرەستەیێ بنەڕەت ژ ڤان تۆخمان پێکدهێت.

ژ لایەکێ دی ڤە، تالێس و ئەناکسیمێنس د وێ باوەرێ بوون کو ئاڤ و با دوو ئالاڤێن هەڕە گرنگن د سروشتی دا. گریکی ژی د وێ باوەرێ دابوون کو ئاگر ژی تۆخمەکێ سەرەکی یێ ژیانێ یە: تێرا مە هەیە ئەم تیبینیا گرنگیا هەتاڤێ بۆ ژیانا ڕووەك و شینکاتیان بکەین، یان ژی هزرا خوە د پلا گەرماتیا لەشێ مرۆڤان و گیانەوەران دا بکەین.

دبیت ئیمپیدۆکلیسی پرتەکا داری دیت بیت دەمێ دسووتی. ل وی دەمی چاڤێ وی ب تشتەکی دکەفت کو یێ ژناڤ دچیت: ب سانەهی گوهـ ل دەنگێ هندەکان بلقان ژی دبیت کو "ئاڤ"ە. تشتەك ژی دبیتە دووکێل، ئەو ژی "با"یە. تشتەك ژی ب سانەهی یێ دهێتە دیتن ئەو ژی "ئاگر"ە. دەمێ ل دوماهیێ ئاگر دڤەمریت، هندەك تۆز ل جهێ وی دمینیت کو ئەو ژی خولی یە یان ژی "ئاخ"ە.

ئیمپیدۆکلیسی دگوت گوهۆڕینێن سروشتی ژ ئەنجامێ تێکەلبوون و ژێکڤەبوونا ڤان هەر چوار "ڕەـ"ان پەیدادبن. لێ ل ڤێرێ ژی هێشتا تشتەکێ ڤەشارتی و نەڕۆهن دمینیت، ئەو ژی ئەرێ ئەو فاکتەر چیە یێ دبیتە ئەگەر ئەڤ هەر چوار توخمە دگەل هەڤدوو یەکبگرن و ژیانەکا نوو دروست بکەن؟ هەردیسان ئەو تشت چیە یێ دبیتە ئەگەر دووبارە ئەڤ توخمێن تێکەلبووین ژێکڤە ببن، بۆ نموونە ژێکڤەبوونا گولەکێ.

ب باوەریا ئیمپیدۆکلیسی، د سروشتی دا دوو هێزێن کاریگەر هەنە، ئەو ژی هێزا "ڤیان"ێ و هێزا "کەرب"ێ نە. ڤیان دبیتە ئەگەر ئەڤ توخمە هەڤدوو بگرن و کەرب ژی دبیتە ئەگەرێ ژێکڤەکرنا وان. یا گرنگ ل ڤێرێ ئەوە، وی جوداهی ئێخستیە دناڤبەرا "توخم" و "هێز"ێ دا.

ل سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆکە دا ژی، زانست "کەرەستەیێن بنەڕەتی" و "هێزا سروشتی" ژێکجودا دکەت. زانستێ سەردەم د وێ باوەرییێ دایە کو هەموو پرۆسێسێن سروشتی ڤەدگەڕن بۆ هەڤکاریا دناڤبەرا کەرەستەیێن بنەڕەتی یێن جودا جودا و چەند هێزێن کێم یێن سروشتی.

هەردیسان، ئیمپیدۆکلیسی سەرەدەری دگەل بابەتێ هەستان ژی دکر. بۆ نموونە وی دگوت ئەرێ ئەز چەوا دشێم گولەکێ "ببینم"، ئەرێ ل ڤی دەمی چ ڕوودەت هەتا ئەز بشێم وێ گولێ ببینم؟ ئەرێ تە جارەکێ هزرا خوە تێدا کریە، سۆفیا؟ ئەگەر نە، نوکە ئەو دەلیڤە یا ل بەر دەستێ تە هزرا خوە تێدا بکەی.

ل دووڤ بۆچوونا ئیمپیدۆکلیسی، چاڤێن مە ژی وەکو هەموو تشتێن دی یێن سروشتی ژ ئاخ و با و ئاگر و ئاڤێ پێکدهێن. ب ڤی ڕەنگی ئەو ئاخا د چاڤێن مە دا وان تشتان دبینیت یێن ژ ئاخێ پێکدهێن و با ژی وان تشتێن ژ بای پێکهاتی دبینیت و ئاگر و ئاڤ ژی ب هەمان شێوە وان تشتان دبینن یێن ژ ئاگر و ئاڤێ دروستبووین. ئەگەر یەك ژ ڤان تۆخمان ژ چاڤێ مە یێ کێم بیت، ل وی دەمی ئەم نەشێین سروشتی ل دەوروبەرێ خوە ببینین.

## بەشەکێ هەر تشتەکی د هەموو تشتان دایە.

فەیلەسۆفەکێ دی ژی هەبوو نەدشیا خوە دگەل وێ بیرۆکەیێ بگونجینیت یا دگوتی سروشت ژ کەرەستەیەکی ب تنێ پێکدهێت، بۆ نموونە ژ ئاڤێ ب تنێ. ئەو فەیلەسۆف ژی ئەناکساگۆراس بوو کو دناڤبەرا سالا 550 هەتا 428ێ بەری زاینی دا ژیایە.

هەردیسان ئەو بیرۆکەیە ژی ل دەڤ وی یا پەسەند نەبوو یا دگوتی ئاڤ و ئاخ و ئاگر و با دشێن ببنە هەستیك و خوین. ئەناکساگۆراس د وێ باوەرێ دا بوو کو سروشت ژ چەندەها بەشێن گەلەك هویر و بچووك پێکدهێت کو ب چاڤ ناهێنە دیتن.. ب دیتنا وی ئەم دشێین ڤان تشتێن بچووك ژی ل سەر پارچەیێن گەلەك بچووکتر دابەش بکەین، لێ بەشەك ژ وی تشتێ سەرەکی دێ دناڤ هەر پارچەیەکا بچووك دا مینیت.

ب باوەریا ئەناكساگۆراسی، ئەگەر موو و پیستێ لەشێ مرۆڤی بهێنە گوهۆڕین بۆ هندەك تشتێن دی، ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە، ئەو شیرێ ئەم ڤەدخوین و ئەو نانێ دخوین، دڤێت موو و پیست دناڤ دا هەبن. ئەم دشێین ب ئینانا هندەك نموونەیێن سەردەم، بۆچوونا ئەناكساگۆراسی باشتر شرۆڤە بكەین. ب هاریكاریا تەكنیكا لێزەرێ یا ئەڤرۆكە ل بەر دەستێ مە، ئەم دشێین وێنەیەكێ تایبەت پێ بگرین كو دبێژنێ وێنەیێ سێ ڕەهەندی 3D یان ژی هۆلۆگرام.

بۆ نموونە، ئەگەر وێنەیەكێ سێ ڕەهەندی یێ ترۆمبێلەكێ بگرین و پاشی ڤی وێنەی پارچە پارچە بكەین، ل وی دەمی دێ شێین د هەر پارچەیەكا وێنەی دا، وێنەیێ هەموو ترۆمبێلێ بینین خو هەكە ئەو پارچە یا وێنەیێ دەعامیێ ترۆمبێلێ ژی بیت. هەلبەت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت كو وێنەیێ گشتی یێ هەموو ترۆمبێلێ د هەموو بەشێن بچووك یێن ترۆمبێلێ دا هاتیە بەرجەستەكرن.

لەشێ مە ژی ب هەمان شێوە هاتیە داڕێژتن، ئەگەر ئەم خانەیەكا پیستی ژ تبلەكا مرۆڤی وەربگرین، ل وی دەمی نافكا خانێ ب تنێ شێوەیێ ڕەنگێ پیستێ لەشی نیشا مە نادەت بەلكو ب ڕێكا نافكا هەمان خانە ئەم دشێین ڕەنگێ چاڤ و پرچ و هەر ساخلەتەكا دی یا لەشی پێ دیاربكەین، زێدەباری دیاركرنا هژمارا تبلێن مرۆڤی و جۆرێ هەر تبلەكێ.

دناڤ نافكا هەر خانەیەكا لەشێ مە دا، پێزانینێن تەمام و هوور ل دور پێكهاتەیا هەموو خانە و شانە و ئەندامێن لەشی تێدانە. ئانكو "بەشەك ژ هەموو پێكهاتنا لەشێ مرۆڤی" یا دناڤ وێ خانێ دا هەلگرتیە، تا وی ڕادەی د بچووكترین یەكەیا پێكهاتنا لەشێ مرۆڤی دا كو خانەیە، كوپیەكا پێكهاتنا سەرجەم لەشێ مە دناڤ دا هەیە. ئەناكساگۆراسی دگوتە ڤان بەشێن بچووك كو بەشەكێ گشتی تێدایە، "توڤ" یان ژی "دندك".

ل ڤێرێ دێ ئاماژێ ب بۆچوونا ئیمپیدۆكلسی كەین دەمێ دگوتی كو ڤیان بەشێن جودا جودا خڕڤە دكەت و لەشێ مە یێ تەمام پێكدئینیت. ب هەمان شێوە، ئەناكساگۆراسی هزردكر كو هێزەك دبیتە ئەگەرێ دروستكرنا گیانەوەر، مرۆڤ، گول، داروباران و هەر یەكێ ژ وان شێوەیەكێ تایبەت ددەتێ. وی دگوتە ڤێ هێزێ، "هێزا ئەقلی" یان ژی "بیرتیژی".

ئەگەرەکێ دی ژی هەیە کو ئەناکساگۆراسی گرنگیا خوە یا تایبەت ل دەڤ مە هەبیت: ئەو یەکەمین فەیلەسۆفێ ئەسینایە. هەرچەندە د بنەڕەت دا ئەو خەلکێ ئاسیا بچووك بوو، لێ د ژیێ چل سالیێ دا ل باژێرێ ئەسینایێ ئاکنجی بوو هەتا هاتیە گونەهبارکرن ب "تاوانا خودا نەنیاسیێ" و پاشی ژ باژێری هاتە دەرێخستن. وی وێرەکی ژ بۆ گوتنان گەلەك تشتان هەبوو، بۆ نموونە وی دگوت: هەتاڤ خوداوەند نینە، بەلکو تەنەکێ سۆر و مەزنە و قەبارێ وی گەلەك ژ قەبارێ نیمچە گزیرتا پیلۆپۆنس مەزنترە.

ئەناکساگۆراس پێ داخبار بوو ب زانستێ ستێرناسیێ و جەخت ل سەر وێ گوتنێ دکر یا دگوتی کو تەنێن ئەسمانی ژ هەمان وان کەرەستەیان پێکدهێن یێن ئەرد ژێ دروستبووی. هەلبەت پشتی وی هندەك ڤەکۆلین ل سەر بەرەکێ نەیزەکێ کرین، ئەڤ دەرئەنجامە بدەستخوە ڤە ئینان. هەر ژبەر ڤێ چەندێ ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو ڕەنگە خەلك ل سەر ئەختەرێن دی ژی هەبن. وی دگوت ڕۆناهیا هەیڤێ ژ هەیڤێ ب خوە ناهێت، بەلکو ئەو ڕۆناهیا خوە ژ ئەردی وەردگریت. هەردیسان دیاردا ڕۆژگیرانێ ژی هەر وی ب خوە شرۆڤە کربوو.

تیبینی: سۆپاسیا تە دکەم سۆفیا ژ بۆ گوهداریا تە،

چ پێ نەڤێت تو دێ ڤی بەشی چەندین جاران خوینی هەتا باش تێدگەهی. زانست ژ هەژی هندێ یە مرۆڤ خوە پێڤە ب واستینی. ئەز پێ پشتڕاستم تو چ هەڤالان نابینی کو د هەموو بابەتێن خوە دا ب سەرکەڤیت بێ خوە زەحمەت بدەت یان خوە بواستینیت. ما تو بێژی ئەز پێ شاش بم؟ پێدڤیە هەتا سوباهی چاڤەڕێ بی هەتا بەرسڤێ ل سەر کەرەستەیێ بنەڕەت و وان گوهۆڕینێن د سروشتی دا پەیدادبن وەردگری. هەردیسان دێ ئاشنای فەیلەسۆفەکێ دی بی ب ناڤێ "دیمۆکریتس". نوکە ئەز چ تشتێن دی بۆ تە نابێژم.

سۆفیایێ ئەو ستری و گژوگیایێ د ڕێکا خوە دا ڕاکرن و ب ڕێکا دەرگەهێ کۆلکی تەماشەی باخچەی دکر. وێ دڤیا پیچەکێ هزرێن خوە ڕێکبێخیتە ڤە نەخاسم پشتی خواندنا وی کورسی.

یا ئاشکەرایە کو ئاڤ ژ بلی بەفرێ و هەلمێ ناهێتە گوهۆڕین بۆ چ تشتێن دی. ئاڤ نەشێت بهێتە گوهۆڕین بۆ شتیەکی، چونکی ژ بلی ئاڤێ شتی ژ تشتەکێ دی ژی پێکدهێت.

ئەرێ ئەو دا زانیت کو بەفر هەر ئاڤە ئەگەر وێ ئەڤ کورسە نەخواندبایە؟ ئەرێ ما ل سەر وێ یا پێدڤی نەبوو بەری هینگێ دیاردەیا گوهۆڕینا ئاڤێ بۆ بەفرێ و پشتی هینگێ دووبارە حەلبوونا وێ بۆ ئاڤێ، بخوینیت. سۆفیایێ پێکۆل دکر ئەو ب خوە هزرێن خوە بکەت بێ کو پشت بەستنێ بکەتە سەر وی تشتێ خواندی.

پارمینیدسی دانپێدان ب هیچ گوهۆڕینەکێ نەدکر، سۆفیایێ چەند پتر هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا کربایە، پتر باوەری پێ دئینا. ئەقلێ پارمینیدسی ب چ ڕەنگان باوەر ژ هندێ نەدکر کو تشتەك ژ نیشکەکێ ڤە دشێت بهێتە گوهۆڕین بۆ تشتەکی دی یێ زێدە جیاواز. ب ڕاستی ژی ئەو گەلەك یێ زیرەك و چاڤنەترس بوو دەمێ ئەڤ چەندە دگوتی، چونکی هەموو کەسان ب سانەهی گوهۆڕینێن سروشتی ب چاڤێن خوە ددیتن و د هەمان دەم دا وی ژی ئەڤ گوهۆڕینە هەموو ڕەتدکرن. چ پێ نەڤێت گەلەك کەس هەبوون ب بۆچوونا وی دکرە کەنی ژی. ئیمپیدۆکلیس ژی فەیلەسۆفەکێ زیرەك بوو، چونکی وی دگوت گەردوون ژ توخمەکێ ب تنێ پێکناهێت بەلکو ژ گەلەك تۆخمان پێکدهێت. ب ڤی ڕەنگی هەموو گوهۆڕینێن سروشتی دەلیڤە هەیە ڕووبدەن بێ کو د ڕاستی دا گوهۆڕینەکا ڕاستەقینە د پێکهاتەیا وان دا ڕووبدەت.

ئەڤ فەیلەسۆفێ گریکی یێ کەڤن ب تنێ ب ڕێکا ئەقلی گەهشتە ڤی ئەنجامان، چ پێنەڤێت وی سروشت ژی خواند بوو لێ وەکو سەردەمێ ئەڤرۆکە بوارێ شرۆڤەکرنا کیمیایی ل بەر دەستێ وی نەبوو. سۆفیایێ ب دروستاهی نەدزانی کا باوەر ژ هندێ بکەت کو ئاڤ و با و ئاگر و ئاخ بنیاتێ هەموو تشتێن د سروشتی دایە، باشە گرنگیا ڤێ چەندێ چیە؟ ب شێوەیەکێ بنەڕەتی، ئیمپیدۆکلیس یێ شاش نەبوو، چونکی مگرتیا یەکانە یا وەل مە دکەت باوەر ژ هەموو وان گوهۆڕینان بکەین یێن ئەم ب چاڤێن خوە دبینین ئەوە کو پتر ژ کەرەستەیەکێ بنەڕەتی هەبیت. سۆفیایێ دیت کو ژ ڕاستا فەلسەفە بابەتەکێ بالکێش و بلیمەتە، چونکی ئەو دشیا ب ئەقلێ خوە هزرا خوە د ڤان بۆچوونان دا بکەت بێ کو پێدڤی ب هندێ بیت ل وان تشتان بزڤڕیت یێن ل قوتابخانێ وەرگرتین یان فێربووی. ل دوماهیێ ژی گەهشتە وی دەرئەنجامی کو فەلسەفە تشتەکێ هۆسا نینە مرۆڤ بشێت خوە فێربکەت، لێ ئەم شێین ب شێوەیەکێ فەلسەفی هزر بکەین.

# دیمۆكریتس

*... بلیمەترین یاری ل جیهانێ...*

سۆفیایێ هەموو كاغەزێن وانەیێن خوە یێن فەلسەفی ئەوێن ژ دەڤ فەیلەسۆفەكێ نەدیار ڤە هاتین كرنە د سندوقا خوە یا ئاسنی دا و دەرێ وێ گرت. پاشی ژ كۆلكێ خوە دەركەفت و هاتە دناڤ باخچەی دا و پیاسە كرن. وێ هزرێن خوە دكرن كا دوهی سپێدێ ل سەر تێشتێ چ ڕوودابوو، ب تایبەت تڕانەیێن دایكا وێ ل دور "نامەیا ئەڤینیێ" یا بۆ وێ هاتی. ژبەر هندێ هەر زوو چوو سندوقا پۆستەی ب پشكنیت داكو هەمان هەلویستێ دوهی دگەل وێ دووبارە نەبیتەڤە.

ئەو دێ شێت هێجەتەكێ ژ پێش نامەیا ئەڤینێ ڤە گریت لێ هەكە ئەڤ نامەیە دوو ڕۆژان ل دووڤ یەك بۆ هات، ئێدی دایكا وێ ژی باوەرناكەت.

جارەكا دی، وێ زەرفەكێ سپی یێ بچوك دناڤ سندوقا پۆستێ دا دیت. ئێدی ب شێوازەكێ تایبەت نامە بۆ وێ دهاتن: هەموو ڕۆژان پشتی نیڤرۆ زەرفەكێ قەهوائی بۆ وێ دهات، پشتی ئەو ژ خواندنا وێ ب دوماهی دهات، ئەو فەیلەسۆف دا زەرفەكێ دی یێ سپی یێ بچووك بۆ كەتە د سندوقا پۆستەی دا.

ڕامانا ڤێ چەندێ ئەو بوو كو ئەو دشێت بزانیت كا ئەو فەیلەسۆف كیە لێ پا هەكە ئەو فەیلەسۆف ژن بیت نەك زەلام، ما كی دزانیت؟ بۆ ڤێ چەندێ ژی ئەو دشێت د پەنجەركێ دا بڕاوەستیت و زێرەڤانیا سندوقا پۆستەی بكەت و دێ ب چاڤێن خوە وی

فەیلەسۆفێ نهێنی بینیت، ژبەرکو ئەو نامێن سپی یێن بچووك ب خوە ناهێنە دناڤ سندوقێ دا.

سۆفیایێ بڕیار دا ڕۆژا دی سپێدێ دەست ب پلانا خوە بکەت. سوباهی ڕۆژا ئەینی یە و بێهنڤەدانا دوماهیا حەفتیێ ژی هەمموو یا ل بەر سینگێ وێ.

سۆفیا چوو د ژوورا خوە ڤە داکو وی زەڕفی ڤەکەت، ئەڤرۆکە چ تشت د وی زەڕفی دا نەبوون ژ بلی کاغەزەکا بچووك و پرسیارەکا ب تنێ ل سەر هاتبوو نڤیسین، لێ هۆسا دیارە ئەڤ پرسیارە گەلەك ژ وان هەرسێ پرسیارێن د نامەیا ئەڤینیێ یا دوهی دا ب زەحمەتترە.

## ئەرێ بۆچی یاریا "لیگۆ" بلیمەتترین یاریە ل جیهانێ؟

ل دەستپێکێ، سۆفیا دگەل هندێ نەبوو کو یاریا لیگۆ بلیمەتترین یاریە ل جیهانێ، چونکی ئەڤە چەندین سالە وێ ئەڤ یاریە نەکری، زێدەباری ڤێ چەندێ وێ چ پەیوەندی دناڤبەرا یاریا لیگۆ و فەلسەفێ دا نەددیت.

لێ ئەو قوتابیەکا گوهداربوو، ژبەر هندێ چوو کارتونا یارییێن خوە یاکو دانایە سەر دولابا خوە یا جلکان ئینا خوارێ و دناڤ یارییێن خوە دا گەڕیا هەتا زەڕفەکێ تژی پارچەیێن لیگۆیێ یێن ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆر دیتین.

ئەو ماوەیەکێ درێژ بوو وێ دەستێ خوە نەکریە پارچەیێن وێ یاریێ لێ دگەل هندێ ژی دەمێ وێ دەستێ خوە کریێ و یاری پێ کرین و پێکۆل دکری هندەك تشتان ژێ دروست بکەت، هزرا خوە د تایبەتمەندیا ڤێ یاریێ دا کر.

ل دەستپێکێ کرنا ڤێ یاریا و دروستکرنا هندەك تشتان ژ پارچەیێن وێ گەلەك یا ب سانەهی بوو، سەرەڕای هندێ کو ڤان پارچەیان شێوە و قەبارەیێن جودا جودا هەنە، لێ ئەو دشێت هەمموویان لێکبدەت و تشتێن نوو ژێ دروست بکەت. پارچەیێن ڤێ یاریێ تێکناچن، ئەرێ جارەکێ مە پارچەیەکا لیگۆیێ یا شکەستی دیتیە؟ نوکە پارچەیێن ڤێ لیگۆیێ هەروەکو هینگێ نە دەمێ بەری چەندین سالان وێ کرین و هەلگرتین.

یا ژ هەموویێ ژی گرنگتر ئەوە، هەر تشتێ مە بڤێت ئەم دشێین ژ ڤان پارچەیان دروست بکەین. ئەم دشێین پارچەیێن وان ژێکڤە بکەین و دووبارە تشتەکێ جودا ژێ دروست بکەین.

ئەرێ ژ ڤێ چەندێ پتر چ تشتێ دی یێ پێدڤیە؟ ب ڕاستی سۆفیا ل دوماهیێ گەهشتە وێ باوەریێ کو یاریا لیگۆ بلیمەتترین یاریە ل جیهانێ، لێ پرسیار ئەوە ئەرێ ڤێ یاریێ چ پەیوەندی دگەل فەلسەفێ هەیە؟ هەلبەت ئەڤ چەندە ژی نهێنیەکا دی یە.

سۆفیایێ خانیەکێ مەزن ژ لێکدانا وان پارچەیان دروست کر. د دلێ خوە دا ڤەت نەدوێریا دانپێدانێ ب هندێ بکەت کو ئەڤە دەمەکێ درێژە وێ خوشیەکا هۆسا مەزن نەبریە. ئەرێ بۆچی دەمێ خەلك مەزن دبن ئێدی شەرم دکەن یاریان بکەن.

دەمێ دایکا وێ هاتیە مال و دیتی سۆفیا مژوولی کرنا یاریانە، ب دلخوشی ڤە گوتێ: "جهێ خوشحالیا منە دەمێ دبینم تو هێشتا وەکو زارۆیەکا بچووك یاریان دکەی."

سۆفیایێ گوت: "ئەز یاریان ناکەم، بەلکو ئەز یا هندەك تاقیکرنێن فەلسەفی یێن ئالۆز ئەنجام ددەم."

دایکا وێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا، چ پێنەڤێت وێ هزرا خوە د چیرۆکا کێڤریشکا سپی و کولاڤێ سێرەبەندی یێ ڤالاْ دا دکر.

رۆژا دی سپێدێ دەمێ سۆفیا ژ قوتابخانێ زڤڕی، وێ زەرفەکێ قەهوائی یێ مەزن د سندوقا پۆستەی دا دیت. وێ ئەز زەرف دگەل خوە بر و چوو د ژوورا خوە ڤە، وێ دڤیا هەر یەکسەر دەست ب خواندنا وێ بکەت و د هەمان دەم دا ل بەر پەنجەرکێ ڕاوەستیا و چاڤێ وێ ل سندوقا پۆستەی بوو.

# تیورا گەردیلێ

ئەڤە جارەکا دی ئەم گەهشتینە هەڤدوو، سۆفیا.

ئەڤرۆکە تو دێ گوهداریا دوماهیك فەیلەسۆفێ بوارێ سروشتی کەی. ناڤێ وی دیمۆکریتس (460-370 بەری زاینی) بوو. د بنەڕەت دا خەلکێ باژێرێ "ئابدیرا" ل سەر کنارێ ڕۆژهەلاتی یێ دەریایا ئیجە بوو. ئەگەر تو شیابی بەرسڤا پرسیارا یاریا لیگۆیێ بدەی، چ پێنەڤێت تێگەهشتنا پرۆژەیێ ڤێ فەیلەسۆفی بۆ تە یا ب زەحمەت نابیت.

دیمۆکریتس یێ هەڤڕابوو دگەل فەیلەسۆفێن بەری خوە ئەوێن دگوتین گوهۆڕینێن بەرچاڤ د سروشتی دا، ژ ئەنجامێ گوهۆڕینەکا ڕاستەقینە پەیدانابن. ئەو ژی دگەل وێ چەندێ بوو کو پێدڤیە هەر تشتەکێ د گەردوونی دا ژ هندەك توخمێن بچووکتر پێکهاتبیت. هەر یەك ژ ڤان تۆخمان ژی یێ نەگوهۆڕە. دیمۆکریتسی ناڤێ ڤان پارچەیێن هەڕە بچووك کرنە گەردیلە Atom، ئانکو ئەو پارچەیێن ئێدی نەهێنە دابەشکرن.

دیمۆکریتسی پێکۆل دکر وێ چەندێ پشتڕاست بکەت کو ئەو توخمێن گەردوونی پێکدئینن، نەشێن ل سەر دابەشبوون و پارچە پارچەبوونێ بەردەوام بن، چونکی ب دیتنا وی ئەگەر ئەڤ توخمە بەردەوام بهێنە دابەشکرن ئێدی نەشێن ببنە ئەگەرێ پێکهاتنا وان تشتان یێن دناڤ سروشتی دا هەین.

ئەگەر بەردەوام گەردیلە بۆ پارچەیێن بچووکتر بهێنە دابەشکرن و پرت پرت کرن، ل وی دەمی سروشت دێ چڕاتیا خوە ژ دەست دەت هەتا وەکو شوربەیەکا ڕۆهن و شل لێدهێت.

ژلایەکێ دی ڤە، ئەو توخمێن سروشتی پێکدئینن پێدڤیە د نەگوهۆڕ بن، چونکی چ تشت ژ دەڤ خوە پەیدانابن. ل دور ڤێ خالێ، دیمۆکریتس دگەل هەر یەك ژ پارمینیدس و ئیلینی یێ هەڤڕابوو.

ئەو د وێ باوەرێ دا بوو پێدڤیە هەموو توخم د ڕەق و چڕ بن بێ کو هەموو وەکو یەك بن. ئەگەر هەموو توخم د وەکهەڤ بانە، ل وی دەمی چ شرۆڤەکرنێن ڕازیکەر

"ڤایلکەر" نەدبوون ژ بۆ هەمەجۆریا شێوەیێن جودا جودا د گەردوونی دا وەك زەیتون و پیستێ بزنێ و پرچا مرۆڤی.... هتد.

هەردیسان دیمۆکریتس د وێ باوەرێ دا بوو دناڤ گەردوونی دا هژمارەکا بێ وێنە یا گەردیلەیان هەنە. هندەك ژ وان د گرۆڤرن و د حلینە و هندەکێن دی ژی د زڤر و خواروڤیچن، ژبەر ڤان شێوە و قەبارەیێن نەوەکهەڤ، ئەو دشێن دگەل هەڤ کوم ببن و تەن و پێکهاتەیێن جودا جودا دروست بکەن. هەرچەندە هژمارا گەردیلەیان یا بێ دوماهیە و د ژێکجودانە، لێ دگەل هندێ ژی دشێن هەتا هەتایێ بمینن و نەهێنە ژناڤبرن یان پارچە پارچە کرن.

دەمێ لەشەکێ زیندی دمریت، بۆ نموونە دارەك یان گیانەوەرەك، گەردیلەیێن وی جارەکا دی ژێکڤەدبن و بەربەلاڤ دبن و دبیت هندەك جاران ئەڤ گەردیلەیە جارەکا دی دگەل هندەك گەردیلەیێن دی کوم ببن و لەشەکی یان بونەوەرەکێ نوو دروست بکەن.

گەردیلە دناڤ ئەسمانی دا ب ئازادی دفڕن و دهێن و دچن، لێ هندەك ژ وان هندەك پێکهاتەیێن وەکو ددانان یان ستریان هەنە و ب ڕێکا وان دشێن خوە پێکڤە بگرن و تشتێن دەوروبەری مە پێکبینن.

نوکە تە زانی کا مەرەما من ژ پارچەیێن یاریا لیگۆیێ چ بوو، مانە هۆسایە؟ هەمان ڤان پارچەیان ژی ئەو ساخلەت هەنە یێن دیمۆکراتیسی داینە گەردیلەیان، هەر ژبەر هندێ هەر تشتێ مە بڤێت ئەم دشێین ژێ دروست بکەین، ژبەرکو ئەڤ پارچە زێدەتر ناهێتە پرت پرت کرن، هەردیسان قەبارە و شێوەیێن جودا جودا هەنە و وان ژی هندەك پێکهاتەیێن وەکو ددان و ستریان هەنە کو هاریکاریا وان دکەن بمینتە پێکڤە دەمێ مە دڤێت تشتەکێ نوو ژێ دروست بکەین. ئەڤ شێوازێ نوو یێ پێکڤەگرێدانێ و ئەو تشتێ نوو یێ مە ژێ دروستکری، ئەم دشێین دووبارە ب سانەهی ژێکڤەبکەین و سەر و ژ نوو تشتەکێ دی ژێ دروست بکەین.

شیانێن دووبارە بکارئینانا یاریا لیگۆیێ بوویە ئەگەرێ سەرکەفتنا ڤێ یاریایێ و بەربەلاڤبوونا وێ ل سەرانسەری جیهانی. ئەو پارچەیێن لیگۆیێ یێن زارۆك بۆ خوە ترۆمبێلەکێ ژێ دروست دکەن، دشێت ل ڕۆژا پاشتر خڕاب بکەت و دووبارە خانیەکی ژێ

دروست بکەت، ژبەر هندێ ئەم دشێین بێژین ئەڤ پارچە د نەمرن. ئەرێ ما مە گەلەك جاران زارۆکێن خوە نەدیتینە دەمێ یاریان ب وان پارچەیێن لیگۆیێ دکەن دەمێ دایك و بابێن وان هێشتا زارۆك و د ژیێ وان دا ئەو یاری دکری بۆ خوە کرین؟

هەردیسان ب ڕێکا تەڤنا دەستکرد ژی ئەم دشێین شێوەیێن جودا جودا دروست بکەین، لێ ئەم نەشێین پشتی چەندین جارێن بکارئینانێ مفای ژ ڤێ تەڤنێ وەربگرین، چونکی دێ خراب بیت و تێکچیت و ئێدی دێ یا ب زەحمەت بیت ئەم بشێین تشتەکێ نوو ژێ دروست بکەین.

ل سەردەمێ ئەڤرۆکە ئەم دشێین بێژین تیورا دیمۆکریتسی ل دور گەردیلەیان یا دروست بوو، چونکی ژ ڕاستا سروشت ژ گەردیلەیێن جودا جودا پێکدهێت و بەردوام ئەڤ گەریلەیە خوە لێکددەن و ژ هەڤدوو دوور دکەڤن. بۆ نموونە، ڕەنگە گەردیلەیەکا هایدروجینی یا نوکە ڕەخەکێ دفنا من پێکئینای، بەری نوکە و ل سەردەمەکێ دی پرتەك بیت ژ لمبیسا فیلەکی. ڕەنگە ژی گەردیلەیەکا کاربونی یا نوکە دناڤ زەڤلّەکا دلێ من دا، بەری نوکە کوریا دەیناسۆرەکی بیت.

دگەل بورینا دەمی، زانستی ئەو چەندە دووپاتکر کو گەردیلە ژی ژ هندەك تەنێن بچووکتر پێکدهێن دبێژنێ "گەردیلەیێن دەستپێکی". ئەڤ تەنە "پرۆتۆن"، "نیوترۆن" و "ئەلیکترون"ن. دوور نینە ل پاشەڕۆژێ زانست بگەهیتە وێ چەندێ کو ئەڤ تەنەژی ژ هندەك تشتێن بچووکتر پێکبهێن، لێ زانایێن فیزیایێ ل سەر هندێ ڕێکەفتینە کو دڤێت سنوورەك هەبیت و ئێدی ئەڤ گەردیلەیە زێدەتر نەهێنە دابەشکرن. چ پێنەڤێت ژی ئەڤ گەردیلەیێن زێدە هوور و بچووك سروشتی پێکدئینن.

دیمۆکریتسی مفا ژ ئامیرێن ئەلیکترونی یێن ل سەردەمێ مە وەرنەگرتبوو، بەلکو ئەقلێ وی ب تنێ هاریکاریا وی دکر و ئالاڤێ وی یێ یەکانە بوو، ژبەر هندێ وی چ هەلبژارتنێن دی نەبوون.

ئەگەر ئەم ل سەر وێ بۆچوونێ ڕێك بکەڤین کو چ تشت د گەردوونی دا ناهێنە گوهۆڕین و چ تشت ژ دەڤ خوە پەیدانابن و چ تشت ژناڤ ناچن، پێدڤیە ئەم ل سەر وێ بۆچوونێ ژی ڕێك بکەڤین کو سروشت ژ هژمارەکا بێدوماهی یا گەردیلەیێن هەڕە بچووك

پێکدهێت، ب ڕەنگەکێ بەردەوام ئەڤ گەردیلەیە دگەل یەك خڕڤەدبن و تشتەکی دروست دکەن و پاشی پشتی دەمەکی ژێکڤەدبن و تشتەکێ نوو دروست دکەنەڤە.

دیمۆکریتسی پەنا بۆ بەر چ "هێز"ەکێ یان "ڕۆح"ەکێ نەبربوو ژ بۆ شرۆڤەکرنا دیاردەیێن سروشتی، بەلکو هەبوونا سروشتی ب تنێ بۆ گەردیلە و ڤالاهیێ دزڤڕاند. ڕەنگە ژی وی ب تنێ باوەری ب وان تشتان هەبایە یێن دهاتنە بەرجەستەکرن و ژ ماددەیەکی پێکهاتبان، ژبەر هندێ دگوتنە وی فەیلەسۆفێ مەتریالی یان ژی ماددەخواز*.

چ نیاز د لڤینێن گەردیلەیان دا نینن، بەلکو هەر تشتەکێ د سروشتی دا هەی ب ڕێکەکا میکانیکی دلڤلڤیت، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو هەر تشتەك ژ نیشکەکێ ڤە ڕوددەت، بەلکو هەر ڕوودانەك ل دووڤ یاسایەکا نەگوهۆڕ پەیدادبیت. ب دیتنا دیمۆکریتسی، ل پشت ڤان هەموو دیاردەیان، ئەگەرەکێ سروشتی هەیە، ئەگەرەکێ هۆسا کو خوە دناڤ وان تشتان ب خوە دا ڤەشارتیە. جارەکێ دیمۆکریتسی گوتبوو وی پێخوشترە ئەو یاسایەکا سروشتی ئاشکەرا بکەت ل شوونا هندێ ببیتە شاهێ ئیمپراتۆریا فارسان.

هەردیسان تیورا گەردیلێ یا دیمۆکریتسی، ئاریشەیا هەستا دیتنێ ژی شرۆڤە دکەت، ئانکو ژ ئەنجامێ لڤین و هاتنوچوونا گەردیلەیان دناڤ ڤالاهیا سروشتی دا، ئەم دشێین تشتێن دەوروبەری خوە ببینین، بۆ نموونە، دەمێ ئەم هەیڤێ دبینین، ڕامانا وێ ئەوە گەردیلەیێن هەیڤێ دکەڤنە پێشچاڤێن مە.

لێ بابەتێ ڕۆحێ چەوا دێ هێتە شرۆڤەکرن؟ ئەرێ ئەم دشێین ڕۆحا مرۆڤەکی ژی ب ڕێکا گەردیلەیێن وێ ببینین، ئانکو ب ڕێکا بەرجەستکرنا پێکهاتەیێن وێ؟ باشە، ب دیتنا دیمۆکریتسی، ڕۆح ژ هندەك گەردیلەیێن گرۆڤر و حلی "گەردیلەیێن ڕۆحێ" پێکدهێت، دەمێ مرۆڤ دمریت، گەردیلەیێن ڕۆحا وی ژ لەشێ وی دەردکەڤن ژێکڤەدبن و بەرەڤ هەموو ئاڕاستەیان بەربەلاڤ دبن، دبیت ژی پشتی هینگێ دووبارە ئەڤ گەردیلەیە خوە لێکبدەنەڤە و ڕۆحەکا نوو دروست بکەن.

---

* مەتریالیست Materialist یان ماددەخواز ئەو کەسن یێن ل دووڤ ڕێبازا ماددەی دچن کو ب باوەریا وان هەر تشتەکێ د گەردوونی دا، د بنەڕەت دا ژ ماددەیا پێکدهێت، ب ڤی ڕەنگی ماددە تشتەکێ دەستپێکییە و هەست "مەژی" تشتەکێ لاوەکی یان ژی ناڤنجییە.

ئەڤ چەندە ژی هندێ ڕادگەهینیت کو ڕۆحا مرۆڤی نە یا نەمرە، گەلەك كەسێن سەردەمێ ئەڤرۆکە ژی باوەری ب ڤێ چەندێ هەیە. ڤان كەسان باوەری ب هندێ هەیە کو ڕۆحا مرۆڤی دگەل مەژییێ مرۆڤی یا گرێدایە، ژبەر هندێ دەمێ مەژییێ مرۆڤی پیچ دبیت، ئێدی ئەم نەشێین ب چ ڕەنگان هەست ب هشیارییێ بکەین.

ب ڤی ڕەنگی، دیمۆکریتسی ب تیورا خوە یا گەردیلێ، خیچەك ل سەر فەلسەفەیا سروشتی یا گریکیان ڕا ئینا و دا ڕەخەکی.

دیمۆکریتس دگەل هیڕاکلیتسی یێ هەڤڕابوو کو هەر تشتەك د گەردوونی دا یێ د دوخەکێ گوهۆڕینێ یێ بەردەوام دا، لێ ل پشت ڤان تشتێن بەردەوام دهێنە گوهۆڕین، تشتەکێ جێگیر و هەتا هەتایی هەیە و قەت ناهێتە گوهۆڕین، دبێژنە ڤی تشتی ژی گەردیلە.

دگەل خواندنا ڤان نامەیان، سۆفیا ل بەر پەنجەرکێ یا ڕوونشتی بوو داکو بزانیت کا ئەرێ کەسەکێ نەنیاس دێ نێزیکی سندوقا پۆستەی بیت یا نە. ئەو ب ڤی ڕەنگی یا ڕوونشتی بوو و دووبارە هزرا خوە د وان تشتان دا دکر یێن بەری نوکە خواندین.

هەموو ئەو کارێ دیمۆکریتسی کری، ب تنێ ئەو بوو کو وی هزرا خوە دکر. ب ڕێکا ڤێ هزرکرنێ شیا بگەهیتە بیرۆکەیەکا بلیمەت، ئەو بیرۆکەیا شیای ئاریشەیا هەلاویستی دناڤبەرا "کەرەستەیێ یەکانە" و "گوهۆڕین"ێ دا چارەسەر بکەت. پشتی کو بۆ ماوەیێ چەندین چەرخێن درێژ فەیلەسۆف ل بەر ڤی دیواری ئاسێ بووین، ل دوماهیێ دیمۆکریتس هات و ب تنێ ب ڕێکا ئەقلێ خوە ئەڤ ئاریشەیە چارەسەرکر.

سۆفیایێ دەست ب کەنیێ کر و پیچەك مابوو دلێ وێ خراب بیت هندی دکرە کەنی، ب ڕاستی ژی تشتەکێ لوژیکی یە. ل دوماهیێ بۆ وێ دیاربوو سروشت ژ چەند توخمێن بچووك پێکدهێت کو ب چ ڕەنگان ناهێنە گوهۆڕین.

ژلایەکێ دی ڤە، هیڕاکلیتس نەیێ شاش بوو دەمێ گوتی هەموو توخمێن د سروشتی دا، یێن د دوخەکێ گوهۆڕینێ یێ بەردەوام دا، بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ژی ئەوە

هەموو مرۆڤ و گیانەوەر ل دوماهیێ هەر دمرن، هەتا چیاییێن مەزن و بهێز ژی هێدی تووشی ژناڤچوونێ دبن.

یا گرنگ ل ڤێرێ ئەوە بزانین ئەڤ چیاییێن مەزن، سەرەڕای ژناڤچوونا وان، لێ ئەو ب خوە ژ هندەك گەردیلەیێن گەلەك بچووك پێكدهێن كو قەت ناهێنە ژناڤبرن یان پرت پرت كرن.

لێ دیمۆكریتسی هندەك پرسیارێن دی ئازراندن، بۆ نموونە، دەمێ وی گوتی تشتێن د گەروونی دا ل دووڤ هێزەكا میكانیكی ب ڕێڤە دچن، وی بیرۆكەیا هەبوونا هێزەكا گیانی د گەردوونی دا ڕەتدكر كو ئەمفیدوكلیس و ئەنكزاگورسی باوەری پێ هەبوو، د هەمان دەم دا ئەو د وێ باوەریێ دا بوو كو ڕۆحا مرۆڤی نە یا نەمرە.

ئەرێ هەتا ڤێ خالێ ئەو یێ ڕاست بوو؟

سۆفیایێ بەرسڤا دروست نەدزانی، چونكی ئەڤە نە دەمەكێ درێژ بوو وێ دەست ب خواندنا كورسێ فەلسەفێ كری.

# چارەنڤیس

*...فالڤەکەر پێکۆلێ دکەت تشتەکی شرۆڤە بکەت کو د ڕاستی دا نەیێ پێشبینیکریە...*

دگەل خواندنا فەلسەفا دیمۆکریتسی، چاڤێ سۆفیایێ بەردەوام د پەنجەرکێ دا ل باخچەی بوو، داکو دلێ خوە ئارام بکەت، ژ ژوورا خوە هاتە خوارێ داکو بچیت تەماشەی سندوقا پۆستەی بکەت.

دەمێ دەرگەهێ مال ڤەکری، زەڕفەکێ بچووك ل بەر دەرگەهی دیت کو ناڤێ وێ ل سەر یێ نڤیسای بوو، سۆفیا ئاموندسن.

هۆسا دیارە ڤێجارێ وی سوفیا سەردابر! چونکی ئەڤرۆکە دەمێ ب درێژاهیا ڕۆژێ ئەو ل بەر پەنجەرێ یا ڕاوەستیای و چاڤێ وێ ل سندوقا پۆستەی، فەیلەسۆفێ نهێنی د ڕێکەکا دی ڕا هاتبوو و ئەڤ زەڕفە دانابوو بەر دەرگەهێ مالا وان و پاشی دووبارە خوە دناڤ دارستانێ دا بەرزە کربوو.

ئەرێ وی چەوا زانی سۆفیا ل بەر پەنجەرێ یا ڕاوەستیایە و زێرەڤانیا سندوقا پۆستەی دکەت؟ ئەرێ وی ئەو د پەنجەرێ دا دیتبوو؟

هەرچەوا بیت، سۆفیا یا کەیفخوش بوو کو شیای نامێ دگەل خوە ببەت بەری کو دایکا وێ بهێتە مال و زەڕف ل بەر دەرگەهی دیتبایە.

سۆفیا بلەز زڤڕی ژوورا خوە و ئەو نامە ڤەکر، کوژیێن زەرفێ سپی پیچەکێ د تەڕ بوون و هندەك شوونوار ل سەر مابوون کو هۆسا دیارە شوونوارێن ددانان بوون. ئەرێ ئەڤ چەندە چەوا چێبوویە؟ چونکی ئەڤە چەند ڕۆژە باران نەهاتی.

ل سەر کاغەزا دەستپێکێ یا نڤیسای بوو:

ئەرێ تە باوەری ب چارەنڤیسی هەیە؟

ئەرێ نەساخی سزادانەکە ژ دەڤ خودای؟

ئەو کیژ هێزە کونترۆلێ ل سەر پێڤاژوویا دیرۆکێ دکەت؟

ئەرێ وێ باوەری ب چارەنڤیسی هەیە؟ ل دەستپێکێ ئەو نە یا پشتڕاست بوو کا باوەری پێ هەیە یان نە، لێ وێ گەلەك کەس دنیاسین کو باوەری ب چارەنڤیس و بەختی هەبوو. کچەکا ژ هەڤالا وێ د پولێ ڤە بەردەوام گوشەیا بورجێن بەختی د گوڤار و ڕۆژنامەیان دا دخواندن. ئانکو ئەگەر مە باوەری ب زانستێ فەلەکی هەبیت، چ پێ نەڤێت دێ مە باوەری ب چارەنڤیسی ژی هەبیت ژبەرکو زانایێن فەلەکی د وێ باوەرێ دانە کو جهێ ستێران ل ئەسمانی کاریگەری ل سەر ژیانا مرۆڤان ل سەر ڕوویێ ئەردی هەیە.

ئەگەر مە باوەری ب هندێ هەبیت کو دیتنا پشیکەکا ڕەش ل سەر جادێ نیشانا بێئیفلەحیێ بیت، پێدڤیە مە باوەری ب چارەنڤیسی ژی هەبیت، مانە هۆسایە؟ هەرچەند وێ پتر هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا کربایە، پتر نموونە دهاتنە سەر هزرا وێ. بۆ نموونە، بۆچی گەلەك مرۆڤ دبێژن "ڤی داری بگرە؟"* هەردیسان بۆچی ڕۆژا ئەینی یا 13ێ هەیڤێ دهێتە هژمارتن ڕۆژەکا بێ ئیفلەح؟ سۆفیایێ زانیبوو کو هندەك ئوتێلان ژمارە سێزدە نەدانایە سەر ژوورێن خوە. هەلبەت ئەڤ نموونە ژی وێ چەندێ دووپات دکەن کو گەلەك کەسان باوەری ب ڤان ئەفسانەیان هەیە.

---

* ڤێ دارێ بگرە knock on wood ئیدیەما زمانێ ئینگلیزیێ یە ل وی دەمی دهێـە گوتن دەمێ کەسەك بێژیتە کەسەکێ دی خوە ژ تشتێن خراب دووربێخە.

پەیڤا "ئەفسانە" ب خوە پەیڤەکا بێ ڕامانە. بۆ نموونە ئەگەر تو کەسەکێ موسلمان یان کریستیان بی، دێ بێژن تو مرۆڤەکێ خوەدان باوەری، لێ هەکە تە باوەری ب زانستێ فەلەکێ هەبیت یان باوەری ب بێئیفلەحیا ڕوژا ئەینی یا 13ێ هەبیت، دێ بێژن تو کەسەکێ ئەفسانەچی. ئەرێ کێ ئەو ماف هەیە باوەریا کەسێن دی ب ئەفسانەیی ل قەلەم بدەت؟

هەرچەوا بیت، سۆفیا یا ژ تشتەکی ب تنێ پشتڕاست بوو: دیمۆکریتسی باوەری ب چارەنڤیسی نەبوو، بەلکو وی ب تنێ باوەری ب گەردیلە و ڤالاهیێ هەبوو.

سۆفیایێ پێکۆل دکر هزرا خوە د پرسیارێن دی یێن ل سەر نامێ بکەت.

ئەرێ نەساخی سزادانەکە ژ دەڤ خودای؟ ئەرێ ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە کی باوەر ژ تشتەکێ هۆسا دکەت؟ ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە دڤێت ئەم داخوازا هاریکاریێ ژ خودای بکەین داکو ساخلەم بینەڤە، چونکی وێ گەلەك کەس د ژیانا خوە دا دیتبوون دەمێ نەساخ دبوون، دوعا دکرن داکو ساخلەم بنەڤە، لێ ئەرێ هەتا چ ڕادە وان باوەری ب هندێ هەبوو کو خودای ئەو نەساخی یێن داینە وان و هەر ئەو دشێت نەساخیا وان چارەسەر بکەت.

هەلویستێ وێ بەرامبەری پرسیارا سیێ ژ هەمووان ب زەحمەتر بوو، بەری نوکە چ جاران وێ هزرا خوە د هندێ دا نەکربوو کا کی کونترۆلێ ل سەر دیرۆکێ دکەت. باشە مانە هەر مرۆڤ ب خوەنە؟ باشە هەکە خودا یان چارەنڤیس هەبیت، ئانکو خەلك نەشێن خواست "ئیرادە" و حەزێن خوە ب ئازادی پڕاکتیزە بکەن.

ڤێ بیرۆکێ، بیرۆکەیا پڕاکتیزەکرنا خواستان ب ئازادی، سۆفیا بەرەڤ ئاڕاستەیەکێ نوو بر. ئەرێ بۆچی ئەو یا ڕازییە ئەڤ فەیلەسۆفێ نەدیار یاریا دگەل وێ بکەت، یاریا پشیك و مشکی؟ ئەرێ بۆچی ئەو ژی نامەیەکێ بۆ ڤی فەیلەسۆفێ نەدیار فڕیناکەت؟ چ پێنەڤێت ئەو دێ هێت و زەرفەکێ دی یێ قەهوائی دانیتە د سندوقا پۆستەی دا، باشە پا سۆفیا ژی دێ نامەیەکێ بو وی\وێ کەتە د سندوقا پۆستێ دا.

هەر یەکسەر وێ دەست ب ئەنجامدانا ڤی کاری کر. نە یا ب سانەهی بوو ئەو نامەیەکێ بۆ کەسەکێ وێ چ جاران نەدیتی بنڤیسیت، تا وی ڕادەی ئەو نزانیت ئەو کەس

ژنە یان زەلامە، یان ژی کەسەکێ گەنجە یان دانعەمرە، یان تو بێژی کەسەکێ هۆسا بیت سۆفیا وی بنیاسیت؟

ل دوماهیێ وێ ئەڤ نامە نڤیسی:

*بۆ بەرێز: فەیلەسۆفێ هێژا*

*ب رێزگرتنەکا مەزن ڤە، ئەڤ مالە شانازیێ ب جەنابێ هەوە یێ بەرێز و هنارتنا وانەیێن فەلسەفی دبەت، لێ ئەو تشتێ بوویە جهێ دلگرانیا مە ئەوە کو ئەم تە نانیاسین، ژبەر هندێ ئەم هیڤی ژ تە دکەین خوە بۆ مە بدەیە نیاسین و ناسنامەیا خوە دیار بکەی.*

*بەرامبەری هندێ، ئەم تە داخواز دکەینە ڤەخوارنا قەهوەیەکێ ل مالا مە و یا باشتر ئەوە سەرەدانا تە ل وی دەمی بیت دەمێ دایکا من ل مال نە. ئەو رۆژانە، ژ رۆژا دووشەمبی هەتا ئەینی ژ دەمژمێر 7:30 سپێدێ هەتا 5:00 ئێڤاری کار دکەت. لێ ئەز ژی ل ڤی دەمی دچمە قوتابخانێ، لێ سوباهی رۆژا پێنج شەمبی یە و دێ ل دەمێژێر 2:15 پشتی نیڤرۆ زڤرمە مال. پشتراست بە ئەز دێ قەهوەیەکا گەلەك خوش بەرهەڤ دکەم. دووبارە سوپاس بۆ تە.*

*دگەل رێزێن من*

*قوتابیا تە یا دلسوز*

*سۆفیا ئاموندسن یا 14 سالی*

ل بنێ نامێ ژی نڤیسا: هیڤی دکەم بەرسڤێ بدە.

سۆفیایێ هەستپێکر نامەیا وێ زێدە یا فەرمی یە، لێ بۆ وێ یا ب زەحمەت بوو بزانیت دێ کیژ پەیڤان بۆ کەسەکی نڤیسیت یێ کوهێشتا نەدیتی.

وێ ئەو نامە کرە د زەرفەکێ ڕەنگ پیڤازی دا و دەرێ وێ گرت و ل سەر نڤیسا: بۆ فەیلەسۆفی.

ئاریشە ئەو بوو دێ چەوا وی زەرفی کەتە د سندوقا پۆستەی دا بێ کو دایکا وێ ببینیت، باشە، یا باشترە پشتی ل دانێ ئێڤاری دایکا وێ دهێتە مال ئەو بچیت بکەتە د سندوقێ دا و ڕۆژا دی سپێدی زوو ژی بچیت سەحکەتێ کا هێشتا ل جهێ خوە مایە یان نە. ئەگەر ل ئێڤاری یان ب شەڤێ چ زەرفێن دی بۆ وێ نەهاتبن، دێ نەچاربیت زەرفێ خوە یێ پیڤازی ژ سندوقا پۆستەی دا ئینتە دەرێ.

باشە بۆچی تا ڤی ڕادەی کارێ وێ هۆسا یێ ئالۆز و ب زەحمەتە؟

ل ڤێ ئێڤارێ، سۆفیا زووی چوو سەر جهێن خوە یێن نڤستنێ، هەرچەندە ئەو ئێڤاریا ڕۆژا ئەینی بوو و دایکا وێ پێکۆل دکر وێ بهێلتە هشیار داکو پێکڤە بیتزایێ بخون و هەردوو پێکڤە تەماشەی زنجیرەیا پولیسی یا خوشتڤی یا ب ناڤێ "دیریك" ل دەڤ وان بکەن، لێ سۆفیایێ هۆسا خوە دیارکر کو ئەو گەلەك یا واستیایە و دڤێت ل سەر تەختێ خوە یێ نڤستنێ پەڕتووکەکێ بخوینیت.

دەمێ دایکا وێ ل بەر تێلەڤزیونێ یا ڕوونشتی، سۆفیایێ ئەڤ چەندە ب دەلیڤە زانی و بلەز چوو ژ دەرڤە و نامەیا خوە هاڤێتە د سندوقا پۆستەی دا.

وێ دزانی دایکا وێ یا نیگەرانە، نەخاسم ئەڤە ژ وێ ڕۆژێ وەرە یا سۆفیایێ بەحسێ چیڕۆکا کێڤریشکا سپی و کولاڤی بۆ کری، ژبەر هندێ سۆفیایێ نەدڤیا زێدەتر بۆ وێ نەخوش بکەت، لێ چ پێنەڤێت یا ل سەر وێ پێدڤی بوو زێرەڤانیا سندوقا پۆستەی بکەت.

دەمێ دایکا وێ چوویە ڤاتێ سەری، دەمژمێر نێزیکی دوازدەی شەڤێ بوو و هێشتا سۆفیا د پەنجەرێ دا یا ڕاوەستیای بوو و بەرێ وێ ل کولانێ بوو.

دایکا وێ پرسیار ژێ کر: "ئەرێ تو زێرەڤانیا سندوقا پۆستەی دکەی؟"

- "ئەز یا مافدارم تەماشەی وی تشتی بکەم یێ من دڤێت."

- "ئەز دبێژم تو یا ئەڤیندار بووی، لێ هەکە تو ل هیڤیا نامەیەکا نوو بی، ئەز باوەرناکەم ئەو ڤێ نیڤا شەڤێ بهێت و نامەیەکا دی بۆ تە بکەتە د سندوقێ دا."

ئاخ، کەربێن سۆفیایێ گەلەک ژ ڤان چیرۆکێن عەشقێ یێن ئاشوپی ڤەدبوون، لێ پا ما ئەو چ بکەت؟ یا باشترە ئەو دایکا خوە ب ڤی شێوەی بهێلیت و بلا هەر ڤێ هزرا شاش بکەت باشترە ژ هندێ نهێنیا وێ بزانیت.

دایکا وێ بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "ئەرێ وی بۆ تە بەحسێ کێڤریشک و کولاڤێ سێرەبەندیێ کریە؟"

سۆفیایێ ب بەلێ بەرسڤا وێ دا.

- "ئەو... باشە ئەو کەرەستەیێن بێهوشکەر بکارنائینیت، مانە؟"

ب ڕاستی ژی دلێ وێ دما ب دایکا وێ ڤە، لێ ئەو نەدشیا زێدەتر دایکا خوە د ڤێ نیگەرایێ دا بهێلیت. وێ ب تەمامی بەروڤاژی هزردکر، هزرا وێ ب تنێ بۆ کەرەستەیێن بێهوشکەر دچوو دەمێ دیتی کچا وێ پیچەکێ یا هزرا خوە د هندەک تشتان دا دکەت و ئەقلێ خوە بکاردئینیت... هندەک جاران کەسێن مەزن ژی چەند د ئەقل سڤکن!...

- "دادێ ئەز سوزێ ددەمە تە کو چ جاران نێزیکی ڤان تشتان نەبم."

دگەل گوتنا ڤان پەیڤان، ئەو ل دایکا خوە زڤڕی و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "هەروەسا ئەو ژی ڤەت کەرەستەیێن بێهوشکەر بکارنائینیت، بەروڤاژی ڤێ چەندێ، ئەو گەلەک گرنگیێ ب فەلسەفێ ددەت."

- "باشە ئەو ژ تە مەزنترە؟"

سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند و ب نەخێر بەرسڤا وێ دا.

- "باشە ئەو هندی تەیە؟"

دیسان وێ سەرێ خوە هەژاند بێ کو بەرسڤەکا دروست بدەتە وێ.

- "باشە تو دبێژی ئەو گرنگیێ ب فەلسەفێ ددەت؟"

دووبارە سۆفیایێ ب بەلێ بەرسڤ دا.

- "هۆسا دیاره ئەو کەسەکێ ژێهاتی یە، نوکە هەڕە بنڤە. ئەز دبێژم تو بچیە سەر جهێن خوە بنڤی بۆ تە باشترە."

لێ سۆفیا هەر ما ل بەر پەنجەرێ و بەردەوام تەماشەی کولانێ دکر. دەمێ دەمژمێر بوویە یەکی شەڤێ، خەوێ چاڤێن وێ گرتن و پیچەك مابوو دا چیتە سەر جهێن خوە لێ ژ نیشکەکێ ڤە سیتافکا کەسەکی کەفتە بەر چاڤێن وێ دەمێ ژ ناڤ دارستانێ دەرکەفتی.

ژ دەرڤە، دنیا یا تاڕی بوو، لێ ڕۆناهیا هەیڤێ تێرا هندێ دکر کو ئەو شێوەیێ وی زەلامی ببینیت، ئەو کەسەکێ دانعەمر بوو، ئانکو هەرچەوا بیت ژ وێ مەزنتر بوو و کولاڤەك ل سەری بوو.

بۆ ساتەکی، وی سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی مالا وان کر، لێ وێ ڕۆناهیێن مال هەموو ڤەمراندبوون. پاشی بەرەڤ سندوقا پۆستەی ڤە چوو و زەرفەکێ مەزن کرە تێدا، لێ هەر ل وی دەمی چاڤێ وی ب زەرفێ پیڤازی کەفت.

د ماوەیێ چەند چرکەیێن کێم دا ئەو ژ وێرێ دوورکەفت و بەرەڤ ڕێکا ناڤ دارستانێ ڤە چوو و یەکسەر بەرزەبوو.

دلێ سۆفیایێ بلەز خوە قوتا، یا ل سەر وێ پێدڤی بوو ب جلکێن نڤستنێ ل دووڤ وی زەلامی بکەتە غارێ ئەگەر ئەو ... نەخێر، نابیت ئەو ل دووڤ کەسەکێ نەنیاس بکەتە غارێ نەخاسم ل درەنگی شەڤ، ل شوونا هندێ نوکە ل سەر وێ یا پێدڤیە بچیتە ژدەرڤە و وی زەرفێ د سندوقێ دا بهەلگریت.

بۆ ساتەکی ڕاوەستیا، پاشی ب هشیاری ژ دەرەجکان هاتە خوارێ و هێدی دەرگەهـ ڤەکر، د ماوەیێ کێمتر ژ خولەکەکێ دا زڤڕی ژوورا خوە ڤە و ئەو زەرف د دەستان دا بوو. ل سەر تەختێ خوە ڕوونشت و بێهنا خوە کوور هەلکێشا. پشتی بورینا چەند خولەکان، بێ ڕوودانا چ تشتان، زەرف ڤەکر و دەست ب خواندنا نامێ کر.

چ پێنەڤێت نوکە ئەو ل هیڤیا بەرسڤا نامەیا خوە نەبوو، چونکی ئەو یا پشتڕاستە سوباهی دێ بەرسڤا وێ هێتە دان.

# چارەنڤیس

**دەمباش، ئەڤە**

**جارەکا دی ئەزم، خوشتڤیا من سۆفیا!**

**دەمێ هزرەکا شاش دهێتە د سەرێ تە دا و کارەکێ نەچاڤەرێکری بکەی، ئەز هوشدارییێ ددەمە تە کو ب چ ڕەنگان سیخورییێ ل سەر من نەکەی، ڕۆژەك دێ هێت و دێ هەڤدوو بینین، لێ ئەز دێ بڕیارێ دەم کا کەنگی و ل کیرێ. ئەڤە من هوشداری دا تە و ئەز یێ پشتڕاستم تو دێ یا گوهداربی، مانە هۆسایە؟**

**دا بزڤڕینە بابەتێ خوە یێ فەلسەفێ. بەری نوکە مە زانی کا چەوا فەیلەسۆفان پێکۆل کربوو دیاردەیا گۆهۆرینێ د سروشتی دا شڕۆڤە بکەن. ل سەردەمێن بەرێ، هەموو تشت بۆ ئەفسانەیان دزڤڕاندن.**

**لێ پێدڤی بوو ئەڤ ئەفسانەیێن کەڤن گۆڕەپانێ بۆ هندەك بوارێن دی چول بکەن. ئەم دێ ڤێ چەندێ ب ئاشکەرای بینین دەمێ دچینە دناڤ بابەتێن نەساخی و ساخلەمیێ دا، زێدەباری سیاسەتێ. د ڤان هەردوو بوارێن هەڕە گرنگ دا، گریکییێن کەڤن باوەری ب چارەنڤیسی هەبوو تا وی سەردەمێ ئەم د وانەیا خوە دا گەهشتینێ.**

**باوەری ئینان ب قەدەر و چارەنڤیسی، مەرەم ژێ ئەوە هەر تشتەکێ بهێتە ڕوودان، بەری هینگێ بڕیار ل سەر هاتیە دان. ئەم دشێین تیبینیا ڤی تێگەهی ل سەرانسەری جیهانێ بکەین، هەر ژ سەردەمێن گەلەك کەڤن و هەتا سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆکە ژی ئەڤ چەندە یا بەربەلاڤە. بۆ نموونە ل وەلاتێن باکوری، باوەریەکا تەمام ب چارەنڤیسی هەبوو، هەروەکو د سەرهاتییێن میتولوژیا ئایسلەندی یێن کەڤن دا.**

**ل دەڤ گریکیان، هەروەکو ل گەلەك دەڤەرێن دی یێن جیهانێ، ئەو بیرۆکە یا بەربەلاڤ بوو کو خەلك دشێت چارەنڤیسێ خوە یان قەدەرا خوە ب هاریکاریا هندەك فالڤەکەران یان زەلامێن ئولی بزانن، ئانکو چارەنڤیسێ کەسەکی یان دەڤەرەکێ ب ڕێکێن جودا جودا دهاتە شڕۆڤەکرن.**

هندەك كەس هەنە باوەری ب بەختی ژی هەیە، ئەو ژی ب ڕێكا كێشانا هندەك كارتان، یان ژی ب ڕێكا خواندنا ستێران.

هەردیسان هندەك كەس فنجانێن قەهوێ دخوینن، دبیت بەرمایكێن قەهوێ هندەك وێنە یان شێوەیێن دەستینشانكری ل سەر لێڤێن فنجانێ ل پاش خوە بهێلیت، ل دووڤ دا ژی دەمێ پیچەكێ هزرێن خوە تێدا بكەن و ئاشوپا خوە بكاربینن، دێ شێن شرۆڤەكێ دەنە وی وێنەی، بۆ نموونە، ئەگەر ئەو وێنە وەكو وینەیێ ترۆمبێلەكێ بیت، ئەڤ چەندە هندێ دگەهینیت كو ئەو كەسێ فال بۆ هاتیە گرتن دێ ب گەشتەكا ترۆمبێلێ ڕابیت.

ب ڤی ڕەنگی فالڤەكەر پێكۆلێ دكەن تشتەكی شرۆڤە بكەن كو د سروشتێ خوە دا یێ دیار نینە و چ شرۆڤەكرنێن دیاركری نینن. ئەڤ چەندە ل سەر هەموو هونەرێن پێشبینیكرنێ دهێتە سەپاندن. ئەو تشتێ ئەم شرۆڤە دكەین تا وی ڕادەی یێ ئالۆز و نەدیارە ئەم نەشێین دژی وی فالڤەكەری بڕاوەستین.

ئەگەر ئەم بەرێ خوە بدەینە ستێران، ژ بلی گێلەشوكەكا خالێن گەش و تەیسوك ئەم چ دی نابینین. سەرەڕای ڤێ چەندێ، لێ گەلەك كەسان و د هەموو سەردەمان دا باوەری ب هندێ هەبوو كو ستێر دشێن چارەنڤیسێ مە ل سەر ئەردی بۆ مە دیار بكەن. هەتا نوكە ژی گەلەك سەركردەیێن پارتێن سیاسی بۆچوونێن فالڤەكەران وەردگرن بەری هندەك بڕیارێن گرنگ بدەن.

## فالڤەكەرا دێلفی

گریكیێن كەڤن باوەری ب هندێ هەبوو كو ئەو دشێن چارەنڤیسێ خوە ب هاریكاریا فالڤەكەرا دێلفی بزانن، ل وی سەردەمی، ئەپولون، خوداوەندێ فالڤەكرنێ، ب ڕێكا كاهنا ژن "پیتیا"یێ پەیامێن خوە دگەهاندنە خەلكی كو ئەو ژی ل سەر كورسیكەكێ یا ڕوونشتی بوو و كورسیكا وێ ل سەر دەرزەكا "شەقەكا" ئەردی هاتبوو دانان. هندەك گاز ژ

ڤێ دەرزێ دەردکەفت کو وەل فالڤەکەرێ دکر بچیتە د دوخەکێ نێزیکی بێئاگەهیێ دا. ئەڤەژی دوخەکێ پێدڤی و گرنگ بوو هەتا ئەو بشێت ل سەر ئەزمانێ ئەپولونی باخڤیت.

دەمێ خەلك دهاتنە پەرستگەها دێلفی، خەلکی پرسیارێن خوە ئاراستەی کاهنێن وێرێ دکرن داکو ئەو ژی ژ لایێ خوە ڤە بگەهینە پیتیایێ ئەوا کو ب زمانەکێ نەدیار و ئالۆز دئاخفتی، ژبەر هندێ کاهن نەچاردبوون ئاخفتنێن وێ بۆ خەلکی شرۆڤە بکەن. گریکیان هزردکر ئەو دشێن مفای بۆ خوە ژ ڤێ چەندێ وەربگرن، ب تایبەت پەند و شیرەتێن ئەپولونی، ئەوێ ب هزرا وان هەموو تشتان دەرباەی رابردوو و پاشەروژێ دزانیت.

گەلەك ژ سەرکردەیان بەری بۆچوونا فالڤەکەرا دێلفی وەربگرن، نەدوێریان بچنە شەری یان برپارێن مەترسیدار بدەن. ل ڤێرێ، کاهنێن ئەپولونی ب رۆلێ دیبلوماتکار و شیرەتکاران رادبوون، چونکی ئەو باش شارەزای سەروبەرێ خەلکی و وەلاتی ببوون.

ل بەر دەرگەهێ پەرستگەها دێلفی، ئەڤ گوتنا ناڤدار هاتبوو نڤیسین: "**تو ب خوە، خوە بنیاسە.**"

مەرەما وان ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو کو بیرا خەلکی ل هندێ بینەڤە کو ئەو د چووینە و کەس ژ وان نەشێت ژ قەدەرا خوە برەڤیت.

هوزانڤانێن گریکی ژی گەلەك هوزان ل سەر وان کەسان ڤەهاندبوون یێن خوە رادەستی قەدەرێ کری و بووینە بابەتێ زنجیرەکا شانۆگەرییێن تراژیدی. ناڤدارترین سەرهاتی ژی یا شاهـ ئودیپوسی بوو.

## زانست و چیرۆکا نوشدارییێ

قەدەرێ نە ب تنێ چارەنڤیسێ تاکەکەسان دەستنیشان دکر، بەلکو گریکییێن کەڤن باوەری ب هندێ هەبوو کو چارەنڤیسێ دنیایێ هەموویێ یێ د دەستێن قەدەرێ دا. بۆ نموونە ب هزرا وان چارەنڤیسێ شەڕان د دەستێن خوداوەندان دا بوو. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە ژی، گەلەك کەسان باوەری ب هندێ هەیە کو خودا یان ژی هێزەکا وەکو رۆحێ کونترۆلێ ل سەر چارەنڤیسێ جیهانێ دکەت.

ل وی دەمێ فەیلەسۆفێن گریکی پێکۆل دکری شرۆڤەکرنەکا ژیرانە بۆ دیاردەیێن سروشتی ببینن، زانستەکێ نوو کو ئەو ژی "زانستێ دیرۆکێ" بوو سەرهلدا و پێکۆلێن خورت دکرن ژ بۆ ڤەدیتنا ئەگەرێن سروشتی یێن ل پشت پێڤاژوویا دیرۆکێ.

ل ڤێرێ، ئێدی ئەگەرێن شکەستنا د شەڕان دا بۆ خوداوەندان نەدهاتنە زڤڕاندن. دیارترین دیرۆکنڤیسێن وی سەردەمی، هیرودوت (484-424 بەری زاینی) و توسیدیدیس (460-400 بەری زاینی) بوون.

ل دەڤ گریکیان، نەساخی ژی جۆرەکێ سزادانەکێ بوو ژ دەڤ خوداوەندان. وی ئەڤ نەساخییێن ڤەگر ب سەر وان دا دئینان وەك سزادانەك بۆ گونەهێن وان، د هەمان دەم دا ئەو دشێت ڤان نەساخیان ژ سەر وان ڕاکەت بەلێ پا مەرجەکی، ئەو ژی قوربانیان ل دووڤ هندەك ڕێسایان بۆ وی بدەن.

ئەڤ بیروباوەرە ل ناڤ گریکیان ب تنێ د بەربەلاڤ نەبوون. بەری هاتنا نوشداریا سەردەم، ل پتریا دەڤەرێن جیهانێ خەلك د وێ باوەرێ دا بوون کو نەساخی دیاردەیەکا سەرسروشتی دایە، بۆ نموونە پەیڤا فلو Flue یا ئینگلیزی یان ژی ئینفلوەنزا Influenza یا نەڕویجی بۆ پەرسیڤی دهێتە بکارئینان، د بنەڕەت دا ب ڕامانا هندێ دهێت دەمێ کەسەك دکەڤیتە بن کارتێکرنا خراب یا ستێران.

هەتا ل سەر دەمێ مە یێ ئەڤرۆکە ژی، گەلەك کەس هەنە هزر دکەن نەخوشیا ئیدزێ AIDS سزایەکە ژ دەڤ خودای، هەر ژبەر هندێ ژی گەلەك کەس د وێ باوەرێ دانە کو ساخلەمبوونا مرۆڤان پێدڤی ب هێزەکا ڕادەر و سەرسروشتی دا هەیە.

ب ڤی ڕەنگی، دەمێ فەیلەسۆفێن گریکی مژوولی ڤەدیتنا ڕێکەکێ بووین ل هەمبەر شێوازەکێ نوو یێ هزرکرنێ، دیتنەکا نوو بۆ زانستێ نوشداریێ پەیدابوو کو پێکۆل دکر نەساخی و ساخلەمیێ ب ڕێکەکا سروشتی شرۆڤە بکەت. هیپۆکراتس، ئەوێ ل سالا 460ێ بەری زاینی ل گزیرتەیا کیوس هاتیە سەر دنیایێ، دهێتە هەژمارتن دانەرێ زانستێ نوشداریا گریکی.

ب بۆچوونا هیپۆکراتسی، باشترین ڕێك بۆ خوە پاراستنێ ژ نەخوشیان ئەوە مرۆڤ ب شێوەیەکێ سادە بژیت. ڕەوشا ساخلەمیێ یا باش، ڕەوشا سروشتی یە ل دەڤ مرۆڤان، لێ

**دەمێ مرۆڤ تووشی نەساخیەکێ بیت، ل وی دەمی ساخلەمیا مرۆڤی ژی ژبەر تێکچوون و ژ دەستدانا هەڤسەنگیا لەشی و ڕۆحی تووشی تێکچوونەکێ دبیت. هەلبەت باشترین ڕێك ژی بۆ ڤەگەڕاندنا ساخلەمیێ بۆ ڕەوشا وێ یا ئاسایی ئەوە مرۆڤ ب شێوەیەکێ ناڤنجی و سادە بژیت. هەروەکو کا چەوا ژ کەڤن دا هاتیە گوتن ڕۆحا ساخلەم یا دناڤ لەشێ ساخلەم دا.**

**ل سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆ، هند بەحسێ زانستێ نوشداریێ ناهێتە کرن هندی بەحسێ ڕەوشت و ڕەفتارین پیشەیێ نوشداریێ دهێتە کرن، ئانکو یا ل سەر نوشداری ئەوە پیشەیێ نوشداریێ ب شێوەیەکێ باش و ل دووڤ چەندین یاسایێن ڕەوشتی ئەنجام بدەن، بۆ نموونە، وی ماف نینە ڕاجێتەکا نوشداری بۆ کەسێن ساخلەم بنڤیسیت، هەردیسان ئەو یێ پێگیرە ب پاراستنا نهێنیا پیشەیێ خوە، ئانکو وی ئەو ماف نینە ڕاپورتێن نەساخێن خوە بۆ کەسێن دی فرێکەت یا نهێنیێن نەساخان بۆ کەسێن دی بەحس بکەت.**

**هەلبەت ئەڤ یاسایە هەموو بۆ هیپۆکراتسی دزڤڕن. ئەوی ڤوتابیێن خوە نەچار دکرن ب ڤی شێوەی سووندێ بخون:**

***"سوزێ ددەم ل دووڤ شیانێن خوە و یاسایێ، ل دووڤ وی سیستەمی یان ڕجێمێ بچم یا بۆ نەساخێن من باش و گونجای بیت. سوزێ ددەم خوە ژ هەموو وان تشتان بپارێزم یێن دبنە ئەگەرێ ئێشاندن یان زیانگەهاندنێ ب وان. سوزێ ددەم ب چ ڕەنگان دەرمانێن ژەهراوی یێن کوژەك یان پێزانینان ل دوور ژەهرێ نەدەمە چ مرۆڤان ئەگەر داخواز ژ من هاتە کرن. هەردیسان سوزێ ددەم چ تشتان نەدەمە ژنێن دووگیان کو ببیتە ئەگەرێ ژبەربرنا زارۆکێ د زکێ وێ دا، سوندێ دخوم ب شێوەیەکێ ڕاست و دروست کارێ خوە ئەنجام بدەم. هەموو ئەو مالێن ئەز ڤەستا وان دکەم، مەرەما من ب تنێ دێ چارەسەرکرنا نەساخان بیت ژ نەخوشیان و ب هەموو ڕەنگان خوە ژ کارێن خراب یان سەردابرنێ دوور بکەم ب تایبەت خوە دوورکرن ژ دەستدرێژیا سیکسی بۆ سەر ژن و زەلامان ڤێجا چ مرۆڤێن ئازاد یان کویلە بن. سوزێ ددەم هەموو ئەو تشێن ل دەمێ کارێ خوە دا یا ژ دەرڤە ئەز ژ نەساخان دبینم یان گوهلێدبم، ژ دەرڤە دناڤ خەلکی بەحس نەکەم، بەلکو وەکو نهێنی ل دەڤ خوە بپارێزم. هندی ئەز ل سەر ڤێ سوزێ بمینم، دێ خوشی و بەختەوەریێ ژ ژیانا خوە وەرگرم و هەموو گاڤان دناڤ***

*خەلکی دا دێ یێ سەربلند بم، لێ ئەگەر من ئەڤ پەیمانە شکاند، ل وی دەمێ دڤێت بەروڤاژی ڤێ چەندێ بهێتە سەرێ من."*

دەمێ سپێدەهیا ڕۆژا شەمبی سوفیا ژ خەو هشیار بووی، یەکسەر خوە ژ سەر تەختی هاڤێتە خوارێ. ئەرێ ئەڤ چەندە خەون بوو یان ژی ژ ڕاستا شەڤا بەری هینگێ وێ فەیلەسۆفەك دیتبوو؟

پاشی وێ دەستێ خوە درێژکرە بن تەختی داکو پشتڕاست بیت کا ئەو نامەیا شەڤا بەری هینگێ بۆ وێ هاتی هێشتا ل جهێ خوە مایە. هێشتا سوفیا یا هزرێن خوە د هەمووان پەیڤان دا دکەت یێن وێ ل سەر باوەریا گریکیان ب قەدەرێ خواندین، ئانکو ڕاستە ئەڤ چەندا وێ دیتی خەون نەبوو. چ پێنەڤێت وێ فەیلەسۆف ب چاڤێن خوە دیتبوو، یا ژ وێ چەندێ گرنگتر ژی ئەو بوو کو وێ ئەو دیتبوو دەمێ نامەیا وێ دگەل خوە بری.

سۆفیا ل سەر چوکێن خوە ڕوونشت و هەموو ئەو کاغەزێن ب ئامیرێ تایپکرنێ هاتینە نڤیسین ژ بن تەختی کێشان، بەلێ پا .... ئەڤە چ ڕەنگێ سۆرە ل بن تەختی دتەیسیت؟ چ، دەستماڵ؟

وێ خوە خشاندە بن تەختی و پاشی هاتە دەرێ و دەستماڵەکا سۆر د دەستان دا بوو، ئەو یا پشتڕاست بوو کو ئەڤ دەستماڵە نە یا وێ یە. دەمێ وێ دەستماڵ ڤەکری، نیشانێن حێبەتیێ ل سەر دێمێ وێ دیاربوون، ب دەستخەتەکێ ڕەش ل سەر لایەکێ وێ ئەڤ ناڤە ل سەر نڤیسابوو "هێلد".

هێلد! ئەرێ ئەڤ هێلدە کیە؟ بۆچی ئەو ب ڤی ڕەنگی دکەڤنە بەرامبەر هەڤدوو؟

# سۆكرات

*...زيرەكترين كەس ئەوە يێ دزانيت كو هێشتا ئەو چ نزانيت...*

سۆفيايێ كراسەكێ هاڤينێ يێ تەنك كرە بەر خوە و بلەز چوو د لێنانگەهێ ڤە كو دايكا وێ ژی ل وێرێ بوو و مژوولی بەرهەڤكرنا تێشتێ بوو، ژبەر هندێ سۆفيايێ برِيار دا بەحسێ دەستمالا حەريری يا رِەنگ سۆر بۆ نەكەت.

سۆفيايێ پرسيار ژ دايكا خوە كر: "ئەرێ تو چوويە خوارێ داكو رِۆژنامەيا خوە يا رِۆژانە بينی؟"

دايكا وێ زڤرِی و گوت: "نەخێر، دێ شێی چی بۆ من ئينی؟"

سۆفيا بلەز چوو ژ دەرڤە و بەرەڤ سندوقا پۆستەی ڤە چوو.

ژ بلی رِۆژنامێ چ نامە تێدا نەبوون. هێشتا دەم نەهاتيە ئەو بەرسڤا نامەيا خوە ژ دەڤ فەيلەسۆفێ نەديار وەربگريت، لێ هندەك رِێزێن ل لاپەرِێ يەكێ يێ رِۆژنامێ ئەو د جهـ دا رِاوەستاند. د رِۆژنامێ دا بابەتەك ل دور هێزا بەتاليونا نەرِويجی يا دگەل هێزێن نەتەوەيێن يەكگرتی ل وەلاتێ لوبنانێ دكر هاتبوو بەلاڤكرن.

بەتاليونا نەرويجی یا نەتەوەیێن یەکگرتی... ئەرێ ما ئەڤە هەمان ئەو تشت نەبوو یێ ل سەر وێ نامەیا ب ناڤێ هێلدێ هاتیە نڤیسان؟ لێ ئەو پولێن ل سەر نامێ یێن نەرویجی بوون، ڕەنگە سەربازێن نەرویجی پۆستەی خوە یێ تایبەت هەبیت.

دەمێ زڤڕیە د لێنانگەهێ ڤە، دایکا وێ ب ترانەڤە گوتێ: "سەیرە، ژ کەنگی وەرە تو ڕۆژنامەیان دخوینی؟"

خوشبەختانە، دایکا وێ بەحسێ سندوقا پۆستەی و نامێن وێ ل سەر تێشتێ و نە ژی ب درێژاهیا وێ ڕۆژێ دگەل ڤەنەکر، دەمێ پشتی هینگێ دایکا وێ چوویە ژ دەرڤە بۆ کڕینا هندەك تشتان، سۆفیایێ نامەیا ل دور ڤەدەرێ برە د کۆلکی ڤە.

دلێ وێ بلەز خوە ڤوتا دەمێ زەرفەکێ سپی یێ بچووك ب ڕەخ سندوقا نامێن مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ ڤە دیتی. ئەو یا پشتڕاست بوو کو وێ ئەو زەرڤ نەدانایە وێرێ.

کوژیێن ڤێ نامێ ژی د تەڕبون و هەمان ئەو شوونوار ل سەر بوون یێن ل سەر نامەیا دوهی هەین. باشە، ئەرێ تو بێژی ئەو فەیلەسۆف هاتبیتە ڤێرێ؟ ئەوی نهێنیا وێ زانیە؟ لێ ئەرێ بۆچی کوژیێن ڤان هەردوو نامەیان د تەڕ بوون؟

هەرچەندە ڤان پرسیاران ئەو حێبەتی کربوو، لێ ئەو زەرڤ ژی ڤەکر و دەست ب خواندنا وێ کر:

خوشتڤیا من سۆفیا

من نامەیا تە ب گرنگی ڤە، لێ د هەمان دەم دا ب دوودلی ڤە، وەرگرت و خواند، ئەز یێ نەچارم نوکە کەسایەتیا خوە دیارنەکەم و یێ بەرهەڤ نەبم بهێم فەهوەیەکێ دگەل تە ڤەخوم، لێ پشتڕاست بە ئەو ڕۆژ دێ هێت یا ئەم هەڤدوو دبینین، لێ ب دیتنا من هێشتا گەلەك زوویە کو ئەز ب خوە بشێم بهێمە "تاخێ کلۆڤەر، چەپا کاپتن".

ژلایەکێ دی ڤە، ژ نوکە وێڤە ئەڤ نەشێم ب دەستێ خوە نامەیان بگەهینمە تە ژبەرکو مەترسیەکا مەزن تێدا هەیە، ژبەر هندێ پەیامبەری من یێ بچووك دێ نامەیان گەهینتە جهێ تە یێ نهێنی ل دوماهیا کۆلکی.

هەر دەمێ تە هەستپێکر تو پێدڤی ب منی، تو دشیێ پەیوەندیێ ب من بکەی، بۆ ڤێ چەندێ، پرتەکا شیریناهیێ یان پسکێتێ بکە دناڤ زەرفێ خوە یێ پیڤازی دا و ل وی دەمی پەیامبەر دێ تێگەهیت و نامێ بۆ من دگەل خوە ئینیت.

تیبینی: نە یا جوانە ئەم داخوازنامەیا کچەکا گەنج ژ بۆ ڤەخوارنا قەهوەیەکێ ڕەتبکەین، لێ هندەك جاران ئەم نەچارین ڤێ چەندێ بکەین

تیبینیەکا دی: ئەگەر تە دەستماڵەکا حەریری یا سۆر دیت، هیڤیدارم باش چاڤێ خوە بدەیێ، چونکی گەلەك جاران ڕوودایە هندەك تشت ب شاشی ڤە ناگەهنە خوەدانێن خوە یێن ڕاستەقینە ب تایبەت ل قوتابخانێ یان جهێن دی یێن وەکهەڤ. هەروەسا ژبیرنەکە نوکە ئەم یێ ل قوتابخانەیا فەلسەفێ.

دگەل ڕێزێن من

ئەلبێرتۆ کنوکس

ڕاستە، دەمێ ژیێ گەهشتیە چواردە سالییێ گەلەك نامە بۆ وێ هاتبوون، نامێن جەژنا ژ دایکبوونا وێ، نامێن جەژنێ و هندەك نامێن دی ل هەلکەفتنێن جودا جودا، لێ ئەڤ نامەیا سەیر، نامەیەکا یەکانە بوو ژ جۆرێ وێ.

چ پول ل سەر وێ نامێ نەبوون و ب ڕێکا پۆستەی ژی بۆ نەهاتبوو فرێکرن، بەلکو ڕاستەخو ل جهێ وێ یێ نهێنی ڤە هاتبوو دانان. تشتەکێ دی یێ سەیر ئەو بوو ئەڤ نامە یا تەڕ بوو، لێ ل ڤی دەمێ سالێ دنیا هاڤین بوو.

لێ یا ژ هەموویێ سەیرتر بابەتێ دەستمالا سۆر بوو، هۆسا دیارە ڤی مامۆستایێ فەلسەفێ قوتابییەکا دی ژی هەیە و وێ قوتابییێ ئەڤ دەستمالا خوە بەرزەکریە، لێ پرسیار ئەوە ئەرێ چەوا ئەڤ دەستماڵە چوویە دبن بەختێ سۆفیاییێ ڤە؟

ئەڤ کەسە، ئەلبێرتۆ کنوکس، ئەڤە چ ناڤەکێ سەیرە؟ هەرچەوا بیت، ڤێ نامێ ئەو چەندە بۆ وێ ڕۆهنکر کو پەیوەندیەك دناڤبەرا هێلد موللەر کناگ و مامۆستایێ فەلسەفێ دا هەیە. لێ تشتێ نەڕۆهن ئەوە کا چەوا بابێ هێلدێ ناڤونیشانێن وان تێکەلکرینە.

سۆفیا ڕوونشت و بۆ ماوەیەکێ درێژ هزرێن خوە دکرن بەلکو بشێت هندەك خالێن هەڤپشك دناڤبەرا خوە و هێلدێ دا دیار بکەت.

ل دوماهیێ وێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا. ڤی زەلامێ نەدیار گوتبوویێ ڕۆژەك دێ هێت وی ببینیت، لێ ئەرێ ڕۆژەك دێ هێت ئەو هێلدێ ژی ببینیت؟ وێ ئەو زەڕف ڤەدا و ل سەر پشتا وێ چەند ڕستە دیتن:

***ئەرێ ژیانەکا سروشتی هەیە؟***

***ژیرەکترین کەس ئەوە یێ دزانیت هێشتا ئەو چ نزانیت.***

***زانینا ناڤخۆیی ژ ناخێ مرۆڤی دزێت.***

***کەسێ ڕاستیێ دزانیت، کار ب ڕاستیێ دکەت.***

سۆفیایێ دزانی مەرەم ژ ڤان ڕستەیێن ل سەر زەرفێ سپی ئەوە وێ هانبدەت کاغەزێن دناڤ زەرفی ژی دا بخوینیت. هزرەك هاتە د سەرێ وێ دا، ئەرێ بۆچی ئەو ل ڤێرێ چاڤەرێی پەیامبەرێ وی یێ بچووك ناکەت مادەم ئەو دێ ڕاستەخو هێتە د کۆلکێ وێ ڤە؟ سۆفیا دێ وی نەچارکەت باخڤیت و ناهێلیت ئەو ژ وێرێ بچیت هەتا گەلەك پێزانینان ل دور وی فەیلەسۆفی بۆ وێ نەبێژیت. د نامێ دا گوتبوو "پەیامبەرێ بچووك"، ئەرێ تو بێژی ئەو زارۆیەك بیت؟

ئەرێ ژیانەکا سروشتی هەیە؟

سۆفیایێ دزانی "شەرم" پەیڤەکا کەڤنە و ڕامانا وێ ئەوە، بۆ نموونە ئەو کاودانێ بەرتەنگە دەمێ مرۆڤ ل پێشچاڤێن خەلکی یێ ڕیس بیت، لێ ئەرێ تشتەکێ سروشتیە مرۆڤ ژ ڕاستان نەخوشیا خوە ژ ڤێ چەندێ ببینیت؟ دەمێ ئەم دبێژین تشتەکێ سروشتیە، کەواتە تشتەکێ هەڤپشکە دناڤبەرا هەموو مرۆڤان دا.

ڕیساتی ل هندەك وەلاتێن جیهانێ تشتەکێ ئاسایی یە، لێ ئەرێ جڤاك بڕیارێ ل سەر هندێ ددەت کو ئەڤ چەندە تشتەکی پەسەندکری یان ڕەتکری بیت؟ ل سەردەمێ داپیرا سۆفیایێ تشتەکێ ب شەرم بوو هەکە ئەو سینگێ خوە ڕیس بکەت داکو هەتاڤ لێبدەت و ئەسمەر ببیت، لێ ئەڤرۆکە ئەڤ چەندە بوویە تشتەکێ ئاسایی... هەردیسان ل دەڤ مە ژی. چونکی هێشتا دناڤ گەلەك جڤاکێن دی دا تشتەکێ قەدەغەکری یە. سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند، ئەرێ پەیوەندیا فەلسەفێ دگەل ڤێ چەندێ چیە؟

پاشی ئەو چوو ڕستەیا دووێ: زیرەکترین کەس ئەوە یێ دزانیت کو هێشتا ئەو چ نزانیت.

باشە ژ کێ زیرەکتر بیت؟ ئەگەر مەرەما فەیلەسۆفی ئەو کەس بیت یێ دزانیت کو ئەو هەموو تشتێ دناڤبەرا ئەرد و ئەسمانان دا نزانیت زیرەکترە ژ وی کەسێ کێم تشتان دزانیت و هۆسا خوە دیار دکەت کو هەموو تشتان دزانیت، بەلێ، ل وی دەمی سۆفیا ژی یا هەڤڕایە دگەل وی.

سۆفیایێ چ جاران بەری نوکە بابەت ب ڤی ڕەنگی هەڵنەسەنگادبوون، لێ نوکە چەند پتر وێ هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا دکر، هێدی هێدی بۆ وێ دیاردبوو دەمێ مرۆڤ

دزانیت کا بەری هینگێ چەند یێ نەزان بوو، ئەو چەندە ژی جۆرەکە ژ زانینێ. لێ تشتێ نەخوش ژی ل دەڤ وێ ئەو کەس بوون یێن هۆسا خوە دیار دکەن کو وان شارەزاییەکا باش د بابەتەکی دا هەیە لێ د ڕاستی دا چ تشت ژ وی بابەتی نەدزانین.

ل دووڤ دا ئەو هاتە سەر بابەتێ "زانینا ڕاستەقینە ژ ناخێ مرۆڤی دزێت". لێ مانە هەر بابەتەکێ بەری مرۆڤ بزانیت، پێدڤیە بەری هینگێ ژ دەرڤە فێرببیت؟ ژلایەکێ دی ڤە، بیرا سۆفیایێ ل وان کاودانان هات دەمێ مامۆستا یان دایکا وێ دڤیای وێ فێری تشتەکی بکەت لێ وێ خوە ڤەدزی و نەدڤیا وی تشتی فێر ببیت چونکی ب ڕاستی ژی ب تنێ ئەو فێری وان تشتان دبوو یێن وێ حەز ل سەر فێربوونا وان هەی. پاشی ژ نیشکەکێ ڤە ئەو فێری تشتەکی بوو، دبیت ئەڤە ئەو تشت بیت یێ دبێژنێ "دووربینی*".

ل دوماهیێ، ئەو ژ ڕاهێنانێن خوە یێن هزرکرنێ ب سەرکەفتیانە دەرچوو، ڕستەیا دوماهیێ یا سەیر ب تەمامی کەنیا وێ ئینا: "ئەو کەسێ ڕاستیێ دزانیت، کار ب ڕاستیێ دکەت."

ئەرێ مەرەما وی ئەوە دەمێ دزیکەرەك بەنکەکێ دشەلینیت، ژبەر هندێ یە کو ئەو چ کارێن ژ ڤی باشتر نزانیت؟ سۆفیایێ باوەری ب ڤێ چەندێ نەبوو! سۆفیا د وێ باوەرێ دا بوو کو زارۆك و کەسێن مەزن ژی دشێن هندەك شاشیێن بێ ڕامان بکەن و پاشی پەشیمان ببن، هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ئەنجامدانا شاشیانە دژی هزروبیران.

سۆفیا ب بێدەنگی یا ڕوونشتی بوو و هزرێن خوە دکرن. ل وی دەمی سەرنجا وێ چوو سەر خشت خشتەکێ کو دناڤ دارێن دارستانێ دا دهات، ئەرێ تو بێژی ئەڤە پەیامبەرێ بچووك بیت؟ هێدی هێدی دلێ وێ بلەزتر خوە قوتا و پتر دترسیا چونکی وێ دزانی ئەو تشتێ نێزیکی وێ دبیت، وەکو گیانەوەرەکی بێهنا خوە دهەلکێشا.

پشتی ماوەیەکێ کورت، سەیەکێ مەزن ژناڤ دارستانێ دەرکەفت و خوە هاڤێتە د کۆلکێ وێ ڤە، هەلبەت زەرفەکێ قەهوائی یێ مەزن ب دەڤێ خوە گرتبوو و ل بەرامبەری سۆفیایێ دانا و چوو. هەموو تشت بلەز ب ڕێڤە چوون و وێ دەم نەبوو بڕەڤیت. سوفیایێ

* دووربینی Insight کو ب زمانێ عەرەبی دبێژنێ "تبصر"، شیانێن خواندن و تێگەهشتنا تشتەکی یان مرۆڤەکی نە ب شێوەیەکێ کوور و تێرو تەسەل.

دەستێن خوە دانانە سەر سەروچاڤێن خوە و کرە گری. دەمێ وێ سەرێ خوە بلند کری، نەزانی کا چەند وەخت بوری بوو.

باشە، هۆسا دیارە ئەڤە پەیامبەر بوو، ژبەر هندێ لێڤێن زەرڤی د تەڕ بوون و شوونوارێن ددانان ل سەر بوون. ئەرێ چەوا وێ بەری نوکە تیبینیا ڤێ چەندێ نەکربوو؟ لێ هەر چنەبیت نوکە ئەو تێگەهشت کا بۆچی ل سەر وێ یا پێدڤیە پارچەیەکا شیریناهیێ یان پسکێتێ بکەتە د نامەیا خوە دا.

ئێدی ل سەر وێ یا پێدڤی بوو ئەو وێ هزرێ ژ سەرێ خوە بینتە دەرێ کو داخوازێ ژ پەیامبەری بکەت کا ئەلبێرتۆ کنوکس ل کیڤە دژیت. سۆفیایێ زەرڤ ڤەکر و دەست ب خواندنێ کر.

## فەلسەفە ل ئەسینایێ

خوشتڤیا من سۆفیا

دەمێ تو نوکە ڤێ نامێ دخوینی، چ پێنەڤێت نوکە تە هێرمس ژی نیاسی یە. ئەگەر هێشتا تە ئەو باش نەنیاسی بیت ئەز دێ بۆ تە بەحسێ وی کەم. ڕاستە ئەو سەیە لێ پا گەلەك یێ خشکوك و گوهدارە، ئەو ژ گەلەك مرۆڤان ژی ب ئاقلترە، هەر چ نەبیت ئەو خوە ب هندێ نائینتە دەرێ کو ئەو پتر ژ وێ چەندێ دزانیت یا ئەو ب دروستاهی دزانیت.

ب ڤێ هەلکەفتێ، تو دێ تیبینیا هندێ کەی کو من ناڤێ وی ژ نیشکەکێ ڤە نەهەلبژارتیە. هێرمس پەیامبەرێ خوداوەندێن گریکیان و خوداوەندێ دەریایان بوو، لێ نوکە دا ئەم ڤێ چەندێ بدەینە ڕەخەکی. هێرمس پەیڤەکا یونانی یە ب ڕامانا "ڤەشارتگەهـ" یان ژی ئەو جهێ مرۆڤ نەشێت بگەهیتێ. ئەڤ چەندە ژی دگەل کاودانێ مە دگونجیت، چونکی ب هاریکاریا هێرمسی ئەم هەردوو دێ ل هەڤدوو د ڤەشارتی بین.

ژلایەکێ دی ڤە، هێرمس سەیەکێ گوهدارە دەمێ مرۆڤ گازی دکەتێ، هەردیسان گەلەك باش یێ هاتیە پەروەردەکرن و نەریتێن هەڕەباش ل دەڤ هەنە.

دا بزڤڕینە بابەتێ خوە یێ فەلسەفێ، مە پشکا یەکێ یا وانەیا خوە ب دوماهی ئینا، مەرەما من فەیلەسۆفێن سروشتی و پشکەك ژ وێنەکرنا ئەفسانەیێ بۆ جیهانێ. نوکە ژی دێ چینە دناڤ بابەتێ هەرسێ گرنگترین فەیلەسۆفێن جیهانا کەڤن: سۆکرات، ئەفلاتۆن و ئەرستۆ کو هەر یەکی ب شێوازێ خوە یێ تایبەت کاریگەریا خوە ل سەر فەلسەفەیا ئەوروپی بجھ هێلایە.

ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنە فەیلەسۆفێن سروشتی، فەیلەسۆفێن بەری سۆکراتیێ. ڕاستە دیمۆکریتس چەندین سالان پشتی سۆکراتی مربوو لێ بۆچوونێن وی هەموو بۆ قۆناغا بەری سۆکراتیێ دزڤڕین.

سۆکرات نەك تنێ وەك هێمایەك یان ناڤبڕەکێ دەمی دناڤبەرا ڤان هەردوو سەردەمان دا دهێتە هەژمارتن، بەلکو وی گوهۆڕینەکا جهی ژی پەیداکربوو. سۆکرات یەکەم فەیلەسۆفێ گریکی بوو یێ ل باژێرێ ئەسینا هاتیە سەر دنیایێ و ل وێرێ ژیای و فەلسەفەیا خوە پراکتیزەکری. ڤوتابیێن وی یێن پشتی هینگێ ژی وەکو وی بوون و ل باژێرێ ئەسینا هاتبوونە سەر دنیایێ و لێ ژیابوون. دبیت ل بیرا تە بیت کو ئاناکزاگورس بۆ ماوەیەکی ل باژێری ژیابوو لێ پشتی هینگێ ژ باژێری هاتبوو دوورئێخستن دەمێ گوتی هەتاڤ نە خوداوەندە بەلکو تەپەیەکا ئاگری یە "بێهنا خوە فرەهـ بکە دا بزانی کا دێ چ هێتە سەرێ سۆکراتی ژی ژبەر بیروبۆچوونێن وی".

ل سەردەمێ سۆکراتی، ژیانا ڕەوشەنبیری ل باژێرێ ئەسینا پێشکەفتنەکا باش ب خوە ڤە دیت، لێ دڤێت گوهۆڕینەکا بنەڕەت د سروشتێ پرۆژەیێ فەلسەفێ دا بهێتە تومارکرن کو سۆکراتی ژ سەردەمێ بەری خوە جودا بکەت.

بەری بەحسێ سۆکراتی بکەین، یا پێدڤیە ئەم بەحسێ سۆفیستییان* Sophists بکەین کو وێنەیەکێ ڕەوشەنبیری یێ دیار یێ باژێرێ ئەسینایێ ل بەری سەردەمێ سۆکراتی خویا دکر.

---

* الفلاسفه السفسگائیین

## مرۆڤ بنگەهێ هەموو تشتانە

پشتی سالا 450ێ بەری زاینی، ئەسینا ببوو پایتەختێ ڕەوشەنبیری یێ جیهانا گریکی، ب ڤی ڕەنگی فەلسەفێ ئاڕاستەیەکێ نوو وەرگرت. فەیلەسۆفێن سروشتی هندەك زانا بوون گرنگی ددا شرۆڤەکرنا فیزیایی بۆ دیاردەیێن جیهانێ، ژبەر ڤێ ساخلەتێ، وان جهەکێ گرنگ د دیرۆکا زانستی دا تومارکر، لێ ل باژێرێ ئەسینایێ، ڤەکۆلینا سروشتی هاتە گوهۆڕین بۆ ڤەکۆلینا مرۆڤی و جهێ وی دناڤ جڤاکی دا، ئانکو ئێدی فەیلەسۆفان گرنگی ددا مرۆڤی نەك دیاردەیێن سروشتی.

هێدی هێدی، جۆرەکێ دیموکراتییێ ڕۆناهی دیت و دناڤ جڤاکی دا بەربەلاڤبوو. یەك ژ بنەماییێن پێدڤی بۆ بەرقەراربوونا دیموکراتییێ ژی ئەو بوو کو پێدڤیە خەلك یێ ڕەوشەنبیر بیت داکو بشێت بەشداریێ د پرۆژەیێ دیموکراتییێ دا بکەت. ل سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆکە ئەم دبینین کو چەوا دیموکراتی پێدڤی ب جۆرەکێ پەروەردەیا گەلی هەیە. ل دەڤ خەلکێ ئەسینایێ ژی، ڕەوانبێژی د هونەرێ گەنگەشەکرنێ دا یەك ژ بنەماییێن هەرە سەرەکی بوو.

د دەمەکێ کێم دا، باژێرێ ئەسینایێ پڕبوو ژ وان مامۆستاییێن فەلسەفی یێن ژ مێتانگەهێن گریکی ل دەڤەرێن دی دزڤڕین، ڤان مامۆستایان ناسناڤێ "سۆفیستی" دانا سەر خوە. مەرەم ژ زاراڤێ سۆفیستی، ئانکو زەلامێ ڕەوشەنبیر و خوەدان شیان. هەردیسان د ماوەیەکێ بلەز دا، فێربوون و خواندنا هاولاتییێن ئەسینی بۆ ژێدەرێ پەیداکرنا پارێ ژیانێ بۆ سۆفیستیان.

هەڤبەندەکێ هەڤپشك دناڤبەرا سۆفیستی و فەیلەسۆفێن سروشتی دا هەبوو: ئەو ژی ڕەخنەگرتن بوو ل میتولوژیایێ. لێ د هەمان دەم دا، سۆفیستیان شێوازێ هزکرنا وان ڕەتدکر.

ل دووڤ بۆچوونا وان، ئەگەر خو بەرسڤەك بۆ پرسیارێن فەلسەفی هەبیت ژی، مرۆڤ چ جاران نەشێت بگەهیتە باوەریا تەمام، ب تایبەت بۆ وان تشتێن پەیوەندی ب سروشت و گەردوونی ڤە هەی. د فەلسەفێ دا، دبێژنە ڤێ دیتنێ "گومانبرن-Skepticism".

لێ ئەگەر د شیانێن مەدا نەبیت نهێنییێن سروشتی شرۆڤە بکەین، هەر چ نەبیت ئەم دزانین کو ل سەر مە مرۆڤان یا پێدڤیە فێری هندێ ببین کا چەوا دێ دگەل هەڤدوو ژین، ژبەرهندێ سۆفیستیان گرنگیەکا مەزن ب مرۆڤی و جهێ وی دناڤ جڤاکی دا ددا.

"مرۆڤ پیڤەرێ هەمووو تشتانە". ئەڤ چەندە گوتنا فەیلەسۆفێ سۆفیستی، پرۆتاگۆراسی (487-420ێ بەری زاینی) بوو. مەرەما وی ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو کو ڕاستی و شاشی، باشی و خرابی، پێدڤیە هەمووو ل دووڤ پێدڤیێن مرۆڤان بهێنە دەستنیشانکرن.

دەمێ پرسیار ژێ کری کا ئەرێ وی باوەری ب خوداوەندێن گریکیان هەبوو، ب تنێ ئەڤ چەندە گوت: "ئەو بابەتەکێ گەلەك هوور و درێژە، ژیانا مرۆڤی ژی یا کورتە." ئەو کەسێ نەشێت بۆچوونا خوە ب شێوەیەکێ ڕۆهن و دیار ل دور هەبوون یان نەبوونا خوداوەندان دیار بکەت، دبێژنێ "لانەگر-Agnostic" یا ژی "بێلایەن" و ل دووڤ ڕێبازا "بێلایەنیێ" دچت.

سۆفیستیان حەز ل سەر گەڕیان و گەشتان بۆ وەلاتێن جیهانێ هەبوو، زێدەباری هەڤبەکرنا شێوازێن جودا جودا یێن حکومەتێن وەلاتان، ژبەر هندێ وان تیبینیا هژمارەکا هەڕە مەزن جوداهییان دناڤبەرا نەریت و تیتال و یاساییێن باژێران دا دکر.

ل ڤێرێ گەنگەشەیا وان ل دور وی تشتێ سروشت دەستنیشان دکەت دەستپێکر، زێدەباری وی تشتێ جڤاك دەستنیشان دکەت. ل سەر بنەمایێ ڤێ چەندێ، وان هژمارەکا ڕێساییێن ڕەخنەیا جڤاکی د دیموکراتیا ئەسینایێ دا دانان.

ب ڤێ ڕێکێ ئەو دشیان وێ دەربڕینێ پتر ڕۆهن بکەن یا دبێژیت "شەرما سروشتی، هەمووو گاڤان دگەل کەتواری ناگونجیت، ئانکو ئەگەر تشتەکێ سروشتی بایە کو مرۆڤ یێ شەرمین بیت، ڕامانا وێ شەرم تشتەکێ زکماکی یە. ئەرێ ژ ڕاستا شەرم تشتەکێ زکماکی یە یا ژی ژ ئەنجامێ کاریگەریا جڤاکی ل سەر مرۆڤی پەیدادبیت؟ بەرسڤ گەلەك یا ب سانەهیە، بۆ هەر کەسەکێ کێم گەشت ژی کربن، نە یا سروشتی یان زکماکی یە مرۆڤ ژ خوە ڕیسکرنێ بترسیت، هەردیسان شەرمکرن یان نەبوونا شەرمێ ژی ب تنێ هندەك تێگەهن پەیوەندی ب نەریت و تیتالێن جڤاکی ڤە هەیە نەك زێدەتر.

هەروەکو تو دبینی، سۆفیستیان گەنگەشەیەکا مەزن دناڤ جڤاکێ ئەسینایێ دا ئازراند، ئەو ژی ب ڕەتکرنا وان بۆ هەبوونا هندەك پیڤەران ب ڕامانا وان یا دروست ب تایبەت ئەو پیڤەرێن پەیوەندی ب باشی و خڕابیێ ڤە هەی. د هەمان دەم دا، بەروڤاژی وان، سۆکراتی پێکۆل دکر دووپات بکەت کو هندەك پیڤەر د ڕەها و گونجاینە بۆ جڤاکی.

## سۆکرات کی بوو؟

گومان تێدا نینە کو سۆکرات (470-399ێ بەری زاینی) پڕ نهێترین کەسایەتی یە د دیرۆکا فەلسەفێ دا. هەرچەندە وی دێرەکا ب تنێ ژی نەنڤیسایە لێ دگەل هندێ یەکە ژ وان کەسێن پترین کاریگەری ل سەر هزرا ئەوروپی کری، هەلبەت ئەڤ چەندە بۆ مرنا وی یا تراژیدی ڤەدگەریت.

ئەم دزانین ئەو ل باژێرێ ئەسینایێ هاتبوو سەر دنیایێ و پتریا دەمێ خوە دگەل وی خەلکی دبوراند یێ ل سەر جادە و کولانان یان ل گۆڕەپانێن بازاڕی ددیتن، وی بەردەوام ئەڤ ئاخفتنە دووبارە دکر: "داروبارێن ل چیای نەشێن من فێری چ تشتان بکەن". هەردیسان وی شیانێن هندێ هەبوون بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران ل سەر یەك بچیتە دناڤ هزرکرنەکا کوور دا.

د ژیانا خوە دا، وەکو کەسەکێ پڕی نهێنی و نەدیار دهاتە نیاسین، پشتی مرنا وی ژی، وەك دامەزرێنەری چەندین قوتابخانەیێن فەلسەفی یێن جودا جودا دهاتە ل قەلەمدان، چونکی نهێنی و نەدیاریا وی ببوو ئەگەر چەندین ئاڕاستەیێن فەلسەفی یێن جۆراوجۆر پەیدابین و گرنگیێ ب بۆچوونێن وی بدەن.

پتریا ئەو تشتێن ئەم ل دور ژیانا وی دزانین، ب ڕێکا قوتابیێ وی ئەفلاتۆنی بۆ مە ماینە کو ئەو ب خوە ژی پشتی هینگێ ببوو یەك ژ فەیلەسۆفێن هەرە مەزن و ناڤدار ب تایبەت پشتی چەندین دیالوگ "دانوستاندنێن فەلسەفی" نڤیساین و تێدا سۆکرات وەك ئاخفتنکەرەك بکاردئینا.

لێ دەمێ ئەفلاتۆن ئاخفتنەکێ ل سەر زارێ سۆکراتی ڤەدگێڕیت، مە چ ڕێك نینن پشتڕاست بکەین کا ئەرێ ژ ڕاستا وی ئەڤ چەندە گوتیە یان نە چونکی گەلەك یا ب زەحمەتە ئەم بشێین جوداهیێ بێخینە دناڤبەرا وانەیێن سۆکراتی و ئاخفتنێن ئەفلاتۆنی ب خو دا. هەلبەت ئەڤ ئاریشە هەموو وان دەمان پەیدادبیت دەمێ مە چ دەستخەتێن نڤیسای یێن کەسایەتیەکێ دیرۆکی ل بەردەست نەبن.

ئەڤ چەندە گەلەك جاران ڕوودەت پتر ژ وێ چەندێ یا تو هزر دکەی، ناڤدارترین نموونە ل سەر ڤێ چەندێ ژی حەزرەتێ مەسیحی یە، ئەرێ چەوا ئەم دێ شێین خوە پشتڕاست کەین کو "مەسیحێ دیرۆکی" ئەو ئاخفتن گوتینە یێن مەتا یان لوقا ڤەدگێڕیت؟ نوکە ئەم یێ ل هەمبەر دوخەکێ هەڤشێوە ل بەرامبەری "سۆکراتێ دیرۆکی".

ڕەنگە نیاسینا سۆکراتی، کو ڕاستی ژی هۆسایە، نە هند جهێ گرنگیپێدانێ بیت، چونکی ئاخفتنێن ئەفلاتۆنی یێن ل سەرێ زارێ سۆکراتی بوون یێن بووینە ئەگەر نێزیکی 2500 سالان هزرمەندێن جیهانا ڕۆژئاڤای پێڤە مژوول ببن نەك سۆکرات ب خوە بوو.

## هونەرێ دانوستاندنێ

بنیاتێ سروشتی یێ هونەرێ سۆکراتی د هندێ دابوو کو وی پێکۆل نەدکر خەلکی فێر بکەت، بەروڤاژی، وی هۆسا خوە دیاردکر کو وی دڤێت ژ کەسێ بەرامبەری خوە فێر ببیت. هەردیسان ل شوونا مامۆستایەکێ کلاسیکی وانەیان بێژیت، وی گەنگەشە و دانوستاندن دگەل خەلکی دکرن.

چ پێنەڤێت ئەگەر وی ب تنێ گوهێ خوە دابایە دانوستاندێن خەلکی، قەت نەدبوو فەیلەسۆفەکێ ناڤدار، ڕەنگە فەرمانا سێدارەدانێ بۆ نەدهاتە دان.

د ڕاستی دا، ل دەستپێکێ ئەو دا پرسیارەکێ کەت و پاشی هۆسا خوە دیاردکر کو چ نزانیت. ل دووڤ دا د ماوەیێ دانوستاندنا خوە دا وەل کەسێ بەرامبەر دکر ئەو ب خوە خالێن لاواز یێن هزرکرنا خوە دیار بکەت و ل دوماهیێ ژی ئەو د گوشەیەکێ دا دووڕپێچ دکر و نەچار دکر جوداهیێ بێخیتە دناڤبەرا شاشی و ڕاستیان دا.

دبێژن دایکا سۆکراتی داپیرك بوو، وی ژی ژ لایێ خوە فەلسەفەیا خوە دگەل هونەرێ ژ دایکبوونێ ل دەڤ ژنان هەڤبەر دکر. داپیرك ئەو کەسە نەبوو یا زارۆکەك دئینایە سەر دنیایێ بەلکو وێ پتر هاریکاری پێشکێش دکر داکو بونەوەرەکێ زیندی بینیتە د ژیانێ دا، ب ڤی ڕەنگی، کارێ سۆکراتی ژی ئەو بوو هاریکاریا ئەقلێ خەلکی بکەت هزرێن دروست بینیتە د هەبوونێ دا. ئانکو، زانینا ڕاستەقینە ئەوە یا دناڤ ناخێ مە ب خوە دا دەردکەڤیت بێ کو کەسەك ڤێ زانینێ پاڤێژتە بەر مە یان بکەتە د سەرێ مە دا.

ل ڤێرێ ئەز دێ ل سەر خالەکێ ڕاوەستم: ژ دایکبوونا زارۆیەکی تشتەکێ ئاسایی یە، هەردیسان د شیانێن هەموو کەسان دایە بگەهنە ڕاستییێن فەلسەفی ئەگەر هات و ئەقلێن خوە بکارئینان. ژبەر هندێ دەمێ مرۆڤەك دەست ب هزرکرنێ دکەت، ئێدی ئەو ب خوە دێ ناخێ خوە کۆلیت و بەرسڤێن خوە بدەستڤەئینیت.

ڕەفتارا سۆکراتی دگەل خەلکی دەمێ هۆسا خوە نیشان ددای کو ئەو چ تشتان نزانیت دبوو ئەگەر خەلك هزرا خوە بکەت. وی دزانی کا چەوا دێ ب ڕۆلێ کەسەکێ نەزان ڕابیت یان ژی هەر چ نەبیت هۆسا خوە دیار دکر کو ژ کەسێ بەرامبەر بێ ئاقلترە، دبێژنە ڤێ چەندێ "پێتڕانکیا سۆکراتی-Socratic irony". ب ڤی ڕەنگی ئەو دشیا هەموو گاڤان تبلا خوە درێژ کەتە خالێن لاواز یێن هزرکرنێ ل دەڤ خەلکێ ئەسینایێ.

پتریا جاران ئەڤ دیمەنە ل نیڤا بازاڕی و ل پێشچاڤێن خەلکی ڕوودda، ئانکو دەمێ سۆکرات ل بازاڕی هاتبایە دیتن، خەلکی دزانی ئەو دێ خوە کەتە لێبوك و پێتڕانك د نیڤا بازاڕی دا.

ژبەر ڤێ چەندێ یا سەیر نینە ئەگەر گەلەك کەس وی وەکو کەسەکێ بێزارکەر ل قەلەم بدەن، ب تایبەت ئەو کەسێن خوەدان دەستهەلات دناڤ جڤاکی دا.

وی بەردەوام دگوت: "ئەسینا وەکو هەسپەکێ تەمبەلە و ئەز ژی وەکو وێ پێشیێ مە یا پێکۆلێ دکەت ڤی هەسپی هشیار بکەت و بهێلیتە ساخ."

(باشە تو بێژی خەلك چ ل وێ پێشیا مەزن بکەن یا پێکۆلێ دکەت ب وان ڤەدەت؟ ئەرێ تو دشێی بەرسڤا من بدەی سۆفیا؟)

## دەنگەکێ خودای

مەرەما سۆکراتی ژ پێڤەدانێ ئەو نەبوو زیانێ بگەهینتە خەلکێ خوە، بەلکو وی ئاماژە ب هندێ دکر کو تشتەك د ناخێ وی دا وی پالدەدەت ڤێ چەندێ بکەت، وی بۆ خەلکی دووپات دکر کو وی گوهـ ل "دەنگەکێ خودای" هەیە د ناخێ خوە دا.

سۆکرات ڕازی نەدبوو بەشداریێ د ڕێوڕەسمێن سێدارەدانا خەلکی ژ لایێ دەستهەلاتداران ڤە بکەت، هەردیسان یێ ڕازی نەبوو ناڤێن کەسێن بەرهەنگارێن سیاسی و ئوپۆزسیون ئاشکەرا بکەت. ژبەر هندێ ئەڤ چەندە ل دوماهیێ بوونە ئەگەرێ تێبرنا وی.

ل سالا 399ێ بەری زاینی ب هندێ هاتە گونەهبارکرن کو خوداوەندەکێ نوو ئینایە دناڤ ئەسینایێ دا، ل دووڤ دا ژی ب تاوانا سەردابرنا تەخا گەنجان هاتە گونەهبارکرن و ل دادگەهەکا پێکهاتی ژ 500 ئەندامان هاتە دادگەهکرن.

د شیانێن وی دا هەبوو داخوازا دلوڤانیێ بکەت، یان ژی هەر چ نەبیت دشیا خوە ژ حوکمێ سێدارەدانی قورتال بکەت ئەو ژی هەکە ڕازیبایە ئەسینایێ بجهـ بهێلیت، لێ هەکە وی ئەڤ چەندە کربایە، ئەو نەدبوو سۆکراتێ ئەڤرۆکە.

ل دەڤ سۆکراتی، وژدانا وی و ڕاستی ژ هەموو تشتان گرنگتر بوون، ژبەر هندێ وی ئەڤ چەندە دانابوونە بەری ژیانا خوە. هەرچەندە کارکرنا وی هەموو ژ پێخەمەت چاکسازی و خزمەتکرنا جڤاکی بوو، لێ دگەل هندێ ژی حوکمێ سێدارەدانێ ل سەر هاتە سەپاندن. پشتی هینگێ ب دەمەکێ کێم، ب ئامادەبوونا نێزیکترین هەڤالێن خوە، وی گلاسەکا ژەهرێ ڤەخوار و کەفت و مر.

بۆچی سۆفیا؟ بۆچی ل سەر سۆکراتی یا پێدڤی بوو بمریت؟ ژ 2400 سالان هەتا نوکە بەردەوام ئەڤ پرسیارە دهێتە کرن؟ لێ سۆکرات کەسێ یەکانە نەبوو د دیرۆکێ دا دژی هندەك بیروباوەرێن کلاسیکی ڕاوەستیای و ژیانا خوە گوری ڤێ چەندێ کری. بۆ نموونە ل ڤێرێ حەزرەتێ مەسیح ژی دهێتە بیرا مە کو ئەو ب هەمان شێوە دژی بیروباوەرێن وی سەردەمی ڕاوەستیابوو.

چەندین خالێن هەڤپشك دناڤبەرا حەزرەتێ مەسیح و سۆکراتی دا هەنە، ل ڤێرێ دێ بیرا تە ل هندەك ژ وان خالان ئینم:

خەلکێ ل سەردەمێن وان هەردووکان هزردکر ئەو کەسێن پڕی نهێنی و نەدیارن، هەردووکان ژی چ شینوار یان دەستخەتێن نڤیسیای ل سەر پەیامێن خوە ل پاش خوە نەهێلاینە، ژبەر هندێ ئەم نەچارین پشت بەستنێ بکەینە سەر وان وێنە و پێزانینان یێن قوتابیێن وان ل دور ژیانا وان بۆ مە ڤەدگێڕان.

ئەم دزانین کو هەردوو د هونەرێ دانوستاندنێ دا د بسپور و شارەزابوون و هەردووکان ژی ب باوەری خوەبوونەکا زێدە دئاخفت کو ئەڤ چەندەژی دبوو ئەگەر کەسێن بەرامبەری وان بکەڤنە ژێر کاریگەریا ئاخفتنێن وان، یان ژی ژێ دلگران بن و دژی وان براوەستن. یا ژ هەموویێ ژی گرنگتر، وان هەردووکان هەستپێدکر وان پەیامەکا گەلەك مەزنتر ژ ڤەبارێ خوە هەلگرتیە و پێدڤیە بگەهینە خەلکی.

وان هەردووکان هەڤرکیا سیستەمێ دەستهەلاتێ دکر و ڕەخنە ل زۆلم و نەبوونا دادپەڕوەریێ و خراب بکارئینانا دەستهەلاتێ دگرت، بێ کو ئەم بچینە د درێژاهیا بابەتی دا، هەردووکان ژیانا خوە گوری ڤێ پەیاما خوە کر و بوونە قوربان.

هەردیسان دادگەهکرنا هەر یەك ژ مەسیح و سۆکراتی تا ڕادەیەکی یا وەکهەڤ و کاریگەر بوو، هەر یەك ژ وان دشیا داخوازا لێبورینێ بکەت و ژیانا خوە قورتال بکەت، لێ وان دزانی کو ئەو یێن هاتینە ڕاسپاردن بۆ گەهاندنا پەیامەکێ، ژبەر هندێ ئەگەر ئەو هەتا دوماهیێ ڤێ پەیامێ نەگەهینن دێ هەست ب خیانەتێ کەن. هەردیسان، چەوانیا ڕوو ب ڕوو بوونا وان بۆ مرنێ ب شێوەیەکێ ئارام و پایەبلندی، بۆ ئەگەر پشتی مرنا وان ژی ب هزاران کەس باوەریێ پێ بینن و ل دووڤ ڕێبازا وان بچن.

دەمێ ئەز بەحسێ ڤان وەکهڤیان دکەم، مەرەما من ئەو نینە کو ئەو د وەکهەڤ بوون، بەلکو مەرەما من ئەوە کو هەر یەك ژ وان پەیامەك هەلگرتبوو کو یا گرێدای بوو ب چاڤنەترسا وان یا کەسایەتی ڤە.

## كارتا جوكەر ل ئەسينايێ

ئاخ، سۆكرات، هێشتا ئەم يێ بەحسێ تە دكەين، سۆفيا مە بەرى نوكە بەحسێ رێبازا سۆكراتى كر، لێ تو دزانى كا پرۆژەيێ وى يێ فەلسەفى يێ چەوا بوو؟

سۆكرات د هەمان وێ قۆناغێ دا ژيايە يا سۆفيستى تێدا دژيان، هەروەكو وان، وى ژى گرنگى ب مرۆڤان و ژيانا خەلكى ددا پتر ژ وان بابەتێن فەيلەسۆفێن سروشتى گرنگى پێ دداى. پشتى وى ب چەند چەرخەكان، فەيلەسۆفەكێ دى يێ گريكى ب ناڤێ "شيشرون"ى گوت: "سۆكراتى فەلسەفە ژ ئەسمانى ئينا سەر ئەردى و هێلا ئەڤ فەلسەفە دناڤ باژێران دا بژيت و بچيتە د مالێن خەلكى ڤە و وان نەچار بكەت هزرا خوە د ژيان و دابونەريت و باشى و خرابيێ دا بكەن".

لێ د خالەكاسەرەكى دا، سۆكرات ژ سۆفيستيان دهێتە جوداكرن. وى خوە وەك كەسەكێ سۆفيستى نەددا دياركرن، ئانكو زەلامەكێ رەوشەنبير و زانا، ژبەر هندێ، بەروڤاژى سۆفيستيان، وى چ پارە بەرامبەر زانين و فێركرنا خەلكى وەرنەدگرتن. وى ب چ رەنگان خوە وەك فەيلەسۆف نەددا نياسين ل دووڤ تێگەهێ ڤێ پەيڤێ. (فيلو-سوف Philo-Sophe) ئانكو "ئەو كەسێ ل دووڤ گەهشتنا راستيێ دگەرييێت".

ئەرێ سۆفيا تو يا روونشتى و گوهێ تە ل منە؟ گەلەك يا گرنگە بۆ وانەيێن داهاتى تو باش تێبگەهى كو جوداهيەكا مەزن هەيە دناڤبەرا سۆفيستى و فەيلەسۆفان دا. سۆفيستيان پارە بەرامبەر دانوستاندن و وانەيێن خوە وەردگرت، هەلبەت ئەڤ جۆرە كەسە ل هەموو جهـ و سەردەمان هەنە. ل ڤێرێ من دڤێت ب دروستاهى بۆ تە وێ چەندێ دەستنيشان بكەم كو ئەڤ جۆرە مامۆستايە يان ئەو كەسێن وانەبێژ، ب تنێ ب وى تشتى ڤە دگرێدانە يێ ئەو دزانن، يان ژى خوە هۆسا ديار دكەن كو هەموو تشتان دزانن لێ د راستى دا ئەو چ تشتان ب دروستاهى نزانن. چ پێنەڤێت نوكە تە گەلەك سۆفيستى د ژيانا خوە دا ديتينە.

سۆفيا، فەيلەسۆفێ راستەقينە كەسەكێ دى يە، كەسەكێ تەمام بەروڤاژى. فەيلەسۆف هەموو گاڤان هۆسا خوە نيشان ددەت كو ئەو گەلەك كێم تشتان دزانيت، ژبەر هندێ ژى ئەو ب بەردەوامى پێكۆلێ دكەت بگەهيتە راستيێ. سۆكرات ژى يەك بوو ژ ڤان

کەسێن بژارە. ئانکو وی هۆسا خوە دیاردکر کو چ تشتان دەربارەی ژیان و جیهانێ نزانیت، یا ژ وێ ژی گرنگتر ئەو ژبەر ڤێ نەزانینێ دهاتە ئازاردان.

باشە، فەیلەسۆف ئەو کەسە یێ دانپێدانێ ب هندێ دکەت کو کێم تشتان دزانیت و نەخوشیان سەرا ڤێ چەندێ دخوت. هەلبەت ب ڤی ڕەنگی ئەو یێ بەلگەیەکی ل دوور زیرەکیا خوە پێشکێش دکەت کو ئەو کەسێن خوە دیار دکەن هەموو تشتان دزانن نەشێن چ بەلگەیێن هۆسا پێشکێش بکەن. ئەرێ ما من نەگوتە تە زیرەکترین کەس ئەوە یێ دانپێدانێ ب هندێ دکەت کو چ نزانیت.

سۆکراتی دووپاتی ل سەر هندێ دکر کو ئەو چ نزانیت ژ بلی تشتەکێ ب تنێ، ئەو ژی: "ئەو چ نزانیت". ڤێ ڕێسایێ باش ژبەر بکە. هەتا ل دەڤ فەیلەسۆفان ب خوە ژی ئەڤ دانپێدانە گەلەك یا کێمە. هەلبەت ئەڤ دانپێدانە هند یا ب مەترسیە، دوور نینە ببیتە ئەگەرێ ژناڤچوونا وی کەسی. ئەو کەسێن بەردەوام پرسیار و مژاران دئازرینن، ئەو ژ هەموو کەسان مەترسیدارترن. بەرسڤادانا پرسیاران چ مەترسی تێدا نینە، لێ ڕەنگە پرسیارەکا ب تنێ مژارەکێ هۆسا بئازرینیت کو هزاران بەرسڤ نەشێن وێ چەندێ بکەن.

ئەرێ تە گوهـ ل چیرۆکا وی شاهی بوویە دەمێ دەستەکێ نوو یێ جلکان کریە بەر خوە؟ هەرچەندە د ڕاستی دا ئەو یێ ڕیس بوو لێ خوە یەك ژ شیرەتکار و زێرەڤانێن وی نەدوێریان ڤێ چەندێ بێژنە وی. ژ نیشکەکێ ڤە، زارۆکەکی کرە هەوار و گوت: "شاهـ یێ ڕیسە". سۆفیا، سۆکرات ژی وەکو ڤی زارۆکێ چاڤنەترس بوو، ب دەنگەکێ بلند دکرە هەوار دگوت ئەم مرۆڤ تا چ ڕادە د بێئاگەهین و زانینا مە بۆ تشتێن دەوروبەری مە گەلەك یا کێمە. بەری نوکە ژی مە دیارکربوو کو گەلەك خالێن هەڤپشك دناڤبەرا زارۆك و فەیلەسۆفان دا هەنە.

مرۆڤ ڕوو ب ڕووی گەلەك پرسیاران دبیت یێن کو چ بەرسڤێن تەمام و ڕازیکەر نەی، پاشی ل ڤێرێ ب تنێ دوو هەلبژارتن ل بەر سینگێ مە هەنە: یان دڤێت وەکو هەموو خەلکێ دی خوە بخاپینین و هۆسا خوە دیاربکەین کو ئەم ژی هەموو تشتان دزانین، یان ژی دڤێت بەرێ خوە ژ مژارێن مەزن وەرگێڕین و ب یەکجاری خوە ژ هیڤیێن پێشکەفتنێ بدەینە پاش.

ب ڤی ڕەنگی، مرۆڤ ل سەر دوو جۆران دهێنە پارڤەکرن: جۆرێ هەڕە بەربەلاڤ ئەون یێن خوە هۆسا ددەنە دیارکرن کو هەموو تشتان دزانن، جۆرێ دووێ ئەون یێن چ تشت بۆ وان نەیێ گرنگ، (ئەڤ هەردوو جۆرە دبن فەروووییێ کێڤریشکێ ڤە دهێن و دچن، بیرا تە دهێت؟".

ئەڤ بابەتە وەکو دابەشکرنا کارتێن یارییێ یە دەمێ ل سەر دوو یاریکەران دابەش دکەی، کارتێن سۆر و کارتێن ڕەش، لێ جار جارە ژی کارتا جوکەرێ دهێتە دناڤ یارییێ دا، ئانکو کارتەکا بێ بەروپشتە، نە یا چوارگوشەیە و نەژی گول نەفەلە و نەژی تیرەکێ بچووکە. سۆکرات ژی وەکو یەك ژ ڤان کارتێن جوکەر بوو ل ئەسینایێ. نە وی هۆسا خو دیاردکر کو هەموو تشتان دزانیت و نەژی ژ وان کەسان بوو یێن د بێئاگەهـ و چ تشت بۆ وان نە د گرنگ. ب ڤی ڕەنگی ئەو بوو فەیلەسۆف، ئانکو کەسەکێ بەردەوام بوو ل سەر گرنگیپێدانێ، کەسەك بوو بەردەوام پێکۆل دکرن دا بگەهیتە زانینا ڕاستەقینە.

ڤەدگێڕن و دبێژن جارەکێ زەلامەکی پرسیار ژ فالڤەکەرێن دێلفی کر، زیرەکترین زەلام ل ئەسینایێ کیە؟ فالڤەکەران بەرسڤ دا و گوت: "سۆکراتە." لێ سۆکرات ژ ڤێ بەرسڤێ دمینتە حێبەتی چونکی هزردکر ئەڤ چەندە نوکتەیەك بوو. پاشی ئەو زەلام دچیتە بازاڕی و ل کەسەکێ هۆسا دگەڕێیت کو ب بۆچوونا خوە و یا خەلکێ دی دا زیرەکترین کەس بیت، لێ دەمێ ئەو کەسەکێ هۆسا دبینیت و دزانیت کو ئەو کەس ژی نەشێت بەرسڤا پرسیارێن سۆکراتی بدەت، ژ نوو دزانیت کو بەرسڤا فالڤەکەرێ یا دروست بوو.

بۆ وی گەلەك یا گرنگ بوو ڕێسایەکا ب هێز بۆ زانینا مە دیار بکەت. ب بۆچوونا وی، ئەڤ ڕێسایە دکەڤیتە د ئەقلێ مرۆڤی دا. باوەریا وی ب ڤێ چەندێ ئەو کرە فەیلەسۆفەکێ ڕاشیونالیزمی*.

---

* الفلاسفه العقلانیون

**دیتنا تشتان ب شێوەیەکێ دروست، بەرێ مە ددەتە کرنا کارێن دروست**

بەری نوکە مە دیارکر کو سۆکراتی دگوتە خەلکی، وی گوهـ ل دەنگەکێ خودای هەیە د ناخێ خوە دا. ڤی دەنگێ خودای دگوتە وی کا چ تشت یێ ڕاست و دروستە. ئەو کەسێ ڕاستیێ بزانیت دێ کارێن ڕاست کەت. وی بەردەوام ئەڤ چەندە دووبارە دکر و دگوت کو دەمێ مرۆڤ تشتان ب شێوەیەکێ دروست ببینیت، دێ کارێن دروست کەت.

ژبەر هندێ ئەو کەسێ کارێن دروست بکەت دێ بیتە مرۆڤەکێ دروست و سەرکەفتی. لێ دەمێ ئەم ب شێوەیەکێ خراب ڕەفتارێ دکەین یان کارەکێ نەدروست ئەنجام ددەین، ڕامانا وێ ئەوە ئەم یێ ل سەر شاشیێ، لەوڕا پێدڤیە پتر خوە ماندی بکەین و زانینا خوە زێدە بکەین.

سۆکراتی دووپاتی ل سەر هندێ دکر کو دڤێت هەموو تشتێن ڕاست و شاش ب شێوەیەکێ ڕۆهن و ئاشکەرا بهێنە دەستنیشانکرن. بەروڤاژی سۆفیستیان، ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو شیانێن ژێکجوداکرنا باشی و خرابیێ دکەڤنە دناڤ ئەقلێ مرۆڤی دا نەك دناڤ جڤاکی دا.

سۆفیا، دبیت بۆ تە یا ب زەحمەت بیت تو ب سانەهی بشێی د ڤان هەموو تشتان بگەهی، ژبەر هندێ ئەز دێ دەست ب پێکۆلەکا نوو کەم. ب دیتنا سۆکراتی، تشتەکێ مەحالە مرۆڤ یێ بەختەوەر بیت ئەگەر هات و بەروڤاژی بۆچوونێن وی ڕەفتار کر، ئەو کەسێ بزانیت ژی کا دێ ب چ ڕێك یێ بەختەوەر بیت، دێ هەموو کاران کەت داکو بگەهیتە ڤێ بەختەوەریێ، هەر ژبەر هندێ ئەو کەسێ بزانیت ڕاستی چیە دێ کارێن ڕاست ئەنجام دەت. پا ل ڤێرێ ئەو کیژ مرۆڤە حەز دکەت یێ ئێخسیر و بێ شەنس بیت؟

باشە بۆچوونا تە دەربارەی ڤێ چەندێ چیە؟ ئەرێ تو دێ یا بەختەوەر بی ئەگەر ئەو کارێن تو ئەنجام ددەی تو بزانی د ناخێ خوە دا تو یا شاشی؟ گەلەك کەس هەنە دەمێ خوە ب درەو و دزی و فەسادی و بەلاڤکرنا گوتگوکان ڤە دبورینن، ئەرێ تو دبێژی ئەو د ناخێ خوە دا نەزانن کو ئەڤ چەندا ئەو دکەن کارەکێ خرابە، ئەرێ تو باوەر دکەی ئەو ب ڤی ڕەنگی د بەختەوەر بن؟ سۆکراتی باوەر نەدکر ئەو د بەختەوەر بن.

دەمێ سۆفیا ژ خواندنا وێ نامێ ب دوماهی هاتی یاکو بەحسێ سۆکراتی دکری، د سندوقا نامەیان دا ڤەشارت و ژ کۆلکێ خوە دەرکەفت. وێ دڤیا بچیتە مال بەری دایکا وێ ژ بازاڕی بزڤڕیتە مال و پرسیارێ ژێ بکەت کا ل کیڤە بوو، زێدەباری هندێ وێ سوز دابوو دایکا خوە ئامانان ژ پێش وێ ڤە بشوت.

هێشتا وێ حەنەفی نەڤەکری، دایکا وێ ب ژوورکەفت و دوو کیسکێن مەزن یێن کەلوپەلان دگەل خوە ئینابوون و دانانە سەر مێزێ و گوت: "سۆفیا تە خێرە، هۆسا دیارە تو نە یا ب سەلامەتی. سوفیا بێ کو بزانیت کا بۆچی دایکا وێ ئەڤ پرسیارە ژێ کر، یەکسەر گوت: "ژبەر سۆکراتی یە."

- "سۆکرات!"

سۆفیا کوور چووبوو د هزران دا، بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "بەداخەوە، ئەو نەچار بوو ژیانا خوە گوری ڤێ چەندێ بکەت."

- "گوهێ خوە بدە من سۆفیا، ئەز نزانم تو هزرا چ دکەی؟"

- "هزرا سۆکراتی، ئەو کەسێ ب تنێ یەك تشت دزانی، ئەو ژی ئەو بوو کو ئەو چ نزانیت، لێ دگەل هندێ ژی ئەو زیرەکترین زەلام بوو ل ئەسینایێ."

دایکا وێ بێدەنگ بوو و ما گوهشی، پاشی دووبارە پرسیار ژێ کر.

- "باشە ل قوتابخانێ هەوە فێری ڤان تشتان دکەن؟"

سۆفیایێ ب هێز سەرێ خوە هەژاند.

- "ئووف، نەخێر، نە ل قوتابخانێ. ئەز فێری چ تشتێن گرنگ ل قوتابخانێ نابم. ما تو نابینی جوداهیا مەزن دناڤبەرا ماموستایێ قوتابخانێ و ماموستایێ فەلسەفێ د هندێ دایە کو ماموستایێ قوتابخانێ هەموو گاڤان هۆسا خوە نیشان ددەت کو گەلەك تشتان دزانیت و ب خورتی ڤان تشتان نیشا قوتابیێن خوە ددەت، لێ ماموستایێ فەلسەفێ پێکۆلێ دکەت ل بەرسڤا وان پرسیاران بگەڕیێت یێن وی و قوتابیێن خوە پێکڤە ئازراندین.

- "ئاها، باشە تە دڤێت جارەکا دی بۆ من بەحسێ چیرۆکا کێڤریشکا سپی بکەی. تو دزانی؟ من دڤێت تو ب زووترین دەم هەڤنیاسینا من دگەل وی هەڤالێ خوە بکەی، چونکی هۆسا دیارە وی کەسایەتیەکا سەیر هەیە."

سۆفیا بۆ چەند ساتەکان ژ شووشتنا ئامان ڕاوەستیا و پاشی ل دایکا خوە زڤڕی و فرچەیەك د دەستان دا بوو و گوت: "ئەو نەیێ سەیرە، ئەو وەکو وێ پێشیا گڤگڤوکە یا پێکۆلێ دکەت خەلکی هشیار بکەت داکو ژ بێئاگەهیا خوە یا هزری بدەرکەڤن."

- "باشە، ئەڤ چەندە تشتەکێ باشە، لێ ئەو چەوا خوە دبینیت؟"
- سۆفیایێ سەرێ خوە چەماند و بەردەوامی دا شووشتنا ئامانان.
- "ئەو نە زانا و نە دادخوازە، بەلکو ب تنێ وی دڤێت بگەهیتە زانینا ڕاستەقینە. ئەڤەیە جوداهیا دناڤبەرا کارتا جوکەر و گشت کارتێن دی یێن یاریێ."
- "تە گوت جوکەر."
- سۆفیایێ ب بەلێ سەرێ خوە هەژاند و پاشی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.
- " باشە بۆچی مە پرسیار ژ خوە نەکریە کا بۆچی ئەڤ هژمارا مەزن یا چوارگوشە و تیرکوڤان و دل و نەفەل د کارتێن یاریا پەڕکانێ دا هەنە، لێ جوکەرەکێ ب تنێ هەیە؟"
- "باشە و دێ بەحسێ چ دی کەی؟"
- "و پا تو ژی، ما دێ هەر پرسیاران کەی؟"

دایکا وێ هەموو ئەو تشتێن کڕین ژ کیسکان ئینانە دەرێ و دانانە جهێن وان، پاشی ڕۆژنامەیا خوە هەلگرت و چوو د هۆلا ڕوونشتنێ ڤە. سۆفیایێ هەستپێکر دایکا وێ ب هێز دەرگەهـ ل پشت خوە گرت.

دەمێ ئەو ژی ژ شووشتنا ئامان ب دوماهی هاتی، چوو د ژوورا خوە ڤە. دەستێ خوە هاڤێتە وێ دەستمالا سۆر یا بەری هینگێ دانایە ب ڕەخ یاریا لیگۆیێ ڤە ل سەر قومسورا جلکان، پاشی چەند جارەکان سەحکرێ و پشکنی.

هێلد...

# ئەسینا

*...هژمارەکا ئاڤاهیێن بلند ژ جهەکێ کاڤل دەرکەفتن...*

ل ئێڤاریا وێ رۆژێ، دایکا سۆفیایێ چوو سەرەدانا هەڤالەکا خوە. هێشتا دایکا وێ ژ مال دوورنەکەفتی، سۆفیا بلەز چوو دناڤ باخچەی دا و پاشی بەرەڤ کۆلکێ خوە چوو. وێ پاکیتەکا مەزن و نخافتی ب رەخ سندوقا نامێن خوە ڤە دیت. پشتی سۆفیایێ کاغەزا وێ ل سەر راکری و ڤەکری، کاسێتەکا ڤیدویێ تێدا دیت.

کاسێتەکا ڤیدیویێ! وێ بلەز کرە غار و هاتە ژوور ڤە، لێ ئەرێ وی فەیلەسۆفی چەوا زانی وان ئامیرەکێ ڤیدیویێ هەیە؟ تو بێژی چ ل سەر ڤێ کاسێتا ڤیدویێ هاتیە تومارکرن؟

سوفیایێ کاسێت کرە بەر ئامیرێ ڤیدویێ. دیمەنێ باژێرەکێ مەزن ل سەر شاشەیا تێلەڤزیونێ دیاربوو. سۆفیا یەکسەر تێگەهشت کو ئەڤە باژێرێ ئەسینایێ یە، چونکی زووما کامیرێ چوو ل سەر دیمەنێ "ئەکرۆپۆل*"ێ کو بەری هینگێ ژی سوفیایێ گەلەك جاران ئەڤ دیمەنە د تێلەڤزیونێ دا دیتبوو.

---

*ئەکرۆپۆل Acropolis: کەلهەکا کەڤنە دکەڤیتە سەر گرەکی ل هنداڤ باژێرێ ئەسینایێ ل یونانێ و ژ هژمارەکا ئاڤاهیێن کەڤن پێکدهێت کو یێ ژ هەموویان ناڤدار دبێژنێ "پارتینۆن Parthenon.

ئەو وێنە یێن زیندی و ڕاستەخو بوون. هژمارەکا مەزن یا گەشتیاران دناڤ شوونوارێن پەرستگەهێن کەڤن ب جلکێن خوە یێن هاڤینێ و کامیرێن خوە یێن وێنەکرنێ سەرەدانا وێرێ کربوون، لێ هۆسا دیارە کەسەکێ ژ ناڤ وان لافیتەك بلند کربوو. بەلێ لافیتەك؟ ل سەر ڤێ لافیتێ ژی ناڤێ "هێلد"ێ نڤیسابوو!

پشتی دوو سێ خولەکان، وێنەیێ زەلامەکێ د ژیێ چل سالیێ دا دەرکەفت کو پیچەك یێ بەژن کورت بوو و ڕیهێن وی ژی د ڕەش و ڕێکخستی بوون و کولاڤەکێ شین ل سەری بوو. پاشی بەرێ خوە یەکسەر دا کامیرێ و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "تو بخێرهاتی بۆ ئەسینایێ، سۆفیا. چ پێنەڤێت نوکە تە دزانی ئەز ئەلبێرتۆ کنوکسێ خوەدانێ نامێ مە. ئەگەر هێشتا تو یا پشتڕاست نینی، دێ دووبارە بێژم کو کێڤریشکا سپی یا مەزن بەردەوام یا د کولاڤێ گەردوونی یێ ڤالاْ دا دهێتە دەرێ. نوکە ئەم یێ ب ڕەخ ئەکرۆپۆلێ ڤە ڕاوەستیاین. ڕامانا ڤێ پەیڤێ ژی ئانکو "کەلها باژێری" یان ژی "باژێرێ ل سەر بلنداهییان". هەر ژ سەردەمێ تەباشیری و هەتا نوکە مرۆڤ ل ڤی جهی ژیاینە، چ پێنەڤێت ژبەر جهێ وێ یێ ب خێر و بەرەکەت بوو. ئەڤ بلنداهیە بوویە ئەگەر بەرەڤانیکرن ژ باژێری یا ب سانەهی بیت، زێدەباری هندێ کو دکەڤیتە هەمبەر دیمەنەکێ جوان و بالکێش یێ یەك ژ جوانترین بەندەرێن دەریا سپی.

هێدی هێدی باژێرێ ئەسینایێ ل بنارێ چیای گەشەکر و مەزن بوو و ئەکرۆپۆل ژی وەکو کەلهـ و پەرستگەهەك دهاتە بکارئینان. ل ڤێ دەڤەرێ، ل نیڤا دووێ ژ چەرخێ پێنجێ بەری زاینی، شەڕەکێ دژوار دگەل فارسان هاتە کرن. ل سالا 480ێ بەری زاینی ژی، شاهێ فارسان، زێرکیسی باژێرێ ئەسینایێ داگیرکر و هەموو ئاڤاهیێن داری یێن ئەکرۆپۆلێ سووتن، لێ پشتی هینگێ ب سالەکێ فارس شکەستن و ژ باژێری دەرکەفتن. پشتی هینگێ سەردەمێ زێڕین یێ ئەسینایێ دەستپێکر و دووبارە ئەکرۆپۆل ب شێوەیەکێ جوانتر و بالکێشتر ئاڤاکر. ل وی دەمی و پشتی هینگێ ئەڤ ئەکرۆپۆلە ب تنێ وەکو پەرستگەهـ دهاتە بکارئینان.

د ڤێ قۆناغێ دا، سۆکرات دناڤ جادە و کولانێن ئەسینایێ دا دگەڕیا و دانوستاندن دگەل خەلکێ وێ دکر، د هەمان دەم دا ئاگەهـ ژ دووبارە ئاڤاکرنا ئەکرۆپۆل و ئاڤاهیێن

دەوروبەری وێ هەبوو. ئەرێ ئەڤە کیژ جهە؟ ئەڤ ئاڤاهیێ ل پشت من تو دبینی، مەزنترین پەرستگەهە و دبێژنێ "پارتینۆن" یان ژی "وارگەهێ کچێ" و وەك رێزگرتن بۆ خوداوەندا ئەسینایێ هاتیە ئاڤاکرن.

ئەڤ پەرستگەهە ئاڤاهیەکێ گەلەك مەزنە و هەموو ب بەرێن مەرمەرێ هاتیە ئاڤاکرن و چ هێلێن راست و تیژ تێدا نینن بەلکو هەر چوار لایێن وێ پیچەکێ د گرۆڤرن. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ژبەر هندێ یە داکو ب شێوەیەکێ جوانتر خویا بکەت و دیمەنەکێ ئەندازەی یێ بالکێش بدەتە ڤێ پەرستگەهێ.

هەرچەندە ئاڤاهیەکێ مەزنە ژی، لێ هۆسا دیارناکەت کو یێ گران بیت، ژبەرکو ئەندازەیا وی فێلەکا خاپاندنێ تێدا هەیە. ستوونێن وێ پیچەکێ بەرەڤ ژناڤدا خوار دبن و دشێن هەرەمەکا ب بلنداهیا 500 مەتری پێکبینن ئەگەر هات و ل سەر پەیکەری د خالەکێ دا گەهشتنە یەك. تشتێ یەکانە یێ دناڤ ڤی ئاڤاهیێ مەزن دا، پەیکەرێ خوداوەندێن ئەسینایێ بوو کو درێژاهیا وی دوازدە مەتر بوون. ئەو مەرمەرێ سپی ب چەندین رەنگێن جودا جودا هاتیە بویاغکرن، بەری هینگێ ژ وی چیای ئینابوونە دەرێ یێ نیزیکی شازدە کیلومەتران ژ باژێرێ ئەسینایێ دوور."

سۆفیا پۆسیدە بوو و روونشت، ئەرێ ژ راستا ئەڤە مامۆستایێ وێ یێ فەلسەفێ یە ئەوێ ل سەر کاسێتا ڤیدیویێ دگەل وێ دئاخڤیت؟ بەری نوکە ب تنێ جارەکێ د تارێیاتیێ دا وەکو سیبەرەکێ دیتبوو. دبیت ئەو هەر ئەڤ زەلامە بیت یێ نوکە دناڤ ئەکرۆپۆلێ دا بەحسێ باژێرێ ئەسینایێ بۆ دکەت.

پشتی دەمەکی، ئەو زەلام ب رەخ دیوارێن پەرستگەهێ ڤە دچوو و کامیرەڤان ژی بەردەوام ب دووڤ وی ڤە بوو. ل دوماهیێ ژی بەرەڤ لایێ چیایی چوو و ب تبلا خوە ئاماژە کرە دیمەنێ ل هەمبەری وی. کامیرەیێ ژی زووما خوە نێزیکی پەیکەرەکێ کەڤن ل بەر ئەکرۆپۆلێ کر.

- "ئەڤە سەکویێ کەڤن یێ شانۆیا "دیونیسیوس"یە و دهێتە هەژمارتن کەڤنترین شانۆیا ئەورۆپا. ل سەردەمێ سۆکراتی گەلەك شانۆگەریێن تراژیدی یێن مەزن هاتبوونە پێشکێشکرن وەك شانۆگەریا ئەخیلیوس سوفوکلیس و یوربیدیوسی. بەری نوکە ژی من بۆ

تە بەحسێ دەردەسەرییێن شاهێ بەلنگاز ئودیپوسی کربوو. لێ شانۆگەرییێن دی یێن کەیفوخوشییێ ژی ل ڤی جهی دهاتنە پێشکێشکرن.

ناڤدارترین نڤیسەرێ کومێدی دگوتنێ "ئەڕیستۆفانس" ل ڤی باژێری دژیا و شانۆگەریەك نڤیسابوو کو تێدا پەسنا زەلامەکێ ئەسینی یێ غەریب دکر کو ئەو ژی سۆکرات بوو.

تو دبینی، ل دوماهیا ڤێ شانۆیێ دیوارەکێ بەری هەیە کو ئەکتەر ل دەڤ دڕاوەستیان. دگوتنە وی جهی "سکین-Skene" کو پەیڤا "سین" یا بەربەلاڤ د زمانێن لاتینی دا ژ وێ هاتیە وەرگرتن کو ب ڕامانا "دیمەن" دهێت. پەیڤا "شانۆ" پەیڤەکا گریکی یا کەڤنە یە ب ڕامانا "تەماشە بکە" دهێت. نوکە دێ زڤڕینە بابەتێ فەلسەفێ و دێ بەحسێ پارتینۆنێ کەین و چینە دناڤ دا."

پاشی ئەو زەلام ل دور پارتیۆنێ زڤڕی و ل لایێ خوە یێ ڕاستێ ئاماژە کرە چەندین پەرستگەهێن دی یێن بچووك و گرنگیا وان کێمتر. ل دووڤ دا ل سەر دەرەجکان چوو خوارێ و دناڤ چەندین ستوونێن بلند ڕا دەرباز بوو.

دەمێ گەهشتیە بنێ ئەکرۆپۆلێ، ل سەر گرکەکێ بچووك ڕوونشت و دەستێ خوە درێژ کرە ئەسینایێ و گوت: "دبێژنە ڤی گرکێ بچووك "ئاریوپاگ". ل ڤی جهی، دادگەها بلند ل ئەسینایێ حوکم ل سەر تاوانباران دسەپاند. پشتی هینگێ ب چەند چەرخان قەشە "پۆلس"ی ل هەمان جهـ بانگەوازا ئاینێ مەسیحیەتێ دکر و گوتنێن حەزرەتێ عیسای بۆ خەلکی ڤەدگێڕان "ل بەشێن بهێت ئەم دێ بەحسێ ڤێ چەندێ کەین". ل خوارێ و ل لایێ چەپێ، بەرمایکێن کەڤن یێن بازاڕێ ئەسینایێ هەنە لێ ژ بلی پەرستگەها مەزن یا خوداوەند "هیفایستوس"ی و چەند کەڤالێن مەرمەڕی، چ تشتێ دی لێ نەمایە. نوکە دا زێدەتر بچینە خوارێ."

پشتی دەمەکێ کێم، دووبارە ئەو زەلام دناڤ بەرمایکێن باژێری یێن کەڤن دا دەرکەفتە ڤە. پەرستگەها مەزن یا ئەسینایێ ل پشت وی بوو. ئەو فەیلەسۆف ل سەر بەرەکی یێ ڕوونشتی بوو و بەرێ وی ل کامیرێ بوو و گوت: "نوکە ئەم یێ ل بەرامبەری گۆڕەپانا بازاڕی یا کەڤن، ڕاستە نوکە جهەکێ ڤالایە و چ تشت لێ نینە، لێ ل سەردەمەکی

ئەڤ جهە ژ هەر چوار لایان ڤە یێ پڕبوو ژ پەیکەر و ئاڤاهیێن مەزن و دادگەهـ و چەندین ئاڤاهیێن دی یێن گشتی وەك كوگەهـ و هۆلەكا موزیكێ، هەتا هۆلەكا یاریا جمناستیكێ ژی لێ هەبوو. ئەڤ ئاڤاهیە هەموو ب شێوەیەكێ ئەندازەیی یێ چوارگوشە ل دورماندوری ڤێ گۆڕەپانێ هاتبوونە ئاڤاكرن.

ئەڤ جهێ كاڤل، لاندكا شارستانیا ئەورۆپا هەموویێ بوویە و گەلەك پەیڤێن بەربەلاڤ مینا سیاسەت، دیموكراتی، ئابوری، دیرۆك، زیندەوەرزانی، فیزیا، بیركاری، لوژیك، لاهوت، فەلسەفە، دەروونزانی، ڕێباز، پلان، بیرۆكە... هتد ژ گەلەكێ بچووك گەهشتینە مە كو ژیانا خوە ل دەوروبەری ڤێ گۆڕەپانێ دبوراند.

سۆكراتی گەلەك جاران سەرەدانا ڤی جهی دكر و دانوستاندن دگەل وی خەلكی دكر یێ ل ڤێرێ ددیتین. دبیت جارەكێ وی بەندەك "عەبدەك" دیت بیت دەمێ گوزكەكێ زەیتێ ل سەر ملی و د ڤێرێ ڕا بوری و سۆكراتی ژی ڕاوەستاند بیت و پرسیارەكا فەلسەفی ژێ كربیت، چونكی ب دیتنا سۆكراتی ژی ڤی بەندەی ژی شیانێن هزركرنێ هەنە هەروەكو كا چەوا زەلامەكێ ئازاد و بلیمەت ئەو شیان هەنە. هەر ل ڤی جهی، دبیت ژی وی ب تێروتەسەلی گەنگەشە دگەل هاولاتیەكێ بازێری كر بیت یان ژی ب دەنگەكێ نزم دگەل قوتابیێ خوە ئەفلاتۆنی ئاخفت بیت.

دبیت یا سەیر بیت ئەم نوكە هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا بكەین ب تایبەت دەمێ بەحسێ فەلسەفەیا "سۆكراتیەتیێ" یان " ئەفلاتۆنیەتیێ" بكەین، لێ دا هەستەكا گەلەك جودا بیت ئەگەر ئەم ب خوە سۆكرات یان ئەفلاتۆن باینە."

چ پێنەڤێت بۆ سۆفیایێ ژی تشتەكێ سەیر بوو، لێ ب هەمان ڕەنگ بۆ وێ یا سەیرە كو فەیلەسۆفەك ب ڕێكا كاسێتەكا ڤیدیویێ دگەل وێ باخڤیت. پاشی ئەو فەیلەسۆف ل سەر وی بەرێ مەڕمەڕی ڕابووڤە و ب دەنگەكێ نزم گوتە سۆفیایێ:

- "سۆفیا، پێدڤیە ئەز ل ڤێرێ بڕاوەستم. من دڤیا ئەكرۆپۆل و گۆڕەپانا ئەسینایێ یا كەڤن نیشا تە بدەم، ئەز نەیێ پشتڕاستم كا تو باش تێگەهشتی ئەڤ جهە ل سەردەمێ خوە چەند یێ مەزن بوو. ژبەر هندێ من دڤێت ئەز تشتەكێ دی ژ بلی ئاخفتنێ نیشا تە

بدەم. من باوەری ب تە هەیە و ئەز دزانم دێ ئەڤ چەندە وەکو نهێنیەکی بیت دناڤبەرا مە دا. نوکە ئەز ڤێ بیرۆکێ نیشا تە دەم..."

زەلام بێدەنگ بوو و بۆ ماوەیەکێ درێژ تەماشەی چاڤکێ کامیرێ کر. پاشی وێنەیەکێ دی هاتە سەر شاشەیا تێلەڤزیونێ. ل وی جهێ کاڤل، چەند ئاڤاهیێن بلند دەرکەفتن خو دا بێژی سێرەبەندەکی ئەو ئاڤاهیێن کەڤن هەمموو نوو کرن. هێشتا پەرستگەها ئەکرۆپۆل ژی ل جهێ خوە بوو، لێ وێ ژی وەکو هەمموو ئاڤاهیێن دورماندوری خوە ب شێوەیەکێ نوو و سەردەم خویا کر کو ب زێڕی هاتبوو نخافتن و ڕەنگێن وێ یێن گەش دتەیسین. دناڤ وێ گۆڕەپانا چوارگوشە دا، زەلامێن گریکی ب جلکێن ڕەنگاوڕەنگ دهاتن و چوون و هندەکان ڕمەك د دەستان دا بوون و هندەکێن دی ژی گوزك ل سەر سەرێ وان بوون. کەسەکی ژی نامەیەکا پۆستەی ل بن ملێ وی بوو.

سۆفیایێ یەکسەر مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ نیاسی، چونکی هێشتا کولاڤێ وی یێ شین ل سەری بوو لێ وی ژی وەکو خەلکێ دی جلکەکێ گریکی یێ ڕەنگ زەر کربوو بەر خوە و تەماشەی سۆفیایێ کر و پتر خوە نێزیکی کامیرێ کر و گوت: "باشە، نوکە ئەم یێ ل باژێرێ ئەسینایێ یێ کەڤن. خوزی نوکە تو ژی ل ڤێرێ بایە، تو تێدگەهی؟ نوکە ئەم یێ ل سالا 402ێ بەری زاینی، ئانکو سێ سالان بەری مرنا سۆکراتی. هیڤیا من ئەوە تو مفای ژ ڤێ سەرەدانا دەگمەن وەربگری چونکی ب کرێگرتنا کامیرەکا ڤیدیویێ ل ڤی دەمی نە کارەکێ ب سانەهی بوو."

سۆفیایێ هەست ب گێژبوونێ کر، چەوا ئەڤ زەلامە شیا بچیتە باژێرێ سەردەمێ بەری 2400 سالان؟ چەوا ئەو دێ شێت تەماشەی گرتەیەکا ڤیدیویێ یا ڤی سەردەمێ کەڤن بکەت؟ وێ باش دزانی کو ل وی سەردەمی کامیرە و ڤیدیو نەبوون، باشە پا تو بێژی ئەڤە فلمەك بیت؟ لێ هەمموو ئاڤاهیێن مەڕمەڕی د ڕاستەڤینەنە! ئەرێ تو بێژی وان دووبارە باژێر و ئەکرۆپۆل ئاڤاکربنەڤە ب تنێ دا فلمەکی لێ تومار بکەن، لێ وەکو وێ دزانی دیکورێن ئاڤاهیان ژی هەمموو یێن هەڕفتین؟ ئەرێ وان ئەڤ چەندە هەمموو کریە داکو ئەسینایا ڕاستەڤینە نیشا وێ بدەن؟

زەلامێ کولاڤ ل سەر دووبارە تەماشەی وێ کر و گوت: "ئەرێ تو هەردوو زەلامێن ل بن ستوونا هە دبینی ئەوێن دانوستاندنێ دکەن؟

ل بن وێ ستوونێ، زەلامەکێ دانعەمر و قەلەو لێ بوو و جلکەکێ توگا* یێ بێ سەروبەر ل بەر بوو و ڕیهێن وی ژی د درێژ و بێ سەروبەر بوون و دفنا وی ژی یا مەزن و پەحن بوو و چاڤێن وی ژی د شین و گەش بوون و ئەرزنکەکا درێژ هەبوو. گەنجەکێ کەشخە ژی ب ڕەخ ڤە یێ ڕاوەستیای بوو.

- "ئەوێ هە سۆکرات و قوتابییێ وی ئەفلاتۆنە، نوکە تو تێگەهشتی، سۆفیا؟ بێهنا خوە فرەهـ بکە، دێ نوکە وان بۆ تە دەمە نیاسین؟"

مامۆستاییێ وێ بەرەڤ وان هەردوو زەلامێن ڕاوەستیای چوو و دەمێ نێزیکی وان بووی، کولاڤێ خوە ژ سەرێ خوە کر و خوە بۆ وان چەماند و ب هندەك پەیڤێن گریکی دگەل وان ئاخفت، لێ سۆفیا د ڕامانا وان ئاخفتنان نەگەهشت. پاشی ل پشت خوە زڤڕی و تەماشەی کامیرێ کر و گوت: "من گوتە وان تو کچەکی کو دڤێت هەڤنیاسینێ دگەل وان بکەی. ئەفلاتۆنی دڤێت هندەك پرسیاران ژ تە بکەت داکو هزرێن خوە تێدا بکەی. لێ دڤێت ئەم بلەز ڤێ چەندێ بکەین بەری زێرەڤان مە دەستەسەر بکەن."

دلێ سوفیایێ بلەز خوە قوتا دەمێ ئەو کەس هاتیە پێش و سەحکریە کامیرێ.

- "تو بخێرهاتی بۆ باژێرێ ئەسینایێ. سۆفیا."

وی ئەڤ چەندە ب دەنگەکێ نزم گوت. پاشی وی دەست ب ئاخفتنێ دکر، لێ دناڤبەرا هەر پەیڤەکێ بۆ یەکا دی دا، وی پیچەکێ خوە دهێلا.

- "ناڤێ من ئەفلاتۆنە، نوکە دێ چوار ئەرکان دەمە تە."

- یەکەم: پێدڤیە تو پرسیار بکەی کا چەوا هوستاییێ شیریناهیان دشێت پێنجی کێکێن وەکهەڤ دروست بکەت.
- پاشی دێ پرسیار کەی کا بۆچی هەموو هەسپ وەکو یەکن؟

---

* تاگو Tago جۆرەکێ تایبەت یێ جلکێن خەلکێ ئاسایی "ژبلی بەندەیان" یێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی بوون ل بەری نێزیکی 2000 سالان کو ژ عەبایەکێ درێژ و سپی پێکدهات و ل دور بەژنا خوە دئالآند.

- پشتی هینگێ ل بەرسڤا هندێ بگەرە کا ئەرێ مرۆڤی ڕۆحەکا نەمر هەیە؟
- ل دوماهیێ ژی پرسیار بکە کا ئەرێ ژن و زەلام ژ لایێ ئەقلی ڤە د وەکهەڤن.

داخوازا بەختەکێ باش بۆ تە دخوازم.

پشتی چرکەیەکێ، شاشەیا تێلەڤزیونێ ڕەش بوو، سۆفیایێ چەند جارەکان کاسێت دووبارە کر لێ چ تشتێ نوو ل سەر دیارنەبوو. سۆفیایێ پێکۆل دکر خوە ئارام بکەت و هزرێن خوە کوم بکەت، لێ بەری هزرا خوە د پرسیارەکێ دا کربایە هەر زوو هزرا وێ دچوو سەر پرسیارا ل دووڤ دا.

ئەو ماوەیەك بوو ژ هندێ پشتڕاست بووی کو مامۆستاییێ وێ یێ فەلسەفێ، مامۆستایەکێ تایبەت و جودایە، لێ بابەت بگەهیتە هندێ شێوازەکێ فێرکرنێ یێ هۆسا بکاربینیت کو دژی یاسایێن سروشتی بیت، بەلێ ئەڤ چەندە ب دیتنا سۆفیایێ لادانەکا مەزن بوو.

ئەرێ ڕاستە ئەڤ هەردوو زەلامێن وێ د تێلەڤزیونێ دا دیتین سۆکرات و ئەفلاتۆن بوون؟ چ پێ نەڤێت بەرسڤ نەخێرە. لێ ئەو یا پشتڕاست بوو ئەڤ چەندا وێ دیتی نە فلم کارتون بوو. سۆفیایێ کاسێتا ڤیدویێ ئینا دەرێ و چوو د ژوورا خوە ڤە ب ڕەخ یاریا لیگۆیێ یا دناڤ قومسورێ دا ڤەشارت. پاشی چوو سەر تەختێ خوە درێژ کر و هەر زوو خەوێ چاڤێن وێ گرتن. پشتی چەند دەمژمێران، دایکا وێ هاتە د ژوور ڤە و سەرێ وێ هەژاند و گوت:

- "تە خێرە سۆفیا؟"
- "ئووف..."
- "تو ب جلك ڤە نڤستیە؟"

ب خورتی چاڤەکێ خوە ڤەکر و ب نمنمەکێ گوت:

- "ئەز چووبوومە باژێرێ ئەسینایێ..."

سۆفیا نەشیا چ پەیڤێن دی بێژیت، یەکسەر بەرێ خوە وەرگێڕا و دووبارە نڤست.

# ئەفلاتۆن

*...خەریبی ژ بۆ دیتنا وارگەهێ ڕاستەقینە یێ ڕۆحێ...*

ل ڕۆژا پاشتر سپێدێ زوو، دەمێ سۆفیا ژ خەو هشیاربووی نیشانێن ترسێ ل سەر دێمێ وێ دیاربوون. تەماشەی دەمژمێرێ کر لێ هێشتا نەببوو پێنجی سپێدێ. خەوا وێ ژی نەدهات، ژبەر هندێ نەچاربوو ژ ناڤ جهێن خوە یێن نڤستنێ دەرکەڤیت. ئەرێ بۆچی وێ کراسێ خوە نەئێخستیە؟ ژ نوو هاتە بیرا وێ،

هەر زوو خوە ژ سەر تەختی هاڤێت و چوو سەر کوسیکێ و تەماشەی سەر بانێ قومسورێ کر. هێشتا کاسێتا ڤیدیویێ ل جهێ خوە بوو. ئانکو ئەڤ تشتێ وێ دیتی خەون نەبوو، یان ژی هەر چ نەبیت هەموو تشت خەون نەبوون.

لێ وێ ژ ڕاستا سۆکرات و ئەفلاتۆن نەدیتبوون. ئاه، چ نینە! وێ تاقەت نەبوو هزرا خوە د چ تشتان دا بکەت.. دبیت دایکا وێ یا مافدار بیت دەمێ گوتییێ ڤان ڕۆژان تو د ڕەوشەکا سەلامەت دا نینی و نە یا ب سەلامەتی.

هەرچەوا بیت، ئەو نەشیا جارەکا دی بچیتە سەر تەختی و بنڤیت. ئەرێ بۆچی ئەو ناچیتە دناڤ کۆلکێ خوە دا، ما بەلکو سەیێ پەیامبەر نامەیەك بۆ وێ ژ دەڤ فەیلەسۆفی ئینابیت؟ سۆفیا ل سەر تبلێن خوە یێن پیان و ب بێدەنگی ژ دەرەجکان هاتە خوارێ و پێلاڤا خوە یا وەرزشی کرە پێن خوە و ژ مال دەرکەفت.

دناڤ باخچەی دا، هەموو تشت د ئارام و بێدەنگ بوون، ب تنێ چووچك نەبن كو دەنگێ ئاوازێن وان ل سەر وان جهان بلند دبوو و كەنیا سۆفیایێ دئینا. خوناڤا سپێدەهیا یا ل سەر گیای ژی وەكو دندكێن كریستالی دتەیسین. ژ نیشكەكێ ڤە وێ جارەكا دی تیبینیا هندێ كر كا هەتا چ ڕادە جیهانێ حنێرەكا ڕادەبەر ئافراندیە.

هێشتا ئەردێ باخچەی و ناڤ كۆلكی پیچەكێ یێ تەڕ بوو. هەردیسان چ نامە ژی ژدەڤ فەیلەسۆفی بۆ وێ نەهاتبوون. سۆفیایێ قورمەكێ دارێ پاقژ كر و ل سەر ڕوونشت. پاشی بیرا سۆفیایێ هاتەڤە كو ل دوماهیا گرتەیا ڤیدیوییێ دا، ئەفلاتۆنی ئەركەك دابوویێ داكو هزرێن خوە تێدا بكەت: ئەرێ چەوا هوستایێ شیریناهیان دشێت پێنجی كێكێن وەكهەڤ دروست بكەت؟

سۆفیایێ بۆ ماوەیەكێ درێژ هزرێن خوە كرن، لێ بۆ وێ دیاربوو بەرسڤا ڤێ پرسیارێ نە هند یا ب سانەهی یە وەكو وێ پێشبینی بۆ دكری. ل وان جارێن كێم دەمێ دایكا وێ پارچەیێن بچووك یێن كێكان ل مال بەرهەڤ دكرن، خو یەك پارچە وەكو یا دی نەبوو. هەردیسان ژبەركو دایكا وێ شارەزایەكا باش د دروستكرنا كێكان دا نەبوو، گەلەك جاران ئەڤ چەندە وەكو كارەساتەكێ ب دوماهی دهات و لێنانگەها وێ بێ سەروبەر دبوو.

هەتا ئەو كێكێن ئەم ژ بازاڕی ژی دكرین، ب شێوەیەكێ تەمام د وەكهەڤ نینن مادەم هوستایێ شیریناهیان یەك یەكە دروست دكەت.

ژ نیشكەكێ ڤە گرنژینەك ل سەر لێڤێن سۆفیایێ پەیدابوو دەمێ بیرا وێ ل هینگێ هاتی دەمێ جارەكێ بابێ وێ ئەو دگەل خوە بریە بازاڕی و دایكا وێ ژی مایە ل مال داكو كێكا جەژنا سەرێ سالێ دروست بكەت. دەمێ ئەو زڤڕینە مال، وان دیت دایكا وێ هژمارەكا پارچەیێن كێكان یێن بچووك ل سەر شێوێ زەلامان یێن دروستكرن و ل سەر مێزێ یێن ب ڕێزكرین. هەرچەندە ئەڤ پەیكەرێن بچووك ب شێوەیەكێ تەمام د وەكهەڤ نەبوون، لێ تا ڕادەیەكێ مەزن وەكو یەك بوون. ئەرێ چەوا ئەڤ چەندە چێدبیت؟ چ پێنەڤێت ئەگەرێ وەكهەڤیا وان بۆ هندێ دزڤڕیت كو دایكا وێ قالبەك بۆ دروستكرنا وان هەموو پارچەیان بكارئینابوو.

سۆفیایێ هەست ب بێهنفرەهیێ کر دەمێ هەستپێکری کو ئەو شیا نهێنیا وەکهەڤیا پارچەیێن شیریناهیان شرۆڤە بکەت، تا وی ڕادەی کەیفا وێ هات کو هزرکر وێ ڕاهێنانا یەکێ ژ ئەرکێ خوە بجهـ ئینا. ئانکو دەمێ هوستایێ شیریناهیان پێنجی پارچەیێن شیریناهیان یێن وەکهەڤ دروست دکەت، ڕامانا وێ ئەوە وی قالبەك ژ بۆ دروستکرنا وان بکارئینایە.

پشتی هینگێ، ئەفلاتۆنی تەماشەی کامێرێ کربوو و پرسیار ژێ کربوو:

- "بۆچی هەموو هەسپ وەکو یەکن؟"

سەرەڕای ڤێ پرسیارێ، چ هەسپ وەکو هەسپەکێ دی نینە هەروەکو کا چەوا چ مرۆڤ وەکو مرۆڤەکێ دی نینە. پیچەك مابوو ئەو ڤێ پرسیارێ بدەتە ڕەخەکی ئەگەر وێ دووبارە ب وی شێوازی هزرنەکربا دەمێ بابەتێ پەیکەرێن کێکێ پێ شرۆڤە دکری. هەرچەندە ب تەمامی خو یەك ژ وان وەکو یێن دی نەبوو، چونکی هندەك ژ وان د مەزنتر بوون و هندەك بچووکتر یان زراڤتر بوون، لێ دگەل هندێ ژی ئەگەر کەسەکی تەماشەی وان کربایە دا هزرکەت هەموو د وەکهەڤن.

دبیت مەرەما ئەفلاتۆنی ژ ڤێ پرسیارێ ئەو بیت کا بۆچی هەسپ هەر دێ مینیت هەسپ و نابیتە گیانەوەرەکێ دی یێ دووڕەگ* دەمێ دگەل بەرازەکێ جووت دبیت. بۆ نموونە، ڕاستە هندەك هەسپ وەکو میهان د ڕەنگ سپی نە و هندەکێن دی وەکو مەیمینکان د ڕەشن، لێ دگەل هندێ ژی ساخلەتەکا هەڤپشك دناڤبەرا وان دا هەیە.

ئەرێ تە دڤیا بزانی کا شێوەیێ هەسپی دا یێ چەوابیت ئەگەر وی هەشت پێ هەبان؟ لێ چ پێنەڤێت مەرەما ئەفلاتۆنی ئەو نەبوو بێژیت ئەگەرێ وەکهەڤیا هەسپان بۆ هندێ دزڤڕیت کو هەموو ژ قالبەکی هاتینە دروستکرن!

ل دووڤ دا، وی پرسیارەکا دی یا گرنگ و ب زەحمەت ئازراند بوو.

---

* دووڕەگ Hybrid کو ب زمانێ عەرەبی دبێژنێ "هجین". ئەو گیانەوەرە یان زیندەوەرە یێ ب ڕێکا دەستکاریکرنا پێکهاتنا بۆماوەیی و ژ تێکەلکرنا دوو زیندەوەرێن ژ دوو ڕەگەزێن جودا پەیدادبیت.

ئەرێ مرۆڤی ڕۆحەکا نەگوهۆڕ هەیە؟ ئاها ئەڤە ئەو پرسیار بوو یا سۆفیا لێ مایە ئاسێ. هندی ئەو دزانیت لەشێ مریان ل بن ئاخێ دهێتە ڤەشارتن یان دهێتە سووتن و پشتی هینگێ چ پاشەڕۆژێن دی نینن. ئەگەر ئەم بێژین مرۆڤی ڕۆحەکا نەمر هەیە، کەواتە دڤێت وێ بیرۆکێ پەسەند بکەین یا دبێژیت مرۆڤ ژ دوو بەشێن تەمام ژێکجودا پێکدهێت.

لەشەك کو پشتی چەند سالێن ژیانێ ب دوماهی دهێت و ژناڤ دچیت، ڕۆحەك کو چ ژ نێزیك یان دوور پەیوەندی ب گەشەکرنێ و پیربوونا لەشی ڤە نینە. ڕۆژەکێ وێ گوهـ ل داپیرا خوە ببوو دەمێ گوتی لەشێ وێ ب تنێ یێ پیربووی، لێ هێشتا ئەو د ناخێ خوە دا کچەکا گەنج و چواردە سالی یە.

دەربڕینا "کچەکا گەنج" بەرێ سۆفیایێ دا پرسیارا دوماهیێ: ئەرێ ژن و زەلام ژ لایێ هزرکرن و ئەقلی ڤە د وەکهەڤن؟ بەرسڤدانا ڤێ پرسیارێ گەلەك یا ب زەحمەتە، چونکی بەرسڤا وێ ل سەر هندێ دمینیت کا ب دروستاهی مەرەما ئەفلاتۆنی ژ پەیڤا "ئەقل" چیە.

وێ هزرا خوە د گوتنێن مامۆستایێ خوە یێ فەیلەسۆفێ دا کرن دەمێ بەحسێ سۆکراتی بۆ وێ دکری. سۆکراتی هزردکر هەموو مرۆڤ دشێن ڕاستیێن فەلسەفی ئاشکەرا بکەن ب مەرجەکی ئەقلێ خوە بکاربینن. ب دیتنا وی، بەندەیان ژی وەکو مرۆڤێن ئازاد شیانێن هزرکرنێ ل دور مژارێن فەلسەفی هەنە و دشێن چارەسەریێن گونجای بۆ ببینن. سۆفیایێ باوەری ب هندێ هەبوو کو ئەقلێ ژن و زەلامان یێ یەکسانە.

ل وی دەمێ ئەو دناڤ ڤان هزران دا نقووم بووی، دەنگێ قرچ قرچا هندەك چەقێن داران هات. دەنگێ وی تشتی وەکو دەنگێ ماکینا هەلێ بوو. پشتی بورینا چەند چرکەیان، ئەو سەیێ مەزن وەکو دینان خوە هاڤێتە د کۆلکی ڤە و زەرفەکێ قەهوائی یێ مەزن ب دەڤێ خوە هەلگرتبوو.

سۆفیایێ کرە هەوار: "هێرمس! ئاهـ ئەڤە توی؟"

سەی ئەو زەرف دانا سەر چوکێن وێ، وێ ژی دەستێ خوە ل سەر گەردەنا وی ڕا ئینا و بر و گوتێ: "تو سەیەکێ باشی، هێرمس! تو دزانی؟"

سەیێ مەزن بۆ چەندین خولەکان ما ل دەڤ وێ، پاشی ڕابووڤە و چوو وی جهێ ژێ هاتی، لێ ڤێ جارێ سۆفیا ژی ڕابووڤە و ب دووڤ هێرمسێ کەفت.

سەی پێنگاڤێن هێدی بەرەڤ دارستانێ دهاڤێتن و سوفیا ژی ب دووراتیا چەند مەتران ل دووڤ وی دچوو. پشتی هینگێ سە ل پشت خوە زڤڕی و لێ ڕەوی لێ دەنگی وی هند یێ بلند نەبوو سۆفیایێ بترسینیت. و ل دوماهیێ سوفیا دێ زانیت کا ئەو فەیلەسۆف ل کیڤە دژیت، ئەرێ تو بێژی ئەو ب دووڤ سەی بکەڤیت هەتا خوە دچیتە باژێرێ ئەسینا؟

سەی لەزاتیا خوە زێدەکر و ڕێکا خوە گوهاڕت و چوو د ڕێکەکا تەنگ دا، لێ دەمێ سۆفیایێ ژی وەکو وی کری، سە ل جهێ خوە ڕاوەستیا و وەکو سەیێ پولیسان ب دەنگەکێ بلند لێ ڕەوی، لێ سۆفیا یا بەردەوام بوو ل سەر دووکەفتنا وی و پتر نێزیکی وی بوو دەمێ سە ل جهێ خوە ڕاوەستیای.

دەمێ سەی وەکو تیران کریە غارێ و ل ناڤ دارستانێ بەرزەبووی، سۆفیایێ چ هیڤی نەمان کو بگەهیتە وی، ژبەر هندێ ل سەر قورمێ دارەکێ ڕوونشت و ئەو زەڕف ڤەکر و دەست ب خواندنێ کر.

## ئەکادیمیا ئەفلاتۆنی

سۆپاسیا تە دکەم بۆ وی دەمێ خوش یێ مە پێکڤە بوراندی، سۆفیا. مەرەما من گەشتا مە پێکڤە بۆ باژێرێ ئەسینایێ. و ل دوماهیێ من خوە بۆ تە دا نیاسین. هەروەسا ئەز شیام ئەفلاتۆنی ژی بۆ تە بدەمە نیاسین. باشە نوکە بێ گیروبوون دا بەردەوامیێ بدەینە وانەیا خوە.

ژیێ ئەفلاتۆنی (427-347 بەری زاینی) نێزیکی 29 سالان بوو دەمێ سۆکراتی ژەهر ڤەخواری. ئەفلاتۆن بۆ ماوەیێ چەندین سالێن درێژ قوتابیێ سۆکراتی بوو و گرنگیەکا مەزن ب دادگەهکرنا وی ددا. ب ڕاستی ژی ڕوودانەکا دلتەزین بوو کو ئەسینا شیای حکمێ کوشتنێ ل سەر زیرەکترین کەس ل باژێری بسەپینیت. ڤێ چەندێ نەک

کاریگەریەکا درێژخایەن ل سەر ژیانا وی هەبوو، بەلکو ئاڕاستەییێ ڕەفتارا وی یا فەلسەفی ژی دەستنیشانکر.

ب دیتنا ئەفلاتۆنی، مرنا سۆکراتی دەربڕینەکا هەڕە توند یا هەڤدژیا دناڤبەرا کاودانێن کەتواری د جڤاکی و دا کاودانێن ڕاستی و نموونەیی بوو. یەکەم کارێ ئەفلاتۆن وەك فەیلەسۆف پێ ڕابووی، بەلاڤکرنا پێداچوونێن سۆکراتی بوو، ئانکو گوتنێن وی ل بەرامبەر ئەندامێن دادگەهێ.

دێ بیرا تە ئینمەڤە کو سۆکراتی چ تشت نەنڤیسابوون "بەروڤاژی فەیلەسۆفێن بەری خوە کو وان کارێن خوە دنڤیسیان، لێ مخابن چ کارێن وان نەگەهشتینە مە و هەموو یێن ژناڤچووین". لێ کارێن ئەفلاتۆنی یێن سەرەکی هەموو هاتینە پاراستن و گەهشتینە مە، زێدەباری پێداچوونێن سۆکراتی یێن وی بۆ مە پاراستین کو هندەك نامە و 35 دانوستاندنێن فەلسەفی بوون.

هەلبەت ئەگەرێ پاراستنا ڤان کاران ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو ئەفلاتۆنی قوتابخانا خوە یا فەلسەفی ژ دەرڤەی باژێرێ ئەسینایێ دامەزراند بوو، قوتابخانا ئەفلاتۆنی ل وی باخچەی بوو یاکو ناڤێ قارەمانێ گریکی "ئەکادیموس"ی دانایە سەر، هەر ژبەر هندێ ناڤێ "ئەکادیمیا" کەفتە سەر ڤێ قۆتابخانێ و پشتی هینگێ هژمارەکا مەزن یا قوتابخانەیێن ئەکادیمی ل سەرانسەری جیهانێ بەربەلاڤبوون و نوکە ژی ئەم پەیڤا ئەکادیمی بۆ زانکویان بکاردئینین.

ل ئەکادیمیا ئەفلاتۆنی، بابەتێن فەلسەفە و بیرکاری و وەرزشا جەستەی دهاتنە خواندن. ل ڤێرێ پەیڤا "خواندن" ب ڕامانا خوە یا حەرفی ناهێت، چونکی ل ڤێ ئەکادیمییێ نە ب تنێ بابەت دهاتنە خواندن بەلکو هەڤڕکیەکا دژوار یا بیرۆکە و گەنگەشان جهێ خوە لێ کربوو. ژبەر هندێ نە یا سەیرە کو دانوستاندن شێوازێ ئەدەبی یێ هەڕەباش بوو ل دەڤ ئەفلاتۆنی.

## ڕاستیا هەتا هەتایی، جوانیا هەتا هەتایی و باشیا هەتا هەتایی

ل پێشەکیا کورسێ خوە یا فەلسەفی من گوتبوو تە کو یا گرنگە ئەم پرسیارا پرۆژەیێ فەلسەفی یێ هەر فەیلەسۆفەکی بکەین. ل ڤێرێ دێ پرسیارەکێ ژ تە کەم:

- "باشە ئەفلاتۆنی پێکۆل دکر چ تشت ئاشکەرا بکەت؟"

ب کورتی، ئەم دشێین بێژین وی گرنگی ددا پەیوەندیا دناڤبەرا تشتێن هەتا هەتایی و نەمر و تشتێن بەروەخت و دەمکورت "باشە ب ڤی ڕەنگی ئەو دچیتە د خانا فەیلەسۆفێن قۆناغا بەری سۆکراتییێ دا".

بەری نوکە ئەم ڕێکەفتبووین کو سۆکراتی سۆفیستیان و بەرێ خوە ژ فەلسەفەیا سروشتی دابوو پاش و بەرەڤ مرۆڤ و جڤاکی ڤە چووبوون، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو وان گرنگی ددا پەیوەندیا دناڤبەرا تشتێن نەمر و دەمکورت، ب تایبەت دەمێ بابەت گرێدای ڕەوشت و نەریتێن جڤاکی بیت.

ئەم دشێین ڤێ چەندێ ب شێوەیەکێ ب سانەهیتر شرۆڤە بکەین. سۆفیستی د وێ باوەرێ دابوون کو تێگەهێن باشی و خرابی، شاشی و دروستی د ڕێژەیینە و ژ سەردەمەکی بۆ سەردەمەکێ دی دهێنە گوهۆڕین. باشە، چ تشتێ ڕەها د پرسا باشی و خرابییێ دا نینە. هەلبەت ئەڤە ئەو تێگەهـ بوو یێ سۆکراتی ب یەکجاری ڕەتدکری.

سۆکراتی باوەری ب هندەك ڕێسایێن هەتا هەتایی و نەمر هەبوو ب تایبەت یێن پەیوەندی ب باشی و خرابییێ ڤە هەی. دەربارەی مە و ئەقلێ مە، ئەم دشێین بگەهینە ڤان پیڤەرێن نەگوهۆڕ ئەگەر هات و ئەقلێ خوە بکاربینین، ئەو ئەقلێ نەگوهۆڕ و نەمر.

ئەرێ تو هێشتا دگەل منی، سۆفیا؟ ل ڤێرێ ئەفلاتۆن هات و گرنگی دا تشتێن بەردەوام و جێگیر و نەمر د سروشت و ڕەوشت و ژیانا جڤاکی دا د یەك دەم دا. وی ئەڤ تشتە هەموو کرنە دگەل یەك، د سەلکەکێ دا. وی پێکۆل دکر بگەهیتە کەتوارەکێ پاقژ و نەمر و جێگیر. دا دانپێدانێ بکەین، ئاها مە چەندە ژ فەلسەفێ دڤێت. کارێ وان نینە بچن شاهجوانا جیهانێ بهەلبژێرن یان نیشا مە بدەن کا دێ چینە ل کیرێ باجانکێن ئەرزان کرین "ڕەنگە ژبەر ڤان ئەگەران بیت ئەم هند وان نابینین یان گوهـ ل دەنگێ وان نابین".

فەیلەسۆف پێکۆلێ دکەن ڤان پرسیارێن بابەتێن سادە و سڤك پشتگوهـ بهاڤێژن و ل شوونا وان بابەتێن گرنگ وەك ڕاستیا هەتا هەتایی و جوانیا هەتا هەتایی و باشیا هەتا هەتایی بگەڕیێن.

ب ڤی ڕەنگی مە کورتیەك ل دور فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی دیارکر. ل ڤێرێ دێ هێدی هێدی چینە دناڤ هندەك بابەتێن کوورتر دا. ل دەستپێکێ ژی دێ پێکۆلێ کەین د وی شێوازێ هرزرکرنێ یێ تایبەت تێبگەهین یێ پشتی هینگێ کاریگەریەکا کوور ل سەر هەمووفەیلەسۆفێن ئەورۆپی کری.

## جیهانا بیرۆکەیان

دیمۆکریتس و ئەمفیدوکلیسی بەری هینگێ دووپات کربوو کو هەموو دیاردەیێن سروشتی دکەڤنە بن پێلا گوهۆڕینێ، سەرەڕای ڤێ چەندێ، هێشتا تشتەکێ بنەڕەت هەیە کو ناهێتە گوهۆڕین "هەر چوار توخم یان گەرد". ئەفلاتۆن ژی بۆ ڤێ چەندێ دگەل وان یێ هەڤڕابوو، لێ وی ئەڤ بابەتە ب شێوازەکێ دی دئازراند.

ئەفلاتۆن د وێ باوەرێ دا بوو کو هەموو تشتێن هەستپێکەر د سروشتی دا شیانێن گوهۆڕینێ هەنە. ژبەر هندێ چ کەرەستە نینن کو ژناڤ نەچن یان نەهێنە بهوژین "حەلاندن". ب شێوەیەکێ ڕەها، هەر تشتەکێ سەر ب جیهانا ماددەی ڤە، ژ ماددەی پێکدهێت و چارەنڤیسێ وی دێ هەر پاشڤەچوون و ژناڤچوون بیت. لێ هەموو تشت ژ قالبەکێ جێگیر و نەمر هاتینە ئافراندن کو چ جاران ژناڤ ناچن.

- "باشە تە دیت؟ نەخێر... "

باشە سۆفیا بۆچی هەسپ هەموو وەکو یەکن؟ ڕەنگە تو هزر بکەی ئەڤ چەندە نەڕاستە، لێ ڕاستیەك هەیە کو دناڤ هەموو هەسپان دا خاڵەکا هەڤپشك هەیە کو وەل مە دکەت ب تەمامی ئەم بزانین ئەو هەسپن نەك گیانەوەرەکێ دی. ئەگەر هەر یەك ژ وان بکەڤیتە ژێر کاریگەریا پیربوونێ و گوهۆڕینێ هەتا ل دوماهیێ دمریت، لێ ئەڤ چەندە نابیتە ئەگەرێ هندێ کو "قالبێ هەسپی" ژناڤ بچیت یان نەمینیت.

ل دەڤ ئەفلاتۆنی، تشتێ نەمر و هەتا هەتایی نە مادەیەکێ دەستپێکی یێ فیزیایی یە، بەلکو پرەنسیپەکێ خوەدان ساخلەتەکا رۆحی یە.

دا پتر روهن بکەین، فەیلەسۆفێن بەری سۆکراتی شرۆڤەکرنەکا بالکێش ب گوهۆرینێن د سروشتی دا رووددەن دانابوو، بێ کو نەچاربین پێشبینیا هندێ بکەین کو د کەتواری دا دێ گوهۆرین ب سەر تشتەکی دا هێن یان نە. ئەو د وێ باوەرێ دا بوون کو د سروشتی دا هندەك پارچەیێن گەلەك بچووك هەنە دنەمرن و چ جاران ژناڤ ناچن.

هەتا ڤێرێ بابەت یێ رۆهنە! لێ وان چ شرۆڤەکرنێن باوەرپێکری نەبوون بۆ تێگەهشتنا هندێ کا چەوا ئەڤ گەردیلەیێن بەری نوکە هەسپەك پێکئیناى، دووبارە دێ زڤرنەڤە و پشتی چەند چەرخەکان دێ هەسپەکێ نوو دروست کەنەڤە، یان ژی رەنگە ئەڤ جارە فیلەکی یان تیمساحەکی دروست بکەن.

ئەو تشتێ ئەفلاتۆنی پێکۆل دکری بگەهیتێ ئەو بوو کو ئەو گەردێن دیمۆکریتسی بەحس ژێ کرین، قەت نەشێن گیانەوەرەکێ نوو ب ناڤێ "تیمسف" یان "احیل" دروست بکەن (تێکەلکرنا ناڤێن هەردوو گیانەوەرێن تیمساح و فیل). ل ڤێرێ خالا وەرچەرخانا هزرێن وی دەستپێکر.

ئەگەر تو د ڤێ چەندێ گەهشتبی، ئەم دشێین بچینە پرسیارا ل دووڤ دا، لێ ئەرێ ژ راست تو تێگەهشتیە؟

باشە، ئەز دێ دووبارە کەمەڤە. تە هندەك پارچەیێن یاریا لیگۆیێ یێن هەین و تە هەسپەك ژێ دروست کر، پاشی تە ئەو هەسپ خرابکر و پارچەیێن وێ هەموو ژێکڤەکرن و جارەکا دی زڤراندنە د قالکا وێ دا ڤە. ل ڤێرێ تو نەشێی قالکا وێ ب هەژینی داکو ئەو ب خوە بۆ تە خوە لێکدەنەڤە و هەسپەکی دروست بکەن. ئەرێ تو بێژی پارچەیێن لیگۆیێ بشێن ئەو ب خوە، خوە لێکبدەنەڤە؟ هەلبەت نەخێر. پێدڤیە تو دووبارە هەسپەکێ نوو دروست بکەیەڤە و دەمێ تو دشێی ڤێ چەندێ بکەی، ئەڤە ژبەر هندێ یە کو بەری نوکە تە وێنەیێ هەسپی د بیردانکا خوە دا هەلگرتیە. ئەڤ هەسپێ نوکە تە ژ پارچەیێن لیگۆیێ دروستکری، هەلبەت تە ژبەر وێنەیێ وی هەسپێ بەری نوکە چێکری و مایە د بیردانکا تە دا یێ چێکری.

ل ڤێرێ، ئەرێ ئاریشا پێنچی پارچەیێن کێکێ یێن وەکهەڤ هاتە چارەسەکرن؟

ئەم دێ هۆسا هزرکەین تو یا ژ ئەسمانان هاتی و چ جاران تە کێك و شیریناهی د ژیانا خوە دا نەدیتینە. ژ نیشکەکێ ڤە تو دبەر دکانەکا شیریناهیان ڕا چووی و چاڤێ تە ب هندەك کێکێن ل بەر جامێ کەفت و سەرنجا تە ڕاکێشا، پاشی توو چوویە د ژوور ڤە و تە پێنجی پارچەیێن کێکێ ل سەر شێوەیێ مرۆڤان یێن وەکهەڤ دیتن.

ل وی دەمی دێ حێبەتی مینی و سەرێ خوە هەژینی و پاشی پرسیار کەی: ئەرێ چەوا ئەڤ پارچەیە هەموو وەکو یەکن. دبیت پارچەیەکێ دەستەك پێڤە نەبیت و یەکا دی سەر پێڤە نەبیت و یەکێ ژی هندەك کرێم ل سەر بیت، لێ پشتی باش هزرا خوە دکەی، دێ تیبینیا هندێ کەی کو ڤان پارچەیێن کێکان یێن ل سەر شێوەیێ مرۆڤی هاتینە دروستکرن، هەموویان دیمەنەکێ هەڤپشك هەیە و دێ زانی کو ژێدەرێ هەموویان ژی ژ جهەکی یە هەتا خو هەکە دانەیەکا ب تنێ ژی یا تەمام نەبیت.

هەردیسان دێ زانی ژی کو ئەڤ پارچەیە هەموو د قالبەکێ ب تنێ دا هاتینە دروستکرن. زێدەباری ڤێ چەندێ، سۆفیا، حەزا دیتنا ڤی قالبی ل دەڤ تە دێ پەیدابیت. دێ د دلێ خوە دا بێژی: چ پێنەڤێت نوکە ئەڤ قالبە گەلەك یێ جوان و بێ کێماسیە کو ب چ ڕەنگان نە وەکو ڤان دانەیێن کوپیکریە.

ئەگەر تو ب تنێ شیای ڤی ئەرکی بجهـ بینی، د ڕاستی دا، کەواتە تە مژارەکا فەلسەفی چارەکر هەروەکو کا چەوا ئەفلاتۆنی چارەسەر کری. ئەفلاتۆن ژی وەکو پتریا فەیلەسۆفێن "ئەوێن ژ ئاسمانی هاتینە خوارێ، ئانکو ل سەر لێڤا داڤەکا تەنك یا فەروویێ کێڤریشکێ ڕاوەستیایە" ژ هندێ مابوو حێبەتی کا چەند وەکهەڤی دناڤبەرا دیاردەیێن سروشتی دا هەنە.

ئەو گەهشتە وی دەرئەنجامی کو پێدڤیە هژمارەکا بێ دوماهی یا ڤان قالبان هەبیت کو ل سەر یان ل پشت هەر تشتەکێ دەوروبەری مە بن. وی ناڤێ ڤان قالبان کرە "بیرۆکە".

ل پشت هەموو هەسپان، هەموو بەرازان، هەموو مرۆڤان، "بیرۆکەیا هەسپی"، "بیرۆکەیا بەرازی" یان "بیرۆکەیا مرۆڤی" هەیە. هەروەکو کا چەوا هوستایێ شیریناهیان

دشێت هژمارەکا مەزن یا پەیکەرێن مرۆڤ و هەسپان ژ هەڤیری دروست بکەت. ئەوێ دکانا وی یا مەزن بیت، دێ وی هژمارەکا مەزن یا قالبان هەبیت، ئانکو بۆ هەر جۆرەکێ شیریناهیان قالبەك هەیە.

پوختە: ئەفلاتۆن ئاماژێ ب هەبوونا ڕاستیەکا دی ل پشت جیهانا هەستان دکەت. ئەڤ ڕاستیە هاتیە ناڤکرن ب "بیرۆکە" کو هەموو وێنەیێن نەگوهۆڕ و نەمر لێ هەنە یێن کو ل پشت دیاردەیێن جودا جودا یێن سروشتی ڕاوەستیان. ئەڤ تێگەهە ژی تیورەکێ پەیدادکەت دبێژنێ "تیورا بیرۆکەیان."

## زانینەکا پشتڕاست

هەتا نوکە گوهێ تە ل منە، مانە هۆسایە؟ ڕەنگە تو پرسیار بکەی ئەرێ ژ ڕاستا ئەفلاتۆنی باوەری ب ڤێ چەندێ هەبوو؟ ئەرێ مەرەما وی ئەو بوو کو نموونەیێن ب ڤی ڕەنگی ل کەتوارەکێ دی هەنە.

نابیت ب ڤی تەرزی ئەم تەماشەی بابەتی بکەین. "سەرەڕای هندێ کو پێدڤیە ئەم گەلەك دانوستاندنێن وی ل بەر ڕۆناهیا ڤێ تێگەهشتنێ بخوینین". دا بەردەوامیێ بدەینە بەلگەیێن وی.

فەیلەسۆف پێکۆلێ دکەن تشتێ جێگیر و نەمر ئاشکەرا بکەن. چ بها د هندێ دایە ئەگەر ئەم ڤەکۆلینەکا فەلسەفی ل دور پەقیشکێن کەفا سابینێ دا بکەین، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو هێشتا مە ڤەکۆلین ل سەر نەکری ئەو پەقیشك دێ پەقیت و نامینیت. ڤێجا کی دێ وێ زەحمەتێ بۆ خوە چێکەت و نامەیەکا فەلسەفی کریت ل دور تشتەکێ کەسێ نەدیت بیت، یان ژی ب تنێ بۆ چەند خولەکان د هەبوونێ دا بیت؟

ب بۆچوونا ئەفلاتۆنی، هەموو تشتێن ل دەوروبەری مە وەکو پەقیشکێن سابینێ نە. خو تشتەکێ ڤێ جیهانا هەستپێکەر یێ بەردەوام نینە و ناڤەکێشیت. ئەز چ تشتێ نوو زێدەناکەم ئەگەر بێژم هەموو مرۆڤ و گیانەوەر ژ نێزیك یان دوور دێ مرن. هەتا

پارچەیێن مەرمەڕی ژی، هێدی هێدی دێ پیچ بن و ژناڤچن "هەتا ئەکرۆپۆل ژی ئەڤرۆکە بوویە گرکەك، هەرچەندە تشتەکێ نەخوشە لێ چ بکەین ژیان ب ڤی ڕەنگی یە!".

ئانکو ئەم چ جاران نەشێین پێزانینێن تەمام ل دور تشتەکی وەربگرین کو بەردەوام گوهۆڕین ب سەر دا بهێن، لێ ب تنێ ئەم دشێین تێگەهشتنەکا گوماناوی ژێ وەربگرین. ئانکو هەموو ئەو تشتێن پەیوەندی ب جیهانا هەستان ڤە هەی، مەرەم ژێ ئەو تشتێن ئەم هەست ب هەبوونا وان دکەین و دبینین و دەستێ خوە لێددەین، ئەم دشێین هندەك شرۆڤەیێن نەپشتڕاست و گریماناوی بو بدانین. ب تنێ ئەم دشێین ڕاستیەکا تەمام ل دور وان تشتان بزانین یێن ئەقل سەرەدەریێ دگەل دکەت و دبینیت.

کا بێهنا خوە فرەهـ بکە، دێ نموونەکا دی ژی بۆ تە شرۆڤە کەم. دبیت هوستاییێ شیریناهیان پارچەیەکا کێکێ باش دروست نەکەت و شێوێ وێ نە وەکو یێ قالبی بیت، ڤێجا دبیت ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ جۆرێ هەڤیری یان هەڤیرترشی یان ئارێ وێ بزڤڕیت. لێ پشتی ئەم بیست یان سیهـ پارچەیێن وەکهەڤ دبینین، ل وی دەمێ خو هەکە مە قالب نەدیت بیت ژی لێ دێ شێین هزرا خوە د شێوەیێ وی دا کەین، ئانکو ل ڤێرێ مرۆڤ باوەر ژ هەستێن خوە دکەت. ئەرێ چەوا مرۆڤ دشێت باوەریێ ب هەستێن خوە بینیت؟ کریارا دیتن و تیبینیکرنێ ژ کەسەکی بۆ کەسەکێ دی یا جودایە، ژبەر هندێ ئەم دشێین ب تنێ باوەر ژ ئەقلێ خوە بکەین چونکی ل دەڤ هەموو مرۆڤان هەیە.

ئەگەر هوون 30 قوتابی د پولێ ڤەبن و مامۆستا پرسیارێ ژ هەوە بکەت کا جوانترین ڕەنگێ کێلەستونێ "کەسکوسۆر" کیژکە؟ چ پێنەڤێت ئەو دێ گەلەك بەرسڤێن جودا جودا ژ قوتابیان گوهلێبیت، لێ ئەگەر ئەو پرسیار بکەت کا ئەنجامێ لێکدانا ژمارە سێ دگەل ژمارە هەشت دێ بیتە چەند، هەلبەت ئەو دێ بەرسڤەکا ب تنێ ژ قوتابیان گوهلێبیت.

ئەگەرێ ڤێ بەرسڤێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت ژبەرکو ل ڤێرێ ئەقل بڕیارێ ددەت نەك هەستوسوز. هەموو گاڤان ژی ئەقل یێ د هەڤریکەکا دژوار دا دگەل هەست و دیتنێن مرۆڤی. ئەم دشێین ل ڤێرێ خوە پشتڕاست بکەین کو ئەقل تشتەکێ نەمر و گەردوونی یە، ژبەرکو ئەو سەرەدەریێ دگەل تشتێن نەمر و گەردوونی دکەت.

یا زانایە کو ئەفلاتۆنی گەلەك گرنگی ب بیرکاریێ ددا. ژبەرکو پەیوەندییێن بیرکاری چ جاران ناهێنە گوهۆڕین، ژبەر هندێ ئەم دشێین ب سانەهی زانیارییێن ڕاستەقینە د ڤی بواری دا وەربگرین. کا دا نموونەکێ ل سەر ڤێ چەندێ وەربگرین: هزر بکە تە ژ دەرڤە گزگلەکا* کاژێ یا گرۆڤر دیت. دبیت تو هەست پێبکەی کو ب تەمامی یا گرۆڤرە لێ د هەمان دەم دا، دا جوانا هزر بکەت پیچەکێ ژ هەردوو ڕەخان ڤە یا خوارە و پاشی هوون ل سەر ڤێ چەندێ گەنگەشێ بکەن. ل دوماهیێ هوون هەردوو نەشێن بگەهنە ڕاستیەکا تەمام ل دور وی تشتێ چاڤێ هەوە دبینیت، لێ د هەمان دەم دا بێگومان هوون هەردوو دشێن بێژن کو سەرجەمێ گوشەیێن بازنەیەکێ 360 پلەیە.

ل ڤێرێ هوون یێ بەحسێ بیرۆکەیا بازنەیەکا نموونەیی دکەن کو د سروشتی دا چ ڕاستی بۆ نینن لێ د ناخێ خوە دا هوون دشێن هەست پێبکەن "ل ڤێرێ ئەم یێ بەحسێ قالبێ پارچەیێن بچووك یێن کێکان دکەین نەك بەحسێ پارچەیەکا کێکێ یا د لێنانگەهێ ڤە".

پۆختە: دیتنێن مە بۆ تشتێن دەوروبەر ناهێلن ژ بلی تشتێن نەدیار، تشتێن دی یێن ڕاستەقینە ببینین. لێ ئەو تشتێ ئەم د ناخێ خوە دا دبینین، هەلبەت ب هاریکاریا ئەقلی، دشێت مە بگەهینتە زانینەکا ڕاستەقینە. سەرجەمێ گوشەیێن سێگوشەیەکێ هەتا هەتاییێ هەر دێ مینیت 180 پلە، هەروەسا بیرۆکەیا هەسپێ ل سەر چوار پێیان بڕێڤە دچیت دێ هەتا هەتاییێ مینیت خو هەکە هەسپێن دنیاییێ هەموو د لەنگ بن.

## ڕۆحەکا نەمر

بەری نوکە مە دیت کا چەوا ئەفلاتۆنی کەتوار دابەش دکر ل سەر دوو بەشان:

بەشێ یەکێ پێکدهێت ژ جیهانا هەستان کو زانینەکا کێم و سنووردار و نەتەمام ددەتە مە دەمێ ئەم هەر پێنج هەستێن خوە بکاردئینین کو ئەو ب خوە ژی د سروشتێ خوە دا د سنووردار و نەتەمامن. ئەڤ جیهانا هەستان بەردەوام یا د گوهۆڕینێ دا و چ تشتێ

* گزگلەکا کاژێ Pine Cone ب عەرەبی دبێژنێ کوز صنوبر یان ژی مخروگ صنوبر.

بەردەوام تێدا نینە، چ تشت تێدا بۆ هەتا هەتایێ نامینیت بەلکو بەردەوام هندەك تشت پەیدادبن و بەرزەدبن.

بەشێ دووێ ژ جیهانا بیرۆکەیان پێکدهێت کو دەلیڤەیێ ددەتە مە ئەم بگەهینە زانینا ڕاستەقینە، ئەو ژی پشتی کو ئەقلێ خوە بکاردئینین. ئەڤ جیهانا بیرۆکەیان، جیهانەکا هەڤدژە دگەل هەستان. هەردیسان ئەڤ بیرۆکەیە د نەمر و جێگیرن.

ئەفلاتۆن د وێ باوەرێ دا بوو کو لەشێ مەژی ژ دوو بەشێن سەرەکی پێکدهێت: لەشەك کو بەردەوام یێ دگوهۆڕینێ دا و پەیوەندیەکا نەبڕ دگەل جیهانا هەستان هەیە و چارەنڤیسێ وێ ژی وەکو یێ هەموو تشتێن دی یێن د دنیایێ دایە "بۆ نموونە وەکو پەڤیشکەکا سابینێ"، ژبەرکو هەستێن مە پەیوەندی ب لەشی ڤە هەیە، ژبەر هندێ نە جهێ باوەریێ نە. بەشێ دووێ ژی ئەوە کو مە ڕۆحەکا نەمر هەیە و بنگەهێ ئەقلی یە. ژبەرکو ڕۆح نە تشتەکێ ماددی یە، ئەو دشێت جیهانا بیرۆکەیان ببینیت.

ڕەنگە من هەموو تشت بۆ تە گوتبن، لێ هێشتا گەلەك تشت یێن ماین. سۆفیا، دێ ئاخفتنا خوە دووبارە کەم و بێژم: ئەفلاتۆن د وێ باوەرێ دا بوو کو بەری ڕۆح بهێتە د لەشێ مە دا و تێدا ئاکنجی ببیت، ئەڤ ڕۆحە هەبوو و یا ئازاد بوو. بەری هینگێ ئەو د جیهانا بیرۆکەیان دا بوو "ئەو ژی دناڤ قالبێن کێکێ دا بوو" لێ پشتی ئەو ژ خەو هشیار دبیت و خوە دناڤ لەشێ مرۆڤەکی دا دبینیت، هەموو بیرۆکەیان ژبیر دکەت و دەست ب پێڤاژوویەکا نوو و سەیر دکەت.

چەند مرۆڤ پتر هەست ب تشتێن دەوروبەری خوە بکەت، بیرهاتنێن سەیر خوە د ناخێ وی دا دهەلاڤێژن. مرۆڤ دێ هەسپەکی بینیت لێ هەسپەکێ نە تەمام "هەروەکو کا چەوا تو کێکەکێ ل سەر شێوەیێ هەسپەکی ببینی". پاشی هەر زوو بیرهاتنا هەسپێ تەمام و نەدیار د سەرێ مرۆڤی دا دێ هشیار بیت، ئەو بیرهاتنا بەری هینگێ ڕۆحا وی دناڤ جیهانا بیرۆکەیان دا نیاسی*.

---

* ئەم دشێین ڤێ چەندێ ب نموونەیەکا دی پتر ڕۆهن بکەین: بۆ نموونە دەمێ مرۆڤ تشتەکی بۆ یەکەم جار دبینیت خو هەکە ئەو تشت نە هند یێ تەمام یان ڕۆهن و ئاشکەرا بیت، لێ مرۆڤ دزانیت کو بەری نوکە

ل ڤێرێ حەزا زڤڕینێ بۆ ناڤ مالا ڕاستەقینە یا ڕۆحێ ل دەڤ مرۆڤی پەیدادبیت. ئەفلاتۆنی ناڤەکێ یونانی دانابوو سەر ڤێ حەزێ و دگوتێ "ئێروس" ئانکو حەژێکرن. ل سەر پەڕێن ئەڤینێ، ڕۆح دزڤڕیتە وارگەهێ خوە یێ ڕەسەن د جیهانا بیرۆکەیان دا ئەو ژی پشتی کو ژ زیندانا لەشی دەردکەڤیت.

بلەز دێ دووپاتییێ ل سەر هندێ کەم کو ئەفلاتۆن خۆلەکا تەمام یا ژیانەکا نموونەیی بۆ مە وێنە دکەت. هەموو مرۆڤ ناهێلن ڕۆحا وان ئازاد ببیت و بزڤڕیتە جیهانا بیرۆکەیان. پتریا مرۆڤان کو ب ڕەنگڤەدانا وێنەیێ بیرۆکەیان ڤە گرێددەن کو ئەڤ ڕەنگڤەدانە یان سیتافکە دناڤ جیهانا هەستان دا هەیە.

دەمێ ئەو هەسپەکی دبینن، ب تنێ وی هەسپی دئینە پێشچاڤێن خوە و ب چ ڕەنگان وی تشتێ ڕەسەن "قالب"ی نابینن یێ هەموو هەسپ ل بەر هاتینە دروستکرن "مرۆڤ دچیتە د لێنانگەهێ ڤە و دەست ب خوارنا پارچەیێن کێکێ دکەت بێ کو پرسیارێ بکەت کا چەوا هاتینە دروستکرن". ئەفلاتۆن بۆ شێوازێ هزرکرنا فەیلەسۆفان وێنە دکەت، ب ڕەنگەکی کو هەموو فەلسەفەیا وان وەك شرۆڤەیەکا ڕەفتارین فەلسەفی بهێتە خواندن.

سۆفیا، دەمێ تو سیبەرەکێ دبینی، تو دزانی کو تشتەکی ئەو سیبەر یا پەیداکری، بۆ نموونە سیبەرا گیانەوەرەکی: دبیت ئەو گیانەوەر هەسپ بیت لێ تو نە یا پشتڕاستی کا ب دروستاهی چ گیانەوەرە. لێ دەمێ تو ل پشت خوە دزڤڕی و هەسپی دبینی، دێ بینی هەسپەکێ گەلەك جوانە و سەروچاڤێن وی گەلەك باشتر ژ سیبەرا وی خویا دکەن.

ب دیتنا ئەفلاتۆنی، هەموو دیاردەیێن سروشتی ب تنێ سیبەرا هندەك وێنە و بیرۆکەیێن هەتا هەتایی نە. هەردیسان وی تیبینیا هندێ دکر کو پتریا مرۆڤان دناڤ ڤان سیبەران دا دژین و هزر دکەن ئەڤ سیبەرە تشتێ یەکانەیە د هەبوونێ دا، ژبەرکو ئەو وان تشتان وەکو سیبەر نابینن بەلکو هزر دکەن ئەڤە تشتێن ڕاستەقینەنە. ژبەر هندێ ئەو سروشتێ ڕۆحا خوە یا نەمر ژبیر دکەن.

---

جارەکێ مرۆڤی ئەو تشت یێ دیتی و دێ هەر هزرێن خوە کەت کا ل کیڤە دیتیە. ل دووڤ باوەریا ئەفلاتۆنی، روحا مە بەری نوکە ئەو تشت دناڤ جیهانا بیرۆکەیان دا دیتیە.

## ڕێکا دەرکەفتنێ دناڤ تارییاتیا شکەفتێ دا

ئەفلاتۆن بۆ مە نموونەیەکێ ڤەدگێڕیت کو هەمان ئەو تشتە یێ من ژی دڤیای بێژم، ئەو ژی نموونەیا شکەفتێ یە و ل ڤێرێ ئەز دێ ل دووڤ شێوازێ خوە بۆ تە ڤەگێڕم:

هزر بکە کومەکا زەلامان د شکەفتەکێ ڤە د زیندانکرینە و پشتا وان یا ل دەرگەهێ شکەفتێ و دەست و پێن وان ژی باش دگرێداینە، ب ڕەنگەکێ هۆسا کو ئەو نەشێن ل دور خوە بزڤڕن و ژ بلی ئەو دیوارێ ل بەر سینگێ وان چ تشتێن دی نابینن. ل پشتا وان دیوارەکێ دی هاتە دانان و کومەکا زەلامێن دی یێن شێوەیێن وان جودا جودا ل سەر وی دیواری هاتن و چوون. ژبەرکو ئاگرەك ژی ل پشت وی دیواری هاتبوو هەلکرن، سیبەرا وان زەلامێن دهاتن و چوون ل سەر دیوارێ دوماهیا شکەفتێ دیاردبوو.

ل ڤێرێ، ئەو زەلامێن زیندانکری ب تنێ شانۆیەکا سیتافکا زەلامان ددیت. ژبەرکو ئەڤە ژ ڕۆژا ئەو بووین ل ڤی جهی هاتینە زیندانکرن، ژبەر هندێ هزر دکر ئەڤ سیتافکە هندەك تشتێن ڕاستەقینەنە د ڤێ جیهانێ دا.

هزر بکە پشتی هینگێ زەلامەك ژ وان زەلامێن زیندانکری شیا خوە قورتال بکەت. یەکەم تشت دێ پرسیار کەت: ئەرێ ئەڤ سیبەرێن ل سەر دیوارێن شکەفتێ ژ کیڤە دهێن؟ تو بێژی چ ڕووبدەت دەمێ ئەو زەلامێن ڕاستەقینە یێن ل پشت وی دیواری دبینیت. ل دەستپێکێ دێ ڕوناهیەکا گەش چاڤێن وی ڕۆهن کەت، پاشی دیمەن و وێنەیێن جودا جودا دێ وی حێبەتی کەن ژبەرکو بەری نوکە وی خو تشتەك ژ ڤان نەدیتبوو ب تنێ سیبەرا وان نەبیت.

دێ هزرکەین ئەو شیا ب سەر دیواری بکەڤیت و ژ ئاگری دەرباز بیت و پاشی ژ شکەفتێ دەرکەڤیت. ل وی دەمی دێ چاڤێن وی ب دیتنا دیمەنێن ژ دەرڤەی شکەفتێ پتر ڕۆهن بن و پشتی پیچەکێ چاڤێن خوە دخورینیت، دێ ب دروستاهی جوانیا دیمەنێن دەوروبەری خوە بینیت و بۆ یەکەم جار دێ ڕەنگان ژێکجودا کەت. ئێدی دێ داروبار و گیانەوەران ل سەر شێوەیێ وان یێ ڕاستەقینە بینیت کو بەری نوکە ب تنێ سیتافکا وان یا خاف دیتبوو.

پاشی دێ پرسیار کەت ئەرێ ئەڤ گیانەوەر و داروبارە هەموو ژ کیڤە هاتینە. دەمێ چاڤێ وی ب ڕۆژێ دکەڤیت، دێ زانیت کو ئەو ڤێ ژیانێ ددەتە ڤان هەموو گیانەوەر و داروباران هەروەکو کا چەوا ئاگرێ شکەفتێ ڤە دبوو ئەگەر ئەو سیتافکا ل سەر دیواری ببینن.

نوکە ئەڤ کەسێ ژ شکەفتێ ڕەڤی دشێت بچیتە د سروشتی دا و ب بەختەوەری بژیت، لێ دێ هزرا خوە د وان کەسان دا کەت یێن هێشتا د شکەفتێ ڤە و نەزانن ژیانەکا هۆسا ژ دەرڤە هەیە. ژبەر هندێ ئەو دێ زڤڕیتە شکەفتێ داکو بۆ وان دیار بکەت کو ئەو سیتافکا ل سەر دیواری چ تشتێن ڕاستەقینە نینن بەلکو جیهانا ڕاستەقینە ئەوە یا ژ دەرڤەی شکەفتێ. بەداخەوە کەس باوەر ژێ ناکەت و دێ ب تبلێن خوە ئاماژێ کەنە سیبەرێن ل سەر دیوارێ شکەفتێ کو ئەو تشتێن ڕاستەقینەنە و دوور نینە ل دوماهیێ ئەو وی کەسی بکوژن ژی.

ئەو تشتێ ئەفلاتۆنی دڤیای ب ڕێکا نموونەیا شکەفتێ بۆ مە ڕۆهن بکەت ئەو ڕێك بوو یا فەیلەسۆف پێکۆلێ دکەن بەرێ مە ژ سیبەرێن نەڕاستەقینە و نەپشتڕاست بدەنە بیرۆکەیێن ڕاستەقینە یێن خوە ل پشت دیاردەیێن سروشتی ڤەشارتین.

هەردیسان مەرەما وی ژ وی کەسێ ئازاد ژ لایێ زەلامێن شکەفتێ ڤە هاتیە کوشتن، سۆکرات بوو، چونکی ئەو هات و نەخوشی گەهاندە دیتنێن وان یێن شاش و پێکۆل دکر وان هشیار بکەت. ب ڤی ڕەنگی نموونەیا شکەفتێ بوویە هێمایەك بۆ چاڤنەترسیا فەیلەسۆفان و بەرپرسیاریا وان ل هەمبەر مرۆڤان.

ئەفلاتۆنی دڤیا دووپات بکەت کو هەڤدژیا دناڤبەرا تاریاتیا شکەفتێ و سروشتێ ژ دەرڤە دا، هەمان ئەو هەڤدژیە یا دناڤبەرا جیهانا هەستان و جیهانا بیرۆکەیان دا. ل دەڤ وی، سروشت نەتشتەکێ تاری و خەمگینە لێ ب هەڤبەرکرن دگەل جیهانا بیرۆکەیان، یا تاری و خەمگینە، هەروەکو کا چەوا وێنەیێ کچەکا جوان نەیێ تاری و خەمگینە، لێ پا چ پێنەڤێت نە وەکو کچا ڕاستەقینە ب خوەیە.

# شاهنشینا فەلسەفێ

نموونەیا شکەفتێ یا ئەفلاتۆنی یا هەڤدەم بوو دگەل دانوستاندنا وی یا ب ناڤێ "کومار" کو د ڤێ دانوستاندنێ بەحسێ "وەلاتەکێ نموونە" یان "یوتوبیا" دکەت. کورتیا وێ چەندێ ئەوە کو پێدڤیە فەیلەسوٚف ڤی وەلاتی ب ڕێڤە ببەن. ژ بۆ دووپاتکرنا ڤێ چەندێ ژی لەشێ مرۆڤی وەکو نموونە دئینیت.

ب دیتنا وی، لەشێ مە بۆ سەر سێ بەشێن سەرەکی دهێتە دابەشکرن: سەر و سینگ و هناڤ. بەرامبەر هەر یەك ژ ڤان بەشان ساخلەتەك ژ ساخلەتێن ڕۆحێ هەیە: سەر بنگەهێ ئەقلی یە، سینگ بنگەهێ خواستایە و هناڤ ژی بنگەهێ حەز و دلچونایە.

بەرامبەر هەر یەك ژ ڤان ساخلەتێن ڕۆحێ ژی، پەیوەندی دگەل تشتەکێ نموونەی یان باش هەیە: دڤێت ئارمانجا ئەقلی پەندیاری "حکمەت" بیت و خواست ژی دڤێت بەلگەیەکی ل سەر چاڤنەترسیێ پێشکێش بکەت، ل دوماهیێ ژی پێدڤیە مرۆڤ حەز و دلچونێن خوە ڕێکبێخیت داکو مرۆڤ بشێت هەڤسەنگیا خوە بپارێزیت. چ مرۆڤێن د گونجای و هەڤسەنگ نابن ئەگەر هەر سێ بەشێن لەشێ وی پێکڤە کارنەکەن. پێدڤیە ل قوتابخانێ نیشا قوتابیان بدەن کا دێ چەوا حەزێن خوە ڕێکئێخن و کونترۆلێ ل سەر کەن، پاشی نیشا وان بدەن کا چەوا دێ وێرەکی و چاڤنەترسیێ ل دەڤ خوە پەیداکەن و ل دوماهیێ پێدڤیە ئەقل بەرێ وان بدەتە پەندیاریێ.

ل دووڤ ڤی بنیاتی، ئەفلاتۆنی هزرا خوە د وەلاتەکی دا دکر کو ل دووڤ بنیاتێ پێکهاتەیا لەشێ مرۆڤی بهێتە ئاڤاکرن. وێنەیێ هەر سێ بەشێن وی ژی وەکو سەر و دل و زکی بن، ڤی وەلاتی زێرەڤان ، شەڕکەر (لەشکەر) و کرێکار (بۆ نموونە جوتیار) هەبن.

چ پێنەڤێت ل ڤێرێ ئەفلاتۆن پشتا خوە ب نوشداریا گریکی گەرم دکەت. دەمێ لەش و ئەقلێ مرۆڤی ب شێوەیەکێ باش کار بکەت، دێ مرۆڤەکێ هەڤسەنگ و ڕێکخستی بیت. د ڤی باژێرێ نموونەی و بەرکەفتی دا، پێدڤیە هەر کەسەك ل جهێ خوە کار بکەت داکو باژێرەکێ یەکگرتی پێکبینن.

فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی بۆ باژێری، هەروەکو گشت دیتنێن وی یێن دی یێن فەلسەفی، دکەڤنە د چوارچۆڤەیێ ڕاشیونالیزمێ دا. ل ڤی وەلاتێ نموونەی، پێدڤیە کەسێن ئەقلمەند فەرمانڕەوایێ لێ بکەن هەروەکو کا چەوا سەر کونترۆلێ ل سەر لەشی دکەت. ئانکو پێدڤیە حوکمێ باژێری بکەڤیتە د دەستێ فەیلەسۆفان دا.

ل ڤێرێ دێ خشتەیەکێ سادە کێشین ژ بۆ هەڤبەرکرنا پارچەیێن لەشی و باژێری.

| لەش | ڕۆح | ساخلەت | باژێر |
|---|---|---|---|
| سەر | ئەقل | پەندیاری | زێرەڤان |
| دل | خواست | وێرەکی | شەڕکەر |
| زك | حەز | هەڤسەنگی | کرێکار |

دبیت باژێرێ نموونەیی یێ ئەفلاتۆنی بیرا مە ل سیستەمێ تەخێن گرتی یێن کەڤن ل وەلاتێ هندێ بینیت، ب ڕەنگەکی هەر کەسەکی کارێ خوە یێ تایبەت هەبوو و بۆ بەرژەوەندیا گشتی کار دکر. ل سەردەمێ ئەفلاتۆنی، ئەڤ سیستەمە ل وەلاتێ هندێ دهاتە پەیرەوکرن: تەخا فەرمانڕەوانیان "تەخا زەلامێن ئولی"، تەخا شەڕکەران، تەخا بازرگان و جوتیاران و ل دوماهیێ ژی تەخا پیشەکار و خزمەتکاران.

لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆ، ئەو باژێرێ ئەفلاتۆنی خەون پێڤە ددیتن، دهێتە ناڤکرن ب وەلاتێ دیکتاتوری "توتالیتاری". لێ تشتێ بالکێش ل ڤێرێ ئەوە ژن ژی وەکو زەلامان دشێن بگەهنە تەخا فەرمانڕەوایان. فەرمانڕەوای پشت بەستنێ دکەتە سەر ئەقلی و ب دیتنا ئەفلاتۆنی ژنێ ژی وەکو زەلامان ئەقل هەیە، ئەو دشێن ڤی کاری بکەن ئەگەر وەکو زەلامان بهێنە پەروەردەکرن و خوە ژ کاروبارێن ناڤمالێ و خوەدانکرنا زارۆیان بدەنە پاش.

ئەفلاتۆنی دڤیا خێزان و ملکێ تایبەتێ ڕێڤەبەر و زێرەڤانان نەهێلیت. ب دیتنا وی، پەروەردەکرنا زارۆیان ژی گەلەك ژ هندێ گرنگترە بکەڤیتە سەر ملێن کەسەکی ب تنێ، بەلکو دڤێت بەرپرسیاریا پەروەردەکرنا زارۆیان بێخیتە ستۆیێ خوە "ئەو یەکەم فەیلەسۆف بوو داخوازا ڤەکرنا باخچەیێن زارۆیان و قوتابخانەیێن تێکەل کری".

پشتی ئەفلاتۆن تووشی چەندین تێکچوونا ل سەر ئاستێ سیاسی بووی، دەست ب نڤیسینا دانوستاندنا خوە یا ناڤدار "یاسا" کر کو تێدا بەحسێ وی باژێری دکەت یێ یاسا سەروەر بیت و ب رێڤە دبەت کو ئەو ژی باژێرەکێ "دادپەروەرە". هەلبەت پشتی باژێرێ "نموونەی". د ڤی وەلاتی دا، ژ بۆچوونێن خوە دەربارەی نەهێلانا خێزان و ملکێ تاکەکەسی پەشیمان دبیت. ب ڤی رەنگی ئازادیا ژنان سنووردار دکەت، لێ دگەل هندێ ژی دبێژیت: "وەلاتەك کو ژنێن خوە فێرنەکەت، وەکو وی مرۆڤی یە یێ ب تنێ راهێنانان ب دەستێ خوە یێ راستێ دکەت."

ب شێوەیەکێ گشتی ئەم دشێین بێژین ئەفلاتۆنی دیتنەکا گەشبین ل هەمبەر ژنێ هەبوو ب تایبەت ئەگەر دگەل بۆچوونێن خەلکێ وی سەردەمی ل دور ژنێ هەڤبەر بکەین. د دانوستاندنەکا خوە دا بەحسێ ژنەکا دیندار یا ئەفسانەی دکەت ب ناڤێ "دیوتیما" کو وێ زیرەکیا خوە یا ئەفسانەی دایە ئەفلاتۆنی.

دەمێ سۆفیا ل سەر قورمەکێ دارێ مژوولی خواندنا ڤی بەشێ ل دور ئەفلاتۆنی بووی، هەتاڤ ل لایێ رۆژهەلاتی ژ پشت کرگێن نزم بلند ببوو. ل دەمێ سۆفیا گەهشتیە سەرهاتیا وی زەلامێ ژ شکەفتێ رەڤی، تیشکێن هەتاڤێ دناڤبەرا چەڤێن داران دا دکەفتنە سەر سەروچاڤێن وێ، لەورا وێ چاڤێن خوە ژ ڤێ رۆناهیا دژوار دخوراندن.

وێ هزرکر ئەو ژی یا ژ شکەفتێ دەردکەڤیت. پشتی وێ بابەتێ ئەفلاتۆنی خواندی، ئێدی وێ ب چاڤەکێ دی تەماشەی سروشتی کر. خوە دا بێژی ئەو یا تووشی نەخوشیا کورەبوونا رەنگان* بووی.

هەرچەندە وێ بەری نوکە گەلەك سیبەر دیتبوون، لێ هۆسا دیارە وێ چ جاران بیرۆکە ب ڤێ گەشاتیا خوە نەدیتبوون.

---

* نەخوشیا کورەبوونا رەنگان Blindness نەخوشیەکا بۆماوەیی یە کو مرۆڤ نەشێت یەك ژ هەر سێ رەنگێن سۆر و زەر و شین یان تێکەلێن وان ببینیت. بۆ نموونە کەسێ توشبووی نەشێت جوداهیێ بێخیتە دناڤبەرا کەسك و سۆری دا یان ژی زەر و پرتەقالی دا.

سەرەڕای ڤێ چەندێ، ئەفلاتۆن نەشیا ب تەمامی باوەریێ بۆ وێ ل دور وێنەیێن نەمر چێکەت. لێ وێ ئەڤ چەندە وەك بیرۆکەیەکا جوان ل قەلەم دا: ئەو ژی هزر بکەین کو هەر تشتەکێ زیندی ب تنێ کوپیەکا نەتەمام یا وێنەیێن نەمرە د جیهانا بیرۆکەیان دا. ئەرێ ما گول و داروبار و گیانەوەر، هەتا مرۆڤ ژی بونەوەرێن نەتەمامن؟

هەموو تشتێن ل دەوروبەری وێ د زیندی و جوان بوون کو وەلێ کر باش چاڤێن خوە بپەڕخینیت و تەماشەی وان بکەت. ڕاستە خو تشتەك ژ وان بۆ هەتا هەتاییێ نامینیت، لێ پشتی سەد سالێن دی، دێ گەلەك گول و گیانەوەر و داروبارێن دی یێن هەڤشێوە شین بن. باشە ئەگەر هەموو گیانەوەر و گول و هەر تشتەکێ دی یێ بەرهەڤ بیت بۆ مرن و ژناڤچوون و ژبیرکرنێ، پێدڤیە تشتەك هەبیت، ل جهەکی، بیرا خوە ل وان هەموویان بینتەڤە. سوفیاییێ هزرێن خوە د تشتێن دەوروبەری خوە دا دکرن، وێ هە سڤورەکە سوواری دارەکا کاژێ بوو و پاشی چەندین جاران ل دور قورمێ وێ زڤڕی و بلەز خوە دناڤ هندەك بەلگان ڕا ڤەشارت.

هێی تو... من بەری نوکە تو یێ دیتی! وێ ئەڤ چەندە د دلێ خوە دا دگوت. ئەو یا پشتڕاست بوو کو ئەڤە نە ئەو سڤورە بوو یێ وێ بەری هینگێ دیتی، لێ شێوێ وان وەکو یەکە، دبیت ئەفلاتۆن یێ ڕاست بیت دەمێ گوتی کو وی ڕۆحا شێوەیێ نەمر یێ سڤورەی یێ دیتی بەری ئەڤ ڕۆحە بهێتە د لەشێ وێ دا.

ئەرێ ڕاستە بەری نوکە مە ژیانەکا دی هەبوویە؟ ئەرێ ڕاستە ڕۆحا مە هەبوویە بەری کو لەشێ مە بۆ خوە ببینیت و تێدا ئاکنجی بیت؟ ئەرێ ڕاستە د ناخێ مە دا پارچەیەکا زێڕی یان ئەلماسی هەیە کو دەم نەشێت کونترۆلێ ل سەر بکەت. ڕۆحا مە بەردەوام دێ مینتە ساخ هەکە ڕۆژەکێ لەشێ مە پیربوو و ژناڤچوو؟

# كۆلكێ مایجەری

*....ئەو كچكا د خودیكیێ دا هەردوو چاڤین خوە پێكڤە دنقاندین...*

هێشتا دەمژێر حەفت كێم چارێكەكە، ئانكو وێ چ كارێن هۆسا گرنگ نەبوون لەزێ بكەت و بزڤڕیتە مال. گومان تێدا نینە دایكا وێ ژی حەز دكەت بۆ دوو دەمژمێرێن دی بمینتە د خەو چونكی ئەو حەزدكەت ل سپێدەهیێن ڕۆژێن یەكشەمبی پتر بێهنا خوە ڤەدەت.

ئەرێ ما بۆچی ئەو ل ناڤ دارستانێ ل ئەلبێرتۆ كنوكسی ناگەرییێت؟ ئەرێ بۆچی سەی ب دەنگەكێ بلند دڕەوی دەمێ دیتی ئەو یا ل دووڤ وی دكەتە غارێ؟

سۆفیا ڕابوو ژ پێرڤە و ئەو هەموو كاغەزێن ل دور ئەفلاتۆنی كرنە د زەڕفێ قەهوائی دا و ب دەستێ خوە هەلگرت و پاشی بەرەڤ وێ ڕێكێ چوو یا هێرمس تێرا چووی. دەمێ ل دوماهیێ ڕێكا سەرەكی بوویە دوو ڕێكێن ناڤنجی، ئەو د ڕێكا فرەهتر ڕا دچوو.

دەنگێ ئاوازێن چووچكان ب سەر سەر دارستانێ دا دفڕی: ل سەر داروباران، دناڤ بای دا، ل سەر گژوگیا و دارێن نزم. ڕاستە چووچك ڕۆژا یەكشەمبی ژ ڕۆژێن دی یێن حەفتیێ جودا ناكەن، لێ ئەرێ كێ نیشا وان دایە ڕۆژانە ب ڤی شێوەی ئاوازان بخوینن؟ ئەرێ ڕێكخەرەك د سەرێ هەر یەك ژ وان دا هەیە كو وەكو "بەرنامەیەكێ پێزانینان" بیت و نیشا وان بدەت كا دێ چەوا ئاوازان خوینن؟

دوماهیا ڕێکێ گرەکێ بچووك هەبوو و ل دووڤ دا بۆ لایێ خوارێ چەپ دبوو کو ب هژمارەکا مەزن یا دارێن بلند یێن کاژان هاتبوو گرتن. ل ڤی جهی، دارستان ژبەر داروباری گەلەك چڕ ببوو و ئێدی سۆفیا نەدشیا زێدەتر ژ چەند مەترەکێن ل بەر سینگێ خوە چ تشتێن دی ببینیت.

ژ نیشکەکێ ڤە، وێ پنیەکا ڕۆناهیێ یا گەش دناڤ چەقێن دارا کاژەکێ ڕا دیت. چ پێنەڤێت ئەو دەریاچەیە. هەرچەندە ل لایێ دی ڕێکەکا دی ژی دچوو سەر وێ دەریاچێ، لێ سۆفیایێ ڕێکا خوە دناڤ چەقێن وان داران ڕا کر و تێرا دەرباز بوو. وێ ژی نەدزانی کا ئەو چ دکەت، لێ هۆسا دیارە پێن وێ ئەو بەرەڤ ڤێ ڕێکێ بر.

قەبارەیێ وێ دەریاچێ هندی گۆڕەپانەکا یاریا تەپا پێی بوو. ل لایێ دی یێ ئاڤێ کۆلکەکێ بچووکێ وەکو کابینەکێ یێ بۆیاغکری ب ڕەنگێ سۆر هەبوو و ل دورماندوری وی ژی کومەکا قەدێن دارێن سپینداران هاتبوو دانان و دووکێلەکا مەزن ژ بوخیریا سوپا وی یا داری دەردکەفت.

سۆفیا هەتا سەر لێڤا ئاڤێ چوو. هێشتا کنارێن ئاڤێ د تەڕبوون و پاشی چاڤێ وێ ب بەلەمەکا بچووك کەفت کو ل سەر لێڤا ئاڤێ و ل جهەکێ هشك یا ڕاوەستیای بوو و دوو دەستك تێدابوون.

وێ تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر و دڤیا خوە بگەهینتە ڕەخێ دی یێ ئاڤێ، لێ هۆسا دیارە ئاڤ یا کوور بوو، لەوڕا نەشیا بدەتە ناڤ ئاڤێ و دەرباز بیت، ژبەر هندێ بەرەڤ بەلەمێ ڤە چوو و پالدا دناڤ ئاڤێ و پاشی چوو تێدا و ب هەردوو دەستکێن وێ پێلێن ئاڤێ پالدان هەتا پشتی دەمەکێ کێم خوە ل ڕەخێ دی یێ دەریاچێ دیتی. پاشی خوە هاڤێتە سەر ئەردێ هشك و پێکۆل کر بەلەمێ ژی بکێشتە سەر هشکاتی.

ل ڤی ڕەخێ ئاڤێ، ئاستێ ئەردی ژ ڕەخێ دی یێ ئاڤێ خوارتر بوو. ژبەر هندێ ئەو زڤڕی و خوە نێزیکی وی کۆلکی کر. وێ قەت باوەر ژ وێرەکیا خوە نەدکر کو بەرێ وێ دابیتە کارەکێ هۆسا، ئەرێ ئەو چەوا وێریا بهێتە ڤی جهی؟ هەلبەت وێ ب خوە ژی بەرسڤا ڤێ پرسیارێ نەدزانی، لێ یا پشتڕاست بوو تشتەکی د ناخێ وێ دا ئەو پالدایە ڤی کاری بکەت.

سۆفیا چوو بەر دەرگەهی و قوتا. بۆ ماوەیەکی خوە گرت لێ هەر کەس نەهات دەرگەهی ڤەکەت، ژبەر هندێ ئەو نەچاربوو دەستکێ دەرگەهی بادەت و بچیتە دژوور ڤە.

- "هێی، کەسەك د ژوور ڤە هەیە؟"

دەمێ وێ کەس د ژوور ڤە نەدیتی، چوو د هۆلا وێ یا سەرەکی ڤە بێ کو دەرگەهی ل پشت خوە بدائێخیت. یا دیاربوو کو ئەڤ جهە نەییێ بەردایە بەلکو کەسەك تێڤە دژیت، چونکی هێشتا ئاگرێ کوچکێ وی یێ هەلبوو. چ پێنەڤێت ئەو کەسێن د ڤی خانی ڤە ئاکنجی، بەری دەمەکێ کێم یێن چووینە ژ دەرڤە.

ل سەر مێزەیەکا مەزن، وێ ئامیرەکێ تایپکرنێ و کومەکا پەرتووك و چەندین پێنوس و کاغەزێن جۆراوجۆر دیتن. ل هەمبەر پەنجەرا بەرێ وێ دکەفتە دەریاچێ، کورسیك و مێزەکا دی یا بچووك د دانای بوون. ژ بلی ڤان تشتان، چ کەلوپەلێن دی د وی کۆلکی ڤە نەبوون، لێ یەك ژ دیوارێن وی ب هژمارەکا پەرتووکان هاتبوو نخافتن. هەردیسان ل سەر وێ مێزا سپی، خودیکەکا رۆناهیێ یا گرۆڤر و مەزن دناڤ چوارچۆڤەیەکێ مسی دا هاتبوو دانان و هۆسا دیارە ئەو ژی یا کەڤن بوو.

ل سەر لایەکێ دی یێ دیواری، دوو کەڤالێن دی هاتبوونە هەلاویستن: د کەڤالەکی دا، دیمەنێ خانیەکێ سپی ل نێزیکی بەندەرەکی هاتبوو کێشان. ئەو بەندەر ب رەنگێ سۆر هاتبوو رەنگکرن و دناڤبەرا خانی و بەندەرێ دا باخچەیەکێ سەرئەڤراز و پڕ ژ دارێن سێڤان و کومەکا دارێن بچووك و کومەکا بەران هاتبوو کێشان. کومەکا دار سپینداران ژی وەکو پەرژانەکی ل دورماندوری خانی هاتبوو کێشان. ناڤێ وی کەڤالی "بجێرکلی" ئانکو "ل بن سیبەرا دارسپینداران" بوو.

کەڤالێ دی یێ کەسەکێ دانعەمر بوو کو ل سەر کورسیکەکێ روونشتبوو خوارێ و پەرتووکەك ل سەر پێن وی بوو. ل پشت وی ژی کەنداڤەکێ بچووك و داروبار هاتبوونە کێشان. ناڤێ وی کەڤالی ژی "بێرکلی" بوو. یا دیاربوو کو ژییێ وی کەڤالی چەندین سال بوون، رەنگە چەندین چەرخ بن. نیگارکێشی ناڤێ خوە "سمیبرس" ل بنێ کەڤالی کێشابوو.

بجێرکلی و بێرکلی، ئەڤە چ جوداهیا سەیرە؟

سۆفیا ل وارا هات و چوو دا بزانیت کا چ دناڤ ڤی کۆلکی دا هەیە، دەرگەهەك بەرەڤ لێنانگەهەکا بچووك دچوو. د وێ لێنانگەهێ ڤە کومەکا سێنیك و گلاسان ل سەر ڕەفانکەکا تەقنێ هاتبوونە دانان و هێشتا د تەڕ بوون و هندەکان ژی بەرمایکێن سابینێ مابوونە پێڤە، ئانکو هۆسا دیارە بەری دەمەکێ کێم یێن هاتینە شووشتن. کومەکا بەرمایکێن خوارنێ ژی کەفتبوونە سەر فەرشێ لێنانگەهێ، ئانکو دیارە سەیەك یان پشیکەك ژی د ڤی کۆلکی ڤە دژیت.

سۆفیا زڤڕی ناڤ هۆلا سەرەکی ڤە و پاشی چاڤێ وێ ب دەرگەهەکێ دی کەفت کو بەرەڤ ژوورا نڤستنێ دچوو. د وێ ژوورێ ژی ڤە هندەك بەتەنیك ل سەر دوشەکێ بوون. پاشی چاڤێ وێ ب هندەك داڤێن پرچێ یێن ڕەنگ سۆر کەفت. ئەڤە ئەو بەلگە بوو یێ سۆفیا لێدگەریای. بەلێ ئەڤە مالا وان هەردووکانە: مالا ئەلبێرتۆ کنوکس و هێرمسی.

دەمێ دووبارە سۆفیا زڤڕیە ناڤ هۆلێ، ئەو ل بەرامبەر خودیکەکا ڕۆناهیێ یا مەزن ئەوا ب دیواری ڤە هەلاویستی ڕاوەستیا. خودیك گەلەك یا کەڤن بوو، ژبەر هندێ وێنەیەکێ شێلی تێدا دەردکەفت. سۆفیایێ سەروچاڤێن خوە خاڤ و ڕەق کرن هەروەکو کا چەوا گەلەك جاران ل بەر خودیکا سەرشوویا خوە ڤە ژی ئەڤ چەندە دکر. هەلبەت وێنەیێ دناڤ خودیکێ ژی هەمان لڤینێن وێ دووبارە دکرن. ئەڤ چەندە تشتەکێ ئاسایی بوو لێ ژ نیشکەکێ ڤە تشتەکێ سەیر ڕوودا.

سۆفیایێ دیت ژ نیشکەکێ ڤە ئەو کچکا د خودیکێ دا هەردوو چاڤێن خوە پێکڤە نقاندن، سۆفیا ترسیا و پیچەکێ بەرەڤ پاشڤە زڤڕی. ئەرێ چەوا ئەو دشێت تەماشەی وێ کچکێ بکەت ئەگەر هەردوو چاڤێن خوە پێکڤە نقاندبن. نەك هەر ئەڤ چەندە ب تنێ، بەلکو وێ کچا دناڤ خودیکێ دا هۆسا تەماشەی سۆفیایێ دکر هەروەکو دڤیا بێژیتێ: ئەز دشێم تە ببینم، ئەز یا د ناخێ تە دا.

دلێ وێ بلەز خوە قوتا. هەر ل وی دەمی، دەنگێ ڕەوینا سەیەکی ژ دوورڤە هاتە گوهێن وێ. چ پێنەڤێت ئەو هێرمسە، ژبەر هندێ دڤێت بلەز خوە ڤەشێریت.

د هەمان دەم دا چاڤێن وێ ب جزدانکەکا کەسك ب ڕەخ خودیکا ڕوناهیا ل سەر مێزێ کەفت. سۆفیایێ جزدانك هەلگرت و ب هشیاری ڤەکر. وێ پارچەیەکا پارەیێ پێنجی

کورونی تێدا دیت، زێدەباری بەلگەنامەیەکا قوتابخانێ کو وێنەیێ کچەکا پرچ زەر پێڤە بوو و ناڤێ وێ هێلد موللەر کناگ ل سەر بوو و ناڤێ قوتابخانێ ژی "لیلساند" یا ئامادەی بوو.

سۆفیایێ هەست ب سەرماتیەکێ دکر. سەی ژی هێشتا درەوی، ژبەر هندێ یا ل سەر وێ پێدڤی بو بزووترین دەم وی جهی بهێلیت. دەمێ ئەو ب رەخ مێزێ ڤە بوری، چاڤێ وێ ب تشتەکێ دناڤبەرا پەرتووك و کوما کاغەزان دا کەفت، ئەو ژی زەرفەکێ مەزن و سپی بوو و ناڤێ سۆفیایێ ل سەر نڤیسای بوو.

بێ پتر خوە گیرو بکەت و هزرا خوە تێدا بکەت، یەکسەر دەست هاڤێتە وی زەرفی و کرە دگەل زەرفێ دی یێ وانەیا ئەفلاتۆنی تێدا و بلەز ژ کۆلکی دەرکەفت و دەرگەهـ ل دووڤ خوە ڕا گرت.

هێدی هێدی دەنگێ ڕەوینا سەی بلندتر لێ دهات. چ پێنەڤێت پشتی خولەکەك یان دووێن دی دێ گەهیتە وێرێ، لێ یا ژ وێ نەخوشتر بەلەم ل جهێ خو نەمابوو. لێ پشتی چەند چرکەیان وێ بەلەم دناڤەڕاستا دەریاچێ دا دیت و یەك ژ دەستکێن وێ ب سەر ئاڤ کەفتبوو.

ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕی کو سۆفیا نەشیابوو ب شێوەیەکێ باش بەلەمێ ڕاکێشیتە سەر هشکاتی. پاشی وێ هەستپێکر دەنگێ ڕەوینا سەی ژ لایێ دی یێ دەریاچێ دهات و تشتەك ناڤ داروباران دا لڤلڤی.

سوفیایێ هەست ب سەرگێژیێ کر. ئێدی نەشیا پتر خوە بگریت و یەکسەر خوە هاڤێتە دناڤ گژوگیایێ ل پشت کۆلکی و پشتی هینگێ نەچاربوو دناڤ گومەکا ئاڤێ ڕا دەرباز بیت کو هەتا سەر چوکان ئاڤا وێ یا کوور بوو و چەندین جاران پێ وێ دکەفتە بەر بەرەکی یان ب گیایەکی ڤە دئالزیا. لێ ئەو یا نەچار بوو بلەز ژ وێرێ بچیت ژبەرکو وێ چ ڕێکێن دی نەبوون و پێدڤی بوو ب هەر ڕێکەکا هەی خوە بگەهینتە مال.

ل دوماهیێ سۆفیا گەهشتە سەر ڕێکەکێ، ئەرێ تو بێژی ئەڤە هەمان ئەو ڕێك بیت یا بەری نوکە ژێ هاتی؟ سۆفیایێ جلکێن خوە یێن تەڕ گڤاشتن و ئاڤا جلکێن وێ ژی چپك چپك کەفتە سەر ئەردی. پاشی وێ دەست ب گریێ کر. ئەرێ بۆچی ئەو هندە یا بێ ئاقل بوو؟ یا ژ هەموویێ ژی نەخوشتر چیرۆکا بەلەمێ بوو؟ قەت وێنەیێ بەلەمێ و

دەستکێ وێ یێ دناڤ ئاڤێ دا ژ پێشچاڤێن وێ نەدچوو. ئەنجامێ ڤێ سەرهاتییێ گران ل سەر وێ ڕاوەستیا و یا ژێ پەشیمان بوو.

ل دەمەکی، ئەو فەیلەسۆف دێ هێتە سەر لێڤا ئاڤێ و دێ پێدڤی ب بەلەما خوە بیت داکو پێ بزڤڕیتە مالا خوە! سۆفیایێ هەستپێکر وێ کارەکێ خڕاب یێ کری ل دەمەکی ئەڤ چەندە د هزرا وێ دا نەبوو!

باشە ئەڤ زەڕفە؟ دبیت بابەتێ وی گرانتر ل سەر وێ براوەستیت! ئەرێ بۆچی وێ ئەڤ زەڕفە ژ سەر مێزێ ڕاکر و دگەل خوە ئینا؟ ڕاستە ناڤێ وێ ل سەر بوو و دا بۆ وی هێتە هنارتن، لێ دگەل هندێ ژی وێ هەست ب پەشیمانییێ کر و هزرکر دزیەك یا کری، زێدەباری ڤێ چەندێ، ب ڤی کاری بۆ فەیلەسۆفی دێ دیار بیت کو ئەو یا چوویە د کۆلکێ وی ڤە.

سۆفیایێ کاغەزەکا بچووك ژ زەڕفی ئینا دەرێ و دەست ب خواندنا وێ کر:

***ئەرێ کیژ ژ وان ل بەراهیێ دهێت؟ مریشك یان بیرۆکەیا مریشکێ؟***

***ئەرێ مرۆڤی هندەك بیرۆکەیێن ژکماکی هەنە؟***

***جوداهیا دناڤبەرا ڕووەك و گیانەوەر و مرۆڤی دا چیە؟***

***بۆچی باران دباریت؟***

***مرۆڤی پێدڤی ب چ هەیە داکو ژیانەکا بەختەوەر ببورینیت؟***

سوفیا نەشیا د ڤی کاودانی دا هزرێن خوە د ڤان پرسیاران دا بکەت. وێ هزرکر ڤان پرسیاران پەیوەندی ب فەیلەسۆفێ بهێت ڤە هەیە. ئەرێ مانە ناڤێ وی ئەڕستۆیە؟

دیتنا پەرژانێ مالێ، هەلبەت پشتی غاردانەکا دوور و درێژ دناڤ دارستانێ دا، هۆسا هاتە بەر چاڤێن وێ کو ها وەختە ئەو ژی دێ دناڤ ئاڤێ دا نقووم ببیت. دەمێ گەهشتیە ناڤ کۆلکێ خوە و تەماشەی دەمژمێرا خوە کری کو ب درێژاهیا ڤێ گەریانێ دا تەماشەی وێ نەکربوو، دەمژمێر ببوو 10:30 سپێدێ.

سۆفیایێ زەڕفێ سپی کرە دناڤ سندوقەکا مەزن دا کو بەری هینگی ژی هەموو زەڕفێن دی د وێ سندوقێ دا دپاراستن. کاغەزا بچووك یا پرسیاران کرە دناڤ گورا خوە دا.

دەمێ سۆفیا گەهشتیە مال، دایکا وێ ب تێلەفۆنێ دگەل کەسەکێ دئاخفت، لێ دەمێ چاڤێ وێ ب سۆفیایێ کەفتی، یەکسەر تێلەفۆنا خوە دانا.

- "سۆفیا، ئەڤە تو ب ڤی سەروبەری ڤە ژ کیڤە دهێی؟"

دەڤێ وێ تێکئالزیا و گوت: "ئەز... ئەز چووبوومە گەریانەکێ دناڤ دارستانێ دا."

- "ئانکو هۆسایە! لێ سەروبەرێ تە هۆسا خویا ناکەت!"

سۆفیایێ کو هێشتا چیك ژ کراسێ وێ دکەفتن، بەرسڤا دایکا خوە نەدا

- "نوکە من تێلەفۆنا جوانایێ دکر."
- "جوانایێ؟"

دایکا وێ دەستەکێ جلکێن هشك بۆ ئینان و کرنە بەر، پیچەك مابوو کاغەزا پرسیارێن مامۆستایێ وێ یێ فەلسەفی دناڤ گورا وێ دا ببینیت، لێ بەری وە بکەت، چوو د لێنانگەهێ ڤە داکو گلاسەکا شیری یێ کەل بۆ سوفیایێ بینیت.

پاشی پرسیار ژێ کر: "باشە تو دگەل وی بووی؟

- "دگەل وی؟"
- "بەلێ دگەل وی، دگەل "کێڤریشکا خوە"

سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند و ب نەخێر بەرسڤا وێ دا.

- " وەختێ هوون دگەهنە هەڤدوو، هوون چ دکەن؟ بۆچی تو هۆسا تەڕبوویە؟"

وێ بەرێ خوە ژ مێزێ نەدا پاش و سەرێ خوە بلند نەکر. لێ د دلێ خوە دا پیچەکێ کەنیا وێ دهات. هەی ژارێ دایکا من یا بەلەنگاز! ژبەر ڤێ چەندێ دلێ وێ د دووڤ من ڕا بوو؟

پاشی دووبارە سەرێ خوە هەژاند و بەرسڤا وێ ب نەخێر دا، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر هندەك پرسیارێن نوو بهێنە ئازراندن.

- "ئەز یا ڕژدم ڕاستیێ بزانم. شڤێدی ب شەڤ تو دەرکەفتبووی، مانە هۆسایە؟"

- "بۆچی تو ب جلك ڤە نڤستبووی؟ بۆچی پشتی تە زانی خەوێ چاڤێن من گرتن تو ژ ژوورا خوە دەرکەفتی و چوویە ژ دەرڤە؟ ئەرێ ما تە ژبیرکریە هێشتا ژیێ تە ژ 14 سالان نەبوریە. من دڤێت بزانم کا تو دگەل کێ دەردکەڤی؟"

سۆفیایێ دەست ب گرییێ کر. پاشی دەست ڤەگێڕانا هەموو تشتێن هاتینە سەرێ وێ بۆ دایکا خوە کر. هێشتا ئەو ل ژێر کاریگەریا ترسا دایکا خوە بوو. گەلەك جاران دەمێ ئەم دترسین، ئەم هەموو ڕاستیان دکەینە سەر بەرکێ.

سۆفیایێ بۆ دایکا خوە ڤەگێڕا کا چەوا سپێدێ زوو ژ خەو هشیاربوو و خەوا وێ نەدهات و پاشی چوو ناڤ باخچەی. پاشی بەحسێ کۆلکی و بەلەمێ بۆ کر، هەردیسان ژبیرنەکر و بەحسێ وێ خودیکا سەیر ژی بۆ دایکا خوە کر، لێ تشتێ باش ئەو بوو شیا هەموو تشتێن پەیوەندی ب وانەیێن فەلسەفێ ڤە هەین بڤەشێریت و بەحس نەکەت. هەردیسان وێ چ تشت دەربارەی جزدانکا کەسك ژی نەگوتن بێ کو بزانیت ئەگەرێ پاراستنا ڤێ نهێنیێ چ بوو، لێ وێ هەست ب هندێ دکر کو پێدڤیە چیرۆکا خوە دگەل هێلدێ وەکو نهێنیەکێ بپارێزیت.

دایکا وێ کچا خوە هەمبێز کر، ل وی دەمی سۆفیا تێگەهشت کو ژ نوو دایکا وێ باوەر ژ وێ کر. سۆفیایێ ب چاڤێن گری ڤە گوت: "من چ هەڤال نینن، لێ ئەڤ چەندە من ژبەر هندێ گوت چونکی هێشتا تو یا دوودل بووی دەمێ من بەحسێ کێڤریشکا سپی بۆ تە کری."

دایکا وێ گوت: "باشە، ئانکو هۆسایە! تو چووبوویە کۆلکێ مایجەری، باشە...."

سۆفیایێ ب حێبەتی ڤە پرسیار کر: "کۆلکێ مایجەری؟"

- "بەلێ، ئەو خانیکێ بچووك یێ دناڤ دارستانێ دا ئەوێ تە ئاشکەرا کری، دبێژنێ کۆلکێ مایجەر یان مایجەرستوگا، چونکی کەسەك ب ناڤێ مایجەر ژ مێژە د وی کۆلکی ڤە دژیا، ئەو کەسەکێ سەیر بوو.. ئەم دشێین بێژین یێ دین بوو. لێ ئەرێ بۆچی نوکە ئەم هزرا وی دکەین؟ لێ ئەڤە ژ مێژە ئەو کۆلك چول بووی و کەس تێڤە ناژیت."

- "تو هۆسا هزر دکەی، بەلێ پا نوکە فەیلەسۆفەك تێڤە دژیت."

- "گوهێ خوە بدێ سۆفیا، نەهێلە جارەکا دی هزرێن شاش خوە ل سەرێ تە بدەن."

سۆفیا چوو د ژوورا خوە ڤە و هزرا خوە د هەموو وان تشتان دا کر یێن هاتینە سەرێ وێ. سەرێ وێ وەکو یاریەکا سێرکێ یا پڕی قەرەبالغ لێ دهات، یاریەکا سێرکێ دەمێ فیل ب هەموو هێزا خوە ڤە دلڤلڤینیت دگەل لێبوکێ سەرەکی و ئەکتەرێن پەهلەوان و مەیمینکێن سەماکەر نیشاندانان دکەن. ئەو وێنە قەت ل سەر هزرا سۆفیایێ نەدچوو: وێنەیێ بەلەما د نیڤا دەریاچێ دا و دەستکێ ب سەر ئاڤ کەفتی. کەسەك پێدڤی ب وێ بەلەمێ یە داکو پێ بزڤڕیتە مالا خوە.

ئەو دزانیت مامۆستایێ فەلسەفی سەرا ڤێ ڕەفتارا وێ کری، وێ سزا نادەت، بەلکو دێ ل وێ بوریت ژی هەکە بزانیت ئەو یا چوویە د کۆلکێ وی ڤە. لێ پا وێ خیانەت ل سوزا خوە کر. ئەرێ دێ هۆسا سەرەدەریێ دگەل کەسەکی کەین یێ وانەیێن فەلسەفی نیشا مە ددەت؟ ئەرێ دێ چەوا شێت ڤێ چەندێ قەرەبوو کەت؟

پاشی سۆفیایێ کاغەزەکا ڕەنگ پیڤازی ئینا دەرێ و ئەڤ نامەیە نڤیسی:

*هێژایێ فەیلەسۆف.*

*ئەو ئەز بووم ل سپێدەهیا ڕۆژا یەکشەمبی هاتیمە د کۆلکێ تەڤە. من گەلەك دڤیا تە ببینم داکو ب شێوەیەکێ باشتر گەنگەشێ ل سەر هندەك بۆچوونێن فەلسەفی بکەین. نوکە ئەز ژ پشتەڤانێن ئەفلاتۆنی مە، لێ هێشتا من قەناعەت ب بۆچوونا وی نینە کو بیرۆکە یان ژی قالبێن هەر تشتەکێ د سروشتی دا، ل جیهانەکا دی هەیە. چ پێنەڤێت ئەو بیرۆکە د ناخێ مە ب خوە دا هەنە. لێ ب بۆچوونا من یا سادە و پێشبینیکری، ئەڤە چیرۆکەکا دی یە. هەروەسا ئەز دانپێدانێ بۆ تە دکەم کو ب چ ڕەنگان من قەناعەت ب هندێ نینە ڕۆحا مە یا نەمر بیت. من ب خوە چ بیرهاتن ل دور گیانەوەرێن بەری نوکە نینن. لێ هەکە تو بۆ من باوەریێ چێکەی کو ڕۆحا داپیرا من یا ڕەحمەتی دناڤ جیهانا بیرۆکەیان دا یا بەختەوەرە، دێ سوپاسدارا تە بم.*

*تە ڕاستی بڤێت، پرسیارکرن ل دور بابەتێن فەلسەفی، ئەز پاڵنەدام ڤێ نامێ بۆ تە بنڤیسم ئەوا کو من دگەل پارچەیەکا شیریناهێ کریە د زەرفەکێ پیڤازی دا، بەلکو ژ دل من دڤێت تو ل من ببوری. من پێکۆل کر بەلەمێ بکێشمە سەر هشکاتی لێ ئەز هند یا ب هێز نەبووم ڤی کاری باش ئەنجام بدەم. دبیت ژی پێلەکا ئاڤێ یا ب هێز هات بیت و بەلەم بربیتە دناڤ ئاڤێ دا.*

*هیڤیا من ئەوە تو ب سانەهی گەهشتبیە ماڵ بێ کو تو تەڕ ببی، ئەگەر نە، تو دشێی بێهنا خوە ب هندێ بینی کو ئەز ژی تەڕبووم و دبیت پەرسیڤەکا گران ژی بهێتە من، لێ چ نینە ئەز ژ هەژی ڤێ چەندێ مە.*

*من دەستێ خوە نەکریە خو تشتەکێ دناڤ کۆلکی دا، لێ مخابن بەرامبەر وی زەرفێ ل سەر مێزێ یا لاواز بووم و من هەلگرت. هەلبەت مەرەما من ئەو نەبوو تشتەکی ژ تە بدزم، لێ دەمێ من ناڤێ خوە ل سەر دیتی، من هزرکر ئەڤ زەرفە بۆ منە. ژ دل داخوازا لێبورینێ دکەم و سوزێ ددەم جارەکا دی تە بێ هیڤی نەکەم.*

*تێبینی: پاشی هەر یەکسەر ب کووراتی دێ هزرێن خوە د پرسیارێن نوو دا کەم.*

*تێبینیەکا دی: ئەرێ ئەو خودیکا ل سەر مێزێ، خودیکەکا ئاسایی یە یان ژی خودیکەکا سێژەبەندیێ یە؟ من ئەڤ پرسیارە ژ بەر هندێ ژتە کر چونکی ئەز فێری هندێ نەبوویمە وینەیێ خوە د خودیکەکێ دا ببینم و هەردوو چاڤێن خوە پێکڤە بنقینم.*

قوتابیا تە یا گوهدار

سۆفیا

سوفیایێ دوو جاران کاغەزا پرسیاران بەری بکەتە د زەرفی دا خواندبوو، لێ وەکو نامەیا بەرێ نە هند یا فەرمی بوو. بەری سۆفیا بچیتە د لێنانگەهێ ڤە پارچەیەکا شیریناهیێ بینیت، دووبارە ئەو کاغەز دەرێخست یا پرسیار و ڕاهێنانێن هزری ل سەر نڤیسای:

ئەرێ کیژ ژ وان ل بەراهیێ دهێت؟ مریشك یان بیرۆکەیا مریشکێ؟

ل دەستپێکێ ئەڤ پرسیارە ژی وەکو پرسیارا مریشکێ و هێکێ یا ب زەحمەت بوو. چ هێك بێ مریشك پەیدانابن و چ مریشك ژی بێ هێك نابن. ئەرێ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ ژی وەکو مەتەلا مریشك و هێکێ یا ئالۆز و ب زەحمەتە؟

سۆفیا باش تێدگەهشت کا بۆچوونا ئەفلاتۆنی ل سەر ڤێ چەندێ چ بوو: بیرۆکەیا مریشکێ د جیهانا بیرۆکەیان دا هەیە بەری کو خو مریشکەك د جیهانا هەستان دا هەبیت. ل دووڤ بۆچوونا ئەفلاتۆنی، ڕۆحا مە بەری بهێتە دناڤ لەشێ مە دا، ل دەستپێکێ بیرۆکەیا مریشکێ یا دیتی، لێ مانە ئەڤە ئەو خالە یا سۆفیا دگەل ئەفلاتۆنی هەڤدژ؟ چەوا مرۆڤەکی بەری هینگێ نە چ مریشك و نە چ وێنەیێن مریشکان دیتبن، دێ بیرۆکەیەك ل دور مریشکێ ل دەڤ وی هەبیت.

پشتی هینگێ یەکسەر چوو پرسیارا ل دووڤ دا: ئەرێ مرۆڤی هندەك بیرۆکەیێن زکماکی هەنە؟

ڕاستی ئەڤە ژی پرسیارەکا ب گومانە. گەلەك یا ب زەحمەتە سۆفیا باوەر بکەت کو ئەو زارۆکێ ژ نوو هاتیە سەر دنیایێ، گەلەك یێ بیرتیژ بیت و هزر هەبن. لێ ئەم نەشێین خوە گەلەك ژ ڤێ چەندێ پشتڕاست بکەین. دەمێ زارۆك نەشێت باخڤیت، ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو سەرێ وی یێ ڤالایە. دگەل ڤێ چەندێ ژی پێدڤیە ل دەستپێکێ ئەم وان تشتان ببینین و پاشی پێزانینان ل سەر وەربگرین.

جوداهی چیە دناڤبەرا ڕووەك و گیانەوەر و مرۆڤی دا ؟

هژمارەکا جوداهیێن پێشچاڤێن هەنە. بۆ نموونە سۆفیا باوەرناکەت ڕووەکان ژی ژیانەکا دلینی و عەشقێ هەبیت. ئەرێ مە جارەکێ گوهلێبوویە دلێ گول بنەفشەکێ

شکەست بیت؟ ڕووەك شین دبن و خوارنێ دروست دکەن و دندکێن توڤی یێن بچووك بەرهەم دئینن، ئەڤ توڤە جارەکا دی شین دبیت و ڕووەکەکێ نوو پەیدادکەت. ژ بلی ڤێ چەندێ چ تشتێ دی ل بیرا سۆفیایێ نەبوو. سۆفیا دشیا ڤێ چەندێ بۆ مرۆڤ و گیانەوەران ژی بێژیت لێ گومان تێدا نینە گیانەوەران هندەك ساخلەتێن دی ژی هەنە، بۆ نموونە ئەو دشێن ب ڕێڤە بچن "ئەرێ مە جارەکێ گولەك دیتیە ب ڕێڤە چووبیت؟".

دەستنیشانکرنا جوداهیێن دناڤبەرا مرۆڤ و گیانەوەران دا گەلەك ب زەحمەترە. بۆ نموونە مرۆڤ دشێن هزرا خوە بکەن، لێ ما گیانەوەر ژی نەشێن ڤێ چەندێ بکەن؟ سۆفیا د وێ باوەرێ دا بوو کو پشیکا وێ شیریکان ژی دشێت هزرا خوە بکەت و ب شێوەیەکێ ڕێکخستی سەرەدەری دکر، لێ ئەو ب چ ڕەنگان نەشێت پرسیارەکا فەلسەفی بکەت.

ئەرێ پشیك دشێن پرسیارا هندێ بکەن کا چ جوداهی دناڤبەرا ڕووەك و مرۆڤ و گیانەوەران دا هەنە؟ هەلبەت نەخێر. ڕاستە پشیك دشێت خوە دیار بکەت کا یا کەیفخوەشە یان بێزارە، لێ ئەرێ جارەکێ پشیکەکێ پرسیار کریە کا خودا هەیە یان نە، کا ڕۆحا مرۆڤی یا نەمرە یان نە؟ سۆفیایێ هزرا خوە باش کر و گەهشتە وێ چەندێ کو وێ چ بەلگەیێن ب هێز نینن گیانەوەر ژی بشێن هزرا خوە بکەن ل دەمەکی کو تشتەکێ مەحالە بشێین گەنگەشێ ل دور بابەتێن هۆسا دگەل پشیکەکێ یان زارۆکەکێ ژ نوو پەیدابووی بکەین.

بۆچی باران دباریت؟

سوفیایێ دەستێ خوە بلند کر. هەلبەت ئەڤە نە پرسیارەکا ب زەحمەتە: باران دباریت چونکی ئاڤا دەریایان دبیتە هەلم و پاشی ئەڤ هەلمە ل ئاسمانی ل سەر یەك خڕڤە دبیت و دبیتە عەور و باران ژێ دباریت. هێشتا ل ڤۆناغا دەستپێکێ یا خواندنێ وێ ئەڤ چەندە دزانی. هەردیسان ئەم دشێین بێژین باران ژبەر هندێ دباریت داکو ڕووەك و گیانەوەر بشێن بەردەوامیێ بدەنە ژیانا خوە، لێ ئەرێ ئەڤە ئەگەرێ بارینا وێ یە؟ ئەرێ پەیدابوونا کێلەستونێ "کەسکوسۆر" ئارمانجەك هەیە؟

پرسیارا دوماهیێ پەیوەندی ب ئارمانجێ ڤە هەبوو:

مرۆڤی پێدڤی ب چ هەیە داکو ژیانەکا بەختەوەر ببورینیت؟ مامۆستایێ وێ یێ فەلسەفێ ل دەستپێکا کورسی ژی بەحسێ ڤێ چەندێ کربوو: هەموو مرۆڤ پێدڤی ب خوارن و گەرماتی و ڤیان و دلوڤانییێ نە، ئەم دشێین بێژین ئەڤە مەرجێن سەرەکی نە بۆ بەختەوەرییێ.

پاشی وێ گوت هەموو مرۆڤ پێدڤی ب هندەك بەرسڤێن فەلسەفی نە. زێدەباری ڤێ چەندێ، ئەو کارێ ئەم دکەین، هەکە هات و ژ دل حەز ژ وی کاری بکەین، ئەڤ چەندە دێ بیتە هاریکار مرۆڤ بەختەوەر بیت. بۆ نموونە، ئەگەر کەسەك حەز ژ هاتنوچوونێ نەکەت، نابیت ئەو کارێ شوفێرێ تەکسییێ بکەت. ئەگەر کەسەك کارێن خوە ب هووری و ڕژدی نەکەت، نابیت ئەو ببیتە مامۆستا.

سۆفیا گەلەك حەز ژ گیانەوەران دکەت، ژبەر هندێ هرزر دکەت دێ گەلەك یا بەختەوەر بیت ئەگەر ببیتە نوشدارا ڤێتەرنەری "نوشدارا گیانەوەران". ئەم پێدڤی ب برنا دیاریەکا مەزن د بەریکانەیێن لوتو و کێشانا بەختی دا نابین داکو ببینە مرۆڤێن بەختەوەر. گوتنەك هەیە دبێژیت: "بێکاری، دایکا هەموو خرابیانە."

سۆفیا ما د ژوورا خوە ڤە هەتا دایکا وێ بۆ خوارنا فراڤینێ گازی کرییێ. دایکا وێ گوشت و پتات ئامادە کربوون، چەند خوارنەکا خوشە! ل سەر مێزا خوارنێ شەمالك هەلکربوونێ و پشتی هینگێ تری و کێك ژی پێشکێش کرن. وان بەحسێ هەموو تشتێن هەی و نەی دکر، دایکا وێ پرسیار ژێ کر کا وێ ل بەرە جەژنا ژ دایکبوونا خوە یا پازدێ چەوا بکەت ب تنێ چەند ڕۆژەکێن کێم یێن ماین.

سۆفیایێ ملێن خوە هەژاندن. دووبارە دایکا وێ پرسیار ژێ کر:

- "ئەرێ تە کەسەك داخواز کریە؟ مەرەما من ئەوە تە ل بەرە ئاهەنگەکێ بدانین؟
- "چێدبیت."
- "ئەم دشێین ماتی و مارییایێ.. هیگ و جوانایێ ژی داخواز بکەین.. دبیت بێژینە یورگونی ژی لێ بڕیار یا د دەستێن تە دا کا دێ کێ داخواز کەی. بیرا من باش ل جەژنا ژ دایکبوونا من یا پازە سالیێ دهێت، دێ بێژی دوهی بوو. ل وی دەمی من هەستپێکر ئەز یا

مەزن بوويم. ما ئەڤ چەندە نە تشتەکێ سەیرە، سۆفیا؟ لێ د ڕاستی دا ئەز هەستپێناکەم کو نوکە ژی گەلەك هاتبمە گوهۆڕین."

- "نەخێر، ڕاستە تو نەهاتیە گوهۆڕین. چ تشت نەهاتینە گوهۆڕین بەلکو تو پتر ب سەر ژیانێ یا هەلبووی."

- "ممم، هەر ژ نوکە تو وەکو کەسەکا پێگەهشتی یا دئاخفی! هەستپێدکەم وەخت گەلەك بلەز یێ دبوریت."

# ئەرستۆ

*...ئەو زەلامێ هووربین یێ پێکۆل دکری تێگەهێن مە رێکبێخیت...*

دەمێ دایکا وێ ڤەیلولەك[*] وەرگرتی، سۆفیا ژ مال دەرکەفت و چوو د کۆلکێ خوە ڤە و پرتەکا شیریناهیێ کرە د زەرڤەکێ پیڤازی دا و ل سەر نڤیسی "بۆ ئەلبێرتۆی."

وێ چ نامێن دی یێن نوو د کۆلکێ خوە ڤە نەدیتن، لێ چ پێڤە نەچوو دەمێ دەنگێ رەوینا سەی هاتیە گوهێن وێ. سۆفیایێ ب دەنگەکێ بلند گوت: "هێرمس، ئەڤە توی؟"

هێرمس بلەز هاتە د ژوور ڤە و زەرڤەکێ قەهوائی ب دەڤێ خوە هەلگرتبوو.

- "ئەی سەیێ باش و دلوڤان..."

سۆفیایێ دەستێ خوە ل دور وی ئالاند و هەمبێز کر و زەرڤێ پیڤازی کرە د دەڤێ وی دا. پشتی هینگێ هەر یەکسەر هێرمس ژ کۆلکی دەرکەفت و بەرەڤ دارستانێ چوو.

سۆفیایێ ب دوودلی ڤە زەرڤ ڤەکر. ئەرێ تو بێژی وی تشتەك دەربارەی کۆلکێ خوە و بەلەما ئاڤێ گوت بیت؟ دناڤ وی زەرڤی دا، ژ بلی کاغەزێن بەرچاڤ یێن وەکو هەرجار، نامەیەکا بچووك و ڤەدەر ژی دگەل دا بوو.

---

[*] خەوا پشنی نیڤرو کو ماوەیێ وێ دناڤبەرا 30 هەتا 60 خۆلەکان دایە.

خوشتڤیا من، پولیسا نهێنی، یان باشتره بێژم خاتینا دزیکەر.
من پولیس ل سەر وی تشتێ هاتیه دزین ئاگەهدار کرینه...
نەخێر، من ب تنێ دڤیا ته بترسینم، ئەز ژ ته یێ تۆڕه نینم.
ئەگەر تا ڤی ڕادەی ته حەزا شرۆڤەکرنا بابەتێن فەلسەفی هەبیت، ئەڤه تشتەکێ باشه، لێ تشتێ نەخوش بۆ من ئەوه کو یا پێدڤیه جهێ ئاکنجیبوونا خوه ب ڤەگوهێزم.
هەلبەت ئەڤه ژی شاشیا من بوو، پێدڤی بوو ل دەستپێکێ ئەز ب هندێ یێ ب گومان بامه کو تو دێ ل دووڤ هەموو تشتان گەڕی و جهێ من دیار کەی.
دگەل ڕێزین من

سۆفیایێ بێهنا خوه هەلکێشا و هەست ب ئارامیەکا مەزن کر. باشه ئەو نەیێ تۆڕەیه، بەلێ بۆچی ئەو دێ جهێ ئاکنجیبوونا خوه ڤەگوهێزیت،

سۆفیایێ ئەو کاغەزێن نوو هەلگرتن و بلەز بەرەڤ ژوورا خوه ڤه چوو. یا باشتر ئەوه بەری دایکا وێ هشیار بیت ئەو بزڤڕیته مال. دەمێ گەهشتیه مال ژی دەست ب خواندنا وانەیا خوه یا نوو کر.

## فەیلەسۆف و زانا

خوشتڤیا من سۆفیا:

چ پێنەڤێت تیورا ئەفلاتۆنی ئەم حێبەتی کربووین. ، هەلبەت تو ب تنێ نینی کو هەست ب ڤێ چەندێ کربیت! نزانم کا ته باوەر ژ هەموو تشتان کریه یان ته هندەك نەڕازیبوون و تیبینی ل سەر هەنه. ئەگەر ته ژی تیبینیی ل سەر هەبن بیت، پشتڕاست به

**تیبینی یێن تەژی هەمان ئەو نەڕازیبوونن یێن ئەڕستۆی (384-322 بەری زاینی) هەین کو بۆ ماوەیێ پتر ژ بیست سالان قۆتابیێ ئەفلاتۆنی بوو ل ئەکادیمیا وی.**

**ئەڕستۆ ب خوە نە خەلکێ ئەسینایێ بوو، بەلکو ئەو خەلکێ مەقدونیایێ بوو. دەمێ وی پەیوەندی ب ئەکادیمیێ کری، ژیێ ئەفلاتۆنی نێزیکی 61 سالان بوو. بابێ ئەڕستۆی نوشدار و زانایەکێ بلیمەت و ناڤدار بوو. هەلبەت ئەڤ پاشینەیە "بەکگڕاوەند" تا ڕادەیەکی وێ چەندێ نیشا مە ددەت بزانین کا پڕۆژەیێ فەلسەفی یێ کورێ وی ب چ ڕەنگ بوویە. وی گرنگیەکا مەزن ب سروشتی ددا، ب ڤی ڕەنگی ئەو نەك دوماهیك فەیلەسۆفێ یونانی بوو، بەلکو یەکەم زانایێ زیندەوەرزانیێ بوو ل ئەوروۆپا هەموویێ.**

**ئەم دشێین بێژین ئەفلاتۆنی ب تەمامی پشتا خوە دابوو جیهانا هەستان پتر دناڤ بابەتێ تشتێن هەتا هەتایێ و بیرۆکەیان دا چووبوو خوارێ و گەلەك کێم تیبینیا سروشتێ دەوروبەری خوە دکر. لێ ژلایەکێ دی ڤە، ئەڕستۆی بەروڤاژی ڤێ چەندێ دکر. ئەو ب تنێ مژوولی خواندنا گوهۆڕینێن سروشتی بوو کو ل سەردەمێ ئەڤرۆکە ئەم دبێژینێ گوهۆڕینێن سروشتی.**

**ئەگەر پتر دناڤ بابەتی دا بچینە خوارێ، دێ بێژین کو ئەفلاتۆنی ب تەمامی پشتا خوە دابوو جیهانا هەستان و بەرێ خوە ژ هەموو تشتێن دەوروبەر وەرگێڕابوو یێن ئەم دبینین "وی دڤیا ژ شکەفتێ بدەرکەڤیت و جیهانا بیرۆکەیێن نەمر ببینیت!". ئەڕستۆی بەروڤاژی ڤێ چەندێ دکر. دەست و پێن خوە ژ بۆ خواندنا ماسی و بەق و گول بنەفشان بکارئینان.**

**ئەگەر ئەفلاتۆنی ڤیابا کارەکی بکەت، ب تنێ ئەقلێ خوە بکاردئینا، لێ ئەڕستۆی ژ بلی ئەقلی، هەستێن خوە ژی بکاردئینان. هەلبەت ئەڤ چەندە ژ شێوازێ وان یێ نڤیسینێ ژی یێ دیاربوو. ب ڕەنگەکی ئەفلاتۆن شاعر و داهێنەرێ ئەفسانەیان بوو، لێ پەڕتووکێن ئەڕستۆی د هشك و پڕی شڕۆڤەکرن بوون خوە دا بێژی فەرهەنگەکا هشکە. زێدەباری ڤێ چەندێ، پتریا پەڕتووکێن وی ل سەر بنەمایێ ڤەکۆلینێن وی یێن مەیدانی هاتینە دانان.**

**ژێدەرێن کەڤن ئاماژێ ب هندێ ددەن کو ئەڕستۆی 170 پەڕتووك نڤیساینە، لێ ب تنێ 47 پەڕتووکێن وی هاتینە پاراستن و گەهشتینە بەر دەستێ مە. هەلبەت ئەڤەژی نە**

ناڤونیشانێن پەڕتووكێن وی یێن تەمام بوون، چونكی پترییا نڤیسینێن وی ل سەر شێوێ تیبینیان بوون دەمێ وانەیێن خوە ئامادە دكرن. نابیت ژبیربكەین كو فەلسەفە ل سەر دەمێ ئەڕستۆی ب شێوەیێ زارەكی بوو، ئانكو نەدهاتە نڤیسین.

كەلتورێ ئەوروپی قەردارا ئەڕستۆیە ب هندێ وی بۆ یەكەم جار زمانێ زانستی دامەزراند كو نوكە د گشت بوارێن زانستی دا مفایەكێ مەزن ژێ دهێتە وەرگرتن. هەلبەت ئەڤە نە تشتەكێ سادە بوو، شێوازێ وی یێ ڕێكخستی و سیستەمی ڕۆلەكێ گرنگ هەبوو د دانان و ڕێكخستنا زانستێن جودا جودا دا.

ژبەركو ئەڕستۆی د هەموو بواران دا نڤیسیایە، یا باشتر ئەوە ئەم ب تنێ بوارێن گرنگ بەحس بكەین. ژبەركو بەری نوكە من گەلەك بەحسێ ئەفلاتۆنی بۆ تە كربوو، پێدڤیە تو بۆچوونا ئەڕستۆی ژی ل دور تیورا وی بزانی. ب تایبەت پشتی مە زانی كا چەوا هێدی هێدی فەلسەفا وی یا تایبەت پێشدكەفت. ئەڕستۆی دەست ب پوختەكرنا بۆچوونێن فەیلەسۆفێن سروشتی كر و پاشی هات و تێگەهێن مە ل دور فەلسەفەیا وان ڕێكخستن و لوژیك وەك زانست دامەزراند. ل دوماهیێ ژی دێ پیچەكێ بەحسێ بۆچوونا ئەڕستۆی ل دور مرۆڤ و جڤاكی ژی بۆ تە كەم.

ئەگەر تو یا ب ڤان مەرجان ڕازی، دا دەستێن خوە هەلدەین و دەست ب شولی بكەین.

## چ بیرۆكەیێن زكماكی نینن

وەكو فەیلەسۆفێن بەری خوە، ئەفلاتۆنی ژی دڤیا دناڤ هەموو تشتێن دهێنە گوهۆڕین دا، تشتەكێ نەمر و جێگر دەستنیشان بكەت و ب ڤی ڕەنگی هزرا بیرۆكەیێن تەمام داهێنا كو وی دانابوو سەر جیهانا هەستان. هەروەسا وی هزر دكر ئەڤ بیرۆكەیە پتر د كەتواری نە ژ دیاردەیێن سروشتی. ل دەستپێكێ بیرۆكەیا هەسپی و پاشی دروستبوونا هەموو هەسپێن جیهانێ ژبەر بیرۆكەیا سیبەرا ل سەر دیوارێن شكەفتێ. هەروەسا بیرۆكەیا مریشكێ كو بەری هەموو مریشك و هێكان هەبوو.

ئەرستۆ د وێ باوەرێ دا بوو ئەفلاتۆنی ئەڤ بابەتە بەروڤاژی یێ لێکدای. ئەو دگەل مامۆستایێ خوە یێ هەڤڕابوو کو هەر هەسپەك ژ لایێ خوە ڤە ب تنێ دهێتە گوهۆڕین و پیر دبیت و چ هەسپ هەتا هەتایێ نامینە ساخ. هەردیسان وی دانپێدان ب هندێ ژی دکر شێوەیێ هەسپی یێ جێگیر و نەگوهۆڕە. لێ ئەو تشتێ هەڤدژ دگەل ئەفلاتۆنی ئەو بوو کو ب دیتنا وی بیرۆکەیا هەسپی ب تنێ تێگەهەکە مە مرۆڤان دروستکری، ب تایبەت پشتی مە هژمارەکا هەسپان دیتین. بیرۆکەیان هەسپی یان شێوەیێ وی نە تشتەکێ هۆسا بوو کو بەری هینگێ هەبیت. ب دیتنا ئەرستۆی، شێوە یان فۆرمێ هەسپی دەربڕینێ ژ هندەك ساخلەتێن تایبەت ب هەسپان ڤە دکەت، ئانکو ب دەربڕینەکا دی ئەم دشێین بێژین "جۆر"ێ هەسپی.

دا پتر ڤێ چەندێ دەستنیشان بکەین:

دەمێ ئەرستۆی زاراڤێ "فۆرم" بکاردئینا، مەرەما وی ژێ ئەو تشتێ هەڤپشك بوو یێ دناڤبەرا هەموو هەسپان دا دهاتە دیتن. ل ڤێرێ ئەڤ فۆرمێ قالبێ کێکان نەیێ گونجایە، چونکی ئەڤ قالبە ب شێوەیەکێ سەربەرخو ژ کێکێ هەیە. ب بۆچوونا ئەرستۆی، چ ڕاستی بۆ هەبوونا ڤان قالبان نینن کو ل سەر ڕەفانکەکا دەرڤەی سروشتی هاتبنە دانان و هندەك فۆرمێن دی یێن زیندی ل بەر بهێنە دروستکرن، بەلکو فۆرمێ هەر تشتەکی یێ د وی تشتی ب خوە دا هەی وەك یەك ژ ساخلەتێن وی یێن تایبەت.

هەردیسان ئەرستۆ دگەل وێ بۆچوونا ئەفلاتۆنی ژی نەبوو یا دگوتی بیرۆکەیا مریشکێ بەری مریشکێ هەبوو، ئەرستۆ د وێ باوەرێ دا بوو کو فۆرمێ هەر مریشکەکێ یێ د مریشکێ ب خوە دا هەی و ئەو فۆرمە ژی یەکە ژ ساخلەتێن وێ، بۆ نموونە کا چەوا هەر مریشکەك دشێت هێکان بکەت، ئاها هۆسا فۆرمێ خوە ژی هەیە. ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێین بێژین کو مریشك و فۆرمێ وێ، دوو تشتێن هۆسانە کو قەت ژ هەڤدوو دوورناکەڤن و ژێکڤەنابن هەروەکو کا چەوا لەش و ڕۆح ژێکدوور ناکەڤن.

ب ڤێ چەندێ مە دوماهی ب ڕەخنەیا ئەرستۆی ل دور تیورا ئەفلاتۆنی ئینا. دگەل تومارکرنا تیبینەکێ ل دور وەرچەرخانەکا مەزن یا دیرۆکا هزرکرنێ. ب دیتنا ئەفلاتۆنی، بلندترین پلەیا کەتوار و ڕاستیێ ئەوە دەمێ ئەم ب ڕێکا ئەقلێ خوە هزر

دکەین، لێ ب دیتنا ئەرستۆی بلندترین پلەیا راستیێ ئەوە دەمێ مرۆڤ ب رێکا هەستێن خوە هەستپێدکەت.

ئەفلاتۆنی هزرکر هەموو وان تشتێن ئەم دبینین ب تنێ رەنگڤەدانا تشتەکی یە د جیهانا بیرۆکەیان دا و پاشی ئەڤ تشتە دهێنە دناڤ ناخێ مە دا، لێ ئەرستۆی بەروڤاژی وی هزر دکر: ئەو تشتێ دناڤ ناخێ مەدا، رەنگڤەدانا تشتێن سروشتی یە. ئەڤ سروشتێ ئەم دبینین، وی ب تنێ جیهانا راستەقینە پێکئینایە. ب ڤی رەنگی ئەرستۆی هزردکر ئەفلاتۆن یێ بوویە ئێخسیرێ جیهانەکا ئەفسانەیی کو تێدا مرۆڤ دیتنێن خوە یێن ئەفسانەیی بەرچاڤ دکەت و ددانیتە جهێ د جیهانا راستەقینە دا.

هەردیسان ئەرستۆی دگوت چ تشت ناچنە د ئاگەهیا* مرۆڤی دا ئەگەر بەری هینگێ هەستێن مرۆڤی هەست پێنەکربیت. لێ ئەفلاتۆنی دگوت چ تشتان هەبوونا خوە د سروشتی دا نینە ئەگەر بەری هینگێ د جیهانا بیرۆکەیان دا نەبیت.

ئەرستۆی ددیت کو مامۆستایێ وی ب ڤێ بۆچوونێ هژمارا تشتان دووجارکی لێدکەت. بۆ نموونە وی دگوت کو هەسپ ب رێکا بیرۆکەیا هەسپی شرۆڤە دکر. ئەرێ ئەڤە چ جۆرە شرۆڤەکرنەکە، سۆفیا؟ ئەڤ بیرۆکەیا هەسپی ژ کیڤە هاتیە؟ دبیت هەسپێ سیێ ژی هەبیت و ئەڤ بیرۆکەیە کوپیەك بیت ژ وی هەسپی؟

ئەرستۆی هزردکر هەموو بیرۆکەیێن مە دهێنە دناڤ ئاگەهیا مە دا ب رێکا وی تشتێ ئەم دبینین یان گوهلێدبین، لێ دەمێ ئەم ژ دایکدبین مە ئەقل ژی هەیە. هەلبەت رامانا وێ چەندێ ئەو نینە کو مە هندەك بیرۆکەیێن زکماکی هەبن هەروەکو ئەفلاتۆنی دگوتی، لێ ڤی ئەقلی شیانێن زکماکی هەنە ژ بۆ ڤاڤارتن و ژێکجوداکرنا هەموو وان تشتێن ب رێکا هەستێن خوە هەست پێدکەین. ب ڤی رەنگی تێگەهێن هەموو تشتان ل دەڤ مرۆڤی پەیدادبن و دشێت جوداهیێ بێخیتە دناڤبەرا تشتێن جودا جودا دا وەك "بەر"، "رووەك"، "گیانەوەر"، "زەلام"، "هەسپ"، "کناری".

---

* وعي

ئەڕستۆ حاشاتییێ ژ هندێ ناکەت کو دەمێ مرۆڤ ژ دایك دبیت، ئەقل ژی هەیە، بەلکو بەروڤاژی، ب دیتنا وی ئەقل ساخلەتەکا جوداکەرە ل دەڤ مرۆڤان، لێ ل دەستپێکێ ئەڤ ئەقلە یێ ڤالاَیە و پشتی هەستێن مە هەست ب تشتێن دەوروبەر دکەن، هێدی هێدی ئەڤ ئەقلە ژ بیرۆکەیان پڕ دبیت. ئانکو ب کورتی دشێن بێژین ب دیتنا ئەڕستۆی چ بیرۆکەیێن زکماکی ل دەڤ مرۆڤی نینن.

## فۆرمێ هەر تشتەکی، سەرجەمێ ساخلەتێن وی یێن جوداکەرە

پشتی وی هەلویستێ خوە ل دور تیورا ئەفلاتۆنی دیارکری، ئەڕستۆ دیار دکەت کو ڕاستی ژ تشتێن جودا جودا پێکدهێت. هەکە ئەم پێکهاتنا هەر تشتەکی جودا وەربگرین دێ بینین کو ژ مادده و فۆرمی پێکدهێت. ل ڤێرێ مادده ئەو بنیاتە یێ ئەڤ تشتە ژێ پێکهاتی و فۆرم ژی سەرجەمێ ساخلەتێن وی یێن تایبەتە.

سۆفیا بینە پێشچاڤێن خوە کو مریشکەك یا پەڕێن خوە لێکددەت. فۆرمێ مریشکێ هۆسا خویا دکەت کو ئەو یا پەڕێن خوە لێکددەت و قدقدێ دکەت و هێکان دکەن. ئانکو فۆرم هەموو ڤان ساخلەتێن وێ یێن تایبەت دیار دکەت. دەمێ مریشك دمریت و ئێدی قدقدێ ناکەت، فۆرمێ وێ ژی نامینیت. ئەڤ کەلەخێ وێ یێ مری ب تنێ ماددەیە، ژبەر هندێ وەك ڕامانا حەرفی، ئێدی ئەو نامینیت مریشك.

هەروەکو بەری نوکە من گوتیە تە، ئەڕستۆی گرنگی ددا وان گوهۆڕینێن د سروشتی دا پەیدادبووین: هەر ماددەیەکی شیانێن گەهشتنا فۆرمەکێ تایبەت دناڤ خوە دا هەلگرتینە. ئانکو ئەم دشێین بێژین ئارمانجا ماددەی ئەوە دەربڕینێ ژ ڤان شیانێن خوە بکەت و فۆرمەکی پەیدابکەت. ئانکو گوهورینێن سروشتی و وەرگرتنا فۆرمێ هەر تشتەکی، ژ ئەنجامێ گوهۆڕینا ڤان شیانان بۆ فۆرمەکێ تایبەت پەیدادبیت.

بێهنا خوە فرەهـ بکە دا پتر بۆ تە ڕۆهن کەم، نوکە دێ پێکۆلێ کەم ب ڕێکا سەرهاتیەکا خوش ڤی بابەتی پتر بۆ تە ڕۆهن کەم: پەیکەرسازەك هەبوو کار ل سەر

پارچەیەکا بەرێ گرانێتی دکر. ڕۆژانە وی ب هاریکاریا چەکوچێ خوە ئەڤ بەرە دتڕاشی هەتا ڕوژەکێ زارۆکەکێ بچووك هاتیە دەڤ و پرسیار ژێ کری: "ئەرێ تو ل چ دگەری؟"

-ی"بێهنا خوە فرەهـ بکە تو ب خوە دێ بینی."

پشتی چەند ڕۆژان ئەو زارۆك جارەکا دی هاتە وێرێ، وی دیت پەیکەرسازی پەیکەرێ هەسپەکێ جوان ژ وی بەری ییێ چێکری. زارۆکی ب حێبەتی ڤە پرسیار کر: "ئەرێ تە چەوا زانی ڤی هەسپی یا خوە دناڤ بەری دا ڤەشارتی؟"

ئەرێ ژ ڕاستا، چەوا وی هەسپی خوە دناڤ بەری دا ڤەشارتبوو؟ پەیکەرسازی فۆرمێ هەسپی دناڤ وی بەرێ گرانێتی دا دیتبوو، ئانکو ڤی بەری دناڤ خوە دا شیانێن هندێ هەلگرتبوون کو پەیکەرێ هەسپەکی ژێ بهێتە دروستکرن. ب هەمان شێوە، ئەرستۆ ژی د وێ باوەرێ دا بوو کو هەموو تشتێن د سروشتی دا شیانێن گوهۆڕینێ بۆ فۆرمەکێ تایبەت دناڤ خوە دا هەلگرتینە.

دا بزڤڕینە بابەتێ مریشك و هێکێ. هێکا مریشکێ ئەو شیان تێدا هەنە ببیتە مریشك لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو هەموو هێك دێ بنە مریشك، چونکی گەلەك ژ وان هێکان دبنە خوارنا مە یا سپێدەهیان ڤێجا چ بهێنە قەلاندن، کەلاندن، یان دگەل خوارنەکا دی بهێنە تێکەلکرن بێ کو فۆرمەکێ زیندی وەربگریت. ژلایەکێ دی ڤە، ب چ ڕەنگان هێکا مریشکێ نابیتە قاز چونکی ئەڤ شیانە دناڤ وێ دا نینن. ب ڤی ڕەنگی دیار دبیت کو فۆرمێ هەر تشتەکی دوو خالێن گرنگ بۆ مە دیار دکەت، شیانێن وی تشتی کا دێ بیتە چ، زێدەباری سنوورێن وی یێن دەستنیشانکری.

دەمێ ئەرستۆ بەحسێ فۆرم و ماددەی دکەت، مەرەما وی ب تنێ بونەوەرێن زیندی ب خوە ڤە ناگریت، بۆ نموونە کا چەوا فۆرمێ مریشکەکێ د هندێ دایە قدقدێ بکەت و پەرێن خوە لێکبدەت و هێکان بکات، فۆرمێ تشتەکێ بێ گیان ژی، بۆ نموونە بەرەکێ ڕەق، د هندێ دایە دەمێ وی بەری دهاڤێژی، بکەڤیتە سەر ئەردی. کا چەوا مریشکەك نەشێت قدقدێ نەکەت، ئاها بەرەکێ ڕەق ژی نەشێت نەکەڤیتە سەر ئەردی. گومان تێدا نینە تو دشێی بەرەکی بلند بکەی و ب پاڤێژی، لێ ب چ ڕەنگان تو نەشێی بەرەکی پاڤێژیە سەر بانێ هەیڤێ، چونکی سروشتێ بەری یێ هۆسایە بکەڤیتە خوارێ نەك بفڕیت "هشیاربی دەمێ

ڤێ تاڤیکرنێ دکەی و بەرەکی بلند دکەی، چونکی ڕەنگە بەر تۆلا خوە ڤەکەت، ژبەر هندێ هەرزوو دێ کەڤیتە سەر ئەردی و کی بکەڤیتە د ڕێکا وی دا دێ تۆلێن خوە ژێ ڤەکەت".

## مژارا دوماهیێ

بەری ئەم ژ بابەتێ فۆرمی ب دوماهی بهێین کو هەموو بونەوەرێن زیندی و تشتێن نەزیندی هەیە و دیار دکەت کا ئەو تشت دێ بیتە چ، من دڤێت وێ چەندێ ژی دیارکەم کو ئەڕستۆی تێگەهەکێ سەیر ل دور دیاردەیێن ئەگەری* د سروشتی دا هەیە.

دەمێ ئەم بەحسا "ئەگەر"ێن ڕوودانا هەر تشتەکی دکەین، ئەم پێکۆلێ دکەین تێبگەهین کا چەوا ئەڤ تشتە پەیدابوویە یان ڕوودایە. شووشەیا پەنجەرێ هاتە شکەستن چونکی پیتەری بەرەك دانابوویێ. پیست ژی بێ بوویە پێلاڤ چونکی پنیدوزەکی ئەڤ پارچەیێن پیستی پێکڤە دوورینە، لێ ئەڕستۆی باوەری ب هەبوونا گەلەك ئەگەران د سروشتی دا هەبوو ب ڕەنگەکی کو وی چوار ئەگەرێن سەرەکی دەستنیشانکرینە، ل ڤێرێ یا گرنگە ئەم بزانین کا مەرەما تێگەهێ "ئەگەرێ دوماهیێ"چیە.

دەمێ ئەم بەحسێ پەنجەرا شکەستی دکەین، دبیت پشتی هینگێ پرسیار بکەین کا بۆچی پیتەری ئەو بەر هاڤێت و مەرەما وی ژ ڤێ هاڤێتنێ چ بوو. هەردیسان دەمێ بەحسێ دروستکرنا پێلاڤان دکەین، هەلبەت مەرەمەك یان ئارمانجەك ل پشت دروستکرنا وان هەیە. بەلێ ئەڕستۆی ئەڤ چەندە ل سەر دیاردەیێن سروشتی ژی پڕاکیتزە دکر. ل ڤێرێ ئەم دشێین ب نموونەیەکێ مەرەما خوە پتر ڕۆهن بکەین:

بۆچی باران دباریت، سۆفیا؟ چ پێنەڤێت تە ل قوتابخانێ یا خواندی کو ئەگەرێ باران بارینێ بۆ هندێ دزڤڕیت کا ئاڤا دەریا و زەریایان دبیتە هەلم و ل ئەسمانی هندەك

---

* ئەگەری Causality کو ب زمانێ عەرەبی دبێژنێ "السببیە" یان "العلیە"، بابەتەکێ فەلسەفی یە ب تایبەت د فەلسەفەیا زانستی دا و گرنگیێ ددەتە پەیوەندیا دناڤبەرا ئەگەر و ئەنجامان دا، ب ڕەنگەکەکی کو ڕوودانا دووێ ژ ئەنجامێ ڕوودانا یەکێ پەیدادبیت.

عەورێن ڕەش دروست دکەت و ل دووڤ دا ئەڤ عەوره دێ چڕ بن و ب هاریکاریا هێزا ڕاکێشانا ئەردی، چیکێن بارانێ دێ کەڤنه سەر ئەردی.

ئەرستۆ ژی ئەگەرێن باران بارینێ هەر بۆ ڤێ چەندێ دزڤراند، لێ ژ بلی ڤی ئەگەری وی، سێ ئەگەرێن دی ژی ژ بۆ ڤێ ڕوودانێ دەستنیشانکرن: "ئەگەرێ ماددی" ئەوە کو دەمێ پلا گەرماتییێ دهێته خوارێ، هەلما ئاڤێ ل جهەکی دراوەستیت. "ئەگەرێ کارا" ئەوە کو هەلما ئاڤێ تەزی دبیت. "ئەگەرێ فۆرمی"ژی سروشتێ بارانێ یه دەمێ دکەڤیته سەر ئەردی.

ئەگەر تو هزر بکەی ئەڤ هەرسێ ئەگەرە بەسن، لێ ئەرستۆی پێکۆلدکر ئەگەرەکێ دی ژی ل سەر زێدە بکەت کو ئەو ژی "ئەگەرێ مەرەمێ" یان ژی "ئەگەرێ دوماهیێ" بوو. ژبەر هندێ باران دباریت چونکی گشت ڕووەك و گیانەوەران پێدڤی پێ هەیە. ب ڤێ چەندێ، ئەرستۆی دڤیا ئەگەر یان مەرەما ژیانێ بۆ چیکێن بارانێ بزڤرینیت.

ئەم دشێین بابەتی بەروڤاژی بکەین و بێژین ڕووەك ژبەر هەبوونا شێداریێ شین دبن، ئەرێ تە زانی جوداهی چیە، سۆفیا؟ ئەرستۆ دوێ باوەرێ دابو کو هەر تشتەکێ د سروشتی دا مفایێ خوە هەیە. باران دباریت داکو گیانەوەر گەشە بکەن و دارێن پرتەقال و تری ژی بەرهەمی ددەن داکو مرۆڤ ژێ بخوت.

ل سەردەمێ ئەڤرۆکە زانستی بۆچوونەکا جودا هەیە. ئەم دبێژین شێداری و خوارن دوو مەرجێن سەرەکینە ژ بۆ ژیانا مرۆڤ و گیانەوەران و ڕەنگە ئەگەر ئەڤ هەردوو تشتە نەبان ژیانا مە ژی دا یا مەحال بیت. لێ ئارمانج ژ هەبوونا ئاڤێ و پرتەقالان نە ئەوە داکو ببنە خوارن. ئەم دشێین خوە پشتڕاست بکەین کو تێگەهشتنا ئەرستۆی ل دور ئەگەران یا شاش بوو، لێ دڤێت هشیار بین و زوو بریارێ ل سەر چ تشتان نەدەین.

گەلەك کەسان باوەری ب هندێ هەیە کو خودای جیهان ب ڤی ڕەنگی ئافراندیە داکو مرۆڤ و گیانەوەر بشێن بژین. ئەگەر پتر دناڤ پرەنسیپی دا بچینە خوارێ و بێژین هەبوونا ئاڤێ د ڕووباران دا ژبەر هندێ یە چونکی مرۆڤ پێدڤی دبنە ئاڤێ داکو بشێن بژین. ئانکو ئەم یێ بەحسێ مەرەما خودای یان ژی پلانا وی دکەین، چونکی ل ڤێرێ

مەرەما چپکێن ئاڤا ڕوباران ئەو نینە باشیا مە بڤێت و ببنە ئەگەرێ بەردەوامیبوونا ژیانا مە.

## لوژیك

جوداهیا دناڤبەرا "فۆرم" و "ماددەی" دا ڕۆلەکێ گرنگ هەیە دەمێ ئەڕستۆ بەحسێ چەوانیا ژێکجوداکرنا تشتێن د جیهانێ دا ژ لایێ مرۆڤی ڤە دکەت.

ئەو تشتێن ئەم دبینین یان هەستپێدکەین، ئەم وان ل سەر کوم یان جۆرێن جودا جودا دا پارڤە دکەین. من هەسپەك دیت، هەسپەکێ دی و یەکێ دی ژی من دیتن. ڕاستە هەموو هەسپ وەکو یەك نینن، لێ خاڵەکا هەڤپشك دناڤبەرا وان دا هەیە. ئەڤ خاڵا هەڤپشك فۆرمێ ب دروستاهی یێ هەسپانە. لێ ئەو تشتێ هەسپەکی ژ هەسپەکێ دی جودا دکەت، ماددەیێ هەسپی ب خوەیە.

ب ڤی ڕەنگی ئەم د جیهانێ دا دهێن و چین و تشتێن دەوروبەری خوە ژێکجودا دکەین و پارڤە دکەین. بۆ نموونە: چێلان دکەینە د گوڤێ ڤە و هەسپان دکەینە د ئاخویرێ* ڤە، مریشکان دکەینە دکۆلکی ڤە و بەرازان ژی د جهێ وان یێ تایبەت ڤە.

سۆفیا ژی هەمان ڤی کاری دکەت دەمێ کەلوپەلێن ژوورا خوە لێکددەت. ئەو کتێبان ددانیە سەر ڕەفانکان، پەڕتووکێن قوتابخانێ دکەتە د چانتەی دا، گوڤاران دکەتە د چەکمەچەیێن مێزێ دا، جلکێن خوە ژی جوان دپێچیت و دکەتە د قومسورێ دا. قەمیسان ددانیتە ڕەفانکا سەری و چاکیتان ب حەلاقەیان ڤە دکەت و گوران ژی دکەتە د جهێن ڤەدەر دا.

هەردیسان ئەم بەردەوام ڤی کاری د سەرێ خوە ژی دا ئەنجام ددەین: جوداهیێ دئێخینە دناڤبەرا تشتێن ڕەق و سۆفی و پلاستیکی دا، تشتێن ب گیان و بێ گیان، ڕووەك و گیانەوەر و مرۆڤان دا.

---

* أسطبل

سۆفیا، ئەرێ هێشتا تو دگەل منی؟ ئەرِستۆی دڤیا سروشتی دووبارە رِێکبێخیت. وی گرنگی ددا هندێ دووپات بکەت کو هەموو تشتێن د سروشتی دا ل سەر کومێن جودا جودا دا دهێنە پارڤەکرن، پاشی ئەڤ کومە ژی ژ لایێ خوە ڤە ل سەر هندەك کومێن بچووکتر دهێنە پارڤەکرن. هێرمس بونەوەرەکێ زیندی یە، ژ شاهنشینا گیانەوەران، لقێ بربرداران، پۆلا شیردەرەران، رِێزا گوشتخوران، خێزانا کتکان، رِەگەزێ سەیان، جۆرێ سەیێ لابرادور، ل دوماهییێ سەیێ لابرادور یێ نێر.

نوکە هەرِە د ژوورا خوە ڤە و تشتەکی ژ ئەردی رِاکە، هەر تشتێ هەبیت تو دشێی رِاکەی. نوکە دێ بۆ تە دیار بیت کو ئەو تشتەك سەر ب کومەکێ ڤەیە، جۆرەکی. دەمێ تو دگەهیە وی رِادەی کو ئێدی ئەڤ تشتە زێدەتر ل سەر چ گروپێن دی ناهێتە پارڤەکرن دێ بۆ تە یا سەیر بیت. ئەگەر جارەکێ ژی تە تشتەکێ بچووك دیت و تە زانی کا ئەڤ تشتە نە ب سەر جیهانا گیانەوەر، رِووەك یان تشتێن کانزایی ڤە یە، ئەز دشێم بۆ تە سووند بخوم کو وێ گاڤێ تو نەوێری دەستێ خوە بکەیە وی تشتی.

مە بەحسێ جیهانا گیانەوەر، رِووەك یان تشتێن کانزای کر، نوکە دێ بەحسێ وێ یارییێ کەم دەمێ کەسەکی ژ یارییێ دکەنە دەرێ و کەسێن دی ل سەر تشتەکێ دیارکری رِێکەفتنێ دکەن. دەمێ ئەڤ کەسێ دەرکری دووبارە بچیتە دناڤ وان دا، پێدڤیە بزانیت کا چ د هزرا هەڤالێن وی دایە.

ئەڤ کوما هەڤالان دێ بریارێ دەن هزرا خوە د پشیکەکێ دا بکەن کو ناڤێ وێ "مونز"ە و نوکە یا دناڤ باخچەی مالا جیرانەکێ وان دا. دەمێ ئەو کەسێ دی دهێتە د ژوور ڤە، دێ دەست ب کرنا پرسیاران کەت و هەڤالێن وی ژی ب تنێ ماف هەیە ب "بەلێ" یان "نەخێر" بەرسڤا وی بدەن. ئەگەر ئەو کەسێ بەخترِەش ئەرِستۆتالیسەکێ باش بیت "ل وی دەمی ب رِاستی دێ کەسەکێ بەختەوەر بیت"، دێ دانوستاندنا وان ب ڤی شێوەی بیت:

- "ئەرێ ئەو تشتەکێ بەرجەستەیە؟" (بەلێ!)
- "ئەرێ سەر ب کانزیان ڤەیە؟" (نەخێر!)
- "ئەرێ بونەوەرەکێ زیندی یە؟" (بەلێ!)
- "ئەرێ سەر ب جیهانا رِووەکان ڤەیە؟" (نەخێر!)

- "ئەرێ سەر ب جیهانا گیانەوەران ڤەیە؟" (بەلێ!)
- "باڵندەیە؟" (نەخێر!)
- "شیردەرە؟" (بەلێ!)
- "گیانەوەرەکێ تەمامە؟" (بەلێ!)
- "پشیکە؟" (بەلێ!)
- ئەرێ ئەو پشیکا مونزە؟" (بەلێ!)

ئەڕستۆی ئەڤ یاریە داهێنابوو، داهێنەرێ یاریا خوەڤەشارتنا د تارتاتیێ ژی دا دێ کەینە ئەفلاتۆن. بۆ دیمۆکریتسی ژی، بەری نوکە مە سوپاسیا وی ژبەر بیرۆکەیا یاریا لیگۆیێ کربوو.

ئەڕستۆ زەلامەکێ ڕێکخستی بوو و دڤیا تێگەهێن مرۆڤان ڕێکبێخیت. لەورا وی بنەماییێن "لوژیك"ی وەك زانست دانان، ب ڕەنگەکی وی کومەکا ڕێساییێن هوور دەستنیشانکرن کو دەرئەنجام و بەلگەییێن هەر تشتەکێ ژ لایێ لوژیکی ڤە بهێنە پەسەندکرن. ئەم دێ نموونەیەکێ ل سەر ڤێ چەندێ وەرگرین: ئەگەر دووپاتیێ ل سەر هندێ بکەم کو هەموو بونەوەرێن زیندی دێ مرن "ئەڤە مگرتیا یەکێ یە"، هەروەسا دووپات بکەم کو هێرمس بونەوەرەکێ زیندی یە "ئەڤە مگرتیا دووێ یە"، ئەنجامێ ڤێ ئاخفتنێ ئەڤە: هێرمس دێ مریت.

ئەڤ نموونەیە ئاماژێ ب هندێ دکەت کو لوژیکێ ئەڕستۆی ل سەر پەیوەندییێن دناڤبەرا تێگەهان دا هاتیە دانان: پەیوەندیا دناڤبەرا تێگەهێ ژیانێ و تێگەهێ مرنێ. هەکە مە بڤێت دانپێدانێ ب هندێ بکەین کو ئەڕستۆ ل دور دەرئەنجامێن خوە یێن لوژیکی یێ ڕاست بوو، دڤێت دانپێدانێ ب هندێ ژی بکەین وی چ تشتێن گرنگ بۆ مە نەگوتینە، ژبەرکو هەر ل دەسپێکێ ئەم دزانین هێرمس دێ مریت "ئەو بونەوەرەکێ زیندی یە هەموو بونەوەرێن زیندی ژی دمرن، بەروڤاژی بەرەکێ گوپیتکا چیایەکێ بلند کو نامریت".

ئەم هەموو ڤێ چەندێ دزانین. بەلێ، هەتا ڤێرێ چ تشتێ نوو نینە، لێ پەیوەندیا دناڤبەرا تێگەهێن جودا جودا دا هەموو گاڤان د ڤەبڕ و ڕۆهن نینن. ژبەر هندێ یا پێدڤیە ئەم پیچەکێ تێگەهێن خوە بگوهۆڕین.

ل ڤێرێ ژی، دێ نموونەیەکا دی وەرگرین: ئەرێ ڕاستە مشکێن بچووك ژی مەمکێن دایکێن خوە دمێژن هەروەکو کا چەوا تێشکێن بەرخ و بەڕازان ڤێ چەندێ دکەن؟ ئەز دزانم ڕەنگە کەنیا تە ب ڤێ نموونێ بهێت لێ دا پیچەکێ هزرێن خوە بکەین. تشتەکێ پشتڕاست هەیە، ئەو ژی ئەوە کو مشك هێکان ناکەن، بەلکو ئەو ژی وەکو پەزی و چێلان تێشکێن بچووك دکەن. ئەو گیانەوەرێن تێشکان دکەن دبێژنێ شیردەر، ڕامانا تێگەهێ شیردەر ئەوە کو تێشکێن وان شیری ژ مەمکێن دایکا خوە دخون.

هەلبەت مە ب خوە ئەڤ بەرسڤە دزانی، لێ دڤێت بۆ ساتەکی هزرا خوە بکەین، هزرا خوە د پرسیارێ دا بکەین. دبیت وەختێ مە ئەڤ پرسیارە کری و یەکسەر بەرسڤ نەدابیت ژبەر هندێ بیت یان ژێ د پشتڕاست نەبین، چونکی مە چ جاران ب چاڤێن خوە نەدیتیە دەمێ مشکەکێ بچووك مەمکێ دایکا خوە بگریت و شیری بخوت. ڕەنگە مشك شەرم بکەن ل پێشچاڤێن مە شیری بدەنە تیشکێن خوە.

## پێسترکا سروشتی

دەمێ ئەڕستۆ دهێتە سەر بابەتێ ڕێکخستن و سیستەمی د سروشتی دا، یەکەم تشتێ گوتی ئەو بوو کو گشت دیاردەیێن سروشتی ل سەر دوو گرۆپێن سەرەکی دا دهێنە پارڤەکرن. تشتێن بێ ڕۆح وەکو بەر و چیکێن ئاڤێ و ئاخا سەر ئەردی، ڤان تشتێن بێ ڕۆح شیانێن گوهۆڕینێ بۆ چ تشتێن دی نینن، بەلکو ب تنێ ل وی دەمێ دهێنە گوهۆڕین دەمێ فاکتەرەکێ دەرەکی مایێ خوە تێدا بکەت. گرۆپێ دی ژی بونەوەرێن زیندی نە کو وان خوە دناخێ خوە دا شیانێن گوهۆڕینێ هەلگرتینە.

ئەڕستۆی تشتێن زیندی ژی ل سەر دوو گرۆپێن دی دا پارڤەکرن: ڕووەکێن زیندی و بونەوەرێن زیندی. ل دووڤ دا ژی بونەوەرێن زیندی ل سەر دوو گرۆپێن دی پارڤەکرن، گیانەوەر و مرۆڤ.

ئەم دشێین بێژین ئەڤ ڤاڤارتنا ئەڕستۆی، دابەشکرنەکا ڕۆهن و دیارە، کا چەوا جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا تشتێن زیندی و نەزیندی دا هەیە، ئاها هۆسا جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا گیانەوەر و ڕووەکان ژی دا هەیە، هەروەسا جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا گیانەوەرەکێ وەکو هەسپی و مرۆڤی ژی دا هەیە. ئەگەر ئەم د بابەتی دا بچینە خوارێ و پرسیار بکەین: ئەرێ ئەڤ جوداهیە د کیڤە دانە؟ ئەرێ تو دشێی بەرسڤا من بدەی؟

بە داخەوە من هند وەخت نینە ئەز خوە ل هیڤیا تە بگرم، چونکی هەتا تو بەرسڤا خوە دنڤیسی و دگەل پارچەیەکا شیریناهیێ دکەیە د زەڕفەکێ پیڤازی دا، دێ وەختەکێ درێژ چیت، ژبەر هندێ ئەز ب خوە دێ بەرسڤا خوە دەم.

دەمێ ئەڕستۆی دیاردەیێن سروشتی ل سەر لقێن جودا جودا پارڤە دکرین، وی ژ ساخلەتێن تشتان دەستپێکر، ئەگەر پتر ڕۆهن بکەین، ئەو ژی کا ئەڤ تشتە دشێن چ بکەن یان د شیانێن وان دا هەیە چ بکەن. هەموو بونەوەرێن زیندی خوارنێ دخون و مەزن دبن و وەڕارێ دکەن. هەموو بونەوەرێن زیندی ژ گیانەوەر و مرۆڤان شیانێن هەستپێکرنا جیهانا دەوروبەری خوە هەنە، زێدەباری وان گوهۆڕینێن د سروشتی دا پەیدادبن. زێدەباری ڤێ چەندێ، هەموو مرۆڤان شیانێن هزرکرنێ هەنە، ئاها شیانێن ڤاڤارتنا هەستێن خوە ل سەر لق و گرۆپێن جودا جودا دا.

ژڤی لای ڤە، چ سنوورێن ڕۆهن و دیار د سروشتی دا نامینن. ئەگەر ئەم ژ سادەترین تشت بەرەڤ ئالۆزترین تشت ڤە بسەرکەڤین، ڤێجا چ ل سەر ئاستێ ڕووەکان یان گیانەوەران دا، مرۆڤ دێ ل سەرێ ڤێ پێسترکێ ڕاوەستیت کو ب بۆچوونا ئەڕستۆی هەست ب هەموو ژیانا سروشتی دکەت. مرۆڤ ژی وەکو ڕووەکان خوارنێ دخوت و مەزن دبیت، وەکو گیانەوەران ژی هەست ب جیهانا دەوروبەری خوە دکەت و شیانێن هاتنوچوونێ هەنە. دگەل ڤێ چەندێ هەموویێ ژی، ئەو بونەوەرێ یەکانەیە ل سەر ڕوویێ ئەردی کو شیانەکا تایبەت هەیە، ئەو ژی شیانێن هزرکرنەکا ژیرانەیە.

ب ڤی ڕەنگی، مرۆڤان بەشەك ژ ئەقلێ خودای هەیە. بەلێ سۆفیا. من گوت: ئەقلێ خودای... ئەڕستۆ ل گەلەك جهان دووپاتیێ ل سەر هندێ دکەت کو پێدڤیە خودایەك هەبیت ئەڤ گەردوونە هەموو ئاڤاکربیت و دانابیتە سەر ڕێیەکێ. ل ڤێرێ ژی خودا دێ ل سەرێ پێسترکا سروشتی بیت و کەس د سەر وی دا نابیت.

ئەڕستۆ د وێ باوەرێ دا بوو کو لڤینا ستێر و ئەختەران کونترۆلێ ل سەر لڤینا تشتێن سەر ئەردی دکەت، لێ پێدڤیە هێزەك هەبیت کونترۆلێ ل سەر لڤینا ئەسمان و ئەختەر و ستێران ژی بکەت. وی ناڤێ ڤێ هێزێ کربوو "لڤینەرێ یەکێ" یان ژی "خودا". لڤینەرێ یەکێ نالڤلڤیت، چونکی ئەو ب خوە ئەگەرێ یەکێ یە ژ بۆ لڤینا ستێران و ژێدەرێ هەموو لڤینایە د سروشتی دا.

## ڕەوشت

سۆفیا، دا بزڤڕینە سەر بەحسێ مرۆڤان. ب دیتنا ئەڕستۆی، فۆرمێ مرۆڤی پێکدهێت ژ: بەشەکێ ڕووەکی "ڕۆحەکا ڕووەکی"، بەشەکێ گیانەوەری "ڕۆحەکا گیانەوەری" و بەشەکێ ئەقلی "ڕۆحەکا هزری". ژبەر هندێ ئەو پرسیار دکەت: "ئەرێ ل سەر مرۆڤی یا پێدڤیە چەوا بژیت؟ مرۆڤی پێدڤی ب چ هەیە داکو ژیانەکا بەختەوەر ببورینیت؟"

ئەز دێ ب ڕستەیەکێ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ دەم: "مرۆڤ نەشێت ب بەختەوەری بژیت ئەگەر هەموو هێز و شیانێن خوە بکارنەئینیت."

ئەڕستۆی سێ جۆرێن بەختەوەریێ دەستنیشان کربوون: جۆرێ یەکێ، ژیانەکا پڕی کەیفخوشی و وەخت بوراندنێ، جۆرێ دووێ ئەوە وەکو هاولاتیەکێ ئازاد و بەرپرسیار بژیت، جۆرێ سییێ ژی ئەوە وەکو زانا و فەیلەسۆفەکی بژیت.

ئەڕستۆ دووپاتیێ ل سەر هندێ دکەت پێدڤی یە ئەڤ هەرسێ مەرجە پێکڤە هەبن هەتا کەسەك بشێت ژیانەوەکا بەختەوەر ببورینیت. هەرچەندە ئەو ب هەموو ڕەنگان لایەنگیریێ ڕەت دکەت، لێ هەکە ئەو ل سەردەمێ مە یێ نوکە ژیابایە، دا ڕەخنەیێن مەزن

ل وان کەسان گریت یێن ب تنێ بۆ لەشێ خوە یان ئەقلێ خوە دژین، چونکی د ڤان هەردوو کاودانان دا لایەنگیری دهێتە کرن و مرۆڤ د شێوازەکێ ژیانێ یێ نەهەڤسەنگ دا دژیت.

دەربارەی پەیوەندیا مە دگەل کەسێن دی، ئەرستۆی رێکەکا باش پێشنیار کر بوو: نابیت ئەم د ترسنوك بین و د هەمان دەم دا نابیت د زرتەك ژی بین، بەلکو د ئازا و چاڤنەترس بین. چونکی کێم ئازایەتی، ترسنوکیە و گەلەك ئازایەتی ژی زرتەکیە و چ مفا تێدا نینە. هەردیسان نابیت کەسێن تەماع و نە ژی کەسێن دەستدرێای بین. بەلکو د مەرد و دەستڤەکری بین. چونکی کێم مەردینی، تەماعیە و گەلەك مەردینی ژی دەستدرێای یە وەکو هندێ یە تو پارێت خوە د پەنجەرێ دا پاڤێژی.

هەمان رێسا ل سەر خوارنێ ژی دهێتە بجهئینان. گەلەك خوارن مەترسیە بۆ سەر لەشی و کێم خوارن ژی مەترسی یە بۆ سەر لەشی. زانستێ ئەتیکی ل دەڤ ئەرستۆی، هەروەکو ل دەڤ ئەفلاتۆنی ژی، بیرا مە ل نوشداریا گریکی دئینیت: ژیانا هەڤسەنگ و ناڤنجی رێکا یەکانەیە مرۆڤ ب بەختەوەری بژیت.

## سیاسەت

د تێگەهێ خوە دا بۆ جڤاکی، ئەرستۆی هەڤدژیا خوە بۆ تاکرەوییێ ژی کریە. ب بۆچوونا وی، مرۆڤ د سروشتێ خوە دا بونەوەرەکێ جڤاکی یە. بێ هەبوونا جڤاکێ دەوروبەری مە، ئەم نابینە مرۆڤێن راستەقینە. خێزان و گوند ژی پێدڤیێن مە یێن سەرەکی یێن ژیانێ نە هەروەکو کا چەوا خوارن و گەرماتی و هەڤژینی و پەروەردەکرنا زارۆکان بۆ مە د گرنگن. لێ بلندترین فۆرمێ پێکڤە ژیانا جڤاکی، ئەوە خوە دناڤ وەلاتی دا دبینیت.

ئەڤ چەندە بەرێ مە ددەتە پرسیارەکێ: دێ چەوا وەلاتەکی رێکئێخی؟ "بیرا تە ل وەلاتێ ئەفلاتۆنی یێ نموونەیی دهێت؟". ئەرستۆی سێ فۆرمێن سەرکەفتی بۆ برێڤەبرنا وەلاتی وێنەکرینە. فۆرمێ یەکێ: حوکمێ شاهانە. د ڤی جۆرێ حوکمی دا ب تنێ یەك

سەروك هەیە. داكو ئەڤ فۆرمە د بەرژەوەندیا خەلكی دا بیت، نابیت حوكم بكەڤیتە د دەستێ كەسەكێ دیكتاتور دا و هەموو تشتان د بەرژەوەندیا خوە دا بكاربینیت.

فۆرمێ دووێ: حوكمێ ئەرستۆكراتی. د ڤی فۆرمی دا كومەكا كەسان بەرپرسیاریا ب رێڤەبرنێ ب ستۆیێ خوە ڤە دگرن، لێ ل ڤێرێ ژی نابیت ئەڤ فۆرمە ژی وەكو یاریەكێ بیت د دەستێ كومەكا دەستهەلاتداران دا كو ل سەر دەمێ ئەڤرۆكە ئەم دبێژینێ "كودەتایا سەربازی".

فۆرمێ سیێ ژی، ئەرستۆی ناڤێ وێ كریە "پولیتی" ئانكو دیموكراتی. لێ ڤی فۆرمی ژی لایەنێ خوە یێ نەرێنی هەیە چونكی گەلەك جاران هەر زوو وەلاتەكێ دیموكراتی دهێتە گوهۆرین بۆ وەلاتەكێ ئاژاوەگێر.

## بۆچوون ل دور ژنێ

ل دوماهیێ، دێ هێینە سەر بابەتێ بۆچوونێن وی ل دور ژنێ. بەداخەوە دیتنا وی ژی بۆ ژنێ ژ یا ئەفلاتۆنی باشتر نینە، چونكی ئەرستۆ ژی ژ وێ بیروباوەرێ یێ دوور نەبوو كو تشتەك ژ ژنێ یێ كێمە. ب دیتنا وی، ژن زەلامەكێ نەتەمامە. بۆ نموونە، د كریارا ژ دایكبوونێ دا، ژن یا نەچالاك و وەرگرە، لێ د هەمان دەم دا زەلام یێ چالاك و بەخشندەرە. هەر ب بۆچوونا وی، زارۆك ب تنێ ساخلەتێن بابێ خوە وەردگریت، چونكی وی هزر دكر هەموو ساخلەتێن زارۆكی د ناڤ توڤێ زەلامی دا دهێنە هەلگرتن و ژن ب تنێ وەكو زەڤیەكا ئەردی یە توڤ ل سەر دهێتە چاندن و زەلام ژی وەكو جوتیارەكی یە بەرهەمێ ڤی توڤی دهەلگریت. ئانكو ل دووڤ تێگەهێ ئەرستۆی، زەلام فۆرمی ددەت و ژن ماددەی.

جهێ حێبەتی و داخێ یە كەسەكێ زیرەك و ئاقلمەندێ وەكو ئەرستۆی ڤێ شاشیا هەرە مەزن بكەت و نەزانیت كا پەیوەندیا دناڤبەرا ژن و زەلامی دا چیە. لێ ئەڤ چەندە ژی دوو تشتان دووپات دكەت: یەكەم، ئەرستۆی چ سەربۆر ل دور ژیانا ژن و زارۆكان نەبوون.

دووەم: تشتەکێ مەترسیدارە زەلام کونترۆلێ ل سەر زانست و فەلسەفێ بکەن، چونکی ئاھا دێ ب ڤی ڕەنگی سەرەدەرییێ کەن.

شاشیا ئەرستۆی ل دور ژنێ کارەسات بوو، چونکی ئەڤ تیورا وی، نەك تیورا ئەفلاتۆنی، ھەتا چەرخێن ناڤەراست ژی یا زالێ بوو. ھەتا ئەڤ چەندە ژ لایێ زەلامێن ئاینی ب خوە ڤە ژی دھاتە پەیرەوکرن کو د بنەڕەت دا ئەڤ چەندە د ئینجیلێ ژی دا نەبوو، ژبەرکو حەزرەتێ مەسیح کەسەکێ دژی ژنێ نەبوو.

ھەتا ڤێرێ ئەز دێ ڕاوەستم ھەتا دەنگوباسێن من یێن نوو دگەھنە تە.

دەمێ سۆفیایێ وانەیا ئەرستۆی ب دوماھی ئینای، کاغەزێن خوە ھەموو کومکرن و کرنە د زەرفێ ڤەھوائی دا. پاشی تەماشەی ژوورا خوە کر، وێ دیت ژوورا وێ گەلەك یا بێسەروبەرە. پەرتووك و دەفتەرێن وێ یێن کەفتینە سەر ئەردی و دەرگەھێ قومسورا وێ یا جلکان یێ ڤەکریە و جلکێن وێ یێن ژێ دەرکەفتین. ھەردیسان کومەکا جلکێن پیس ژی بۆ شووشتنێ دانابوونە سەر کورسیکێ.

حەزەکا مەزن ل دەڤ وێ پەیدابوو کو ژوورا خوە ب سەروبەر بکەت و ھەر تشتەکی بدانتە جھێ وی. ل دەستپێکێ دەرگەھێن قومسورا خوە ڤەکرن و ھەموو تشت ژێ ئینانە دەرێ و دانانە سەر ئەردی. یا گرنگ ئەوە ئەو ژ سفرێ دەست پێبکەت. پاشی جلکێن خوە یەك یەکە جوان وەرپێچان و دووبارە زڤڕاندنە د ڕەفانکێن قومسورێ دا کو ھژمارا وان حەفت ڕەفانك بوون.

رەفانکەك تەرخانکر بۆ جلکێن مەلەڤانیان و قەمیسان، ڕەفانکەك بۆ جلکێن ناڤخوی و گورەیان، ڕەفانکەك ژی بۆ پەنترۆنان ...ھتد. ھۆسا ب سانەھی ھەموو جلك کرنە د قومسورێ دا و ئێدی زانی کا ھەر تشتەك ب دروستاھی د کیرێ دایە. پاشی جلکێن پیس ژی کرنە د کیسکەکێ پلاستیکی دا.

ل دوماھییێ ھەموو تشتێن خوە دووبارە ڕێکخستن، ب تنێ گورەیەکا سپی یا ھەتا سەرچوکان نەبیت. چونکی ئەو گورە وەکو چ تشتێن دی نەبوو، ھەروەسا یا وێ ب خوە ژی

نەبوو. دەمێ باش سەحکریە هەموو لایێن وێ بەلکو پیتەکێ یان ناڤەکی ل سەر ببینیت، لێ دەمێ چ تشت نەدیتین، ئەو گورە ژی دانا سەر بانێ قومسورێ، ب ڕەخ یاریا لیگۆیێ و دەستمالا حەریری یا ڕەنگ سۆر ڤە.

پاشی گەڕا پەڕتووکخانا وێ هات. سۆفیایێ هەموو پەڕتووک و دەفتەر و وێنە و لەزگە "لصقه" ئینانە دەرێ. دەمێ ئەو ژی ڕێکخستین، هەروەکو کا چەوا مامۆستایێ وێ یێ فەلسەفی بۆ وێ بەحسێ ئەرستۆی دکری، بەرەڤ تەختێ خوە یێ نڤستنێ ڤە چوو و ئەو ژی ب سەروبەر کر.

ل دوماهیێ، نامێن بەشێ ئەرستۆی ئینانە دەرێ و دووبارە ڕێکخستنەڤە و کرنە دناڤ وێ فائیلا ل سەر بانێ قومسورێ و ب ڕەخ یاریا لیگۆیێ و گورەیێن سپی ڤە. پاشی بڕیار دا ب ڕۆژێ بچیتە د کۆلکێ خوە یێ بچووک ڤە و سندوقا نامێن خوە بینیت.

ژ نوکە وێڤە، هەموو تشتێن وێ د ڕێکخستی و ب سەروبەرن. ئەڤ چەندە ل سەر ژوورا وێ ب تنێ ناهێتە بجهئینان، بەلکو ئەو باش تێگەهشت کو پێدڤیە ئەو تێگەهـ و بیرۆکەیێن خوە ژی ڕێکبێخیت. جهێ یەکانە یێ کو نەکەفتیە بن ڤی سیستەمی، سەربانێ قومسورا وێ بوو کو بۆ کەلوپەلێن ژێکجودا تەرخان کربوو.

سۆفیا ژ دەرەجکان هاتە خوارێ و بەری دایکا خوە هشیار بکەت، خوارن دا گیانەوەرێن خوە یێن کەهی. د لێنانگەهێ ڤە بەرەڤ حەوزا ماسیان ڤە چوو. ماسیەك یا ڕەش بوو و ماسیەکا دی یا پرتەقالی و یەکا سۆر و یەکا سپی بوو، ژبەر هندێ سۆفیایێ ناڤێن وان کرنە: "پیتەرێ ڕەش، ڤرتا زێڕی، لەیلایا سۆر". پاشی خوارنا وان کو کرمێن ئاڤی بوون هاڤێتە بەر و گوت: "هوون سەر ب جیهانا زیندەوەرێن سروشتی ڤەنە، ژبەر هندێ هوون دشێن خوارنێ بخون، مەزن ببن و وەڕاڕێ بکەن. ب تایبەت تو ماسیا ڕەش، تو سەر ب جیهانا گیانەوەران ڤەی، ژبەر هندێ تو دشێی بهێی و بچی و تەماشەی دەوروبەرێن خوە بکەی. تو ماسیەکی کو دشێی ب ڕێکا کڤانێ خمخمکان بێهنا خوە ب هەلکێشی و دناڤ ئاڤێ دا مەلەڤانیان بکەی و بۆ هەموو لایان بهێی و بچی.

سۆفیایێ ڤودیکا کرمان دانا ڕەخەکی و دەرێ حەوزا ماسیان گرت، ئەو ب دیتنا ڤان ماسیێن سۆر گەلەك یا دلخوش بوو. پاشی بەرەڤ بەبەغاێن خوە ڤە چوو ب ڤی ڕەنگی دگەل ئاخفت

- "خوشتڤییێن من سمیت و سمۆێل! هوون ژ دوو هێکێن بچووك دەرکەفتن داکو ببنە دوو بەبەغاییێن جوان و ژێهاتی. ژبەرکو ئەڤ هێکێن هوون ژێ پەیدابووین، سروشتێ وان ب خوە یێ مێ بوو، لەوڕا هوون بوونە دوو بەبەغاییێن مێ یێن جوان، نەك دوو بەبەغاییێن نێر یێن پڕبێژ."

پاشی سۆفیا بەرەڤ سەرشوویێ ڤە چوو کو کیسەلەیێ وێ یێ بێخیرەت دناڤ سندوقەکا مەزن دا دژیا. گەلەك جاران دەمێ دچووی سەرێ خوە بشوت، دایکا وێ لێ دکرە ڤێژی و دگوتێ کو دێ هەر ڕۆژەکێ ڤی کیسەلەی کوژم، لێ ئەڤ چەندە ب تنێ وەکو گەفەکێ بوو نەك زێدەتر.

پاشی سوفیایێ بەلگەکێ کەلەمیێ ئینا و کرە دناڤ سندوقا کیسەلەی دا و گوت: "هەرچەندە تو سەر ب کوما گیانەوەرێن بلەز ڤە نینی، لێ پا تو هەر گیانەوەری و دشێی پیچەکێ ژ سەربۆرێن ڤێ جیهانا مەزن یا ئەم هەموو تێدا دژین تاقی بکەی. تو دشێی دلێ خوە ب هندێ خوش بکەی کو تو بونەوەرێ یەکانە نینی ل سەر ڕوویێ ئەردی یێ نەشێت ژ سنوورێن خوە دەرباز ببیت."

شیریکان ژی، چ پێنەڤێت نوکە ئەو چوویە ژ دەرڤە داکو مشکەکی بگریت چونکی ئەڤە نەریتەکێ زکماکی یە ل دەڤ پشیکان و ب ڤێ ڕێکێ خوارنا خوە پەیدادکەن.

دەمێ بەرەڤ ژوورا دایکا خوە ڤە چووی، د ڕێکێ دا گولدانەکا پڕی گول نێرگز ل سەر مێزەیا هۆلا ڕوونشتێ دیت. سۆفیایێ هزرکر ڤان گولێن زەر بەژنا خوە وەك ڕێزگرتن بۆ وێ یا چەماندی. سۆفیا بۆ چەند چرکەیان ل دەڤ وان ڕاوەستیا و دەستێ خوە ب سەر دا ئینا و گوت: "تو ژی سەر ب جیهانا بونەوەرێن سەر ڕوویێ ئەردی ڤەی، ڕاستە بهایێ وە ژ ڤێ گولدانا شووشەی پترە، لێ بەداخەوە هوون هەست ب ڤێ چەندێ ناکەن."

دوماهیێ چوو د ژوورا دایکا خوە ڤە کو هێشتا د خەوەکا کوور دا د نڤستی بوو. سۆفیایێ دەستێ خوە دانا سەر سەرێ وێ و گوت: "تو یەك ژ بەختەوەرترین بونەوەرێن

سەر ڕوویێ ئەردی، چونکی تو نە ب تنێ بونەوەرەکا زیندی وەکو گول نێرگزێن ناڤ باخچەی یان شیریکان و جوڤیندایێ، بەلکو تو مرۆڤی و تە هندەك شیانێن دەگمەن هەنە کو ل دەڤ چ بونەوەرێن دی یێن زیندی نینن، ئەو ژی شیانێن هزرکرنێ نە."

دایکا وێ بلەز ژ خەو هشیار بوو و گوت: "ئەڤە تو چ دبێژی سوفیا؟"

- "من گوت تو ژی وەکو کیسەلەیەکا تەمبەل و بێخیرەتی. هەروەسا من دڤیا بێژم کو من ژوورا خوە هەموو ب سەروبەر کر، ئەو ژی ل دووڤ هندەك ڕاسپاردە و بنەمایێن فەلسەفی."

دایکا وێ ڕاست ژ ناڤ جهێن خوە ڕابووڤە و گوت: "جارێ تو ڕاوەستە هەتا دەستێ من ب تەرا دگەهیت دێ تە باش چێکەم، لێ نوکە بلەز هەرە بۆ من قەهوەیەکێ چێکە."

سۆفیایێ داخوازا وێ بجه ئینا. د لێنانگەهێ ڤە، ئەو ل سەر مێزا خوارنێ ڕوونشت و قەهوە و شیریناهی و شەربەتا فێقی دانا بەر سینگێ خوە. پشتی دەمەکێ کێم ژ بێدەنگیێ، سۆفیایێ پرسیار کر: "دادێ، ئەرێ تە جارەکێ پرسیار کریە کا بۆچی ئەم دژین؟"

- "ئاخ سۆفیا، تو قەت بەلاٚ خوە ژ من ڤە ناکەی."

- "بەلێ دێ بەلاٚ خوە ژ تە ڤەکەم چونکی نوکە ئەز ب خوە بەرسڤا ڤێ پرسیاری دزانم. خەلك ل سەر ڤی ئەردی دژین بۆ هندێ داکو کەسەك هەبیت ل سەر ئەردی ب ڕێڤە بچیت و هەموو تشتان ب ناڤێن وان یێن تایبەت ناڤ بکەت."

- "ئاها، من چ جاران هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا نەکریە."

- "باشە، تە ئاریەشەکا مەزن هەیە. هندی مرۆڤە، بونەوەرەکێ خوەدان هزرە. ئەو مرۆڤێ هزرا خوە نەکەت، نابیت بێژنێ مرۆڤ."

- "سۆفیا! تە ئاگەهـ ژ دەڤێ خوە هەیە؟"

- "سەحکێ دادێ، ئەگەر ب تنێ ڕووەك و گیانەوەر ل سەر ڕوویێ ئەردی ژیابانە، کەسێ پشیك و سە و گول نێرگز و گول بەیبوون ژێکجودا نەدکرن. ڕووەك و گیانەوەر ژی وەکو مە بونەوەرێن زیندی نە، لێ ئەم مرۆڤ ب تنێ دشێین دەوروبەرێ خوە ژێکجودا بکەین و ل سەر گرۆپێن جودا جودا دا دابەش بکەین."

دایکا وێ کومێنتەك ل سەر ئاخفتنا وێ دا و گوت: "ب ڕاستی تو کچەکا سەیری."

- "هیڤیا من ژی ئەوە ئەز یا هۆسا بم، هەموو مرۆڤ ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگان د سەیرن. ئەز مرۆڤم، کەواتە ئەز ژی یا سەیرم. تە ژی کچەکا ب تنێ هەیە، ڤێجا تشتەکێ سروشتی یە هەکە ئەز ل دەڤ تە یا سەیر بم."

- " من دڤێت بێژمە تە کو ب ڤان ئاخفتن و دانوستاندنێن خوە من دترسینی."

- "چەوا! پێدڤی ناکەت تو ژبەر من نیگەران ببی."

پشتی نیڤرۆ سوفیا چوو ناڤ کۆلکێ خوە و شیا ب دزیکی ڤە ڤالکا زەرفێن خوە یێ فەلسەفی بینیتە د ژوورا خوە ڤە بێ کو چاڤێن دایکا وێ ب وێ بکەڤیت.

ل دووڤ ڕێکەفتا نامێن بۆ وێ هاتین، ئەو نامە هەموو ڕێکخستن و پاشی کاغەزێن وانەیا ئەرستۆی ژی کرنە دگەل و هژمارەك ل سەر دانا و دانانە ب سەر هەموو زەرفێن دی ڤە. نوکە هژمارا نامێن وێ ژ پێنجی نامەیان بوری بوو. ئانکو ب ڤی ڕەنگی وێ بەرپەڕێن دەستپێکێ یێن پەڕتووکا خوە یا فەلسەفی کومدکرن. ڕاستە وێ ئەڤ نامە نەنڤیسابوون، لێ تایبەت ژ بۆ وێ هاتبوونە نڤیسین.

پشتی هینگێ وێ زانی کو چ دەم نەمایە وانەیێن خوە یێن قوتابخانێ بۆ ڕوژا دووشەمبی بخوینیت کو وان تاقیکرنا بابەتێ ئایینێ هەبوو. لێ ژبەرکو مامۆستای بەری هینگێ گوتبوو وان ئەو دێ پتر گرنگیێ دەتە هەڵسەنگاندنا هەلویستێن هزری یێن قوتابیان و بۆچوونێن وان یێن کەسایەتی، ژبەر هندێ سۆفیایێ هەستپێکر کو وێ باش خوە بۆ ڤێ چەندێ بەرهەڤ کریە.

# هیلینیزم

*...چریسکەك ژ ئاگری...*

هەرچەندە مامۆستایێ فەلسەفی ئێدی یەکسەر نامە فرێدکرنە کۆلکێ وێ یێ بچووك و کەڤن، لێ هەموو سپێدەهیێن ڕۆژێن دووشەمبی وەکو هەرجار سۆفیایێ سەحدکرە سندوقا پۆستەی.

هەروەکو وێ پێشبینی دکری، سندوق یا ڤالاٚ بوو. پاشی ئەو بەرەڤ تاخێ "*کلۆڤەر*" ڤە چوو.

ژ نیشکەکێ ڤە، وێنەیەکێ فوتوگرافی ل سەر شوستەی دیت. ئەو وێنە یێ ترۆمبێلەکا جێب یا ڕەنگ سپی بوو کو ئالایەکێ شین و پیتێن UN ل سەر بوون. ئەرێ ئەڤە نە ئالایێ نەتەوەییێن یەکگرتی یە؟

سۆفیایێ وێنە وەرگەڕاند، هۆسا دیارە پۆستەکارتەك بوو ژ دەڤ سۆفیا ئاموندسنێ بۆ "هێلد موللەر کناگ"ێ هاتیە هنارتن. ئەو پولا ل سەر وێ کارتێ یا نەڕویجی بوو، مورا بەتەلیونا نەتەوەییێن یەکگرتی ل سەر بوو و ل ڕۆژا 15 خزیرانا سالا 1990ێ هاتبوو مورکرن.

15 خزیران! مانە ئەڤە ڕۆژا ژ دایکبوونا سۆفیایێ یە!

ئەو تێکستێ ل سەر پۆستکارتێ ب ڤی ڕەنگی بوو:

***خوشتڤیا من هێلد***

***ئەز دبێژم هێشتا سالڤەگەڕا ڕۆژا ژ دایکبوونا تە نەهاتیە، مانە سوباهی یە! هیڤیا من ئەوە ئەڤ کارتە د هەمان ڕۆژ دا بگەهیتە تە. نە یا گرنگە بزانی کا هەتا کەنگی دێ مفای ژ ڤێ دیاریێ وەرگری، چونکی ڕەنگە ب درێژاهیا ژیانا تە بمینتە دگەل تە. جەژنا بوونا تە پیروز دکەم و داخوازا ژیەکێ درێژ بۆ تە دخوازم. ئەز دبێژم نوکە تە زانی کا بۆچی ئەز کارتان بۆ سوفیایێ دهنێرم، ژبەر هندێ یە چونکی ئەزێ پشتڕاستم ئەو دێ گەهینتە تە.***

***تێبینی: دایکا تە گوتە من کو تە جزدانکا خوە یا بەرزە کری، سوزێ ددەم ب زووترن دەم 150 کورونێن سویدی بۆ تە بهنێرم داکو جزدانکەکا نوو بۆ خوە پێ بکری. دەربارەی باجا تە یا قوتابخانێ ژی، تو دشێی بەری هاتنا بێهنڤەدانا هاڤینێ، ب سانەهی ل قوتابخانێ باجەکا دی بۆ خوە دەربێخی.***

***بابێ تە***

***یێ ب دلوڤانی تە هەمبێز دکەت***

سۆفیا حێبەتی ما و پێن وێ ب ئەردی ڤە ڕەق بوون. ئەرێ ئەو چ بەروار بوو ل سەر ڤێ پۆستەکارتێ یا بەری هینگێ بۆ وێ هاتی؟ د دلێ خوە دا دگوت ئەز دبێژم هەمان ڕێکەفتە ئەڤا نوکە ل سەر ڤێ کارتێ: 15ی خزیرانێ، هەرچەندە هینگێ وێ باش نە سەحکربوو ڕێکەفتا هنارتنا وێ کارتێ.

تەماشەی دەمژمێرا خوە کر، پاشی بلەز بەرەڤ مال ڤە زڤڕی. چ تشتێ هۆسا ڕوونادەت ئەگەر ئەو پیچەکێ ل سەر ژڤانێ دەرکەفتنا خوە گیرو ژی بیت.

د ژوورا خوە ڤە، وێ کارتا خوە یا بەری هینگێ ئینا دەرێ کو دانابوو بن دەستمالا سۆر. بۆ وێ دیاربوو پێشبینیا وێ د جهێ خوە دایە، بەلێ ئەو ژی ل ڕۆژا 15 خزیرانێ

هاتبوو هنارتن، ئانكو ڕۆژا جەژنا بوونا سۆفیایێ و دوماهیك ڕۆژێن سالا وێ یا خواندنێ بوون و چەند ڕۆژەكێن كێم مابوون بێهنڤەدانا هاڤینێ دەست پێبكەت.

هەروەكو تشتەك ژ نوو هاتیە سەر هزرا وێ، بەرەڤ بازاڕی ڤە چوو، چونكی یا ل سەر وێ پێدڤی بوو هەڤالا خوە جوانایێ ل مولەكا بازرگانی ببینیت.

ئەرێ هێلد كیە؟ چەوا بابێ وێ یێ پشتڕاستە كو سۆفیا دێ ڤێ دیارییێ گەهینتە دەستێ وێ؟ هەرچەوا بیت، ب ڕاستی تشتەكێ بێ مانایە بابەك ل شوونا پۆستەكارتان ڕاستەوخو بۆ كچا خوە بهنێریت، بۆ سۆفیایێ بهنێریت. ئەرێ ئەڤە ب تنێ تڕانەكە یان ژی مەرەمەك ل پشت هەیە؟ ئەرێ وی دڤێت سوپڕایزەكا خوش بۆ كچا خوە چێكەت ب ڕێكا بكارئینانا كچەكا نەدیار كو ب ڕولێ پەیامبەرەكێ ڕابیت؟

ئەرێ ژبەر ڤێ چەندێ پۆستەكارت ب هەیڤەكێ بەری ژڤانێ وێ یێ دەستنیشانكری هاتیە هنارتن؟ ئەرێ ئەو هزر دكەت بكارئینانا سۆفیایێ وەك پەیامبەر دێ هەڤالەكا نوو بۆ كچا خوە دروست كەت، وەك دیاریەك بۆ ڕۆژا ژ دایكبوونا وێ؟ ئەرێ ئەڤە ئەو دیاریە یا هەتا هەتایێ بمینیت؟

ئەگەر ئەڤ بابێ نەدیار نوكە ل وەلاتێ لوبنانێ بیت؟ چەوا وی ناڤونیشانێن سۆفیایێ ب دەستخوەڤە ئینانە؟ هەرچەوا بیت، تشتەكێ هەڤپشك دناڤبەرا هێلد و سۆفیایێ دا هەیە: ئەو هەردوو د هەمان ڕۆژ دا هاتینە سەر دنیایێ و بابێن وان هەردووكان ل دەرڤەی وەلاتی كاردكەن.

سۆفیایێ هەستپێكر ئەو یا بەرەڤ جیهانەكا ئەفسانەی دچیت. هۆسا دیارە باوەری ئینان ب قەدەرێ تشتەكێ پەسەند بیت، لێ ل سەر وێ یا پێدڤیە زوو ژ ڤان دەرئەنجامان نەدەركەڤیت.

چ پێنەڤێت شرۆڤەكرنەك بۆ ڤێ چەندێ هەیە، لێ چەوا چێدبیت ئەلبێرتۆ كنوكس جزدانكا هێلدێ ببینیت كو ئەو ب خوە ل دەڤەرا "لیلساند" دژیت، ئەڤا چەندین كیلومەتران ل دووری كۆلكێ وی؟ ئەرێ بۆچی سۆفیایێ ئەو پۆستەكارت ل سەر ئەردی دیت؟ ئەرێ تو بێژی ئەڤ كارتە ژ چانتەیێ پۆستەچی كەفت بیت بەری كو بگەهیتە د

سندوقا پۆستەی یا مالا سۆفیایێ دا؟ ئەگەر هۆسا بیت، ئەرێ بۆچی ئەڤ کارتە ب تنێ دەرکەفتی یە؟

- "نەخێر! ما تە تەماشەی دەمژمێرا خوە نەکریە؟"

جوانایێ ل سۆفیایێ کرە ڤێژی دەمێ دیتی یا بەرەڤ مولا بازرگانی ڤە دهێت.

- "ببورە...."

جوانایێ ژی ماموٚستایێ وێ یێ ڤوتابخانێ، ب ناڤچاڤ گرێ تەماشەی سۆفیایێ دکر.

- "هیڤیا من ئەوە تە هێجەتەکا بەرئاقل هەبیت کا بۆچی تو گیروبووی."

- "بەلێ.. تشتەکە پەیوەندی ب نەتەوەییێن یەکگرتی ڤە هەیە. ئەز ژ لایێ سەربازێن دوژمنی ل لوبنانێ هاتبوومە گرتن."

- "باشە... تو یا ئەڤیندار بووی، مانە هۆسایە؟"

پاشی هندی پێن وان شیای وان بهەلگرن، بلەز بەرەڤ ڤوتابخانێ ڤە چوون.

ل وانەیا سیێ، تاقیکرنا ئاینێ دەستپێکر کو بەری هینگێ سۆفیایێ پێشبینی دکر دێ ئەڤ تاقیکرنە هێتە ئەنجامدان، لێ وێ دەم نەبوو ڤێ وانەیێ بخوینیت. پرسیارێن تاقیکرنێ ب ڤی شێوەی بوون:

## فەلسەفەیا ژیان و لێبورینێ

1. لیستەکێ بکێشە و وان تشتان تێدا بنڤیسە یێن مرۆڤ دزانیت، پاشی لیستەکا دی بکێشە و وان تشتێن مرۆڤی باوەری پێ هەی بکە تێدا.
2. هندەك فاکتەران بهەژمێرە یێن فەلسەفەیا مرۆڤی بۆ ژیانێ دەستنیشان دکەن.
3. مەرەم ژ "وژدان"ێ چیە؟ ئەرێ ب بۆچوونا تە هەموو مرۆڤان وژدان هەیە؟
4. مەرەم ژ زاراڤێ "پێشەنگیا بەهاییێن هەلسەنگاندنێ" چیە؟

سۆفیایێ گەلەك هزرێن خوە کرن بەری دەست ب نڤیسینێ بکەت. ئەرێ ئەو دشێت مفای ژ وان پێزانینان وەربگریت یێن وێ ژ ئەلبێرتۆ کنوکسی وەرگرتین؟ د ڕاستی دا ئەو یا نەچار بوو ڤێ چەندێ بکەت. هێدی هێدی هزرێن نوو خوە ل سەرێ وێ دان و ژ پێنوسێ وێ دەردکەفتن.

سۆفیایێ ب ڤی شێوەی دەست ب نڤیسینێ کر:

"ئەم دزانین هەیڤ نە تەپەکا مەزن یا پەنیری یە و گەلەك تشتێن نەدیار ل سەر لایێ وێ یێ ڤەشارتی هەنە. حوکمێ کوشتنێ ب سەر هەر یەك ژ سۆکرات و حەزرەتێ مەسیحی هاتە سەپاندن، هەموو بونەوەرێن زیندی یێن ل سەر ڕوویێ ئەردی ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دێ مرن. پەرستگەهێن مەزن ل ئەکرۆپۆل ژ لایێ هێزێن فارسی ڤە ل دەوروبەری سالا 400 بەری زایینی هاتبوونە خرابکرن. فالڤەکەرا سەرەکی ل دەڤ گریکی یێن کەڤن، فالڤەکەرا دێلفی بوو.

هندەك ژ وان نموونەیێن ب تنێ مە باوەری ب هەبوونا وان هەی، بابەتێ هەبوونا ژیانێ ل سەر ئەختەرێن دی، بابەتێ هەبوونا خودای، هەبوونا ژیانا پشتی مرنێ، بابەتێ پەیوەندی ب مەسیحی ڤە هەی کا کورێ خودای بوو یان مرۆڤەکێ بلیمەت بوو.

هەرچەوا بیت، ئەم نەشێن بزانین کا بنیاتێ جیهانێ ژ کیڤە هاتیە. ئەم دشێین جیهانێ ب کێڤریشکەکا مەزن هەڤبەر بکەین دەمێ ژ کولاڤێ سێرەبەندەکی دا دەردکەڤیت. مرۆڤێن فەیلەسۆف سوواری داڤێن پیرتێ وێ کێڤریشکێ دبوون و بەرەڤ سەری دچن داکو ژ نێزیك وی سێرەبەندی ببینن. ئەرێ جارەکێ دێ گەهنە ڤێ چەندێ؟ ئەڤە ئەو پرسیارە، لێ هەکە هەر یەك ژ وان چوو سەر پشتا یێ دی، هێدی هێدی ئەو دێ ژ پیرتێ وێ دوورکەڤن. ب بۆچوونا من ڕۆژەکێ دێ ب سەرکەڤن و ژ نێزیك سێرەبەندی بینن.

تیبینی: د پەرتووکا پیروز دا بەحسێ تشتەکی دکەت کو ڕەنگە یەك ژ داڤێن نەرم یێن پیرتێ کێڤریشکێ بیت، دبێژنە وێ داڤا مووی "بورجێ بابل". پاشی ئەڤ بورجە هاتە ڕاستکرن، چونکی وی سێرەبەندی نەدڤیا مرۆڤێن بچووك زێدەتر خوە ژ پیرتێ کێڤریشکێ دوور بکەن، ئەو کێڤریشکا بەری هینگێ وی ئافراندی."

سۆفیا بەرەڤ پرسیارا دووێ چوو. هندەك ژ وان فاكتەران بژمێرە یێن فەلسەفەیا مرۆڤی بۆ ژیانێ دەستنیشان دكەن.

وێ ب ڤی ڕەنگی بەرسڤ دا:

"یا زانایە كو ژینگەها دەوروبەر و پەروەردێ ڕۆلەكێ گرنگ د ئاڤاكرنا كەسایەتیا مرۆڤی دا هەیە. ئەو كەسێن ل سەر فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی دژیان، دیتن و تێگەهەكێ جودا بۆ ژیانێ هەبوو، ئەڤ چەندە ژی ژبەر هندێ بوو كو ئەو ل سەردەم و ژینگەهەكا جودا دا ژیاینە. هەردیسان سەربۆرێن مرۆڤی ژی ڕۆلەكێ گرنگ هەیە. لێ ئەقلی چ پەیوەندی ب ڤێ چەندێ ڤە نینە، چونكی ل هەموو سەردەم و ژینگەهێن جودا جودا، ئەڤ ئەقلە ل دەڤ هەموو مرۆڤان هەیە.

ئەم دشێین ژینگەهـ و كاودانێن جڤاكی ب وێ ڕەوشێ هەڤبەر بكەین یا ئەفلاتۆنی ل دور ئاكنجیێن شكەفتێ دیاركری. ب ڕەنگەكی كو ئەقل دەلیڤێ ددەتە كەسەكی خوە دناڤ تارِیاتیا شكەفتێ دا بخشینیت هەتا دگەهیتە ژ دەرڤە. لێ ئەڤ خوە خشاندنە پێدڤی ب برِەكا مەزن یا وێرەكیا خویی هەیە. هەردیسان هەروەكو سۆكراتی ئەوێ ب ڕێكا ئەقلێ خوە، دژی بۆچوونێن زالێ یێن سەردەمێ خوە ڕاوەستیای.

ڤان نموونەیان هەموویان سۆفیا گەهاندە هندەك دەرئەنجامان: ل سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆكە، خەلك كو دناڤ وەلات و كەلتورێن جودا جودا دا دژین و پتر تێكەلی هەڤ دبن، ب ڕەنگەكی ئەم دشێین دناڤ ئاڤاهیەكێ ب تنێ دا كەسێن مەسیحی و موسلمان و بودی ببینین. ژبەر هندێ گەلەك یا فەرە هەر یەك ژ ڤان كەسان ڕێزێ ل بیروباوەرێن یێن دی بگریت و خوە ژ هندێ بدەتە پاش كو پرسیارێ ژێ بكەت بۆچی ئەو ل سەر بیروباوەرێن وی نینن؟"

سۆفیایێ هزركر هەتا ڤێرێ بەسە ئەو پشت بەستنێ بكەتە سەر وان تشتێن ژ مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفی وەرگرتین، بەلكو پێدڤیە هندەك تیبینی یێن دی ژ ڤێرێ و وێراهە بكەتە دگەل دا و هندەك وان ڕستەیێن وێ ژ بابەتی خواندین یان ب شێوەیەكێ دی گوهلێبووین ل سەر زێدە بكەت.

پشتی هینگێ سۆفیا بەرەڤ پرسیارا سیێ ڤە چوو یا دگوتی: مەرەم ژ "وژدان"ێ چیە؟ ئەرێ ب بۆچوونا تە هەموو مرۆڤان وژدان هەیە؟"

ئەڤە ئەو بابەت بوو یێ بەری نوکە مامۆستاییێ وان د پولێ ڤە ب درێژاهی دانوستاندن دگەل قوتابیان کری. لێ سۆفیایێ ب ڤی ڕەنگی بۆچوونا خوە دەربری:

"ب شێوەیەکێ گشتی، مەرەم ژ تێگەهێ وژدان، شیانێن ڕەفتارکرنا مرۆڤی نە ل هەمبەر باشی و خراپیان. ب دیتنا من، هەموو مرۆڤان ئەڤ شیانە هەنە، یان ژی پتر ڕۆهن بکەین، وژدان تشتەکێ زکماکی یە ل دەڤ هەموو مرۆڤان، ئەڤە هەر ئەو ئاخفتن بوو یا سۆکراتی ژی دووپاتی ل سەر دکری. لێ ل ڤێرێ وژدانا کەسەکی ژ یا کەسەکێ دی جودایە. ل ڤێرێ بۆچوونا سۆفیستیان ل دور ڤێ چەندێ یا ڕاست بوو کو وژدان و ژێکجوداکرنا باشی و خراپیێ ل دەڤ هەر کەسەکی، بەری هەموو تشتان پەیوەندی ب وێ ژینگەهێ ڤە هەیە یا تاکەکەسەك تێدا دژیت، لێ سۆکرات د وێ باوەرێ دا بوو کو وژدان تشتەکێ زکماکی یە و ل دەڤ هەموو کەسان هەیە.

ب ڕاستی یا ب زەحمەتە ئەم بزانین کا کیژ ژ وان یێ دروست بوو. بۆ نموونە دبیت وژدانا هندەکان یا ئارام بیت هەکە بچنە بازاڕی و خوە ل پێشچاڤێن خەلکی ڕیس بکەن، لێ پتریا مرۆڤان د هۆسانە ئەگەر خراپیێ دگەل کەسێن دی بکەن، دێ ژودانا وان، وان ئێشینیت. ل ڤێرێ یا پێدڤیە ئەم بزانین جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا هەبوونا وژدانێ و بکارئینانا وێ دا هەیە.

دبیت د کاودانەکێ دیارکری دا، ڕەنگە هندەك مرۆڤ ب شێوەیەکێ بێ وژدان سەرەدەریێ بکەن. لێ ب بۆچوونا من یا تایبەت، وان جۆرە مرۆڤان ژی هەر چ نەبیت تا ڕادەیەکی وژدانەکا زیندی هەیە خوە هەکە دناڤ ناخێ وان دا یا ڤەشارتی ژی بیت. هەروەکو کا چەوا هندەك مرۆڤان ئەقل نەبیت، لێ د ڕاستی هۆسا نینە کو ئەوان ئەقل نینە بەلکو ئەو ئەقلێ خوە بکارنائینن.

تیبینی: ئەقل ژی وەکو وژدانێ یە، ئەو هەردوو ژی وەکو دوو زەڤلەکانە، ئەگەر ئەم بکارنەئینین، هێدی هێدی دێ لاواز بن."

ب تنێ پرسیارا دوماهیێ مابوو: مەرەم ژ زاراڤێ "پێشەنگیا بەهایێن هەلسەنگاندنێ" چیە؟.

بەری نوکە مامۆستای دانوستاندن ل دور ڤی بابەتی ژی دگەل وان کربوو. بۆ نموونە، زانینا هاژووتنا ترۆمبێلێ کارەکێ هەرە باشە، ژبەرکو د ماوەیەکێ کێم دا مرۆڤی ژ جهەکی ڤەدگوهێزیتە جهەکێ دی، لێ ترۆمبێل دبنە ئەگەرێ ژناڤچوونا دارستانان و پیسبوونا ژینگەهێ. ب ڤی رەنگی ئەم دکەڤینە هەمبەر مژارەکا رەوشتی.

سۆفیایێ د بەرسڤا خوە دا گوت: "دارستانێن جوان و سروشتی و پاقژ گەلەك ژ هندێ گرنگترن مرۆڤ بلەز بگەهیتە وی جهێ دڤێت".

پاشی سۆفیایێ چەندین نموونەیێن دی یێن هەڤشێوە بۆ ئینابوون و ل دوماهیێ گوتبوو: "ب بۆچوونا من یا کەسایەتی، هەبوونا وانەیەکا فەلسەفی گەلەك ژ وانەیا رێزمانا زمانێ ئینگلیزیێ گرنگترە. ژبەر هندێ دێ گەلەك باشتر بیت ئەگەر هندەك دەمژمێرێن بۆ وانەیا ئینگلیزیێ هاتینە تەرخانکرن، ل شوونا وان وانەیەکا فەلسەفی وەربگرین."

د ماوەیێ بێهنڤەدانێ دا، مامۆستایی کاغەزێن قوتابیان خواندبوون و کاغەزا سۆفیایێ دانابوو رەخەکی.

- "من بەرسڤێن تە خواندن. سۆفیا، بەرسڤێن تە ل ئاستەکێ هەرە باش بوون."
- "هیڤیا من ئەوە ب دلێ تە بن."
- "ئاها من دڤیا بەحسێ ڤێ چەندێ دگەل تە بکەم. ژلایەکی ڤە بەرسڤێن تە گەلەك د جوان و د جهێن خوە دابوون، بەلێ د جهێ خوە دا بوون و دەربرینەکا کەسایەتی بوو... بەلێ هۆسا دیارە تە وانەیێن خوە نەخواند بوون، مانە هۆسایە؟"

سۆفیایێ بەرەڤانی ژ خوە کر و گوت: "بەلێ، لێ تە گوتبوو مە ئەز پتر گرنگیێ ددەمە بۆچوونێن کەسایەتی."

- "راستە، بەلێ پا ڤێ چەندێ ژی سنوورێن خوە هەنە."

سوفیاییێ تەماشەی چاڤێن مامۆستاییێ خوە کر، ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو مافێ وێ یە وەکو خوە بژیت، نەخاسم پشتی ڤان ڕوودانێن دوماهییێ ب سەرێ وێ هاتین و دەست ب خواندنا کورسەکێ فەلسەفی کر.

- "ئەز وانەیێن فەلسەفی دخوینم و ئەڤ چەندە هاریکاریا من دکەت بنیاتەکێ باش بۆ خوە ئاڤا بکەم و ببمە خوەدانا بۆچوونێن خوە یێن کەسایەتی."

- "لێ پا ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەر، هەلسەنگاندنا کاغەزا تە یا تاقیکرنێ ژی بۆ من یا ب زەحمەت بیت، یان دڤێت نمرەیا تەمام بدەمە تە یان ژی سفرێ."

- "بەلێ ڕاستە، لێ ما ئەو تشتێ من نڤیسای، یان هەموو یێ ڕاستە یان ب یەکجاری نەییێ دروستە؟"

- "پشتڕاست بە، ئەز دێ نمرەیا تەمام دەمە تە، لێ ب وی مەرجی ئەڤ چەندە نەبیتە ئەگەر جارێن بهێت تو وانەیێن خوە پشتگوهـ بهاڤێژی، باشە؟"

دەمێ سۆفیا ژ قوتابخانێ زڤڕی، چانتێ خوە هاڤێتە سەر دەرەجکێن مال و بەرەڤ کۆلکێ خوە ڤە چوو. وێ زەرفەکێ مەزن و قەهوائی ل سەر قورمێ دارەکا مەزن دیت. ئەڤ جارە ڕەخێن وی زەرفی د هشك بوون، ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە ئەڤە ماوەیەکێ درێژە هێرمسی ئەو زەرڤ دانایە وێرێ.

سۆفیاییێ زەرڤ دگەل خوە هەلگرت و چوو مال. پشتی خوارن دایە گیانەوەرانێن خوە، چوو د ژوورا خوە ڤە و ل سەر تەختی خوە درێژ کر و دەست ب خواندنێ کر.

## هیلینیزم

ئەڤە جارەکا دی ئەم گەهشتینە هەڤدوو.

بەری نوکە من بەحسێ فەیلەسۆفێن سروشتی بۆ تە کربوو، زێدەباری سۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆی. ب ڤی ڕەنگی تە بنەمایێن فەلسەفەیا ڕۆژئاڤای زانین. ژبەر هندێ، ژ نوکە وێڤە ئەم دێ وان پرسیارێن پێشەکییێ دەینە لایەکی یێن دناڤبەرا هەر وانەیەکێ وەك ئەرك من بۆ تە دهنارتن داکو هزرا خوە تێدا بکەی بەری ئەز وانەیەکێ ل دور وان

پرسیاران بۆ تە فرێکەم. هەلبەت تە ب خوە ژی گەلەك ئەرکێن قوتابخانێ هەنە و داکو بشێی وەختێ خوە بۆ وان تەرخان بکەی.

ئەڤرۆکە دێ بەحسێ ماوەیەکێ گەلەك درێژ کەم کو هەر ژ سەردەمێ ئەرستۆی ل دوماهیا چەرخێ چوارێ *بەری زایینی*، هەتا دەستپێکا چەرخێن ناڤەراست، ئانکو نێزیکی دەوروبەرێن سالا 400ێ *پشتی زایینی* ڤەکێشابوو. تە تیبینیا هندێ کر مە گوت "بەری زایینی" و "پشتی زایینی". ل ڤێرێ سەردەمەکێ ناڤبڕ هەبوو کو تێدا تشتەکێ سەرەکی و سەیر ڕوودا: ئەو ژی پەیدابوونا ئاینێ مەسیحیەتێ بوو.

ئەرستۆ ل سالا 322ێ بەری زاینی مر. ل وی سەردەمی باژێری ئەسینایێ هەیبەتا خوە ژ دەست دابوو. هەلبەت ئەو ژی ژ ئەنجامێ وان گوهۆڕینێن سیاسی و داگیرکرنا وەلاتان ژ لایێ ئەسکەندەرێ مەکدونی (365-323 بەری زاینی) ڤە.

ئەسکەندەرێ مەزن خەلکێ مەکدونیا بوو، ئەرستۆ ب خوە ژی خەلکێ مەکدونیا بوو و مامۆستایێ تایبەت یێ ئەسکەندەرێ گەنج بوو. ئەڤە ئەو ئەسکەندەر بوو یێ سەرکەفتنەکا مەزن ل سەر لەشکەرێ فارسان تومارکری. هەردیسان وی کارەکێ دی یێ گەلەك گرنگ ژی ئەنجامدابوو: وی ب هاریکاریا لەشکەرێ خوە یێ مەزن، وەلاتێ مسرێ و وەلاتێن ڕۆژهەلاتی هەتا هندێ ب شارستانیا گریکیان ئاشناکرن.

ئەڤ گوهۆڕینە، دەستپێکا چەرخەکێ نوو بوو د دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دا. جڤاکەکێ نێڤدەولەتی پەیدابوو کو تێدا زمان و کەلتورێ گریکی یێ ل سەر زالێ بوو و ڕۆلەکێ گرنگ تێدا هەبوو. دبێژنە ڤێ قۆناغێ کو نێزیکی 300 سالان ڤەکێشابوو، هیلینیزم. زاراڤێ هیلینیزم بۆ ڤێ قۆناغا ناڤبڕی دهێتە گوتن و کەلتورەکێ هۆسا بەربەلاڤ بوو کو مورکێ کەلتورێ گریکی یێ ل سەر زالێ بوو. ئەڤ کەلتورە ل سێ وەلاتێن هەرە مەزن بەربەلاڤبوو کو ئەو ژی مەکدونیا و مسر و سوریا بوون.

ژ سالا 50ێ بەری زاینی و وێڤە، هێزا لەشکەری و سیاسی کەفتە دەستێ "ڕۆما"، ب ڕەنگەکی ئەڤ هێزا نوو شیا شاهنشینێن هیلینی یەك ل دووڤ یەك داگیربکەت و بکەتە ژێر فەرمانڕەوایا خوە ڤە. ب ڤی ڕەنگێ گەڕا کەلتورێ لاتینی هات کو هەر ژ ئاسیا بچووك هەتا ڕۆژئاڤایێ ئیسپانیا ب خوە ڤە دگرت.

ئەڤ سەردەمە دەستپێکا چەرخێ ڕۆمانی بوو کو دبێژنێ چەرخێن کەڤن یێن گێرو Late Antiquity. لێ پێدڤیە ئەم تشتەکێ گرنگ ژبیر نەکەین: دەمێ ڕۆمانی شیاین جیهانا هیلینی داگیر بکەن، ڕۆما ژی بۆ یەك ژ وان وەلاتێن کەلتورێ گریکی دناڤ دا بەربەلاڤبووی. ئەڤ چەندە ژی هندێ دگەهینیت کو کەلتورێ گریکی بەردەوامی پێ هاتەدان. فەلسەفەیا گریکی ژی ڕۆلەکێ گرنگ د ڤی کەلتوری دا هەبوو، سەرەڕای هندێ کو گریکی نەمابوونە د گۆڕەپانا سیاسی دا بەلکو ب تنێ وەك ئەکتەرێن داستانان لێ هاتبوون.

## ئاین و فەلسەفە و زانست

قۆناغا هیلینیزمێ ب هندێ د هێتە نیاسین کو مورکێ کەلتورێ گریکی یێ تێدا زالبوو و سنوورێن دناڤبەرا مللەت و کەلتورێن وان دا هاتبوونە پشتگوهـ هاڤێتن. بەری هینگێ، ڕۆمانی و مسری و بابلی و سوری و فارسان جودا خوداوەندێن خوە د پەرێسین کو ئەم دشێین بێژینێ "ئاینێن نەتەوەی.". لێ دگەل هاتنا سەردەمێ هیلینی، ئەڤ کەلتورێن جودا هەموو ب شێوەیەکێ هەڕەمەکی دناڤ تێکەهێن ئاینی و فەلسەفی و زانستی یێن هیلینیزمێ دا حەلیان.

ئێدی مەیدانەکا جیهانی ل شوونا گۆڕەپانا بازێری پەیدابوو. لێ ل ڤێ گۆڕەپانا کەڤن ژی هێشتا چەندین بیرۆکە و بۆچوونێن هەمەڕەنگ دهاتنە داڕێژتن. تشتێ نوو ژی ئەو بوو کو ئەڤ بازاڕە د پڕبوون ژ وان بەرهەم و بیرۆکەیێن ژ دەڤەرێن دی یێن جیهانێ و ب زمانێن جودا جودا و بیانی دهاتن.

دناڤ ڤان بازاڕان دا، بیرۆکەیا گریکی جهێ خوە باش گرتبوو و بەربەلاڤببوو، هەتا گەهشتبوو وان وەلاتێن ژ دەرڤەی کونترۆلا هیلینیزمێ هەروەکو کا چەوا بەری نوکە مە ئاماژە پێ کری. ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئێدی هەموو خوداوەندێن ڕۆژهەلاتی ل سەر دەریایا ناڤەڕاست دهاتنە پەرستن و د هەمان دەم دا کومەکا ئاینێن نوو پەیدابوون کو هندەك ژ وان ڕەنگڤەدانا ئاینێن کەڤن بوو. دگوتنە ڤێ چەندێ "ساینکریتیزم-Syncretism" یان ژی تێکەلبوونا ئاینان.

بەری هینگێ، خەلك گەلەك ب نەتەوە و باژێرێن خوە ڤە دگرێدای بوون، لێ دگەل نەمانا سنوورێن دناڤبەرا وەلاتان دا، ئێدی خەلکی ب چاڤێ گومان تەماشەی دیتنا خوە ژ بۆ ژیانێ دکر. ژبەر هندێ سەقایەکێ گوماناوی و ژناڤچوونا بەهایێن کەلتوری و ڕەشبینیێ پەڕێن خوە ب سەر چەرخێن کەڤن یێن گیرو دادا، هینگێ گوتنەك پەیدابوو کو دگوت: "ئێدی جیهان یا پیربووی."

هەموو ئەو ئاینێن ل سەردەمێ هیلینیزمێ ڕۆناهی دیتی، د خالەکێ دا د هەڤپشك بوون: زانین و فێربوون مرۆڤان ژ مرنێ فورتال دکەت. پتریا جاران ئەڤ فێربوونە ب شێوەیەکێ نهێنی دهاتە ئەنجامدان.

ب ڕێکا فێربوونا زانستەکێ نهێنی و بجهئینانا ڕێوڕەسمێن ئاینی یێن تایبەت، خەلك ل هیڤیا ب دەستڤەئینانا ڕۆحەکا نەمر و ژیانەکا هەتا هەتایێ بوون. لێ هەبوونا زانینەکا ژیرانە ژ بۆ سروشتێ ڕاستەقینە یێ گەردوونی، نەبوو ئەگەرێ کێمبوونا ڕێزگرتنێ ل بیروباوەر و ڕێوڕەسمێن ئاینی.

ئەڤ چەندە دەربارەی ئاینێن نوو بوو، سوفیا. لێ ژلایەکێ دی ڤە فەلسەفە ژی هێدی هێدی پتر بەرەڤ ئاشتی و ئارامکرنا ژیانێ ڤە دچوو. ئێدی بەهایێ نەك تنێ بیرۆکەیێن فەلسەفێ کاریگەریا خوە هەبوو، بەلکو شیانێن وێ ژی هاریکاریا مرۆڤان کر خوە ژ ترسا مرنێ و ڕەشبینیێ دوور بێخن. ب ڤی ڕەنگی سنوورێ دناڤبەرا فەلسەفێ و ئاینی دا گەلەك لاواز بوو.

دبیت ئەم دشاش نەبین ئەگەر بێژین فەلسەفەیا هیلینیزمێ چ ڕەسەنایەتی پێڤە دیارنەبوو. ڕاستە چ سۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ دناڤ دا نەبوون. لێ دگەل هندێ ڤان هەرسێ فەیلەسۆفێن ئەسینایێ یێن مەزن ڕولەکێ مەزن هەبوو د دەرکەفتن و پێشکەفتنا هژمارەکا ڕێبازێن فەلسەفی دا. پاشی دێ بۆ تە ب درێژاهی ل سەر ئاخڤم.

زانستێ هیلینی ب هندێ دهاتە نیاسین کو ژ تێکەلەکێ پێکهاتی ژ سەربۆرێن کەلتورێن جودا جودا پێکدهات و باژێرێ ئەسکەندەریێ ژی ڕۆلەکێ گرنگ د بەربەلاڤبوونا وێ دا هەبوو، چونکی خالا پێکڤەگرێدانا ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤای بوو.

بازێرێ ئەسینا هەر وەك پایتەختێ فەلسەفێ ما، هەلبەت ژبەر قوتابخانەیێن وێ یێن فەلسەفی ئەوێن ژبەر ئەرستۆ و ئەفلاتۆنی ڤە ماین. لێ بازێرێ ئەسکەندەریە بۆ پایتەختێ زانستی. ژبەر پەرتووکخانەیێن وێ یێن بێ وێنە، ئەڤ بازێرە بۆ بنگەهێ زانستێ بیرکاری و فەلەك و زیندەوەرزانی و نوشدارییێ.

ئەم دشێین کەلتورێ هیلینی دگەل جیهانا خوە یا ئەڤرۆکە هەڤبەر بکەین، ب ڕەنگەکی چەرخێ بیستێ ژی ب هندێ دهێتە نیاسین کو وەك جڤاکەکێ ڤەکری ل هەمبەر کارتێکرنێن دەرەکی ڕاوەستیا. ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا هژمارەکا مەزن یا کودەتایان د بوارێ ئاینی و دیتنا ژیانێ دا. هەروەکو کا چەوا ل ڕۆمایا کەڤن، پەرستگەهێن خوداوەندێن یونان و مسر و وەلاتێن ڕۆژهەلاتی دهاتنە دیتن، ل سەر دەمێ ئەڤرۆکە ژی، ل هەموو پایتەختێن ئەورۆپی دووڤەلانك و پەرستگەهێن هەموو ئاینێن بەرنیاس ل جیهانێ هەنە.

هەردیسان ئەم دشێین تیبینیا تێکەلەکێ پێکهاتی ژ ئاینێن کەڤن و نوو و فەلسەفە و زانستی دا بکەین کو ئەڤرۆکە جارەکا دی ل ژێر ناڤ و شێوەیێن جودا جودا دیاربووینە و بانگەوازا نووخازیێ دکەن. لێ دڤێت مە ئاگەهـ ژ ڤێ چەندێ نەبیت، چونکی ئەڤ زانینا ئەو بانگەشێ بۆ دکەن ب تنێ میراتەکێ زانستێن کەڤنە و بۆ چەندین سەردەمێن کەڤن دزڤڕیت کو یەك ژ وان سەردەمان ژی، سەردەمێ هیلینیزمێ یە.

هەروەکو بەری نوکە مە گوتی، فەیلەسۆفێن هیلینی ب کووراتی کار ل سەر وان پرسیاران دکر یێن سۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆی ئازراندین. مژارا هەرە سەرەکی ل دەڤ وان، دیارکرنا ڕێکەکا نموونەی بوو یا مرۆڤ پێ ژ دایك دبن و دمرن. ب ڤی ڕەنگی، زانستێ ڕەوشتی بۆ گرنگترین پرۆژەیێ فەلسەفی د ڤی جڤاکێ سەردەم دا؛ هەموو مژاران سەرەدەری دگەل هندێ دکر کا بەختەوەریا ڕاستەقینە ل کیڤە هەیە و چەوا مرۆڤ دشێت بگەهیتێ؟

نوکە ئەم دێ ڤەکۆلینێ ل سەر چوار ڕێبازێن فەلسەفی کەین.

# سینیکی

دبێژن جارەکێ سۆکرات ل بەر دەرگەهێ دکانەکێ یێ ڕاوەستیای بوو کو چەندین کەلوپەلێن جودا جودا نمایش کربوون. سۆکراتی ب دەنگەکێ بلند گوت: "گەلەگ تشتێن ل ڤێرێ هەین من پێدڤی پێ نینە."

ئەم دشێین ڤێ داخویانیا سۆکراتی وەك ناڤونیشان و پەیڤا نهێنی یا فەلسەفەیا سینیکیان Cynics بدانینن. ئەڤ ڕێبازا فەلسەفی ل سالا 400ێ بەری زاینی ژ لایێ "ئەنتیستانس"ی ڤە هاتبوو دامەزراند کو ئەو ب خوە یەك ژ قوتابیێن سۆکراتی بوو و هەموو وانەیێن وی ژبەر کربوون.

سینیکیان داکوکی ل سەر بەختەوەریێ دکر کو ب دیتنا وان بەختەوەری ژ تشتێن دەرەکی ناهێت وەکو خوشگوزەرانیا ماددی و دەستهەلاتا سیاسی و ساخلەمیەکا باش، بەلکو بەختەوەریا ڕاستەقینە ئەوە مرۆڤ خوە ژ ڤان کاودانێن دەرەکی یێن ڕێڤینگ و نەجهێ باوەریێ قورتال بکەت، ژبەرکو بەختەوەری ل سەر ڤان توخمان ناڕاوەستیت بەلکو یا ل بەر دەستێ هەموو کەسان و ئەگەر ئەم گەهشتینێ، ئێدی ژ دەڤ مە ناچیت.

ناڤدارترین فەیلەسۆفێ سینیکی، "دیۆجین" بوو کو ئەو ب خوە ژی قوتابیێ ئەنتیستانسی بوو. دبێژن ئەو دناڤ بەڕمیلەکێ دا دژیا و ژ بلی چاکیتەك و گوپالەکی و کیسکەکێ نانی، چ تشتێن دی نەبوون "گەلەك یا ب زەحمەت بوو د ڤان کاودانان دا، ڕێگری ل وی هاتبا کرن کو یێ بەختەوەر بیت".

هەردیسان ڤەدگێڕن دەمێ جارەکێ ئەو ل دەڤ بەڕمیلا خوە ل بەر هەتاڤێ یێ درێژ کری، ئەسکەندەرێ مەزن هاتە دەڤ وی و پرسیار ژێ کر کا پێدڤی ب چ تشتان نینە؟ وی بەرسڤ دا و گوت: "بەلێ، ئەز پێدڤی ب هندێ مە کو پیچەکێ خوە بدەیە ڕەخەکی و ژبەر هەتاڤا من ڕابی". ب ڤی ڕەنگی وی دووپاتکر کو ئەو گەلەك زەنگینتر و بەختەوەرترە ژ ئەسکەندەرێ مەزن، چونکی ئەو تشتێ وی دڤێت یێ هەی.

سینیکی د وێ باوەرێ دا بوون نابیت مرۆڤ ب تنێ خوە ب ساخلەمیا خوە ڤە مژوول بکەت، نابیت ژ نەساخی و مرنێ ژی بترسیت. هەردیسان نابیت بۆ نەخوشیێن

کەسێن دی نیگەران ببیت. ل سەر دەمێ ئەڤرۆ، زاراڤێ "سینیکی" یان "سینیسیزم" بۆ وان کەسان دهێتە گوتن یێن هەست ب نەخوشیێن کەسێن دی نەکەن.

## ستۆیکی

سینیکیان کاریگەریا باش ل سەر دەرکەفتنا ستۆیکیان هەبوو ئەڤێن کو فەلسەفەیا وان ل دەردورێن سالا 300ی بەری زاینی ل باژێرێ ئەسینایێ ل سەر دەستێ کەسەکی ب ناڤێ "زینون" ژ دایکبووی کو ئەو ب خوە د بنەڕەت دا خەلکێ قوبرس بوو. پشتی پاپورا وی شکەستی و خوە گەهاندیە کنارێن دەریایا نێزیکی باژێرێ ئەسینایێ، پەیوەندی ب سینیکیان کر.

زینونی قوتابیێن خوە ل بن ستوونەکێ کومدکرن. ناڤێ ستۆیکی ژ پەیڤا گریکی "پۆرتیکو-Portco" هاتیە وەرگرتن. پشتی هینگێ فەلسەفەیا ستۆیکیان کارتێکرنەکا مەزن ل سەر کەلتورێ ڕومانی بجهـ هێلا.

ستۆیکیان ژی وەکو هیراکلیتسی باوەری ب هندێ هەبوو کو هەر مرۆڤەك بەشەکێ ئەقلێ گەردوونی "لوگوس" پێکدئینن و هەر مرۆڤەك ژی جیهانەکا بچووکە کو ڕەنگڤەدانێ ژ جیهانا مەزن یا گەردوونی دکەت.

ئەڤ جۆرە هزرکرنە بۆ ئەگەرێ سەرهلدانا یاسایەکا گشتی، دبێژنێ "یاسایا سروشتی". دەمێ یاسایا سروشتی ل سەر بنەمایێ ئەقلێ نەمر یێ مرۆڤی و گەردوونی پێکهاتبیت، وەخت و جهـ ناهێنە گوهۆڕین. ب ڤی ڕەنگی وان پشتا سۆکراتی ل دژی سۆفیستیان دگرت.

یاسایا سروشتی، یاسایا یەکانە بوو ژ بۆ هەموو مرۆڤان، هەتا بۆ بەندەیان ژی. ستۆیکیان یاسایێن هەمەجۆر یێن دناڤ پەڕتووکان دا ب زارڤەکرنا نەتەمام یا یاسایا سروشتی ل قەلەم ددا.

هەروەکو کا چەوا ستۆیکیان هەموو جوداهییێن دناڤبەرا مرۆڤ و گەردوونی دا لاددان، ئاها هۆسا هەڤدژییێن دناڤبەرا "ڕۆحێ" و "ماددە"ی ژی لاددان. ب دیتنا وان، ب

تنێ سروشتەکێ یەکانە هەیە نەك زێدەتر. دبێژنە ڤی تێگەهی "تاکپەرستی*" ئانکو بەروڤاژی دووپەرستی یا ئەفلاتۆنی، ئەوا هەموو تشت ل سەر دوو تشتان دابەش دکرین".

ستۆیکی ژی وەکو زارۆییێن ڕاستەقینە یێن سەردەمێ خوە بوون، پتر د جیهانگیری بوون، ئانکو پتر ژ فەیلەسۆفێن سینیکیان ل هەمبەر کەلتورێن چەرخێ خوە د ڤەکری بوون. وان گرنگی ددا سیمیایێ جڤاکی یێ مرۆڤایەتییێ، زێدەباری سیاسەتێ کو گەلەك ژ وان ڕۆلەکێ مەزن تێدا هەبوو وەك مارکوس ئوریلیوس (180-121 ب.ز).

هەردیسان وان ڕۆلەکێ گرنگ هەبوو د بەلاڤکرنا کەلتور و فەلسەفەیا گریکیان دا ل باژێرێ ڕۆما. بۆ نموونە فەیلەسۆف و گوتاربێژ شیشرونی (106-43 ب.ز) ئەوێ تێگەهێ "مرۆڤایەتی" د فەلسەفێ دا وەك "مرۆڤدوستی-Humanism" داهێنای. پشتی هینگێ ستۆیکیەکێ دی ب ناڤێ "سینی" دیارکر: "مرۆڤ تشتەکێ پیروزە بۆ مرۆڤایەتییێ." ئەڤ گوتنا وی دگەل بورینا دەمی بۆ دروشمێ هەموو مرۆڤدوستان.

هەردیسان ستۆیکیان تیبینیا هندێ کر کو هەموو دیاردەیێن سروشتی وەك نەساخی و مرن، ل دووڤ هندەك یاسایێن بەردەوام یێن سروشتی دچن. ژبەر هندێ یا ل سەر مرۆڤان پێدڤیە ژ قەدەرا خوە ڕازیبن، چونکی چ تشت ژ نیشکەکێ ڤە ڕوونادەن بەلکو هەموو تشتێن دهێنە ڕوودان، بەرهەمێ پێدڤیاتییێ نە. چ مفا د هندێ دا نینە مرۆڤ بەردەوام گازندەیان بکەت دەمێ قەدەر دەرگەهێ مرۆڤی دقوتیت.

هەردیسان وان دگوت پێدڤیە مرۆڤ ڕوودانێن خوش یێن ژیانێ ب سینگەکێ بەفرەه و ئارام ڤە وەربگریت. ل ڤێرێ ئەو پیچەکێ نێزیکی بۆچوونا سینیکیان بوون دەمێ دگوتی هەموو ئەو تشتێن ژێدەرەکێ دەرەکی هەی، چ خوشی و بەختەوەریا ڕاستەقینە نینە. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە، زاراڤێ "بێدەنگیا ستۆیکی" بۆ وی کەسی دهێتە گوتن یێ نەهێلیت هەستێن وی ل سەر وی زالٚ بن.

---

* یەکایەتی Monism کو ب زمانێ عەرەبی ژی دبێژنێ "أحادیە". تیورەکا فەلسەفی یە دبێژیت هەموو تشتێن جۆراوجۆر د گەردوونی دا ب تنێ ژ یەك ماددە پێکدهێن. لێ دووانەیی Dualism کو ب زمانێ عەرەبی ژی دبێژنێ "ثنائیە". دبێژیت هەموو تشتێن جۆراوجۆر د گەردوونی دا ژ دوو تشتان پێکدهێن ئەوژی ماددە و ڕۆحێ.

# ئەپیکوری

هەروەکو بەری نوکە مە دیتی، سۆکراتی گرنگی ددا هندێ چەوا مرۆڤ دێ ب بەختەوەری ژیت؟ هەر یەك ژ سینیکی و ستۆیکیان بەرسڤان ڤێ پرسیارێ دابوو: "داکو مرۆڤ بەختەوەر بژیت، پێدڤیە خوە ژ خوشگوزەرانیا ماددی قورتال بکەت". لێ قوتابیەکێ دی یێ سۆکراتی ب ناڤێ "ئەریستیبوس" سەرپێچی ل سەر ڤێ هزرکرنێ کر و دیاردکر کو پێدڤیە ئارمانجا مرۆڤی د ژیانێ دا ئەو بیت پێکۆلێ بکەت پترین خوشگوزەرانییێ ژ ژیانێ وەربگریت.

"باشترین تشت د ژیانێ دا خوشی یە و نەباشترین تشت ژی ئازارە." ل دەمەکی ئارمانجا سینیکی و ستۆیکیان هەموو جۆرێن ئازار و نەخوشیان پەسەند دکرن، ئانکو بەروڤاژی وێ چەندێ کو مرۆڤ هەموو پێکۆلان بکەت و یێ ئامادەبیت هەموو تشتان ژ دەستبدەت پێخەمەت ساخلەمیا خوە."

ل دەردورێن سالا 300ێ بەری زاینی، فەیلەسۆفەکێ دی ب ناڤێ ئەپیکور (341-270 ب.ز) قوتابخانەیەکا فەلسەفی ل ئەسینایێ دامەزراند. ڤی فەیلەسۆفی تیورا خوشگوزەرانییێ یا ئەریستیبوسی دگەل تیورا گەردیلەیان یا دیمۆکریتسی تێکەلکر.

دبێژن ئەپیکوریان Epicureans ل ناڤ باخچەیان هەڤدوو ددیت، ژبەر هندێ ناڤێ وان کریە "فەیلەسۆفێن باخچەی". هەردیسان وان ئەڤ گوتنە ل سەر دەرگەهێ باخچەی نکراندبوو "ئەی کەسێن بیانی، ل ڤێرێ ب شێوەیەکێ جوان دێ سەرەدەری دگەل هەوە هێتە کرن، ل ڤێرە خوشگوزەرانی باشترین تشتە".

ئەپیکوری دووپاتی ل سەر هندێ دکر کو تێربوونا حەزێن مرۆڤی نەبیتە ئەگەر کارتێکرنێن خراب و لاوەکی یێن وێ تێربوونێ مە ژبیرڤە ببەن. سوفیا، ئەگەر ڕۆژەکێ تو تووشی ڕەوشەکا ساخلەمیێ ژبەر زێدە خوارنا شیرینیاهیان بووی، ل وی دەمی دێ د مەرەما من گەهی، ئەگەر تو تێنەگەهشتبی ژی، ڤێ تاقیکرنێ ئەنجام بدە.

"هەموو ئەو پارێن بەری نوکە تە بۆ خوە هەلگرتین، هەڕە بینە دەرێ و شیرینیان پێ بکرە و هەموو شیرینیاهان ژی بخۆ. پشتی نیف دەمژمێرێ دێ ئەو نیشان ل دەڤ تە

دیاربن یێن ئەپیکوری ناڤێ وان کریە "نیشانێن لاوەکی"، ئانکو دەمێ پارێن خوە هەموویان د مەزێخی، پشتی هینگێ دەمێ دمینیە بێ پارە ژ نوو دێ زانی تە چ شاشی کریە."

ژبەر هندێ، ب بۆچوونا ئەپیکوری، پێدڤیە مرۆڤ هەڤسەنگیەکێ بێخیتە دناڤبەرا ئاستێ حەزێن خوە و شیانێن بجهئینانا ڤان حەزان. یان ژی حەزێن خوە یێن بەروەخت پاش بێخیت. "هزر بکە تە بۆ ماوەیێ سالەکێ خوە ژ خوارنا شیریناهیان بێبەهر کر و پارێن وان بۆ خوە هەلگرتن ژ پێخەمەت هندێ ب ڤان پارەیان پایسکلەکێ بۆ خوە پێ بکری یان پێ بچیە گەشتەکێ."

مرۆڤ نە وەکو گیانەوەرانە، بەلکو وی شیانێن رێکخستن و پلاندانانێ هەنە و پلانەکێ بۆ خوشگوزەرانیا خوە بدانیت. ڕاستە شیریناهی تشتەکێ خوشە، لێ هەبوونا پایسکلەکێ یان ئەنجامدانا گەشتەکێ ژی ژ کارێن گرنگن.

ئەپیکوری جوداهی دناڤبەرا خوشی و ڕازیکرنا هەستان دا دکر. زێدەباری بەهایێ گەلەك تشتێن دی وەك هەڤالینی و تام وەرگرتن ژ هونەری. لێ ل سەر ڤان تشتان هەموویان ژی، هندەك تشتێن دی هەنە بۆ مرۆڤی د گرنگن داکو ب شێوەیەکێ تەمام خوشیێ ژ ژیانا خوە وەربگریت وەك فەلسەفەیا گریکی یا کەڤن ئەوا داکوکیێ ل ڕێکخستنا ناخێ خوە، هەڤسەنگی، ئارامیا ناڤخوی دکەت.

هەروەسا پێدڤیە مرۆڤ کونترۆلێ ل سەر حەزێن خوە بکەت چونکی ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەر پتر خوە ل بەر نەخوشیان بگریت و یێ بێهنفرەهـ بیت. ب ڤی ڕەنگی، ئەو کەسێن ژبەر دوودلی و ترسا خوداوەندان دنالێن، هەست ب بەختەوەری و ئێمناهیێ ل باخچەی ئەپیکوری دکر.

تیورا دیمۆکریتسی یا ل دور گەردیلەیان ژی، دەرمانەکێ چالاك بوو دژی ئاین و ئەفسانەیان. دڤێت مرۆڤ ل سەر ترسا ژ مرنێ زالێ ببیت داکو د ژیانەکا بەختەوەر دا بژیت. د ڤێ خالێ دا، ب تایبەتی، ئەرستۆی تیورا دیمۆکریتسی ل دور "گەردێن ڕۆحێ" بکاردئینا. بیرا تە دهێت کو دیمۆکریتسی باوەری ب ژیانا پشتی مرنێ نەبوو، چونکی وی دگوت پشتی مرۆڤ دمریت، گەردێن ڕۆحا وی ناڤ بای دا بەربەلاڤ دبن.

ئەپیکوری دووپات دکر مرنێ چ پەیوەندی ب مەڤە نینە، ئانکو هندی ئەم د زیندی بین مرنێ چ هەبوون نینە، لێ دەمێ دەمێ مرۆڤ دمریت، ئێدی مە چ هەبوون نابیت. "ڕاستە مە چ جاران گوهـ ل کەسەکێ مری نەبوویە کو گازندەیان ژ مرنێ بکەت!".

ئەپیکور ب خوە پوختەیەکێ ل دور تیورا خوە یا فەلسەفی یا ب ناڤێ "چوار گیایێن چارەسەریێ" بۆ مە پێشکێش دکەت.

*خوداوەند نە جهێ ترسێ نە*

*بەرناکەڤیت مرۆڤ ژبەر مرنێ دوودل بیت*

*یا ب ساناهیە مرۆڤ بگەهیتە باشیێ*

*یا ب سانەهیە مرۆڤ خوە ل بەر ترسێ بگریت*

ل دووڤ ڕێبازا گریکیان، هەڤبەرکرنا ئەرکێ فەیلەسۆفەکی دگەل هونەرێ نوشدارەکی نە تشتەکێ نوو بوو. مەرەما وان ژ ڤێ گوتارا فەلسەفی ئەو بوو کو مرۆڤ دشێت کلینیکەکا فەلسەفی یا گەرۆك دگەل خوە بهەلگریت و ڤان هەر چوار دەرمانێن ل سەری ئاماژە پێ هاتیەکرن بکەتە تێدا.

بەروڤاژی ستۆیکیان، ئەپیکوریان هند گرنگی ب ژیانا سیاسی و جڤاکی نەددا. ئەپیکوری شیرەتەك دکر و دگوت "دا ب دزیکی ڤە بژین". ب ڕێکا ڤێ شیرەتێ، ئەم دشێین هەڤبەرکرنا دناڤبەرا باخچەی وی و هندەك خرڤەبوونێن دی یێن گەنجان بهەلسەنگینین ئەوێن ل جهەکێ دی یان ل وارگەهەکێ ئارام دگەڕیێن و دوور ژ جڤاکی دژین.

پشتی مرنا ئەپیکوری، گەلەك کەسان فەلسەفەیا وی کورتکر داکو ب تنێ د بەرژوەندیا حەزێن خو دا بکاربینن و ل ژێر دروشمەکی دانا ب ناڤێ "ل دەمێ نوکە بژی". ل سەردەمێ ئەڤرۆکە، زاراڤێ ئەپیکوری بۆ وی مرۆڤی دهێتە بکارئینان یێ ب تنێ بۆ حەزێن خوە دژیت.

# ئەفلاتۆنیزما نوو

هەروەکو بەری نوکە من نیشا تە دای، فەلسەفەیا هەر یەك ژ سینیکی و ستۆیکی و ئەپیکوریان بۆ قۆناغا بەری سۆکراتییێ دزڤڕیت، هەروەکو هیڕاکلیتس و دیمۆکریتسی، هەتا بۆ سۆکراتی ب خوە ژی. لێ ئەو پێکۆلا هزری یا پتر بەربەلاڤ ل دوماهیا چەرخێ کەڤن یێ گیرو ب فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی د داخباربوون. ژبەر هندێ دبێژنە ڤێ ڕێبازا فەلسەفی، ئەفلاتۆنیزما نوو.

دیارترین فەیلەسۆفێ ڤێ قۆناغێ ئەفلۆتین (205-270 ب.ز) بوو، بەری بهێتە باژێرێ ڕۆما و لێ ئاکنجی ببیت، فەلسەفە ل باژێرێ ئەسکەندەرییێ خواندبوو. یا گرنگە ل ڤێرێ ئەم تیبینیا هندێ بکەین کو وی ل باژێرێ ئەسکەندەرییێ خواندیە، ئەو باژێرێ بوویە خالا پێکڤە گرێدانا فەلسەفەیا ڕۆژئاڤای و ڕۆحانیەتا ڕۆژهەلاتی. پاشی وی ژ ڤی باژێرێ تیورەك کرە د چانتکێ خوە دا و دگەل خوە برە ڕۆمایێ کو پشتی هینگێ ئەڤ تیورە بۆ بهێزترین هەڤڕك بۆ ئاینێ مەسیحیەتێ ل دەستپێکا پەیدابوونا وێ و ل دووڤ دا ژی کاریگەریەکا مەزن کرە سەر ڤی ئاینی.

سۆفیا، بیرا تە ل تیورا ئەفلاتۆنی دهێت. ئەو تیورا جیهانا بیرۆکەیان و جیهانا هەستان ژێکجودا دکری. هەردیسان جوداهی دناڤبەرا ڕۆحا مرۆڤی و لەشی دا دیار دکر. ئانکو ب ڤی ڕەنگی مرۆڤ وەکو بونەوەرەکێ دوولایەنی دهاتە ل قەلەمدان. لەشێ مە ژی وەکو هەموو تشتێن دی یێن جیهانا هەستان ژ ئاخ و گەردان پێکدهێت، ڕۆح ژی یا نەمرە. ئەڤ جۆرە هزرکرنە بەری سەردەمێ ئەفلاتۆنی ژی یا بەربەلاڤ بوو. ژ بلی ڤێ چەندێ، ئەفلۆتینی دزانی ئەڤ جۆرە هزرکرنە دناڤ وەلاتێن ئاسیایی ژی د بەربەلاڤبوون.

ل دووڤ بۆچوونا ئەفلۆتینی، جیهان یا کەفتیە دناڤبەرا دوو جەمسەران دا، ل دوماهیا جەمسەرەکی ڕۆناهیەکا خودای هەیە کو وی ناڤکربوو ب "یەك" یان ژی "خودا" و ل دوماهیا جەمسەرێ دی ژی تارییاتیەکا بێ دوماهی هەیە و چ ڕۆناهی لێ نینە و هەتا ڕۆناهیا "خودا"ی ناگەهیتێ. لێ د هەمان دەم دا پلوتینی دگوت کو چ ڕاستی بۆ تارییاتییێ نینە ئانکو نە دەڤەرەکا دەستنیشانکری یە، بەلکو ب تنێ جهەکێ هۆسایە ڕۆناهی ناگەهیتێ.

ئانکو هەکە ب ئاوایەکێ دی بێژین: ڤێ دەڤەرێ چ هەبوون نینە، ئەو تشتێ ب تنێ هەبوونا خوە هەی، "یەك"ە یان ژی خودایە. ژلایەکێ دی ڤە، هەروەکو کا چەوا ئەو ژێدەرێ ڕۆناهیێ هێدی هێدی دناڤ تارِیاتیێ دا کێم دبیت، ئاها هۆسا جهەك هەیە سنوورەکی بۆ ڤێ ڕۆناهیێ ددانیت.

ب دیتنا ئەفلۆتینی، ڕۆحا مرۆڤی ب ڕوناهیا خودای گەش دبیت و ماددەیێ لەشێ مە ژی ئەو تارِیاتیە یا د ڕاستی دا چ هەبوون بۆ نەی. لێ گشت فۆرمێن سروشتی ڕەنگڤەدانەکا بچوك یا ڕوناهیا خودای هەیە.

نوکە دیمەنێ ئاگرەکێ مەزن بینە پێشچاڤێن خوە د شەڤەکا تارِی دا هاتبیتە هەلکرن و چریسکێن ئاگری بەرەڤ هەر چوار ئاراستەیان بەلاڤ بن. ئەڤ شەڤا تارِی ژی ژبەر ڕۆناهیا ئاگری، هەتا چوارچۆڤەیەکێ دەستنیشانکری یا ڕۆهن بووی. ئانکو ب دووراتیا چەند کیلومەتران، ڕۆناهیا ئاگری گەلەك کز دهێتە دیتن و ئەگەر هێشتا دوور بکەڤین دێ وەکو خالەکا ڕۆناهیێ هێتە پێشچاڤێن مە و ئەگەر بەردەوام دووربکەڤین، ل دوماهیێ دێ گەهینە جهەکی کو ئێدی ڕۆناهیا وی ئاگری ناگەهیتە چاڤێن مە.

ئانکو ل جهەکێ دەستنیشانکری دا، ڕۆناهیا ئاگری دێ دناڤ تارِیاتیا شەڤێ دا بەرزە بیت و دەمێ ب تەمامی تارِی دبیت و ئێدی ئەم نەشێین چ تشتان ببینین. ل وی جهێ تارِی ئەم چ سیبەر و وێنەیان نابینین.

نوکە هزرا خوە د هندێ دا بکە کو ڕاستی ئەو ئاگرێ گەشە. ئەو تشتێ دسوژیت و ڕۆهن دبیت خودایە، ئەو تارِیاتیا ل دوردورێن وی ژی ئەو ماددەیە یێ مرۆڤ و گیانەوەر ژێ هاتینە دروستکرن. ل نیزیکی خودای ژی، هەموو ئەو بیرۆکەیێن نەمر لێ هەنە یێن فۆرمێ بنەڕەتی یێ هەموو بونەوەران ل بەر هاتیە دروستکرن. ل دەستپێکا هەموو تشتان ڕۆحا مرۆڤی دهێت کو وەکو چریسکێن ئاگری یە لێ ل هەموو جهێن دی یێن تارِی ژی دا هندەك ژ ڕۆناهیا خودای دگەهیتێ.

ئەم دشێین دناڤ هەموو بونەوەرێن زیندی دا هەست ب ڤێ ڕۆناهیێ بکەین، هەتا دناڤ گولەباخ و گول نێرگزەکێ ژی دا. و ل بازنەیەکا دوورتر ژ خودای زیندی، ئەرد و ئاڤ و بەر لێ هەنە.

دناڤ هەموو تشتێن زیندی دا، پیچەك ژ نهێنیا خودای دناڤ دا هەیە. ئەم دبینین تشتەك یێ دناڤ ناخێ گول بەروژان دا گەش دبیت یان هەتا دناڤ گولا خشخاشێ یا کیڤی دا. ئەڤ نهێنیا خودای ل دەڤ پەلاتینکەکێ پترە دەمێ ژ سەر گولەکێ دفڕیتە سەر گولەکا دی یان ماسیەکا ڕەنگ زەر دەمێ مەلەڤانیان دکەت. لێ ب هاریکاریا ڕۆحا خوە ئەم دشێین پتر نیزیکی خودای ببین. دەمێ ئەم دگەل ڤێ نهێنیا مەزن دبینە یەك، ڕەنگە بۆ چەند ساتەکان هزر بکەین ئەم ب خوە ئەو نهێنیا خودای نە.

ئەو وێنەیێن ئەفلۆتین بکاردئینیت، چیرۆکا ئەفلاتۆنی دئینتە پێشچاڤێن مە. ئەم چەند پتر نێزیکی دەرگەهێ شکەفتێ دبین، پتر نێزیکی بنیاتێ هەر تشتەکێ د گەردوونی دا هەی دبین.

بەروڤاژی ئەفلاتۆنی ئەوێ کەتوار ل سەر دوو بەشێن ژێکجودا پارڤە دکری، ئەفلۆتینی هزردکر هەموو تشت یەك تشت ب تنێ نە، چونکی هەموو تشت خوەدانە. هەتا ئەو سیتافکا ل دوماهیا شکەفتێ ژی ئەوا ژ ئەنجامێ ڕەنگڤەدانا کەسەکی پەیدادبیت.

هندەك جاران، ئەفلۆتینی هزر دکر ڕۆحا وی دناڤ ڕۆحا خودای دا دحەلیا. دبێژنە ڤێ چەندێ "سەربۆرا سۆفیگەریێ". ئەفلۆتین کەسێ یەکانە نەبوو یێ هەست ب ڤی جۆرێ سەربۆرێ کری، بەلکو ل هەموو سەردەمان و دناڤ هەموو کەلتوران دا هندەك کەسان بەحسێ ڤێ سەروبورێ کریە. دبیت پیچەکێ شێوازێ ڤەگێڕانا سەربۆرا وان یێ جودا بیت، لێ بنەمایێن سەرەکی د گوتنێن هەموویان دا وەکو یەکن. دا تەماشەی هندەکان بکەین.

## سۆفیگەری

مەرەم ژ سەربۆرا سۆفیگەریێ، هەڤگرتنە دگەل خودای یان "ڕۆحا گەردوونی". هندەك ئاین ڤالاهیەکێ دناڤبەرا خودای و مەخلوقی دا دهێلن، لێ سۆفیگەریMysticism ب بەلگە دیار دکەن کو ئەڤ ڤالاهیە نینە و ئەو کەسە دگەل خودای یەکدگریت و تێدا دحەلیێت.

ل پشت ڤێ چەندێ هەموویێ، بیرۆکەیەك هەیە دبێژنێ "ئەز" لێ ئەڤە ئەو "ئەز" نینە یا ڕۆژانە ئەم خوە پێ دنیاسین. چونکی دبیت هندەك جاران ئەم هەست پێ بکەین ئەم ژ "ئەز"ەکێ مەزنتر پەیدابووینە کو هندەك سوڤی دبێژنێ "خودا" و هندەکێن دی دبێژنێ "ڕۆحا جیهانێ". دەمێ هەڤگرتن پەیدادبیت، سۆڤی هەست پێدکەت ئەو یێ خوە ژ دەست ددەت، یان یێ دناڤ خودای دا بەرزە دبیت یان دحەلییێت، هەروەکو کا چەوا چپکەکا ئاڤێ دناڤ دەریایێ دا بەرزە دبیت. ب ڤی ڕەنگی یەك ژ سۆفیێن هندی دەربڕین ژ خوە دکر و دگوت: "دەمێ ئەز هەیم، خودا نەبوو، لێ دەمێ خودا هەی ئەز نەبووم."

سۆفیگەرێ مەسیحی ئەنجیلوس سیلیسیوس (1624-1677 ز.) ب رەنگەکێ دی بۆچوونا خوە شرۆڤە دکر و دگوت: "هەر چپکەك دبیتە زەریا دەمێ دناڤ ئاڤا زەریایێ دا دحەلییێت. ئاها هۆسا ڕۆح ژی وەلێ دهێت دەمێ بلند دبیت و دبیتە خودا."

دبیت نوکە تو هەست پێبکەی نە یا خوشە مرۆڤ خوە ژ دەست بدەت و ئەز باش د تە دگەهم، لێ هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا بکە: "ئەو تشتێ تو ژ دەستددەی، گەلەك کێمترە ژ وی تشتێ تو بدەستڤە دئینی". ڕاستە تو دێ فۆرمێ خوە یێ نوکە ژ دەستدەی، لێ دێ هشیاریا هندێ بدەستڤەئینی کو تو تشتەکێ مەزن و بێسنووری. تو گەردوونی، ئانکو تو ڕۆحا جیهانێی، تو خودای. ئەگەر تو خوە وەك سۆفیا ئاموندسن ژ دەست بدەی، یا پشتڕاست بە ئەڤ "ئەزا تە یا رۆژانە" تشتەکە دێ رۆژەك هێت و ژ دەست دەی.

ئەڤ "ئەز"ا تە یا ڕاستەڤینە، کو ب تنێ ل وی دەمی تو دشێی هەست پێبکەی دەمێ تو ژ دەستددەی، ل دووڤ بۆچوونا سۆفیگەریێ، ئاگرەکێ سۆفیگەریێ یە کو هەتا هەتا دێ هێتە سووتن.

لێ ئەڤ سەربورا سۆفیگەریێ هەموو گاڤان وەکو خوە ڕاست دەرناچیت. دڤێت ئەو کەس ل دەستپێکێ د قۆناغا "پاقژبوون" و "گەشبوونێ" دا دەربازبیت، پاشی دشێت بگەهیتە خودای. ئەڤ ڕێکە شێوازەکێ ب زەحمەت یێ ژیانێ و هژمارەکا ڕێوڕەسمێن هزرکرنێ ب خوە دگریت هەتا ئەو ڕۆژ دهێت یا سوفی دکەتە هەوار و دبێژیت: "ئەز خودامە" یان "ئەز تو مە".

د هەموو ئاینێن جیهانێ دا هندەك نێرینێن سۆفیاتیێ هەنە. سەرەڕای کەلتورێن وان یێن جودا جودا، لێ دبیت گەلەك جاران ئەو دەربڕینێن سوڤ د سەربۆرێن خوە دا پێشکێشی مە دکەن، د وەکهەڤ بن، دەمێ سوفی بەحسێ لێکدانەکا ئاینی یان فەلسەفی یا سەربۆرێن خوە دکەن، ب تنێ ل وی دەمی ڕابردوییێ کەلتورێ وان دهێتە پێشچاڤێن مە.

دناڤ سۆفیگەریا ڕۆژئاڤای دا کو هەر سێ ئاینێن تاکپەڕست، جوهیاتی و مەسیحی و ئیسلامێ ب خوە ڤە دگریت، سوفی بەحسێ گەهشتنا خودایەکێ تایبەت دکەن. ئەو دبێژن هەرچەندە خودا یێ دناڤ ڕۆحا مەدا، لێ دگەل هندێ ئەو یێ ل سەر هەموو تشتان. لێ دناڤ سۆفیگەریا ڕۆژهەلاتی دا، ئانکو دناڤ ئاینێن هیندوسی و بودی و تاوی دا، پتر ئەو چەندە یا ل دەڤ سوفیێن وان بەربەلاڤە کو ب تەمامی دگەل خودای یان ڕۆحا گەردوونی دا دحەلیێن.

سوفی دبێژن: "ئەز ڕۆحا گەردوونی مە" یان "ئەز خودا مە". چونکی ب دیتنا وان ئەگەر خودا نە ب تنێ یێ د جیهانێ دا بەلکو یێل هەموو جهێن دی.

بەری هاتنا ئەفلاتۆنی ب ماوەیەکێ درێژ، ب تایبەت ل وەلاتێ هندێ، پێلەکا مەزن یا سۆفیگەریێ بەربەلاڤبوو. ئەو کەسێ هندی یێ ئاینێ هندوسی گەهاندیە ڕۆژئاڤای، ناڤێ وێ "سوامی ڤیڤیکاناندا" بوو. جارەکێ وی گوت: "هەروەکو کا چەوا هندەك ئاین دبێژن ئەو کەس یێ بێ باوەرە یێ ژ دەرڤەی خوە، باوەری ب چ خوداین تایبەت نەبن، ئاها هۆسا ئەم ژی دبێژین ئەو مرۆڤێ باوەری ب خوە نەبیت مرۆڤەکێ بێ باوەرە. ل ڤێرێ مەرەم ژ بێباوەریێ ئەوە تە باوەری ب پیرۆزیا ڕۆحا خوە نەبیت."

سەربۆرا سۆفیگەریێ ڕەنگە گرنگیەکا مەزن بۆ سوفی هەبیت. هەروەکو کا چەوا یەك ژ سەرکردێن هندی یێن کەڤن "ڕادباکریسبان" دبێژیت: "دڤێت تو هندی خوە حەز ژ کەسێ بەرامبەری خوە ژی بکەی چونکی تو ب خوە کەسێ بەرامبەری خوەی. ب تنێ ئاشوپ وەل تە دکەت هزر بکەی بەرامبەری تە کەسەکێ دی یە."

مرۆڤێن سەردەمێ مە بێ کو باوەری ب ئاینەکێ دەستنیشانکری هەبیت، د سەربۆرەکا سۆفیگەریێ دا دەرباز بووینە و ژ نیشکەکێ ڤە هەست ب تشتەکی کریە کو وان ناڤێ وی کریە "ئاگەهیا گەردوونی" یان ژی "هەستکرنا ئەختەران". وان هەستپێکر ئەو ژ بازنەیا زەمەنی دەرکەفتینە و جیهان د گوشەیا وێ یا هەتا هەتایی دا دیتی یە.

سۆفیا ل سەر جهێن خوە ڕابووڤە و هەستپێدکر هێشتا ئەو یا ساخە و لەشێ وێ ژێ دوورنەکەفتیە. دەمێ وێ دەربارەی فەلسەفەیا ئەفلۆتین و سۆفیگەریێ دخواندی، هەستپێکر ئەو یا ل سەر جهێن خوە ڕابوویەڤە و دناڤ ژوورا خوە دا دفڕیت و پاشی د پەنجەرکا ڤەکری دا دچیتە ژ دەرڤە و دناڤ ئەسمانێ باژێری دا بلند دبیت.

ل ڤی ئەسمانێ بلند، وێ هژمارەکا خەلکی د گۆڕەپانا مەزن یا باژێری دا ددیتن. پاشی وێ بەردەوامی دا فڕینا خوە هەتا ژ دەریا باکوری و ئەورۆپا بوری و گەهشتیە بیابانێ و ژ وێرێ ژی بەرەڤ دەشت و نهاڵێن ئەفریقیاییێ یێن بەرفرەهـ ڤە چوو.

ل پێشچاڤێن وێ، ئەڤ ئەردێ مەزن هەموو پێکڤە وەکو کەسەکێ زیندی لێ هاتبوو. دا بێژی ئەڤ ئەردە سۆفیا ب خوەیە. وێ د دلێ خوە دا گوت: "جیهان هەموو ئەزم". ئەڤ گەردوونێ مەزن و بێ دوماهیك ئەو ب خوەیە. گەردوون گەلەك ب مەزنی دهاتە پێشچاڤێن وێ، لێ نوکە هەست پێدکەت ئەو ژی هندی ڤی گەردوونی یا مەزن بووی.

پشتی دەمەکێ کورت، ئەڤ هەستێن سەیر بەرزە بوون. سۆفیایێ هەستپێکر ئەو یا ژ خەونەکا جوان هشیار بووی و پیچەکێ سەرێ وێ یێ دئێشیت. سۆفیایێ دڤیا ژ ناڤ جهێن خوە ڕابیتەڤە، لێ پیچەکێ دلگران بوو دەمێ جارەکا دی لەشێ خوە دیتی. مانا وێ بۆ دەمەکێ درێژ ل سەر زکی دەمێ وانەیا هیلینیزمێ دخواندی بۆ ئەگەر هەست ب پشت ئێشانێ بکەت. لێ ئەڤ سەربۆرا بەری نوکە ئەو تێدا ژیای بۆ هەتا هەتایێ دێ مینتە د بیردانکا وێ دا.

ل دوماهیێ شیا ڕابیتە سەر پێن خوە. کاغەزێن خوە کومکرن و کرنە دناڤ زەرفێ وێ دا و دگەل وانەیێن دی هەلگرتن و پاشی چوو گەریانەکا دناڤ باخچەی دا.

دناڤ باخچەی دا دەنگێ ئاوازێن چووچکان هۆسا بلند دبوون دا بێژی ژ نوو جیهان یا هاتیە ئافراندن. دارێن سپیندارێن ل پشت قەفەسکا کێڤریشکان هۆسا د کەسك بوون دا بێژێ هێشتا ئافرینەرێ وان ژ ڕەنگکرنا وان ب دوماهی نەهاتیە.

ئەرێ ئەو دشێت باوەریێ ب هندێ بینیت کو ئەڤ تشتە هەموو "ئەز"ەکێ خودای یە؟ و دناڤ ناخێ وێ دا ڕۆحەك هەیە کو ژ ئاگری هاتیە وەرگرتن؟ ئەگەر هۆسا بیت، ئانکو ژ ڕاستا ئەو بونەوەرەکا خودای یە.

# پۆستكارت

*...ئەز دێ سانسۆرەكا ب هێز ل سەر خوە سەپینم...*

چەنین ڕۆژ بورین بێ كو سۆفیا چ دەنگوباسان ل دور مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفی گوهلێببیت. سوباهی ڕۆژا پێنج شەمبی ڕێكەفتی 17ی گولانێ، جەژنا نەتەوەی یا وەلاتێ نەڕویجێ یە، ژبەر هندێ بێهنڤەدانا فەرمی یە و دەرگەهێن قوتابخانێ هەتا ڕۆژا 18ی گولانێ دێ د گرتی بن. دەمێ ئەو ژ قوتابخانێ دەركەفتین، ژ نیشكەكێ ڤە هەڤالا وێ جوانایێ پرسیار ژێ كر: "تو چ دبێژی ئەم بچینە گەشتەكا خیڤەتگەهان؟"

سۆفیایێ هزرێن خوە كرن، هەرچەندە وێ دزانی نابیت بۆ ماوەیەكێ درێژ ژ مال دوور بكەڤیت، لێ بەرسڤ دا و گوت: "بۆچی نە، چ پێنەڤێت بەلێ."

پشتی بورینا چەند دەمژمێران، جوانا هاتە دەڤ سۆفیایێ و چانتەیەكێ مەزن ب پشتا وێ ڤە بوو. سۆفیایێ ژی خیڤەتا خوە ئامادەكر بوو و كیسكەكێ نڤستنێ و پەڕدەیەكا ڤەبڕ و جلكێن گەرم و لائێتەكا بەریكی و ترمزەكێ مەزن یێ چایێ و چەندین كەلوپەلێن خوارنێ كربوونە د چانتێ خوە دا.

دەمژمێر پێنجی ئێڤاری، دەمێ دایكا وێ ژ سەر كاری زڤڕی، كومەكا ڕاسپاردە و شیرەتان لێكرن كا پێدڤیە ل وێرێ چ بكەن و چ نەكەن. هەروەسا داخواز ژێ كر ب دروستاهی جهێ خوە بۆ وێ دیار بكەن یێ وان ل بەرە خیڤەتێن خوە لێ ڤەدەن.

وان ژی ژ لایێ خوە ڤە بۆ دیارکر کو وان ل بەرە خیڤەتێن خوە ل سەرێ گرەکێ ڤەدەر ڤەدەن. بەلکو ئەو ب بەخت بن و گوهـ ل دەنگێ ئاوازێن بلبلان بیت دەمێ سپێدێ ژ خەو هشیار دبن.

سۆفیایێ ژ نیشکەکێ ڤە ئەو جهە نەهەلبژارت بوو. شیدرتوبن گەلەك ژ کۆلکێ مایجەری یێ دوور نەبوو. بەری نوکە ژی وێ گەلەك جاران حەز دکر جارەکا دی سەرەدانا ڤی کۆلکی بکەت لێ ئەو ب تنێ نەدوێریا وی کاری بکەت.

وان هەردوو کچان ڕێکا خوە گرتە بەر ئەوا ژ دەڤ مالا سۆفیایێ وان دەستپێدکری و بەرەڤ دارستانێ چوون. ب ڕێکێ ڤە وان بەحسێ هەموو تشتێن هەی و نەی دکر. ئەڤ چەندە ژی بۆ ئەگەر سۆفیا هەست ب بێهنفرەهیەکا تەمام بکەت و پیچەکێ خوە ژ سەڤایێ وانەیێن فەلسەفی دوور بکەت.

نێزیکی دەمژمێر هەشتی شەڤێ، ئەو ژ ڤەدانا خیڤەتێن خوە ل سەر گرەکێ ڤەدەر ب دوماهی هاتن. پاشی کیسکێن نڤستنێ و کەلوپەلێن دی یێن پێدڤی بۆ شەڤبیریا خوە ژ چانتەیان ئینانە دەرێ. پشتی وان ساندەویچێن خوش خوارین، سۆفیایێ پرسیار ژ هەڤالا خوە کر: "ئەرێ تە گوهـ ل کۆلکێ مایجەری بوویە؟"

- "کۆلکێ مایجەر!"
- "ئەو کۆلکەکێ بچووکە دکەڤیتە لایێ دی یێ دارستانێ ل سەر لێڤا دەریاچەکا بچووك. بەری نها مایجەرەکێ بیانی تێڤە دژیا، ژبەر هندێ ناڤێ وی کریە کۆلکێ مایجەر."
- "ئەرێ نوکە کەسەك تێڤە دژیت؟"
- "ئەم دشێین پاشی بچین سەحکەینی..."
- "بەلێ پا ئەو ل کیڤەیە؟"

سۆفیایێ ئاماژە کرە ئاڕاستەیەکێ نەدیار دناڤبەرا داروباران.

جوانایێ هند حەز نەدکر بچیت، لێ وێ ل سەر خاترا هەڤالا خوە، داخوازیا وێ ڕەتنەکر. دەمێ وان دەست ب چوونێ کری، پیچەك مابوو ڕۆژ ئاڤا ببیت.

ڤان هەردوو کچان ڕێکا خوە دناڤ دارێن کاژان یێن بلند کر و پاشی کەفتنە دناڤ داروبار و گیاییێن کورت و بوش دا هەتا ل دوماهییێ ڕێکەکا بچووك دیتی. ئەڤە ئەو ڕێکە یا سۆفیا حەفتیا دی تێرا بوری!

بەلێ ئەڤە ئەو ڕێکە، چونکی هەر ژ دوور ڤە وی کۆلکی خویا دکر. سۆفیایێ بەرسڤا هەڤالا خوە دا ئەوا بەری هینگێ پرسیارا جهێ کۆلکی ژێ کری.

- "ئاها وێ هەنێ یە."
- "ئەرێ ئەم دێ چەوا ژ ئاڤێ دەرباز بین؟"
- "خوە بێ هیڤی نەکە، دێ ب بەلەمەکێ دەرباز بین."

سۆفیایێ ئاماژە کرە کنارێ دەریاچێ کو بەلەمەکا بچووك یا ل وێرێ گرێدای بوو.

- "ئەرێ بەری نوکە تو هاتیە ڤێرێ؟"

سۆفیایێ ب نەخێر سەرێ خوە هەژاند، چونکی ئەڤ بەرسڤە گەلەك ژ هندێ ب سانەهیتر بوو ئەگەر ئەو بەحسێ سەرهاتیا خوە هەموویێ بۆ وێ بکەت. ئەرێ ئەو دێ چەوا شێت بەحسێ سەرەدانا خوە یا بەری نوکە بۆ وێ کەت بێ کو بشێت نهێنیا پەیوەندیا خوە دگەل ئەلبێرتۆ کنوکسی و وانەیێن وی یێن فەلسەفێ دا بۆ نەکەت؟

ئەو هەردوو سوواری بەلەمێ بوون و دناڤ دەریاچێ دا تڕانە و نوکتە ب هەڤدوو دکرن هەتا گەهشتینە لایێ دی. دەمێ گەهشتینە لایێ دی، سۆفیایێ داکوکی ل هندێ کر کو پێدڤیە ئەو باش بەلەمێ گرێدەن. پشتی بورینا چەند خولەکان، وان خوە ل بەر دەرگەهێ کۆلکی دیت. سۆفیایێ دەستێ خوە هاڤێتە دەستکێ دەرگەهی و وەڕبادا، لێ دیارە کەس د کۆلکی ڤە نینە.

- "یێ گرتیە... چیە یا ژ تەڤە یێ ڤەکریە؟"
- "ڕاوەستێ، بەلکو کلیلەك ل ڤان جهان هەبیت."

پاشی سۆفیایێ دناڤبەرا کون و شەقێن دیوارێ کۆلکی ڕا ل کلیلکا دەرگەهی گەریا.

جوانایێ گوت: "چ کلیل ل ڤان جهان نینن. دا ژ ڤێرێ بچین."

لێ هێشتا وێ ئاخفتنا خوە تەمام نەکری، سۆفیایێ گوت: "ئاها ئەڤە، من دیت."

سۆفیایێ کلیل ژ کونجەکێ ئینا دەرێ و کرە د قوفلێ ڕا و دەرگەهـ پێ ڤەکر. وەکو دزیکەران، وان هەردوو کچان زووی خوە هاڤێتە د ژوور ڤە. سەقایێ ژوورێ یێ تەزی و تاڕی بوو.

جوانایێ گوت: "ئەم چ تشتان نابینین."

لێ بەری هینگێ سۆفیایێ هزرا هەموو تشتان کربوو. ڤالکەکا شخارتێ ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و زلکەکەك بەردایێ. ڕۆناهیا زلکی تێرا هندێ دکر ئەو پشتڕاست بن کۆلك یێ ڤالاًیە و کەس تێڤە نینە. پاشی زلکەکێ دی بەردایێ و شامالکەك د دناڤ شەمالهەلگرەکا برۆنزی ل سەر لێڤا کوچکی دیت. پشتی سوفیایێ ئەو شەمالك بەردایێ، ئێدی کۆلك هەموو ڕۆهن بوو و شیان هەموو تشتان ب سانەهی ببینن.

سۆفیایێ گوت: "مانە تشتەکێ سەیرە، چەوا شەمالکەکا هۆسا بچووك دشێت ڤێ تاڕیاتییێ هەموویێ ڕۆهن بکەت؟

جوانایێ سەرێ خوە هەژاند و ئاخفتنا وێ پەسەند کر.

پاشی سۆفیایێ گوت: "هندەك جهـ هەنە ئەڤ ڕۆناهیە تێدا بەرزە دبیت. لێ د کەتواری دا، چ ڕاستی بۆ هەبوونا تاڕیاتییێ نینن، بەلکو تاڕیاتی ژ ئەنجامێ نەبوونا ڕۆناهیێ پەیدادبیت."

- "ئەڤە چ ل تە هاتیە هەتا تو هۆسا باخڤی؟ وەرە دا بزڤرین."
- "نەخێر، دا تەماشەی سەروچاڤێن خوە د خودیکێ دا بکەین."

ل دەستپێکێ سوفیایێ ئاماژە کرە خودیکا ل سەر مێزێ، جوانایێ گوت: "چەند خودیکەکا جوانە.

- "بەلێ پا ئەو خودیکەکا جادوگەری یە*."
- "جادوگەری، ئەی خودیکا جادوگەر، بێژە من کیژ مە هەردووکان جوانترە؟"

---

* سحری.

- "ئەز ترانەیان ناکەم، جوانا. ئەز تە پشتڕاست دکەم کو تو دشییێ د کوژیەکێ دی ڕا تەماشەی وێ بکەی و تشتەکی تێدا ببینی."

- "گوهێ خوە بدە من، تە گوت ئەز بەری نوکە نەهاتیمە ڤێرێ، پا تو چەوا ڤان تشتان هەموویان دزانی، ئەرێ ما بۆ تە خوشە تو ب ڤان ئاخفتنان من بترسینی؟

سۆفیایێ ب پەیڤەکا ب تنێ بەرسڤا وێ دا و گوت: "ببورە."

پاشی گەرا جوانایێ هات و ل تشتێن دەوروبەرێن خوە گەڕیا هەتا چاڤێ وێ ب تشتەکێ ل سەر ئەردی کەفتی کو ئەو ژی ڤالکەك بوو، دەمێ جوانایێ ڤەکری، کرە ڤێژی و گوت: "کومەکا پۆستکارتانە!"

سۆفیایێ ژی ب ڤێژیەکا بچووك گوتێ: "دەستێ خوە نەکێ، تە گوهـ ل من بوو، دەستێ خوە نەکێ."

جوانا حێبەتی ما و ڤالکا پۆستکارتان هاڤێت، ئەو کارتە هەموو ل سەر ئەردی بەربەلاڤ بوون. پشتی بورینا چەند چرکەیان، هەردوو کچان دەست ب کەنییێ کر.

- "بەلێ ئەڤە ب تنێ هندەك پۆستکارتن نەك زێدەتر."

هەردوو ل سەر ئەردی ڕوونشت و دەست ب کومکرنا وان کر.

جوانایێ گوت: "ئەڤە یا ژ لوبنانێ هاتی، ئەڤە ژی ژ لوبنانێ یا هاتی.. و ئەڤە ژی.. هۆسا دیارە هەموو یێن ژ لوبنانێ هاتین."

سۆفیا نەشیا دەڤێ خوە و ئاخفت.

- "بەلێ ئەز دزانم."

- "ئانکو تو بەری نوکە یا هاتیە ڤێرە؟ مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ."

پشتی هینگێ د دلێ خوە دا گوت ڕەنگە ئەڤ چەندە بۆ من ب سانەهیتر لێ بهێت ئەگەر ڕاستییێ هەموویێ بۆ هەڤالا خوە بێژم. وەکو دی ژی ما دێ چ زیان گەهیتە من ئەگەر بەحسێ سەرهاتییێن خوە یێن ئنتیکە یێن ئەڤە ماوەیەکە تێدا دژیم بۆ وێ بکەم."

- "من نەدڤیا بەری کو ئەم بهێنە ڤی جهی، بەحسێ وی بۆ تە بکەم."

جوانایێ دەست ب خواندنا پۆستکارتان کر، پاشی گوت: "ئەڤ کارتە هەموو بۆ کەسەکێ یێن هاتین ب ناڤێ هێلد موللەر کناگ."

- "ئەرێ چ ناڤونیشان ل سەر نینن؟"

جوانایێ ب دەنگەکێ بلند، یەك ژ وان کارتان خواند.

- "بۆ هێلد موللەر کناگێ ب ڕێکا ئەلبێرتۆ کناکسی- لیلساند- نەڕویج."

سۆفیایێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و ب ئارامی بەردا. ئەو دترسیا نەکو ل سەر ناڤونیشانی نڤیسابایە: ب ڕێکا سوفی ئاموندسنێ. نوکە وێ ژی یەك یەکە دەست ب خواندنا وان کر.

- "ل 28 نیسانێ، 4 گولانێ، 6 گولانێ، 9 گولانێ، هۆسا دیارە ئەڤ کارتە هەموو بەری چەند ڕۆژەکان هاتینە هنارتن."

- "نە ئەڤە ب تنێ، بەلکو مورا هەموویان یا نەڕویجی یە. تەماشەی ڤێرە بکە: "بەتەلیونا نەتەوەیێن یەکگرتی". پۆلێن کارتان ژی هەموو یێن نەڕویجی نە."

- "ئەز دبێژم تشتەکێ ئاسایی یە، پێدڤیە ئەو د بێلایەن بن ژبەر هندێ وان نڤیسینگەهەکا تایبەت بۆ پۆستەیێن خوە هەیە."

- "باشە پا چەوا پۆستەیێن وان دگەهنە مە؟"

- "چێدبیت ب ڕێکا فرۆکەیەکا لەشکەری بیت."

سۆفیایێ شەمالك دانا سەر ئەردی و هەردووکان دەست ب خواندنا وان کر ئەو ژی پشتی جوانایێ هەموو ل دووڤ بەروارێ هنارتنا وان ب ڕێز کرین و دەست ب خواندنا کارتا یەکێ کر."

*خوشتڤیا من هێلد:*

*تو نزانی ئەز چەند یێ کەیفخوەشم ب ڤەگەڕیا خوە بۆ لیلساندێ، ئەز دبێژم فرۆکەیا من ل ئێڤاریا ڕۆژا جەژنا قەشە یوحەنای دێ دادەت. من چەند حەز دکر ل جەژنا بوونا تە یا پازدە سالیێ ئامادەبم لێ ئەز یێ نەچارم گوهداریا فەرمانێن لەشکەری بکەم و ئەرکێ خوە ب دروستاهی ئەنجام بدەم. لێ ئەز شیایمە کاروبارێن خوە ڕێکبێخم ب ڕەنگەکی کو ل ڕۆژا جەژنا ژ دایکبوونا تە، دیاریەکا جوان بگەهیتە دەستێن تە.*

*تیبینی: دگەل ڤێ کارتێ، کارتەکا دی یا هەڤشێوە دێ بۆ هەڤالەکا تە فرێکەم کو ئەز و تو هەردوو باش وێ دنیاسین. خوشتڤیا من ل دەمێن بهێت تو دێ تێگەهی کا مەرەما من ژ ڤێ چەندێ چیە. ڕاستە نوکە ئەز ل دەڤ تە وەکو کەسەکێ سەیر خویا دکەم، لێ هیڤی دکەم بلا تە باوەری ب من هەبیت.*

*ڕێزوسلاڤ ژ دەڤ بابەکێ گەلەك*

*هزر د پاشەڕۆژا کچا خوە دا دکەت*

سۆفیایێ دەستێ خوە هاڤێتە نامەیا دووێ:

*خوشتڤیا من هێلد:*

*ل ڤێرێ ئەم ڕۆژ ب ڕۆژ دژین، ل ڤان هەیڤان ل لوبنانێ فێری چاڤەڕێیەکا بەردەوام بوویمە. لێ دێ هەموو پێکۆلێن خوە مەزێخم داکو ل جەژنا ژ دایکبوونا خوە جوانترین دیاری وەربگری. ئەز نوکە نەشێم زێدەتر بۆ تە چ دی بێژم چونکی من سانسۆرەکا گران ل سەر خوە سەپاندیە.*

*تە ماچی دکەم*

*بابێ تە*

وان هەردوو هەڤالان بێهنا خوە چك کر و دڤیا تشتێن مایی ژی بزانن بێ کو یەك ژ وان ب وێریت پرسیارەکێ ژ یا دی بکەت.

***کچا من یا خوشتڤی:***

***من دڤیا کارتێن خوە دگەل کوترەکا سپی بۆ تە فرێکەم، لێ خوەدانکرنا کوترێن سپی ل وەلاتێ لوبنانێ نە هند تشتەکێ بەربەلاڤە. د ڕاستی دا ئەگەر تشتەك د ڤی وەلاتێ پڕی شەڕ دا یێ پێدڤی بیت، کوترێن سپی نە. خوزی ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان نەتەوەیێن یەکگرتی ئاشتی ل هەموو جیهانێ بەلاڤکربایە.***

***تیبینی: ڕەنگە تو بشێی دیاریا خوە یا جەژنا ژ دایکبوونا خوە بکەیە دوو پارچە و پارچەیەکێ بدەیە کەسەکێ دی ژی. لێ دەمێ ئەز دگەهمە مال دێ ل سەر ڤێ چەندێ ئاخڤین چونکی دبیت هێشتا تو د مەرەما من نەگەهشت بی.***

***ژ دەڤ بابەکێ وەخت هەی هزرا***

***خوە د مە هەردووکان دا بکەت.***

ب ڤی ڕەنگی وان شەش کارت خواندن هەتا گەهشتینە کارتا دوماهیێ:

***خوشتڤیا من هێلد:***

***ئەز بێزاربووم کو هەتا نوکە یێ بێدەنگم و نەشێم بەحسێ دیاریا جەژنا ژ دایکبوونا تە بکەم. هەتا نوکە شیایمە ل سەر حەزا خوە زاڵ ببم، ئەو حەزا ڕۆژانە چەندین جاران من پاڵدەت تێلەفۆنا تە بکەم داکو بێژمە تە ئەو دیاریا دێ بۆ تە فرێکەم تشتەکە بەردەوام یێ د گەشەکرنێ دا، وەکو هەموو تشتێن دی بەردەوام گەشە دکەت و مەزن دکەت ژبەر هندێ یا ب زەحمەتە ئەم وی تشتی بۆ خوە ب تنێ بهەلگرین.***

***تیبینی: ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دێ کچەکێ نیاسی ناڤێ وێ سۆفیایە. داکو تو ل وی دەمی ب سانەهی وێ بنیاسی، من کوپیەك ژ ڤان پۆستکارتێن بۆ تە هنارتین، یێن بۆ وێ ژی هنارتن. ئەرێ ما تو نابێژی ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەرێ پتر لێکنێزیککرنا هەوە، هێلد؟ هەتا نوکە ئەو چ تشتێ پتر ژ وان تشتان نزانیت یێن تو دزانی. هەردیسان وێ هەڤالەکا هەی ناڤێ وێ جوانایە، دبیت ئەو بشێت هاریکاریا وێ بکەت.***

پشتی خواندنا ڤێ نامەیا دوماهیێ، هەردو هەڤالان تەماشەی هەڤدوو کر. جوانایێ دەستێ سۆفیایێ گرت و گڤاشت و گوتێ: "ئەز یا دترسم."

- "ئەز ژی هەروەسا."
- "دوماهیك ڕێکەفتا لێدانا مورا پۆستەی چەندە؟"
- "ڕێکەفتی 16ی گولانێ، ئانکو ئەڤرۆکەیە."

جوانایێ کرە هەوار: "نەخێر، چێنابیت."

پاشی دووبارە تەماشەی ڕێکەفتا لێدانا مورێ کر، بەلێ گومان تێدا نینە کو ڕۆژا 1990.5.19 یە.

جوانایێ گوت: "ئەڤ چەندە قەت چێنابیت، وەکو دی ژی ئەز تێناگەهم کا کێ ئەڤ کارتە نڤیساینە. چ پێنەڤێت کەسەکێ هۆسایە مە دنیاسیت. باشە وی چەوا زانی ئەم دێ ئەڤرۆکە هێینە ڤێرێ؟" جوانا پتر دترسیا، چونکی چیرۆکا هێلدێ و بابێ وێ نە تشتەکێ نوو بوو ژ بۆ سۆفیایێ.

- "ئەز دبێژم ئەڤ کارتەیە ژ ڤێ خودیکا ڕەنگ برۆنزی دەردکەڤن."

ڕەجفینەکا نوو ب سەر لەشێ جوانایێ دا هات و گوت: "پێکۆلێ نەکەی من ژی ڕازی بکەی کو ئەڤ کارتە ژ خودیکا برۆنزی دا دەردکەڤن ل دەمەکی کو ب مورا نڤیسینگەهەکێ ل باشورێ لوبنانێ هاتینە مورکرن."

- "باشە تە شرۆڤەکرنەکا دی هەیە؟"
- "نەخێر، لێ پا..."
- "تشتەکێ دی یێ نهێنی ژی ل ڤێرێ هەیە."

سۆفیا ڕابووڤە و شەمالك برە نێزیکی هەردوو کەڤالێن ب دیواری ڤە هەلاویستی. جوانا ژی دگەل ڕابووڤە و پێکڤە تەماشەی کەڤالان کر.

- "بێرکلی و بجێرکلی، ڕامانا ڤان هەردوو ناڤان چیە؟"
- "ئەز نزانم."

پیچەك مابوو شەمالك بڤەمریت، جوانایێ گوت: "دا بچین."

- "کا ڕاوەستێ، من دڤێت خودیکێ دگەل خوە بینم."

هەرچەندە جوانایێ خوە نەڕازی ژی کر، لێ سۆفیایێ دەستێ خوە هاڤێتە خودیکێ و هەلگرت. ژ دەرڤەی کۆلکی، دنیا یا تاڕی بوو، گەلەك تاڕیتر بوو ژ شەڤێن گولانێ یێن ئاسایی. ئەسمان نەهند یێ ڕۆهن بوو لێ تێرا هندێ دکر ئەو سیبەرا داروبار و گژوگیای ژێکجودا بکەن. ڕۆناهیا هەیڤێ دناڤ دەریاچێ دا ڕەنگڤەددا، ژبەر هندێ ئەو هەردوو ب سانەهی شیان سوواری بەلەمێ ببن و خوە بگەهینە لایێ دی یێ ئاڤێ.

ل دەمێ زڤڕینێ، خو یەك ژ وان شیانێن ئاخفتنێ نەبوون، بەلکو هەردوو کوور چووبوونە د هزران دا. ژ ساتەکی بۆ ساتەکێ دی، دەنگێ چووچکەکا ل سەر سەرێ وان دفڕی یان بۆمەکێ ئەو دتڕساندن.

دەمێ گەهشتینە د خیڤەتا خوە ڤە، کیسکێن خوە یێن نڤستنێ ڤەکرن و چوونە تێدا، لێ جوانا ڕازی نەبو ب چ ڕەنگان خودیکێ بکەنە د خیڤەتێ ڤە و سۆفیایێ ژی نەدڤیا بهێلیتە ژ دەرڤە، لێ ل دوماهیێ نەچاربوون ل جهەکێ دوور ژ خیڤەتێ بدانن. هەردیسان سۆفیایێ ئەو پۆستکارت ژی دگەل خوە ئینابوون و کرنە د بەریکەکا چانتێ خوە دا.

دەمێ سپێدێ ئەو هشیار بووین، سۆفیا بەری جوانایێ ژ کیسکێ خوە یێ نڤستنێ دەرکەفت بوو. پێلاڤێن خوە کرنێ و چوو ژ دەرڤەی خیڤەتێ و بەرەڤ وی جهی چوو یێ خودیك دانایێ کو ب چەندین چیکێن خوناڤێ هاتبوو نخافتن. سۆفیایێ خودیك ب هچکێ خوە پاقژ کر، خوشبەخانە چ کارتێن دی یێن ب مورا لوبنانێ ژ خودیکێ نەهاتینە دەر.

ل سەر وێ دەشتا بەرفرەهـ و ل پشت خیڤەتا وان، چەندین عەور ل ئەسمانی دهاتن و چوون کو وەکو پنیێن پەمبی یێ سپی بوون. ئاوازێن چووچکان ژی ب سەر وان جهان بەلاڤ دبوون. وان هەردوو کچان بەرسینگێن خوە یێن پەمبی کرنە بەر خوە و ب ڕەخ خیڤەتێ ڤە ڕوونشت و تێشت خوار. هەر زوو سحبەتا وان چوو سەر کۆلکێ مایجەری و کارتێن پۆستەی.

پشتی هینگێ وان خیڤەتا خوە گرت و کیسکێن خوە یێن نڤستنێ ژی پیچان و کرنە د زەرڤێ وێ دا. ب رێکێ ڤە چەندین جاران بێهنا سۆفیایێ تەنگ دبوو و بێهنا خوە ڤەددا، ژبەرکو ژ بلی چانتێ وێ یێ گران، خودیك ژی دانابوو بن ملێ خوە. جوانا ڕازی نەبوو ب چ ڕەنگان هاریکاریا وێ بکەت یان دەستێ خوە بکەتە خودیکێ.

دەمێ نێزیکی باژێری بووین، وان گوهـ ل دەنگێ هندەك تەقەیان بوو. بیرا سۆفیایێ ل ئاخفتنێن بابێ هێلدێ ل دور لوبنانێ و شەڕی هات. ژبەر هندێ هەستپێکر ئەو گەلەك یا بەختەوەرە کو ل وەلاتەکێ ئارام و ئازاد دژیت.

سۆفیایێ جوانا داخواز کرە مالا خوە داکو پێکڤە کوپەکێ شیرێ گەرم ڤە چوون. دایکا وێ سەدان پرسیار ژێ کرن کا وان ئەو خودیك ژ کیڤە ئینایە. سۆفیایێ گوتێ کو وێ ل نێزیکی کۆلکێ مایجەری یێ دیتی، لێ دایکا وێ یا ڕژد بوو ل سەر هندێ کو ئەڤە چەندین سالە ئەو خانی یێ چولە و کەس تێڤە ناژیت. پشتی جوانا چووی، سۆفیا چوو سەرێ خوە شووشت و کراسەکێ سۆر کرە بەر خوە.

روودانێن ڕۆژا نەتەوەی یا وەلاتێ نەرویجێ وەکو هەر جار بوون. ل سەر تێلەڤزیونێ ڕاپورتەك ل دور ڤیستەڤالێن سەربازێن نەرویجی یێن دگەل یەکەیێن نەتەوەییێن یەکگرتی ل لوبنانێ کاردکر هاتبوو نمایشکرن کو وان ژی ئاهەنگ دگێڕان.

سۆفیایێ باش تەماشەی تێلەڤزیونێ دکر، چونکی وێ دزانی یەك ژ وان سەربازان بابێ هێلدێ یە.

دوماهیك کارێ سۆفیایێ ل ڤێ ڕۆژێ، 17ی گولانێ، کری ئەو بوو کو خودیکا ڕۆناهیێ ب دیوارێ ژوورا خوە ڤە هەلاویست. ڕۆژا پاشتر زەرڤەکێ ڤەهوائی د کۆلکێ خوە ڤە دیت و هەر یەکسەر دەست ب خواندنا وی کر.

# دوو کەلتور

*...ڕێکا یەکانە ژ بۆ خوە قورتالکرنێ د نقوومبوونا دناڤ تارپاتییێ دا...*

خوشتڤیا من سۆفیا، ل دەمەکێ نێزیك دێ ب دیدارا هەڤدوو شادبین. من دزانی تو دێ زڤرپیە کۆلکێ مایجەری ڤە، ژبەر هندێ من کارتێن بابێ هێلدێ بۆ تە هێلانە ل وێرێ، چونکی ئەڤە ڕێکا یەکانە یا گەرەنتیکری بوو کو ئەو کارتە بگەهنە دەستێ تە. دوودل نەبە کا چەوا ئەو کارتە گەهشتینە وێرێ، چونکی ژ نوکە و هەتا 15ی خزیرانێ، چەندین بابەتێن دی یێن نەدیار دێ بۆ تە ئاشکەرا بن و ب سانەهی کەڤن.

بەری نوکە مە دیت کا چەوا فەیلەسۆفێن قۆناغا هیلینیزمێ ڕەخنە ل فەیلەسۆفێن گریکی یێن دەستپێکێ دگرت. د هەمان دەم دا، ب ڤێ ڕێکێ وان ئەو وەك دامەزرێنەرێن ئاینەکێ نوو ددانە دیارکرن. بۆ نموونە چ نەمابوو ئەفلۆتین، ئەفلاتۆنی وەك ڕزگارکەرێ مرۆڤان بدەتە نیاسین.

لێ هەروەکو ئەم دزانین، ل وی سەردەمی دا، ڕزگارکەرەکێ دی یێ مرۆڤایەتیێ ژ دەرڤەی ئەردێن گریکی و ڕۆمانی ژ دایکببوو. مەرەما من حەزرەتێ مەسیحی یە. ژبەر هندێ، ل ڤێرێ ئەم دێ بەحسێ کارتێکرنا ئاینێ مەسیحیەتێ ل سەر جیهانا گریکی و ڕۆمانی کەین، هەروەکو چەوا جیهانا هێلدێ دهێتە دناڤ جیهانا مە دا و کارتێکرنێ ل مە دکەت.

مەسیح کەسەکێ جوهی بوو و جوهی ژی سەر ب کەلتورێ سامی ڤە بوون، لێ گریکی و ڕۆمانی سەر ب کەلتورێ هندو-ئەوروٚپی ڤە بوون. ژبەر هندێ کەلتورێ ئەوروٚپی دوو ڕەهوڕیشال هەنە. ل ڤێرێ ئەم دێ پیچەکێ بەحسێ هەر یەك ژ وان کەلتوران کەین بەری کو بچینە دناڤ بابەتێ کارتێکرنا مەسیحیەتێ ل سەر کەلتورێ گریکی و ڕۆمانی.

## هندو-ئەوروٚپی

زاراڤێ هندو-ئەوروٚپی، هەموو وان وەلات و کەلتوران ب خوە ڤە دگریت یێن ب زمانێ هندو-ئەوروٚپی دئاخڤن کو هەموو زمانێن ئەوروٚپی ب خوە ڤە دگریت، ب تنێ زمانێن فێنلەندی-ئوگریکی نەبن (لابونی، فێنلەندی، ئەستونی و هنگاری) و زمانێ باسکی کو ل ڕۆژئاڤایێ فرەنسا و ئیسپانیا هەنە. هەردیسان پتریا زمانێن هندێ و ئیرانێ ژی سەر ب خێزانا هندو-ئەوروٚپی ڤەنە.

بەری چوار هزار سالان، گەلێن هندو-ئەوروٚپی ل سەر کنارێن دەریا ڕەش و دەریا قەزوین دژیان، پشتی هینگێ هندەك ژ وان بەرەڤ باشورێ ڕۆژهەلاتی، ئانکو ئیرانێ و هندێ ڤە چوون. هندەك ژی بەرەڤ باشور و ڕۆژئاڤای ڤە، ئانکو یونان و ئیتالیا و ئیسپانیا ڤە چوون هەتا گەهشتینە ئەوروٚپا ناڤەڕاست و پاشی بەرەڤ ڕۆژئاڤای ڤە چوون هەتا گەهشتینە بریتانیا و فرەنسا. ل دووڤ دا ژی بەرەڤ ئەوروٚپا باکوری و باکورێ ڕۆژئاڤای و باکورێ ئەوروٚپا ڕۆژهەلاتی، ئانکو ڕۆسیا ڤە چوون.

هەر جهێ ئەڤ هندو-ئەوروٚپیە چووبانێ، دگەل کەلتورێ وی جهی تێکەل دبوون یێ بەری هینگێ ل وێرێ هەی، لێ هەر زوو زمان و کەلتورێ خوە ل سەر وان دەڤەران دسەپاند.

بۆ نموونە، نڤیسینێن ڤیداسی یێن هندی، فەلسەفەیا گریکی و ئەفسانەیێن ئەسکەندناڤی ب زمانەکێ تا ڕادەیەکی نێزیك و وەکهەڤ هاتینە نڤیسین، لێ ل ڤێرێ ب تنێ د زمانی دا د وەکهەڤ نینن بەلکو هەتا شێوازێ هزرکرنا وان ژی تا ڕادەیەکی یێ وەکهەڤە. ژبەر هندێ ئەم بەحسێ کەلتورێ هندو-ئەوروٚپی دکەین.

ئەڤ کەلتورە ب هندێ دهێتە نیاسین کو باوەری ب فرەخوداوەندان، ئانکو هژمارەکا خوداوەندان هەیە، ژبەر هندێ چەندین تێگەهـ و زاراڤێن ئاینی یێن گرنگ دناڤ کەلتورێ هندو-ئەوروپی دا دووبارە دبن. ل ڤێرێ دێ بیرا تە ل چەند نموونەیان ئینم.

هندییێن کەڤن پەرستنا خودای ئەسمانی "دیوس"ی دکر کو رامانا وی ز مانێ سانسکریتی دا ئانکو "ئەسمان"، "رۆژ" یان "بەهەشت". یونانیان دگوتە ڤی خوداوەندی "زیوس". رۆمانیان ژی دگوتێ "جوبیتیر"، ئانکو بابێ جوف یان ژی بابێ ئایوف. نەرویجیان ژی دگوتێ "تۆر". ڤان ناڤێن دیوس و زیوس و جوبیتەر و تۆر، دەربڕین ژ پەیڤەکا ب تنێ دکر.

بیرا تە دهێت کو ڤایکینگێن باکوری باوەری ب خوداوەندەکی هەبوو دگوتنێ "ئازیر". هەردیسان مە دناڤ هەموو دەڤەرێن هندو-ئەوروپی دا گوهـ ل ڤی ناڤی دبیت. بۆ نموونە، د زمانێ سانسکریتی دا، ئانکو زمانێ هندی یێ کەڤن، دبێژنە ڤی خوداوەندی "ئازورا" و ل ئیرانێ دبێژنێ "ئاهورا". هەردیسان د زمانێ سانسکریتی دا پەیڤەکا دی ب رامانا "خودا" دهێت ئەو ژی پەیڤا "دیڤا"یە، ل ئیرانێ دبێژنێ "دایڤا" و زمانێ لاتینی دا دبێژنێ "دویس" و د زمانێ نەرویجی دا دبێژنێ "تیڤۆر".

هەردیسان خەلکێ باکوری باوەری ب کومەکا خوداوەندێن پیتاندنێ هەبوو "نیورد، فری، فریا). وان ناڤەکێ تایبەت دگوتە ڤان ناڤان هەموویان، ئەو ژی ناڤێ "ڤانیر" بوو. ئەڤ ناڤە بیرا مە ل ناڤێ خوداوەندێ پیتاندنێ یێ لاتینی "ڤینوس"ی دئینیت. ل ڤێرێ زاراڤێ سانسکریتی "ڤانی" ب رامانا "خوشی" یان "حەز" دهێت.

هژمارەکا ڤەکۆلینێن هاتینە ئەنجامدان ل دور هەڤبەرکرنا هندەك ئەفسانەیێن هندو-ئەوروپی، دووپات دکەن کو نێزیکبوونەك یان مرۆڤاینیەك دناڤبەرا هەموو گۆڕەپانێن کەلتورێ هندو-ئەوروپی دا هەیە. بۆ نموونە: دەمێ "سنوور" بەحسێ خوداوەندێن نەرویجی دکەت، ئەفسانەیا وی بیرا مە ل ئەفسانەیەکا هندی دئینیت کو بۆ بەری 2000 یان 3000 سالان دزڤڕیت.

گومان تێدا نینە کو ئەفسانەیێن "سنووری" شوونتبلێن سروشتێ وەلاتێن باکوری پێڤە دیارە. د هەمان دەم دا، ئەفسانەیا هندی ژی ژ بنەکوکا سروشتێ هندێ دەرکەفتیە. لێ

هژمارەکا ڤان ئەفسانەیان هندەك خالێن هەڤپشك هەنە کو بۆ مە خویا دکەن لێکنێزیکبوونەکا باش دناڤبەرا وان دا هەیە. ئەم دشێین ب سانەهی تیبینیا ڤان خالێن هەڤپشك د ئەفسانەیێن دەستپێکی دا بکەین وەك بەحسێ ئەو ڤەخوارنا دبیتە ئەگەرێ نەمرییێ و هەڤرکیا دناڤبەرا خوداوەندێن دژی هێزێن تێکدەر دا.

هەردیسان ئەم دشێین تیبینیا هندەك خالێن هەڤپشك یێن گەلەك بەرچاڤ بکەین، بۆ نموونە، تێگەهێ گەردوونی وەك گۆڕەپانا هەڤرکیەکا بەردەوام دناڤبەرا هێزا باشیێ و هێزا خرابیێ دا. ئەڤ چەندە بوویە ئەگەر هندو-ئەورۆپی بەردەوام خەباتێ ژ بۆ زانینا پاشەروژا جیهانێ بکەن.

بێ کو ئەم بکەڤینە د شاشیان دا، ئەم دشێین خوە ژ هندێ پشتڕاست بکەین کو نە تشتەکێ ژ نیشکەکێ ڤەیە دەمێ فەلسەفەیا گریکی ل سەر ئەردێ وەلاتێ هندو-ئەورۆپی ڕۆناهیێ دبینیت، ژبەرکو ئەفسانەیا هندی و یونانی و باکوری بنگەهەکێ باش ژ بۆ هزرکرن و تیورێن فەلسەفی ئافراندیە..

هندو-ئەورۆپیان پێکۆل دکر بگەهنە وان زانیاریان یێن ل دور پێڤاژوویا جیهانێ هەین. ژبەر هندێ تێگەهێ "ڕاستی" یان "زانست" دناڤ هەموو کەلتورێن هندو-ئەورۆپی دا ب بەرچاڤێن مە دکەڤیت. د زمانێ سانسکریتی دا ئەم دبێژین "ڤیدیا-Vidya"، ئەڤ زاراڤە گەلەك وەکو زاراڤێ یونانی "ئیدوس-Eidos"ی ئانکو "بیرۆکە"یە، هەلبەت ئەڤە ئەو زاراڤە یێ ڕۆلەکێ گرنگ و مەزن د فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی دا هەی.

د زمانێ لاتینی دا، ل هەمبەری وێ مە زاراڤێ "ڤیدیو-Video" هەیە و ئەڤ زاراڤە ل هەموو دەڤەرێن ڕۆمانی دا ب ڕامانا "ئەز دبینم" دهێت. د زمانێ ئینگلیزیێ ژی دا مە زاراڤێ "وایز-Wise" یان ژی "ویزدوم-Wisdom" هەیە ئانکو "پەندیاری"، د زمانێ ئەڵمانی ژی زاراڤێ "ویزن-Wisswn" ئانکو "دزانیت" هەیە. ژلایەکێ دی ڤە، ڕهوڕیشالێن زاراڤێ "ڤیتن-Viten" یێ نەڕویجی هەمان ڕهوڕیشالێن زاراڤێ ڤیدیا یا هندی و ئیدوسا گریکی و ڤیدویا لاتینی هەیە.

ب شێوەیەکێ گشتی، ئەم دشێین تیبینیا هندێ بکەین کو "دیتن" گرنگترین هەست بوو د کەلتورێ هندو-ئەورۆپیان دا. ژبەر هندێ ئەدەبێ هندی و یونانی و ئیرانی و

جێرمانیان ب دیتنەکا ئەسمانی یا مەزن هەبوو "دێ دووبارە کەم کو زاراڤێ دیتن ب خواندنا Vision، ڕەنگە ژ پەیڤا لاتینی Video هات بیت".

مورکەکێ دی یێ کەلتورێن هندو-ئەوروپیان پێ دهێنە جوداکرن ئەوە چیرۆکێن خوداوەندێن وان ب ڕێکا ئەفسانەیان ژ بەرەبابکەکی بۆ یێن ل دووڤ دا هاتینە ڤەگوهاستن.

ل دوماهیێ ژی، هندو-ئەوروپیان تێگەهەکێ خولی "بازنەی"* ژ بۆ دیرۆکێ هەبوو، ئانکو جۆرە تێگەهشتنەکا دیرۆکی د خولەکێ دا بزڤڕیت، هەروەکو کا چەوا وەرزێن سالێ ل دووڤ هەڤدوو دهێن، ب تێگەهێ وان، ئاها ب ڤی شێوەی دیرۆکێ ژی نە دەستپێك و نە دوماهیك هەیە بەلکو چەندین جیهانێن جودا جودا هەنە کو بەردەوام دناڤ بازنەیا هەتا هەتایی یا مرن و ژیانێ دا ژ دایکدبن و بەرزە دبن.

بنیاتێ هەردوو ئاینێن ڕۆژهەلاتی یێن مەزن، بودی و هندوسی، بۆ کەلتورێ هندو-ئەوروپی دزڤڕیت. ئەم دشێن هەمان تشت بۆ فەلسەفەیا گریکی ژی بێژین. ئەڤ چەندە دەلیڤەیێ ددەتە مە هندەك خالێن هەڤپشك دناڤبەرا ڤان هەردوو ئاینێن ناڤبڕی ل لایەکی و فەلسەفەیا گریکی ل لایەکێ دی ئاشکەرا بکەین. هەتا سەردەمێ ئەڤرۆکە ژی، ساخلەتەکا فەلسەفی دناڤ هەردوو ئاینێن بودی و هندوسی دا هەیە.

د ئاینێن بودی و هندوسی دا، گەلەك جاران تەکەزێ ل سەر هەبوونا خودای د هەموو تشتێن دەوروبەر دا دکەن، زێدەباری شیانێن بەردەست بۆ مرۆڤی داکو ب ڕێکا زانینا ئاینی یەکگرتنێ دگەل خودای بکەت "سۆفیا، بیرا خوە ل ئەفلۆتینی بینە!".

ئاها هۆسا مرۆڤ دشێت بگەهیتە خودای، ئانکو ب ڕێکا زڤڕینێ بۆ ناخێ خوە، یان ب ڕێکا هزرکرنێ یان خلوەتکرنێ. ب ڤی ڕەنگی، هەلویستەکێ نەرێنی و خوپارێز و ڤەدەر و وێنەیەکێ ئاینی یێ ڕۆژهەلاتی نیشان ددەت.

* مەرەما وان ژ دیتنا خولی بۆ دیرۆکێ ئەوە کو ژیان وەکو هێلەکا راست ژ خالەکێ دەستپێناکەت و ل خالەکا دی ب دوماهی بهێت، هەروەکو کا چەوا دەمێ هەر چوار وەرزێن سالێ ب دوماهی دهێت، سەر و ژ نوو سالەکا نوو ب چوار وەرزێن دی دەست پێدکەت، بەلکو دیرۆك بەردەوام ل خالەکێ ب دوماهی دهێت و سەر و ژ نوو ژیانەکا دی و جیهانەکا دی دەست پێدکەت.

هەردیسان ل دەڤ گریکیان ژی، ئەو د وێ باوەرێ دا بوون کو پێدڤیە مرۆڤ یێ ڤەدەر بیت و خوە ژ خەلکی دوور بکەت داکو ڕۆحا وی د ئاشتی و تەناهیێ دا بمینیت. بنیاتێ بیرۆکەیێن ب ڤی ڕەنگی بۆ جیهانا فەلسەفی یا گریکی و ڕۆمانی دزڤڕن. هەمان بیرۆکە ل دەڤ هژمارەکا ڤەشەیان ل چەرخێن ناڤەڕاست هەبوون.

هەردیسان د هندەك کەلتورێن هندو-ئەورۆپی دا، ئەم دبینین کو وان باوەری ب دووبارە زیندیبوونا ڕۆحا مرۆڤان هەیە. بۆ ماوەیێ پتر ژ 2500 سالان، ئارمانجا ژیانێ ل دەڤ تاکەکەسێن دناڤ ڤی کەلتوری دا ئەو بوو کا دێ چەوا خوە ژ دووبارە زیندیبوونێ ئازاد کەت. بەری نوکە مە دیت کو ئەفلاتۆنی ژی باوەری ب دووبارە زیندیبوونێ هەبوو.

## سامی

نوکە دێ بەحسێ مللەتێن سامی کەین، سۆفیا. ئەڤ مللەتە سەر ب کەلتور و زمانەکێ جودا ڤەنە. بنیاتێ سامیان ژ نیمچە گزیرتا عەرەبی هاتیە، لێ پشتی هینگێ ل گەلەك دەڤەرێن دی یێن جیهانێ بەربەلاڤبووینە. خەلکێ جوهی بۆ ماوەیێ پتر ژ دوو هزار سالان ل دووری وەلاتێ خوە ژیاینە. دیرۆك و ئاینێ سامیان دوور ژ ڕهوڕیشالێن خوە یێن جوگرافی ب ڕێکا ئاینێ مەسیحی بەربەلاڤبوویە. هەردیسان کەلتورێ سامی ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ ب ڕێکا ئاینێ ئیسلامێ بەربەلاڤبوویە.

هەرسێ ئاینێن کارتێکرنەکا مەزن ل سەر ڕۆژئاڤای کری، جوهیاتی و مەسیحی و ئیسلام. کو هەموویان ژی بنیاتەکێ سامی یێ هەڤپشك هەیە. بۆ نموونە، پەڕتووکا پیروز یا موسلمانان کو قورئانە و پەیمانا کەڤن "تەوڕات" یا جوهیان ب دوو زمانێن سامی یێن لێکنێزیك هاتینە نڤیسین. یەك ژ ناڤێن خودای د پەیمانا کەڤن دا هاتی، هەمان ڕهوڕیشالێن پەیڤا "الله" یا موسلمانان هەیە.

دەربارەی ئاینێ مەسیحیەتێ ژی، هۆسا دیارە بابەت پیچەکێ ئالۆزترە. گومان تێدا نینە کو بنیاتێ ڤی ئاینی ژی هەر سامیە، لێ پەیمانا نوو "ئینجیل" ب زمانێ یونانی هاتیە نڤیسین. زێدەباری هندێ کو لاهوت و بیروباوەرێن مەسیحی پێشکەفتینە و ل دووڤ دا ب

زمانێن گریکی و لاتینی داخبار بووینه، هەر ژ فەلسەفەیا قۆناغا هیلینیزمێ هەتا قۆناغێن ل پشتی هینگێ.

هەروەکو بەری نوکە مە گوتی، هندو-ئەورۆپیان پەرستنا گەلەك خوداوەندان دکر، لێ سامیان هەر ژ دەستپێکێ پەرستنا خودایەکێ ب تنێ کریە. دبێژنە ڤێ چەندێ "یەکتاپەرستی*". چ د ئاینێ یەهودیان دا، یان ژی مەسیحی و ئیسلامێ دا، بیرۆکەیا سەرەکی ل دەڤ هەموویان ئەوە کو ب تنێ یەك خودا هەیە.

یەك ژ ساخلەتێن دی یێن سامیان ئەوە دیرۆکێ ب هێلەکا ڕاست دبینن. ئانکو دەمێ خودای جیهان ئافراندی، وێ هێلێ دەستپێکریە و ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ئەڤ هێلا ڕاست دێ گەهیتە دوماهیێ کو ئەو ڕۆژ ژی دێ بیتە ڕۆژا "لێپرسینێ" کو خودا دێ تێدا لێپرسینێ دگەل مرۆڤان کەت پشتی ژ مرنێ ڕادبنەڤە.

ئەو ڕۆلێ دیرۆك دگێڕیت، ساخلەتەکا سامی یا هەڤپشکە ل دەڤ هەرسێ ئاینێن یەکتاپەرست. ئانکو خودا مایێ خوە د دیرۆکێ دا دکەت و کونترۆلێ ل سەر دکەت. ئانکو ڕۆهنتر بێژین، دیرۆك ژبەر هندێ هەیە داکو خودا تێدا حەزا خوە بجهـ بینیت و مرۆڤان بەرەڤ ڕۆژا دوماهیێ ببەت داکو لێپرسینێ دگەل وان بکەت کو ل ڤێ ڕۆژێ ب تنێ هەموو خرابیێن دنیایێ ژناڤ دچن.

ژبەرکو خودا مایێ خوە د پێڤاژوویا دیرۆکێ دا دکەت، گەلێن سامی ب درێژاهیا هزاران سالان گرنگیەکا مەزن دایە نڤیسینا دیرۆکێ. ئەڤ ڕهوڕیشالێن دیرۆکێ، ناڤەرۆکا ڕاستەڤینە یا پەرتووکێن وان یێن ئاینی یە.

ئەڤرۆکە، باژێرێ قودس "ئورشەلیم" سەنتەرەکێ ئاینی یێ گرنگە بۆ جوهی و مەسیحی و موسلمانان. ئەڤ چەندە ژی بەلگەیە ل سەر لێکنێزیکبوونەکا دیرۆکی دناڤبەرا ڤان هەرسێ ئاینان دا.

ل ڤی باژێری هژمارەکا پەرستگەهێن جوهیان و دێرێن مەسیحیان و مزگەفتێن موسلمانان لێ هەنە کو جهێن پەرستنێ یێن هەرسێ ئاینانە لێ مخابن بوویە جهێ

* یەکتاپەرستی Monotheism. ب زمانێ عەرەبی ژی دبێژنێ "التوحید".

هەڤرکیێن شەڕی و ب هزاران خەلکێ بێگونەهـ ژ هەردوو لایان هاتینە کوشتن. دبیت ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان نەتەوەییێن یەکگرتی بشێن دووبارە ئاشتی و تەناهیێ ل باژێرێ قودسێ پەیدا بکەن و دووبارە وی باژێری بکەنە جهێ پێکڤە ژیانا هەرسێ ئاینان. "نوکە ئەم دێ بەحسکرنا ڤی بەشێ پڕاکتیکی یا وانەیا فەلسەفی دەینە ڕەخەکی، چونکی بابێ هێلدێ دێ ب ڤی ڕولی ڕابیت، چ پێنەڤێت تو دزانی کو ئەو چاڤدێرەکێ نەتەوەییێن یەکگرتی یە ل لوبنانێ ب پلەیا مایجەر. ئەز بێژم هێدی هێدی تو یا تێدگەهی. لێ ژلایەکێ دی ڤە من نەڤێت لەزێ ل ڕووداںان بکەم."

بەری نوکە ژی مە گوتبوو، هەستا گرنگ ل دەڤ هندو-ئەورۆپیان، دیتن بوو. لێ تشتەکێ بالکێشە کو هەستا گوهلێبوونێ ڕۆلەکێ گرنگ و سەرەکی هەیە ل دەڤ سامیان. ژبەر ڤێ چەندێ نە تشتەکێ ژ نیشکەکێ ڤەیە کو باوەری ئینان ب ئاینێ جوهیاتیێ ب ڤێ ڕستێ دەستپێبکەت: "گوهێ خوە بدێ ئیسرائیل!". د پەیمانا کەڤن دا، خەلکی گوهداریا ئاخفتنێن خودای دکر. پێغەمبەرێن جوهیان ژی پەیاما خوە یا پێغەمبەرینیێ ب ڤێ ڕستێ دەستپێدکر: "ب ڤی ڕەنگی یەهوەی* گوت".

هەردیسان ئاینێ مەسیحیەتێ ژی گرنگیەکا مەزن ب گوهدانێ دایە ب تایبەت گوهداریکرنا ئاخفتنێن خودای. زێدەباری ڤێ چەندێ، د ڕێوڕەسمێن ئاینی یێن ڤان هەرسێ ئاینان دا، تێکستێن ئاینی ب دەنگەکێ بلند دهێنە خواندن کو دبێژنێ "تیلاوە".

بەری نوکە من بەحسێ وان پەیکەر و وێنەیان کر یێن مللەتێن هندو-ئەورۆپی بۆ خوداوەندێن خوە دروستکرین، لێ یەك ژ ساخلەتێن هەرە گرنگ ل دەڤ سامیان ئەوە ب هەمموو ڕەنگان دروستکرنا پەیکەران بۆ خودای تشتەکێ قەدەغەیە، ئانکو تشتەکێ قەدەغەیە پەیکەرەك بۆ خودای یان هەر تشتەکێ پەیوەندی ب خودای ڤە هەی بهێتە دروستکرن.

د پەیمانا کەڤن دا، تشتەکێ حەڕام بوو ئەگەر خەلکی پەیکەر ل سەر شێوێ خودای دروستکربان. هەتا سەردەمێ ئەڤرۆکە ژی ئەڤ چەندە د ئاینێ جوهیاتی و ئیسلامێ دا قەدەغەیە. هەتا د ئاینێ ئیسلامێ دا، ب شێوەیەکێ گشتی هوشداریەکا مەزن هەیە ل

* "یەهوە" یەك ژ ناڤێن خودایە د پەیمانا کەڤن دا.

گرتنا وێنەییێن فوتوگرافی و هونەرێن پلاستیکی. مەرەم ژ حەرامکرنا ڤان تشتان ئەوە کو چێنابیت مرۆڤ هەڤرکیا خودای بکەت و هندەك تشتان بئافرینیت.

لێ دێرێن مەسیحی نابنە رێگر ل هەمبەر وێنە و پەیکەرێن دەربرینێ ژ خودای و حەزرەتێ مەسیحی دکەن. رەنگە نوکە تو بێژی کو دێرێن مەسیحان دپرن ژ ڤان جۆرە پەیکەران، بەلێ تو راست دبێژی، هەلبەت ئەڤ چەندە ژی نموونەیەکە ل سەر کارتێکرنا جیهانا گریکی و رۆمانی ل سەر ئاینێ مەسیحی "ل دێرێن ئارتودوکسی، ئانکو ل یونان و رۆسیایێ، هەتا نوکە ژی کێشانا وێنەیان و دروستکرنا پەیکەران بۆ کەسایەتیێن دناڤ چیرۆکێن ئینجیلیێ دا تشتەکێ حەرام و قەدەغەیە".

بەروڤاژی ئاینێن دی یێن رۆژهەلاتی، ئەڤ هەرسێ ئاینە داکوکیێ ل سەر هەبوونا ڤالآهیەکێ دناڤبەرا خودێ و ئافراندیێن وی دا دکەن. هەردیسان ئارمانجا وان د ژیانێ دا ئەو نینە رۆحا خوە ژ دووبارە زیندیبوونێ قورتال بکەن، بەلکو ئارمانجا وان یا سەرەکی خوە پاقژکرنە ژ گونەهان. هەردیسان تشتێ گرنگ د ژیانا وان یا ئاینی دا، نڤێژ و شیرەت و خواندنا پەرتووکێن خوە یێن ئەسمانی یە پتر ژ هندێ بچنە د خلوەت و هزرکرنێ دا.

## ئیسرائیل

سۆفیایا خوشتڤی، من نەڤێت هەڤرکیێ دگەل مامۆستایێ تە یێ ئاینیێ بکەم، لێ من دڤێت پۆختەیەکی ل دور ئاینێ جوهیاتیێ بۆ تە بەحس بکەم.

هەموو تشت دگەل ئافراندنا جیهانێ ژ لایێ خودای ڤە دەست پێدکەن، تو دشێی ل بەرپەرێن دەستپێکێ یێن ئینجیلێ ل دور چەوانیا ئافراندنا جیهانێ بخوینی. لێ مرۆڤ ژ رێکا خودای دەرکەفتن و گوهداریا وی نەکر. ژبەر هندێ خودای ئەو سزادان. ل دەستپێکێ ئادەم و حەوا ژ بەهەشتێ کرنە دەرێ و پاشی ل سەر روویێ ئەردی ژی مرن پەیداکر.

یاخیبوونا مرۆڤان ژ گوهداریکرنا خودای وەکو هێلەکا سۆر ب درێژاهیا تەوڕاتێ دا دهێتە دیتن. ئەگەر تەماشەی سەفەرا "ئافراندن*" ێ بکەین، دێ بینین کو ب درێژاهی بەحسێ چیرۆکا نوحی و تۆفانێ کریە.

پاشی خودا پەیمانەکێ دگەل ئیبراهیم و نەژادێ وی گرێددەت. ئەڤ پەیمانە یان رێکەفتنە ل سەر هندێ بوو کو ئیبراهیم و نەژادێ خوە پەیاما خودای بپارێزن و خودای ژی ل بەرامبەر سوز دایێ زارۆکێن ئیبراهیمی بپارێزیت. پاشی جارەکا دی ئەڤ پەیمانە دگەل موسای ل سەر چیایێ سینا ل سالا 1200ی بەری زاینی دووبارە هاتە نووکرن. ل وی دەمی مللەتێ ئیسرائیلێ وەکو بەندەیان ل مسرێ هاتبوونە ئێخسیرکرن و پاشی ب هاریکاریا خودای زڤڕینە وەلاتێ خوە ئیسرائیلێ.

ل سالا 1000ێ بەری زاینی، ئانکو بەری فەیلەسۆفێن گریکی پەیداببن، تەوڕات بەحسێ سێ شاهێن ئیسرائیلێ دکەت کو ئەو ژی شاوول و داود و سولەیمان بوون. ل وی سەردەمی، مللەتێ ئیسرائیلێ هەموو ل ژێر ئالایێ شاهـ داودی خڕڤەبوون، ژبەر هندێ ژ لایێ سیاسی و لەشکەری ڤە وەك سەردەمەکێ زێڕین دهێتە نیاسین.

دەمێ شاهەك بۆ جوهیان دهاتە هەلبژارتن، پێدڤی بوو خەلکی سوز و پەیمان دابانێ کو گوهداریا وی بکەن. ب ڤی ڕەنگی وان ناسناڤێ "مەسیح" ئانکو کاهن یان ژی شاهـ ددایێ. ل سەر ئاستێ ئاینی ژی، شاهێ وەلاتی وەکو پێغەمبەرەکێ ژ دەڤ خودای دهاتە ل قەلەمدان، ژبەر هندێ وان ناسناڤێ "کورێ خودای" ددا شاهی و ناسناڤێ "شاهنشینا خودای" ددانا سەر وەلاتێ خوە.

لێ شاهنشینا ئیسرائیلێ گەلەك نەڤەکێشا، بەلکو هەر زوو لاواز بوو و هاتە دابەشکرن ل سەر شاهنشینا باکوری "ئیسرائیل" و شاهنشینا باشوری "یەهودا".

ل سالا (772 ب.ز) ئاشوریان شاهنشینا باکوری داگیرکر، ژبەر هندێ ئێدی ڤێ شاهنشینێ کاریگەریا خوە یا سیاسی و ئاینی ژ دەست دا. ڕەوشا شاهنشینا باشوری ژ یا باکوری یا باشتر نەبوو، چونکی ئەو ژی ل سالا (586 ب.ز) ژ لایێ بابلیان ڤە هاتە

* سەفەرا ئافراندنێ Book of Genesis کو ب زمانێ عەرەبی دبێژنێ "سفر التكوين"، بەشەکێ پەڕتووکا تەوڕاتێ یە کو تێدا بەحسێ چەوانیا ئافراندنا مرۆڤان و گەردوونی دکەت.

داگیرکرن. بابلیان پتریا ئاڤاهیێن ڤێ شاهنشینێ هەرفاندن و هژمارەکا مەزن ژ خەلکێ وێ وەك ئێخسیر ئینانە باژێرێ بابل. ئەڤ ئێخسیرکرنە هەتا سالا (539 ب.ز) یا بەردەوام بوو هەتا جارەکا دی دووبارە جوهی زڤرینە قودسێ و سەر و ژ نوو باژێر ئاڤاکری. لێ هەتا دەستپێکا هاتنا ئاینێ مەسیحیەتێ ژی هێشتا ل بن کونترۆلا هێزێن بیانی دژیان.

ژبەر ڤێ چەندێ جوهیان پرسیار دەربارەی ئەگەرێن کەفتنا شاهنشینا داودی ژ خوە کر، ئەڤ کەفتنا بوویە ئەگەر چەندین نەخوشی و کارەساتێن مەزن ل دووڤ دا ب سەرێ مللەتێ جوهی هاتین، ئەڤە سەرەرای هندێ کو خودای سوز دابوو مللەتێ جوهی بپارێزیت. بەرسڤا ڤێ پرسیارێ ژی ئەو بوو کو جوهیان سوزدابوو خودای گوهداریا وی بکەن، لێ دەمێ ئەو ژ فەرمانا وی دەرکەفتین و گوهداریا وی نەکری، خودای ئەو سزادان.

ل دەوروبەرێن سالا (570 ب.ز) هژمارەکا پێغەمبەران دناڤ مللەتێ ئیسرائیلێ دا دەرکەفتن و هەمویان بانگەوازا تۆرەبوونا خودای هەلگرتبوو و پێشبینیا سزادانا ئیسرائیلێ دکر، چونکی ئێدی گوهداریا وان شیرەتان نەدکر یێن خودای بۆ وان دەستنیشان کرین. ڤان پێغەمبەران پێشبینیا هاتنا رۆژەکێ ددا خەلکی کو خودا دێ لێپرسینێ دگەل ئیسرائیلێ کەت. دبێژنە ڤان پێشبینیان "پێشبینیێن لێپرسینێ".

هەردیسان هندەك پێغەمبەرێن دی ژی بانگەوازا هندێ دکر کو دێ خودا بەشەکی ژ ڤی مللەتی قورتال کەت و دێ "میرەکێ ئاشتیێ" بۆ وان فرێکەت، ئانکو دێ پاشایەکێ ئاشتیخواز ژ نەژادێ داودی بۆ وان فرێکەت. ئەڤ شاهە دێ دووبارە شاهنشینا داودی ئاڤا کەت و خەلکێ وێ دێ پاشەرۆژەکا گەش هەبیت.

دا باشتر خوە تێبگەهینین: مللەتێ عبری ل ژێر دەستهەلاتا داودی ب ئاشتی و بەختەوەری دژیان، پشتی ژیانا وان رۆژ بۆ رۆژێ خراپتر لێ دهاتی، ئێدی ئەو پێغەمبەرێن دهاتین بانگەوازا هندێ دکر کو ل دەمەکێ نێزیك دێ پاشایەکێ نوو ژ نەژادێ داودی ژ دایك بیت. ئەڤ پاشایێ نوو دێ خەلکی ژ بندەستیێ رزگار کەت و دووبارە سەربلنداهیا ئیسرائیلێ زڤریت و شاهنشینا خودای ئاڤا کەتەڤە.

# عیسا

باشه، سۆفیا. هیڤیا من ئەوە تە پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدابیت و هێشتا دگەل من بی. پەیڤێن سەرەکی یێن بابەتی پێکدهێن ژ "مەسیح"، "کورێ خودای"، "ئاشتی"، "شاهنشینا خودای"... ل دەستپێکێ ئەڤ پەیڤە هەموو بۆ بابەتێن سیاسی دهاتنە بکارئینان کو ل وی سەردەمی خەلکی هزر دکر مەسیحەکێ نوو وەك سەرکردەیەکێ سیاسی و لەشکەری و ئاینی دێ دەرکەڤیت و دێ ل ئاستێ شاهـ داودی بیت. ئانکو ئەڤ ڕزگارکەرێ نوو وەکو قارەمانەکێ نەتەوەی بوو ئەوێ دێ سنوورەکی بۆ ئەشکەنجەدانا جوهیان ژ لایێ ڕۆمانیان ڤە دانیت.

لێ هندەك کەسێن دی پێشبینیەکا گەلەك مەزنتر ژ ڤێ چەندێ دکر. بەری هاتنا حەزرەتێ مەسیحی ب چەندین چەرخان، هندەم پێغەمبەرێن دی بانگەوازا هندێ دکر کو مەسیحێ چاڤەڕێکری دێ بیتە ڕزگاکەرێ تەڤ جیهانێ، ئانکو ئەو نە ب تنێ دێ ئیسرائیلیان ژبن دەستهەلاتا بیانیان قورتال کەت، بەلکو ئەو دێ گشت مرۆڤان ژ گونەهـ و شاشیێن وان قورتال کەت. هیڤیا پەیدابوونا کەسەکێ هۆسا دناڤ جیهانا هیلینیزمێ ژی دا بەلاڤ بوو.

مەسیح دەرکەفت، لێ ئەو نە ب تنێ وەك مەسیحێ چاڤەڕێکری دەرکەفت، بەلکو دەربڕینێن "مەسیح"، "کورێ خودای"، "شاهنشینا خودای"، "ئاشتی" ژی بکاردئینان و خوە ل دووڤ وان پێشبینیان دیار دکر یێن بەری هینگێ ل دور وی دهاتنە گوتن.

ئەو هاتە دناڤ ئورشەلیمێ دا، خەلکی ژی وەك ڕزگارکەر پێشوازیا وی کر. ئەو ژی ل دووڤ هەمان ڕێکا شاهێن بەری هینگێ چوو دەمێ دچووینە سەر کورسیکا خوە یا دەستهەلاتێ. خەلکی پیرۆزباهی لێکرن و گوت: "نوکە دەم هات، شاهنشینا ئەسمانان یا نێزیکە."

دڤێت ئەڤ چەندە هەموو ل بیرا مە بن، لێ نوکە باش گوهێ خوە بدە ئەڤا مایی: عیسایێ ناسرِیە ژ هەموو وان بانگەشەیێن بەری هینگێ ب هندێ دهاتە جوداکرن کو ئەو نە سەرکردەیەکێ سیاسی و لەشکەری بوو، بەلکو وی پەیامەکا مەزن و بەرفرەهتر دگەل خوە ئینابوو، وی بەحسێ ڕزگاکرن و لێبورینا خودای بۆ مرۆڤان دکر. ژبەر هندێ ئەو دناڤ خەلکی دا دهات و چوو و دگوتێ: "تو ژ گونەهێن خوە هاتیە شووشتن".

دەمێ پێغەمبەرەك ب ڤی ڕەنگی ل گونەهێن خەلكی دبوریت، ب ڕاستی تشتەكێ نوو و ب مەترسی بوو، بەلكو تشتەكێ خراپتر ژی هەبوو، وی ب ناڤێ "باب" گازی خودای دكر. دناڤ جڤاكێ جوهیان دا كەسێ بەری نوكە گوهـ ل تشتەكێ هۆسا نەبوو. ژبەر هندێ گەلەك كەس دژی وی ڕاوەستیان و ئەو دوورپێچ كر، ب تایبەت تەخا نڤیسەرێن تەوراتێ.

ئەگەر ڕۆهنتر بێژین، گەلەك كەسێن ل سەردەمێ مەسیحی دژیاین، ل هیڤیا هندێ بوون ڕزگاركەرەك بهێت و ب هێزێ دووبارە "شاهنشینا خودای" ئاڤا بكەت. لێ مەسیح هات و ب شێوەیەكێ جودا و بەرفرەهتر دەربڕین ژ ڤێ شاهنشینێ كر. عیسای دیاركر كو شاهنشینا خودای ئەوە تو حەز ژ كەسوكار و جیرانێن خوە بكەی، دلوڤانیێ ب هەژار و دەستكورتان ببەی، ل وان كەسان ببوری یێن شاشی و گونەهـ كرین.

ب ڤی ڕەنگی، ئەو دەربڕینا كەڤن یا نیمچە سیاسی، ڕامانەكا جودا وەرگرت. خەلك چاڤەڕێی هاتنا زەلامەكێ سەركردە بوون كو شاهنشینا خودای ڕابگەهینیت، لێ مەسیح ب ڕێكا پێلاڤێن خوە یێن سادە دەركەفت و بۆ وان ڕاگەهاند كو شاهنشینا خودای "پەیمانەكا دی" یا نوویە و ناڤەرۆكا وێ ئەوە "دڤێت تو حەز ژ جیرانێ خوە بكەی كا چەند تو حەز ژ خوە دكەی".

پشتی هینگێ ئەو ژ ڤێ چەندێ دوورتر ژی چوو. وی گوت پێدڤیە ئەم ل دوژمنێن خوە ببورین یێن زیان گەهاندیە مە. ئەگەر كەسەكی شەقەك ل ڕوویێ مە یێ ڕاستێ دا، ئەم ژی لێ بزڤڕینین؟ هەلبەت نەخێر، بەلكو بەرێ ڕوویێ خوە یێ چەپێ ژی بدەینێ. ل سەر مە نە یا پێدڤیە ب تنێ حەفت جاران ل دوژمنێ خوە ببورین، بەلكو یا پێدڤیە حەفتێ جاران ل وی ببورینن.

ژ ژیانا عیسای بۆ مە دیار دبیت كو وی چ ڕێگری نەبوون ئەگەر دگەل ژنێن لەشفرۆش، گومركچیێن گەندەل و زەلامێن سیاسی یێن دوژمنێن وەلاتی ژی باخڤیت. وی پتر ژ ڤێ چەندێ دكر و دگوت: "كورەكێ خراب كو پارێ بابێ خوە هەموو ل خرابیان مەزاخت بیت، یان ژی گومركچیەكێ گەندەل دشێت ل دەڤ خودای توبە بكەت و ببیتە كەسەكێ باش ئەگەر هات و خرابیێن خوە هێلان و داخوازا گونەهژێبرنێ ژ خودای كر. هندی خودایە، یێ دلوڤان و مەردە."

هەردیسان عیسای دگوت ئەڤ "گونەهکارە" ل دەڤ خودای ب قەدرترن و ژ هەژی دلوڤانیا وی نە، پتر ژ وان فەڕاسیێن* دووڕوو "منافق" یێن شانازییێ ب خوە دبەن ل دەمەکی کو ئەو سەرڤە خوە ب کەسێن باوەردار ددەنە دیارکرن و د دل دا دوژمناتیا مەسیحی دکەن.

مەسیحی داکۆکی ل سەر هندێ دکر کو نابیت کەس ژ مە خوە ژ دلوڤانیا خودای بێ منەت بکەت چونکی ئەم مرۆڤ نەشێین خوە قورتال بکەین "ل وی دەمی گەلەك کەسێن گریکی هزر دکر دشێن خوە ڕزگار بکەن".

دەمێ مەسیحی مەرجێن خوە ل خوتبەتا "شیرەتێن چیای" بۆ خەلکی دیار کرین، مەرەما وی ئەو نەبوو کو ب تنێ حەزا خودای بۆ مە دیار بکەت، بەلکو وی دڤیا دووپات بکەت کو چ مرۆڤ ل دەڤ خودای د تەمام و بێگونەه نینن، لێ دلوڤانیا خودای ژی یا بێسنوورە و هەر کەسێ ب ڕێکا نڤێژ و دوعایان ڤە بەرەڤ وی ڤە بچیت و داخوازا گونەهژێبرنێ بکەت، خودا وی ژ دلوڤانیا خوە بێبەهر ناکەت.

دەربارەی کەسایەتیا عیسای و ئارمانجا پەیاما وی، ئەز دێ ڤی بابەتی بۆ مامۆستاییێ تە یێ دیرۆکا ئاینان هێلم، چونکی ئەڤە کارەکێ ب زەحمەتە و هیڤیا من ئەوە ئەو بشێت ب بەلگە بۆ تە دووپات بکەت کا ئەو تا چ ڕادە کەسەکێ بیلمەت بوو؟

عیسای وەکو کەسەکێ شاهرەزا و بلیمەت زمانێ سەردەمێ خوە بکاردئینا ژ بۆ گەهاندنا پەیاما خوە. د هەمان دەم دا، وی ڕامانەکا کوورتر و بەرفرەهتر و جوداتر ددا پەیڤ و دەربرینێن بەربەلاڤ و ناڤدار یێن وی سەردەمی. ژبەر هندێ نە جهێ حێبەتییێ یە کو دوماهیا وی بگەهیتە خاچدانێ نەخاسم کو پەیاما وی ب شێوەیەکێ تەمام یا هەڤدژ بوو دگەل بەرژەوەندیێن و تەخا زاڵ و دەستهەلاتدار هەتا بوویە ئەگەر دژی وی براوەستن و ژناڤ ببەن.

دەمێ مە بەحسێ سۆکراتی دکری، ئەم شیاین تێبینیا هندێ بکەین کا چەند تشتەکێ ب مەترسی یە ئەگەر پەنایێ بۆ ئەقلێ مرۆڤی ببەین. دەربارەی مەسیحی ژی، وی

* فەڕاسی Pharisees بەرەیەکێ سیاسی یێ جوهی یێن کەڤن بوو ل سالا 167 بەری زاینی هەتا 73 پشتی زاینی پەیدابببوون و باوەریەکا توند ب یاسا و ڕێسایێن ئاینی یێن کەڤن هەبوو.

خالّەكا دی نیشا مە دا. جهێ مەترسیێ یە ئەگەر داخوازا ڤیانەكا بێ مەرج و بەخشینەكا بێ مەرج بكەی.

ل سەر دەمێ مە یێ ئەڤرۆكە دا، دێ بینین وەلاتەكێ زەنگین پتر تەنگاڤ دبیت دەمێ هندەك كەسێن دی وەك پەنابەر دچنە وی وەلاتی و هندەك داخوازیێن سادە ژێ دكەن وەك ئاشتی و ڤیان و خوارن بۆ هەموویان و لێبورین دگەل هەڤركێن دەستهەلاتداران.

بیرا تە دهێت كا ئەفلاتۆن چەند تۆڕە بوو دەمێ سۆكراتی ژیانا خوە كریە قوربان، چونكی ئەو باشترین زەلام بوو ل ئەسینایێ. ل دووڤ بیروباوەرێن مەسیحیان ژی، مەسیح ژی باشترین زەلامە ل سەر ڕوویێ ئەردی، سەرەڕای ڤێ چەندێ، لێ ئەو ژی هاتە سێدارەدان و ژیانا خوە ژ پێخەمەت مرۆڤایەتیێ كرە قوربان. ئەم دبێژنە ڤێ چەندێ "ئازارێن مەسیحی ژ پێخەمەت مرۆڤایەتیێ". ڤی "خزمەتكارێ ئازار كێش" خوە ژ پێش مەڤە كرە قوربان داكو ئەم ژ سزایێ خودای ڕزگار ببین.

## ڤەشە پۆلس

پشتی بورینا چەندین ڕۆژان ل سەر خاچدانا مەسیحی و ڤەشارتنا وی، گوتگوتكەك دناڤ خەلكی دا بەلاڤ بوو كو ئەو دووبارە یێ زیندی بوویەڤە و چوویە ئەسمانان. ڤێ جارێ سەروبەرێ وی نە وەكو یێ كەسەكێ ئاسای بوو، هۆسا دیارە ئەو ژ ڕاستا "كورێ خودای" یە.

ئەم دشێین بێژین كو ل سپێدەهیەكا جەژنا ڕابوونێ "جەژنا ئیستەرێ"، دێرا مەسیحی گوتگوتكا زیندیبوونا مەسیحی دناڤ خەلكی دا بەلاڤ كر. ل وی دەمی پۆلسی گوت: "ئەگەر مەسیح زیندی نەبایە، پەیاما مە دا یا نەڕەوا بیت و باوەریا مە ژی نەدما." ژ هینگێ وەرە هیڤیا "دووبارە زیندیبوونا لەشی" ل دەڤ خەلكی پەیدابوو ب تایبەت پشتی وان زانی مەسیح ژبەر گونەهێن وان هاتە خاچدان.

ل ڤێرێ، پێدڤیە ل بیرا تەبیت سۆفیایا خوشتڤی کو جوهیان چ پرسیار دەربارەی نەمریا ڕۆحێ و ژیانا هەتا هەتایی یان هەر جۆرەك ژ جۆرێن دووبارە زیندیبوونێ نەبوون، بەلکو ئەڤ بیرۆکەیە یێن گریکی و هندو-ئەوروپی بوون.

لێ ل گورەی ئاینێ مەسیحیەتێ، چ تشت دناڤ لەشێ مرۆڤی دا، بۆ نموونە ڕۆحا وی، ب دروستاهی د نەمر نینن. ڕاستە دێرێ باوەری ب دووبارە "زیندیبوونا لەشی" و "ژیانا هەتا هەتایی" هەیە، لێ موعجیزەیەکا خودای هەیە کو مە ژ مرنێ و عەزابا هەتا هەتایی ڕزگار دکەت بێ کو د شیانێن مە یێن تاکەکەسی دا هەبیت خوە قورتال بکەین یان ب شێوەیەکێ زکماکی بەرهەڤیەك بۆ قورتالبوونێ ل دەڤ مە هەبیت.

ل دەستپێکێ، بەلاڤکرنا پەیاما ئاینێ مەسیحیەتێ ژ لایێ مەسیحیان ب بەلاڤکرنا "پەیاما باشیێ" دەستپێکر کو وان سوز ددا خەلکی ئەگەر باوەریێ ب حەرزەتێ مەسیحی بینن دێ هێنە ڕزگارکرن. هێدی هێدی ب ڕێکا تەبشیرکرنێ ئەو شیان شاهنشینا خودای بینە د هەبوونێ دا و هۆسا ل سەرانسەری جیهانێ حەژێکرنا مەسیحی چوو دناڤ دلێ خەلکی دا. "پەیڤا کریستوس Kristus د بنەڕەت دا پەیڤەکا گریکی یە، ب ڕامانا "کەسێ ڕزگار" دهێت".

پشتی چەند سالەکان ل سەر وەغەرکرنا مەسیحی، پۆلس هاتە سەر ئاینێ مەسیحیەتێ. پۆلسی ب ڕێکا گەشتێن خوە یێن جۆراوجۆر دناڤ جیهانا گریکی و ڕۆمانی دا، شیا ئاینێ مەسیحیەتێ بکەتە ئاینەکێ جیهانی. ئەڤ چەندە ژی ب ئاشکەرای د بەشێ "کارێن پێغەمبەران" د ئینجیلێ دا هاتیە بەحسکرن. لێ پەیام و ڕێنمایێن پۆلسی ب ڕێکا وان نامەیان گەهشتینە مە یێن وی بۆ کومەلێن مەسیحی یێن دەستپێکی فرێدکرن.

بینە پێشچاڤێن خوە سۆفیا، وی خوە گەهاندیە باژێرێ ئەسینایێ، پایتەختێ فەلسەفێ و چوویە دناڤ گۆڕەپانا گشتی دا. دبێژن کو دەمێ وی هەموو ئەو وێنە و پەیکەرێن خوداوەندان دیتین، گەلەك تێکچوو و هەڕشی. ل دووڤ دا ب مێهڤانداری چوو د پەرستگەها جوهیان ڤە و دگەل فەیلەسۆفێن ئەپیکوری و ستۆیکی دانوستاندن کر، وان ژی پۆلس برە سەرێ گرێ "ئاریوپاگ" و پرسیار ژێ کر: "ئەرێ دێ شێین زانین ئەو چ

بیروباوەڕێن نوونە یێن تو بەحس دکەی؟ مە گەلەك تشتێن سەیر و ئنتیکە گوهلێبووینە، لێ ئەم حەز دکەین کو ڕاستیا ڤان بیروباوەران بۆ مە دیاربکەی.

نوکە ئەو دیمەن هاتە پێشچاڤێن تە. دناڤ گۆڕەپانا بازاڕی دا جوهیەك بدەرکەڤیت و بەحسێ ڕزگارکەرەکێ ل خاچدای بکەت کو پشتی هینگێ یێ زیندی بوویەڤە. ل ڤێرێ دڤێت مە ئاگەهـ ژ وێ هەڤڕکیا دناڤبەرا فەلسەفەیا گریکی و تێگەهێ ڕزگاربوونێ د ئاینێ مەسیحیەتێ دا پەیدابووی هەبیت، لێ پۆلس شیا ب شێوەیەکێ سەرکەفتیانە گوتارەکێ پێشکێش بکەت و قەناعەتێ بۆ خەلکێ ئەسینایێ چێکەت. پاشی ل سەرێ گرێ ئاریوپاگ و ل بن سیبەرا ستوونێن ئەکرۆپۆلێ دەست ب گوتنا گوتارەکێ کر.

"گەلی زەلامێن ئەسینایێ. ئەز یێ دبینم هوون ژ هەموو لایان ڤە گەلەك د دیندارن. لێ دەمێ ئەز دناڤ پەرستگەهێن هەوە دا گەریام و من تەماشەی جهێن هەوە یێن پیروز کری، ل سەر دیوارێ پەرستگەهەکێ هاتبوو نڤیسین "بۆ خودایەکێ نەدیار". چەوا چێدبیت هوون پەرستنا خوداوەندەکی بکەن و نەزانن کیە، ئەز دێ نوکە بۆ هەوە دەمە نیاسین. ئەو خودای هەموو جیهان و تشتێن د ناڤ دا ئافراندین، دەستهەلاتەکا ڕەها ل سەر جیهانێ هەموویێ هەیە و د پەرستگەهەکێ ڤە ناژیت کو ب دەستێ مرۆڤان هاتبیتە دروستکرن. هەردیسان وی پێدڤی ب تشتان نینە کو مرۆڤان ب دەستێ خوە چێکربیت، ژبەرکو ئەو ب خوە ژیان و ڕۆحێ ددەتە مرۆڤان. خودای ژ مرۆڤەکێ ب تنێ نەژادێ مرۆڤان هەموو پەیداکر و ڕێك دایێ ل سەرانسەری جیهانێ بژین. هەر وی ب خوە ئەڤ مرۆڤە ل جهێن جودا جودا دانانینە و جهـ و دەمێن وان دەستنیشان کرینە.

ب ڤی ڕەنگی هەست ب هەبوونا خودای بکەن و ببینن. ئەو یێ ژ مە دوور نینە، بەلکو ئەم هەموو دناڤ وی دا دژین و دهێن و چین. هەروەکو کا چەوا هندەك ژ هوزانڤانێن هەوە دبێژن "ئەم نەڤیێن خودای نە". ژبەر ڤێ چەندێ، ئەگەر ئەم نەڤیێن خودای بین، نابیت هزر بکەین خودای مەزن ژ پەیکەرەکێ زێڕی یان زیڤی یان بەری هاتیە چێکرن کو ب دەستێ مرۆڤان هاتبیتە نکراندن و بەرهەڤکرن. خودای سەردەمێن تاڕی و نەزانینێ نەهێلان و نوکە ژی فەرمان یا دای کو هەموو مرۆڤێن ل سەر ڕوویێ ئەردی دڤێت پەرستنا

وی بکەن. ژبەر ڤێ چەندێ وی پێغەمبەرەك هنارت و وەك نیشانەك ل سەر ڕاستیا پێغەمبەرینیا وی، وی ئەڤ پێغەمبەرە زیندی کرەڤە داکو ئەم هەموو باوەریێ پێ بینین.

پۆلس ل ئەسینایێ! ئاها هێدی هێدی ب ڤی ڕەنگی ئاینێ مەسیحیەتێ دناڤ جیهانا گریکی-رۆمانی دا گەشەکر، هندەك ڕێنماییێن نوو و تەمام جودا ژ ڕێنماییێن ئەپوکراتی و ئەپیکوری و ئەفلاتۆنی دناڤ خەلکی دا هاتنە بەلاڤکرن. لێ پۆلسی خالەکا هەڕە گرنگ دناڤ فەلسەفێ دا دیت کو هاریکاریا وی کر ب سانەهی ڤی ئاینی دناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت.

پۆلسی گوت: "لێگەریانا خودای دناڤ ناخێ هەموو مرۆڤان دا هەیە". هەلبەت ئەڤ جۆرە هزرکرنە دناڤ کەلتورێن یونانی دا تشتەکێ نوو نەبوو لێ تشتێ نوو ئەو بوو یێ پۆلسی ل سەر زێدەکری. وی دگوت کو ئەو خودای بەحس ژێ دکەت نە "خودایەکێ فەلسەفی" یە کو مرۆڤ ب ڕێکا ئەقلێ خوە دشێت نێزیکی وی ببیت، هەردیسان ب کەرەستەییێن زێڕ و زیڤ و بەران ژی نەهاتینە دروستکرن کو ل وی سەردەمی هژمارەکا هەڕە مەزن یا ڤان جۆرە پەیکەران د ل دەڤ ئەکرۆپۆل و گۆڕەپانا گشتی یا باژێری دا هەبوون. خودا دناڤ پەڕستگەهەکێ دا ناژیت کو ب دەستێن مرۆڤان هاتبیتە دروستکرن. بەلکو ئەو خودایەکێ کەسایەتی یە و هاتیە دناڤ پێڤاژوویا دیرۆکێ دا، یێ ل سەر خاترا گونەهێن مرۆڤان خوە کریە قوربان و ب خاچێ ڤە هاتیە هەلاویستن.

پشتی گوتارا ل سەر گرێ ئاریوپاگی، هندەك ژ خەلکێ ئەسینایێ ڕەخنە ل پۆلسی و گوتارا وی ل دور زیندبوونا مەسیحی گرت. هندەکێن دی ژی گوتێ: "ئەم دێ دووبارە هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا کەین و پاشی بڕیارێ دەین". هژمارەکا دی یا خەلکی ژی یەکسەر باوەری پێ ئینا و هاتنە سەر ئاینێ مەسیحیەتێ کو ژ وان ژنەك دناڤ دا بوو دگوتنێ "داماریس". بلا ئەڤ ناڤە باش ل بیرا تە بیت.

ب ڤی ڕەنگی پۆلس ل سەر بەلاڤکرنا پەیاما خودای یێ بەردەوام بوو. ل نێزیکی سالا 80ێ زاینی، چەندین کومەلە یێن کێمینە یێن مەسیحی ل باژێرێن مەزن و جودا جودا یێن گریکی و ڕۆمانی پەیدابوون وەك ئەسینا و ڕۆما و ئەسکەندەریە و کورنتوس و

وافسس. پشتی هینگێ د ماوەیێ چەند چەرخەکان دا، جیهانا هیلینیزمی هەموو هاتە گوهۆڕین بۆ مەسیحیەتێ.

## بیروباوەری

پۆلسی نەك ب تنێ ڕۆلەك مەزن هەبوو د دیرۆکا مەسیحیەتێ دا ل دور بەلاڤکەرێ ڤی ئاینی، بەلکو وی کارتێکرنەکا هەڕە مەزن ل سەر گرۆپێن مەسیحی یێن جۆراوجۆر دا کر کو ل وی دەمی ڤان گرۆپان پێدڤیەکا مەزن ب ڕێبەرەکێ ڕۆحی هەبوو.

پرسیارا هەڕە مەزن ل قۆناغا یەکێ یا بەربەلاڤبوونا ئاینێ مەسیحیەتێ ئەو بوو، ئەرێ کەسەکێ نە جوهی دشێت ببیتە مەسیحی بێ کو بیروباوەر و ڕێوڕەسمێن ئاینێ جوهیان پراکتیزە بکەت. ئەرێ ل سەر گریکیان یا پێدڤیە ڕێزێ ل موسای بگرن؟ پۆلسی بۆ وان دیاردکر کو ئەڤ چەندە نە تشتەکێ گرنگە، ژبەرکو ئاینێ مەسیحیەتێ گەلەك ژ هندێ مەزنترە دناڤ چوارچۆڤەیێ ڕێبازا جوهیان دا بهێتە دوورپێچکرن. ب ڤی ڕەنگی، ئەو بانگەشەیا پەیامەکا ڕزگاکرنێ یا جیهانی بۆ خەلکی ددا دیارکرن ب ڕەنگەکی کو عیسای پەیمانا کەڤن "تەوڕات" دناڤبەرا خودای و خەلکێ ئیسرائیلێ دا لادا و ل شونا وێ پەیمانا نوو "ئینجیل" دناڤبەرا خودای و هەموو مرۆڤان دانا جهێ وێ.

لێ ئاینێ مەسیحیەتێ نە ئاینێ یەکانە و ب تنێ بوو، چونکی بەری هینگێ مە دیت کا چەوا هلینیزم ژ تێکەلەکێ پێکهاتی ژ هژمارەکا ئاینان پێکهاتبوو، ژبەر هندێ ل سەر دێرا یا پێدڤی بوو پوختەیەکێ کورت ل دور تایبەتمەندیا ئاینێ مەسیحیەتێ بۆ خەلکی بدەنە دیارکرن داکو ژ گشت ئاینێن دی یێن بەربەلاڤ بهێتە جوداکرن.

ژلایەکێ دی ڤە داکو چ جودابوون دناڤ دێرا مەسیحیان دا پەیدانەبن و ببنە دوو ڕێباز یان پتر. ب ڤی ڕەنگی، یەکەمین بیربوباوەرێن ئاینێ مەسیحیەتێ ژ دایکبوون کو هەموو بیروەباوەرێن دی یێن ڤی ئاینی دناڤ خوە دا کورت کربوون.

یەك ژ ڤان بیروباوەران ئەو بوو کو مەسیح مرۆڤ و خوداوەند بوو. ژبەر کارێن خوە یێن باش، ئەو نە ب تنێ کورێ خودای بوو، بەلکو ئەو خودا ب خوە ژی بوو، لێ د

هەمان دەم دا ئەو مرۆڤەکێ ڕاستەقینە ژی بوو و دناڤ خەلکی دا دژیا و دەمێ هاتیە خاچدان ژی، وەکو هەر مرۆڤەکێ ئاسای هەست ب ئێشانێ کر.

دبیت ئەڤ چەندە وەکو تشتەکێ هەڤدژ بیت. لێ پەیاما دێرێ ب دروستاهی ئەو چەندە دووپات دکر کو خودا یێ بویە مرۆڤ. مەسیح نیڤ خودا نەبوو "ئانکو نیڤەك مرۆڤ بیت و نیڤەك خودا" کو بەری نوکە ئەڤ جۆرێ باوەریا ب نیڤ خودایان دناڤ خەلکێ سەردەمێ هیلینیزمێ دا یا بەربەلاڤ بوو. دێرێ دگوت: "مەسیح خودایەکێ تەمامە و د هەمان دەم دا مرۆڤەکێ تەمامە ژی".

## پەراوێز

خوشتڤیا من سۆفیا، ئەز یێ پێکۆلێ دکەم بۆ تە شرۆڤە بکەم کا چەوا هەموو تشت ڕوودان. دەمێ ئاینێ مەسیحیەتێ هاتیە دناڤ جیهانا گریکی-رۆمانی دا، مە ب چاڤێن خوە دیت کا چەوا تێکەلبوونەکا مەزن و بالکێش دناڤبەرا ڤان هەردوو کەلتوران دا پەیدابوو، لێ د هەمان دەم دا لادانەکا مەزن ژی د دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دا پەیداکر.

ل ڤێرێ، پشتی بورینا پتر ژ هزار سالان ل سەر دەرکەفتنا فەیلەسۆفێن گریکی یێن دەستپێکێ، دێ پشتا خوە دەینە سەردەمێن کەڤن و ل هەمبەر خالا دەستپێکرنا چەرخێن مەسیحی یێن ناڤەڕاست ڕاوەستین کو وان ژی نێزیکی هزار سالان ڤەکێشا.

ڕۆژەکێ، هوزانڤانێ ئەلمانی "گوتە"ی گوتبوو: "**ئەو کەسێ نەشێت مفای ژ وانەیێن سێ هزار سالێن بوری وەربگریت، دێ هەر دناڤ تارییاتیێ دا مینیت.**"

من نەڤێت تو ببیە بەشەك ژ ڤێ یاریا تاقیکرنا بەختی، بەلکو ئەز دێ هەموو پێکۆلێن خوە دەمە کاری داکو هاریکاریا تە بکەم بشێی ڕهوریشالێن خوە یێن دیرۆکی ئاشکەرا بکەی، ژبەرکو ئەڤ چەندە دێ تە کەتە بونەوەرەکا مرۆڤی و ب ڤی ڕەنگی دێ ژ مەیموونەکا ڕووت یا ل سەر چەقێن داران و باڵندەیەکێ ل ئەسمانی دفڕیت هێیە جوداکرن.

- " ئەڤ چەندە دێ تە کەتە بونەوەرەکی مرۆڤی و ب ڤی ڕەنگی دێ ژ مەیموونەکا ڕووت یا ل سەر ... "

بۆ ماوەیەکێ درێژ، سۆفیا ڕەق ڕاوەستیا و بەرێ وێ ب ڕێکا کونا دناڤ کۆلکی دا ما ل باخچەی مالا وان. هێدی هێدی یا تێدگەهیت کا بۆچی هەتا ڤی ڕادەی یا گرنگە مرۆڤ ڕهوڕیشالێن خوە یێن دیرۆکی بزانیت.

هەرچەندە سۆفیا ژی یەکە ژ وان مرۆڤان یێن ژ نیشکەکێ ڤە ل سەر ڕوویێ ئەردی پەیدابووی، لێ هەکە ئەو ڕهوڕیشالێن خوە یێن دیرۆکی بزانیت، ئێدی کێمتر دێ هەست ب هندێ کەت کو بەرهەمێ ڤی باخچەیە.

ئەو ب تنێ دێ بۆ ماوەیێ چەند سالەکێن کێم ل سەر ڤی ئەردی ژیت، لێ هەکە دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دیرۆکا وێ بیت، کەواتە ژیێ وێ دێ گەهیتە هزاران سالان.

سۆفیایێ کاغەزێن ڤێ وانەیێ هەلگرتن و چوو ژ دەرڤەی کۆلکی و ب ڕێکێ ڤە بەرەڤ چوورا خوە، پیچەك مابوو ژ کەیفان دا بفڕیت.

# چەرخێن ناڤەڕاست

***...برینا نیڤەکا رێکێ، رامانا وێ ئەو نینە تە رێکەکا شاش یا هەلبژارتی...***

حەفیتەك بوری بێ کو سۆفیا چ دەنگوباسان ل دور ئەلبێرتۆ کنوسی بزانیت یان کارتەکا پۆستەی ژ لوبنانێ بۆ وێ بهێت، د ڤی ماوەی دا، وێ و جوانایێ بەردەوام بەحسێ وان کارت و تشتێن دی دکر یێن د کۆلکێ مایجەری ڤە دیتین. ڤی بابەتی جوانا ژ سۆفیایێ پتر دترساند، لێ ژبەرکو د وێ حەفتییێ هەموویێ دا چ تشتێ نوو بۆ سوفیایێ نەهات بوو، ئەو نەچار بوو دەمێ خوە ب خواندنا ئەرکێ، قوتابخانێ ڤە ببورینیت.

سۆفیایێ چەندین جاران نامێن ئەلبێرتۆ کنوکسی یێن بەری هینگێ خواندن، ب هیڤیا هندێ تشتەکی ژ هێلدێ بزانیت. ئەڤ دووبارە خواندنا وێ بۆ ئەگەر باشتر د فەلسەفەیا چەرخێن کەڤن بگەهیت، هەردیسان ب سانەهی جوداهییێ بێخیتە دناڤبەرا فەلسەفە و بۆچوونێن سۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆی دا.

ل رۆژا ئەینی رێکەفتی 25ی گولانێ، سۆفیایێ د لێنانگەهێ ڤە خوارن بۆ دایکا خوە بەرهەڤ دکر پشتی کو ژ سەر کاری زڤریەڤە. سۆفیایێ وەکو هەموو رۆژێن دی یێن ئەینی، خوارنەکا سڤك یا پێکهاتی ژ شۆربەکا ماسی و گوشت و گێزەران بەرهەڤ کر.

ژ دەرڤەی مالا وان، هێدی هێدی باهۆزێن ب هێز بلند دبوون. د پەنجەرێ دا، سۆفیایێ تەماشەی باخچەی ژ دەرڤە و دارێن سپینداران دکر کو بەژنا وان وەکو گولیێن گەنمی دهەژیان.

ژ نیشکەکێ ڤە دەنگێ تشتەکی د پەنجەرێ دا هات، سۆفیا ل پشت خوە زڤڕی و ل دووڤ وی دەنگی چوو. وێ دیت کارتەکا مایە ب پەنجەرا لێنانگەهێ ڤە. دەمێ پتر خوە نێزیك کری، بۆ وێ دیاربوو ئەو پۆستکارتەکە و ل سەر هاتیە نڤیسین "هێلد موللەر کناگ\ ب ڕێکا سۆفیا ئاموندسنێ". سۆفیایێ پەنجەرك ڤەکر و دەستێ خوە هاڤێتە وێ کارتێ و د دلێ خوە دا گوت: "تو بێژی بای ئەڤ کارتە ژ لوبنانێ بۆ وێ دگەل خوە ئینابیت؟"

ئەڤ کارتە ژی ڕێکەفتا ڕۆژا ئەینی، 15ی گولانێ ل سەر هاتبوو نڤیسین. سۆفیایێ ئافك ل سەر ئاگری دانا و ڕوونشت و دەست ب خواندنا وێ کارتێ کر.

***خوشتڤیا من هێلد:***

***ئەز نزانم دەمێ تو ڤێ کارتێ دخوینی، ڕۆژا جەژنا ژ دایکبوونا تە بوری یە یان نە، هەرچەوا بیت هیڤیا من ئەوە ماوەیەکێ درێژ ب سەرڤە نەچووبیت. تو دزانی دەمێ ل دەڤ سۆفیایێ حەفتیەك یان دوو حەفتی دبورن، مەرج نینە ب هەمان شێوە دەم ل دەڤ مەژی هۆسا ببوریت. ئەز دێ ل ئێڤاریا ڕۆژا جەژنا یوحەنای گەهمە مال و پاشی دێ ل سەر حۆلانکا دناڤ باخچەی دا ڕوونینەە خوارێ و تەماشەی دەریایێ کەین، چونکی مە گەلەك سحبەت هەنە دڤێت ل سەر باخڤین.***

***دگەل ڕێزێن من***

***بابێ تە، ئەوێ ژ دیتنا ڤی شەڕی پۆسیدە بووی***

***تێبینی:***

***تو دشێی ژ پێش من ڤە سلاڤان ل سۆفیایێ بکەی؟ بەلەنگازێ سۆفیا، ڕەنگە ئەو هێشتا نزانیت دێ چەوا ڤان ڕوودانان هەموویان دگەل هەڤ گونجینیت، لێ پا تو، ئەز دبێژم هەتا ڕادەیەکی تو یا د پلانا من گەهشتی.***

سۆفیایێ سەرێ خوە دانا سەر مێزێ. ڕاستە ئەو هەتا نوکە چ تشتان ژ ڤی بابەتی تێنەدگەهشت، لێ ڕەنگە هێلد هەموو تشتان بزانیت!

بابێ هێلدێ داخواز ژ کچا خوە کربوو سلاڤێن وی بگەهینتە سۆفیایێ. ڕامانا وێ ئەوە هێلد سۆفیایێ باش دنیاسیت، لێ سۆفیا هێشتا نزانیت ئەو کیە و وێ نانیاسیت. دیسان ڤی بابەتێ ئالۆز سەرێ وێ گێژ کر، ژبەر هندێ چوو سەحکەتە ئافکێ و خوە پێڤە مژوول کر.

هێشتا سۆفیایێ دووبارە ئاگرێ تەباخێ هەلنەکرییێ، زەنگا تێلەفۆنێ هاتە لێدان. خوزی ئەو بابێ وێ بیت! خوزی ئەو بهێتە مال داکو سۆفیا بەحسێ هەموو وان تشتان بۆ بکەت یێن ل ڤان حەفتیێن دوماهیێ ڕوودایین. لێ چ پێنەڤێت ژ بلی دایکا وێ یان جوانایێ کەسێ دی نابیت.

- "ئەلو."

کەسەکی ب دەنگەکێ سەیر بەرسڤا وێ دا و گوت: "ئەڤە ئەزم."

سۆفیا یا ژ سێ تشتان پشتڕاست بوو: ئەڤە نە دەنگێ بابێ وێ یە، بەلێ دەنگێ زەلامەکی یە و سۆفیایێ بەری نوکە یا گوهـ ل ڤی دەنگی بووی.

- "زەحمەت نەبیت کیە دئاخڤیت؟"
- "ئەز ئەلبێرتۆ مە."
- "ئاها."

بەلێ، سۆفیایێ ژ دەنگی وی زانی ئەڤە ئەو کەسە یێ بەری نوکە ل سەر کاسێتا ڤیدیوییێ بەحسێ باژێرێ ئەسینایێ بۆ وێ کری. لێ سۆفیایێ نەدزانی دێ چ بێژیت.

- "ئەرێ تو یا ب سەلامەتی؟"
- "بەلێ..."
- "ژ نوکە وێڤە، چ نامە ناگەهنە تە."
- "بەلێ پا من چ تشتێ شاش نەکریە."
- "ژ نوکە وێڤە ئەم دێ ب دروستاهی و ڕاستەخو هەڤدوو بینین. تو تێگەهشتی؟"

- "بۆچی؟"

- "ئەم یێ ژ لایێ بابێ هێلدێ ڤە هاتینە دوورپێچکرن."

- "دوورپێچکرن؟ چەوا؟"

- "ژ هەموو لایان ڤە، سۆفیا. پێدڤیە ئەم دگەل هەڤدوو د هاریکار بین، لێ هندی ئەز بەحسێ چەرخێن ناڤەڕاست بۆ تە نەکەم، تو نەشێی هاریکاریا من بکەی. دبیت پشتی هینگێ مە دەرفەت هەبیت بەحسێ چەرخێ ڕێنیسانس* و چەرخێ شازدێ زاینی و بێرکلی بکەین یێ کو ڕۆلەکێ مەزن و گرنگ گێڕای."

- "مەرەما تە ئەو کەڤالێ د کۆلکێ مایجەری ڤە هەلاویستی؟"

- "من بەحسێ وی یە، ڕەنگە ژبەر فەلسەفەیا وی شەڕەکێ مەزن دەست پێبکەت."

- "ژ ئاخفتنا تە دیارە دێ شەڕەك ڕوودەت."

- "بەلێ ڕاستە، مەرەما من شەڕەکێ هزری. ل سەر مە پێدڤیە ئەم سەرنجا هێلدێ بۆ خوە براکێشین و وێ ژی بکێشینە دناڤ مژارا خوە دا بەری کو بابێ وێ ژ لیلساندێ بزڤریت."

- "ئەز چ تشتان ژ ڤی بابەتی تێناگەهم."

- "ڕەنگە فەیلەسۆف بشێن چاڤێن تە ڤەکەن. سوباهی سپێدێ زوو ل دەمژمێر 4ی سپێدێ وەرە دێرا "ماریا"، دێ ل وێرێ هەڤدوو بینین. لێ هشیاربی تو ب تنێ بهێی."

- "ئەز دێ چەوا د وێ تاریاتیا شەڤێ دا دەرکەڤم؟"

- "تیك..."

- "ئەلو..."

- "ترسنوك! تێلەفۆن گرت!"

سۆفیا بلەز بەرەڤ لێنانگەهێ ڤە چوو، ژبەرکو کەل هاتە ئاڤکا ل سەر ئاگری. سۆفیایێ پارچەیێن ماسی و گێزەران کرنە دناڤ دا و ئاگرێ تەباخێ کێم کر.

---

* چەرخێ ڕێنیسانس Renaissance یان ژی چەرخێ هشیاربوونێ، ب زمانێ عەرەبی ژی دبێژنێ "عصر النهضة". بزاڤەکا ڕەوشەنبیری بوو ژ چەرخێ چواردێ زاینی هەتا چەرخێ هەڤدێ ڤەکێشابوو. ل دەستپێکێ ل ئیتالیا دەستپێکر بوو پاشی ل پتریا وەلاتێن دی یێن ئەوروپی بەربەلاڤبوو. د بەشێن بهێت دا بەشەکێ تایبەت ل دور ڤی چەرخی هەیە.

دێرا ماریا؟ ئەو دێرەکا بەری یا کەڤنە و دیرۆکا دروستکرنا وێ بۆ چەرخێن ناڤەڕاست دزڤڕیت و نوکە بۆ هندەك ئاهەنگێن "کونسێرتان" و هندەك ڕێوڕەسمێن ئاینی هاتیە تەرخانکرن. هندەك هەیامێن سالێ ب تایبەت ل وەرزێ هاڤینێ دهێتە ڤەکرن، لێ پا ل نیڤەکا شەڤێ دێ بۆچی هێتە ڤەکرن؟

دەمێ دایکا وێ زڤڕیە مال، سۆفیایێ ئەو پۆستەکارت ژێ کربوو دناڤ وێ سندوقێ دا یا تشتێن دی یێن ئەلبێرتۆ کنوکسی کرینە تێدا. پشتی خوارنا شیڤێ ژێ، چوو سەرەدانا هەڤالا خوە جوانایێ. داخواز ژێ کر هەر زوو بچنە د ژوورا وێ ڤە. سۆفیایێ بلەز گوتێ: "پێدڤیە ئەم پلانەکا بچووك بدانین."

پشتی وان دەرگەهـ ل پشت خوە دائێخستی، بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "من ئاریشەکا هەی."
- "چ ئاریشەیە؟"
- "ئەز یا نەچارم بێژمە دایکا خوە کو دێ ئەڤ شەڤە ل دەڤ تە نڤم."
- "هەلبەت ئەڤ چەندە جهێ دلخوشیا منە تو ل دەڤ من بنڤی."
- "بەلێ، لێ ئەڤ چەندە ب تنێ وەکو هێجەتەکا فەرمی یە و دێ بێژمە دایکا خوە، چونکی ئەز ب خوە دێ چمە جهەکێ دی، تو تێگەهشتی؟"
- "تەمساری! دێ چیە دەڤ کورکەکی؟"
- "نەخێر، دێ چمە دەڤ هێلدێ."

جوانایێ ڤێژیەکا هێدی و ب ترس ڤەدا، سۆفیایێ تەماشەی چاڤێن وێ کر و گوت: "ئەز دێ ئێڤاری هێمە دەف تە، لێ پێدڤیە ئەز ب شێوەیەکێ نهێنی ل دەمژمێر سێی سپێدێ ژ مال دەرکەڤم و پێدڤیە تو جهێن من ب نخێڤی هەتا دزڤڕمەڤە."

- "بەلێ پا دێ کیڤە چی؟ سۆفیا بۆ من ڕاستیێ بێژە کا تە چ ل بەرە؟"
- "ببورە، ئەز نەشێم بێژم."

مانا سۆفیایێ ل مالا هەڤالەکا وێ چ ئاریشە تێدا نەبوون، چونکی سۆفیایێ دزانی هندەك جاران دایکا وێ حەز دکەت مال بۆ وێ ب تنێ بمینیت. بەری سۆفیا ژ مال

بدەرکەڤیت، دایکا وێ گوتێ: "من دڤێت تو سپێدێ بزڤڕیە مال داکو تێشتێ پێکڤە بخوین."

- "بەلێ پا هەکە ئەز نەزڤڕیم، تو دزانی کا ئەز ل کیڤەمە."

ئەرێ بۆچی وێ ئەڤ ڕستە گوت؟ تو بێژی ئەڤە خالا لاوازیا وێ بیت؟

شەڤا وان دەستپێکر. وەکو هەموو وان شەڤان دەمێ مرۆڤ دمینتە ل دەڤ هەڤالەکێ خوە، سحبەت و تڕانە و دانوستاندێن درێژ هەتا نیڤەکا شەڤێ. لێ ڤێ شەڤبیریا وان ب تنێ جوداهیەك هەبوو، پشتی کو وان ل دەمژمێر یەکێ شەڤێ بڕیاردای بنڤن، سۆفیایێ زەنگا هشیارکەر دانا سەر دەمژمێر سێی سپێدێ. دەمێ زەنگێ لێدای، ب خورتی جوانایێ چاڤەکێ خوە ڤەکر و د بن لێفکان ڕا گوت: "هشیاری خوە بی."

سۆفیایێ ڕێکا دێرێ گرتە بەر کو چەندین کیلومەتران یا ژ وێ دوور بوو. هەرچەندە سۆفیا بۆ هەیامەکا گەلەك کورت نڤست بوو، لێ ئەو هۆسا یا هشیار بوو دا بێژی دنیا ڕۆژە. ل ڕەخێ ڕۆژهەلاتی، پنیەکا عەوری یا سۆر ل سەر زەڤیان پەیدابوو.

دەمێ ل دوماهیێ سۆفیا گەهشتیە بەر دەرگەهێ دێرا بەری یا کەڤن، دەرگەهێ وێ یێ مەزن پالدا، لێ وێ دیت دەرگەهـ ب خوە یێ ڤەکریە.

وەکو ژیێ دێرێ یێ مەزن، سۆفیایێ هەست ب بێدەنگی و ڤالاهیا وێ دکر. د پەنجەرێن دێرێ ژی دا، تیشکێن ڕۆناهیەکا شین بەربەلەلاڤ دبوو کو ب هزارەکا گەردێن تۆزێ یێن دناڤ بای دا ڕۆهن دکرن. چڕاتیا وان گەردان وەکو پرێن ناڤبڕ خویا دکرن. سۆفیا ل ناڤەڕاستا دێرێ و ل سەر کورسیەکێ ڕوونشت و تەماشەی خاچا دێرێ یا ڕەنگین کر.

پشتی بورینا چەند خولەکان، دەنگێ ئامیرێن ئورگانێ بلند بوو، لێ سۆفیا نەدوێریا ل پشت خوە بزڤڕیت. ئاوازا وێ سترانێ یا سترانەکا ئاینی یا کەڤن بوو کو دیرۆکا وێ بۆ چەرخێن ناڤەڕاست دزڤڕی.

پشتی بێهنەکێ ل سەر وێ بێدەنگیێ، دەنگێ ڕەپ ڕەپا پێن کەسەکی هاتە گوهێن وێ کو هێدی هێدی نێزیکی وێ دبوو. ئەرێ تو بێژی ل پشت خوە بزڤڕیت؟ نەخێر هۆسا باشترە بەرێ خوە ل سەر پەیکەرێ مەسیحی و خاچێ نەڕاکەت. دەنگێ ڕەپ ڕەپا وی کەسی

د بەر وێ ڕا بوری و چوو سەر سەکویێ دێرێ. ژ نوو سۆفیایێ قەشەیەکێ جلوبەرگ ڕەنگ قەهوای دیت، دا بێژی ئەو قەشەیەکێ چەرخێن ناڤەڕاستە.

سۆفیایێ هەست ب ترسێ کر و دلێ وێ خوە بلەز قوتا. لێ قەشە دەمێ گەهشتیە سەر سەکویێ، چوو دەڤ بلندگوویێ و تەماشەی سۆفیایێ کر و ب زمانێ لاتینی گوت:

et ، et Spiritui Sancto. Sicut erat in principio، et Filio،“Gloria Patri
et semper et in saecula saeculorum. Amen.”،nunc

- " ما تو نەشێی ڤان پەیڤان بۆ من ب وەرگێڕی، هەی تەمسارڕ؟

سۆفیا ب دەنگەکێ بلند ئەڤ چەندە گوت لێ هەر زوو دەنگێ وێ ل هەموو لایێن وێ دێرا کەڤن ڤە دەنگڤەدا. پشتی سۆفیایێ زانی کو ئەڤ قەشە ئەلبێرتۆ کنوکسە، ژ ئاخفتنێن خوە پەشیمان بوو کو ب وی شێوەیێ نەجوان دناڤ دێرەکا کەڤن دا ئاخفتی. لێ دگەل هندێ ژی پیچەکێ ترسیا. دەمێ مرۆڤ دترسیت، ئەنجامدانا کارێن قەدەغەکری پیچەکێ مرۆڤی ئارام دکەن.

- "هش!"

ئەلبێرتۆی دەستێ خوە چەماند هەروەکو کا چەوا دەمێ قەشە داخوازێ ژ نڤێژکەران دکەن بڕوونە خوارێ.

- "کچا من، دەمژمێر چەندە؟"

سۆفیایێ ترسا خوە ڤەڕەڤاند و گوت: "دەمژمێر چوار کێم چارێکەکە."

- "باشە، ئەڤە ژڤانێ مەیە. ئەم دشێین نوکە بچینە دناڤ چەرخێن ناڤەڕاست دا."

سۆفیایێ پرسیار کر: "ئەرێ چەرخێن ناڤەڕاست ل دەمژمێر چواری شەڤێ دەست پێکربوون."

- "تا ڕادەیەکی، پاشی دەمژمێر پێنج و شەش و حەفت هاتن. ل وی دەمی دا بێژی وەخت یێ هاتیە ڕاوەستاندن. پاشی بۆ دەمژمێر هەشت و نەهـ و دەهـ هێشتا ئەم ل

چەرخێن ناڤەڕاست بووین. چ پێنەڤێت نوکە تو هزر دکەی ئەڤ چەندە بەسە هەتا بچینە دناڤ قۆناغەکا دی دا، لێ ئەڤ چەندە وەکو بێهنڤەدانا دوماهیا حەفتیێ بوو. پشتی ڤێ بێهنڤەدانا درێژ، دەمژێر یازدە و دوازدە هاتن و پاشی دەمژمێر یەکی پشتی نیڤرو. ل ڤێرێ دگوتێ چەرخێن ناڤەڕاست یێن گیرو کو ل وی دەمی مەزنترین مەترانخانە* ل ئەوروپا هاتنە ئاڤاکرن. ل دەمژمێر دووێ نیڤرۆ ژی دیکلەك یان دوو دیکل هاتن و ل دوماهیا چەرخێن ناڤەڕاست بانگ دا."

سۆفیایێ ب حێبەتی پرسیار کر: "ئەرێ چەرخێن ناڤەڕاست ب تنێ دەه دەمژمێران ڤەکێشان؟"

ئەلبێرتۆی کولاڤێ جلکێ خوە یێ قەشەیان ل سەر سەرێ خوە هاڤێت و تەماشەی نڤێژکەرێن د دێرێ ڤە کر کو ب تنێ کچەکا گەنج یا چواردە سالی بوو.

- "بەلێ، ئەگەر ئەم هەر دەمژمێرەکێ ل بەرامبەر چەرخەکی وەربگرین. ئەم دشێین ژ هندێ دەست پێبکەین کو مەسیح ل نیڤا شەڤێ ژ دایکبوویە و پاشی قەشە پۆلسی بەری دەمژمێر دوازدە و نیڤی شەڤێ دەست ب بەلاڤکرنا ئاینێ مەسیحیەتێ کریە و پشتی هینگێ ب چارێك دەمژمێر ل باژێرێ ڕۆما وەغەرکر. ل نێزیکی دەمژمێر سێی شەڤێ، دێرا مەسیحی یا قەدەغەکری بوو، لێ پشتی هینگێ ئیمپڕاتۆریا ڕۆمانی ل سالا 313ی زاینی ل سەر دەمێ ئیمپڕاتۆر قوستەنتینی دانپێندان ب ئاینێ مەسیحیەتێ کر ئەوێ ل سەر تەختێ مرنێ باوەری ب ڤی ئاینی ئیناى. ژ سالا 380ی وێ ڤە، ئاینێ مەسیحیەتێ بۆ ئاینێ فەرمی یێ ئیمپڕاتۆریا ڕۆمانی."

- "ئەرێ ما هینگێ هێشتا ئیمپڕاتۆریا ڕۆمانی ژناڤ نەچووبوو؟"

- "بەلێ، هێدی هێدی گەفێن هوشداریا ژناڤچوونێ لێ دهاتنە کرن. ئەو سەردەم ب خالێ ناڤبڕ د دیرۆکا کەلتوری دا دهێتە ل قەلەمدان، ژبەرکو ئیمپڕاتوریا ڕۆمانی ل نێزیکی سالا 300 کەفتبوو بن دوو گەفێن مەترسیدار: گەفێن گەلێن باکوری ژلایەکی ڤە، ناکوکی و شەڕێن وێ یێن ناڤخۆیی ژلایەکێ دی ڤە. ل سالا 330ێ، قوستەنتینی پایتەختێ ئیمپڕاتوریا خوە ڤەگوهاستە باژێرێ "قوستەنتینیە" کو ل بەر لێڤێن دەریا ڕەش ئاڤا

---

* مەترانخانە یان ژی کاتیدرائی Cathedral جۆرەکێ دێرێن مەسیحیانە.

کربوو و ب باژێرێ "ڕۆما یا نوو" دهاتە نیاسین. ل سالا 395ێ ژی، ئیمپڕاتۆریا ڕۆمانی بۆ دوو بەش: بەشێ ڕۆژئاڤای کو پایتەختێ وێ باژێرێ ڕۆما بوو، بەشی ڕۆژهەلاتی ژی پایتەخێ وێ باژێرێ قوستەنتینیە بوو. ل سالا 401 ، هێزێن بەربەری یێن دڕندە باژێرێ ڕۆما داگیرکر و تالان کر هەتا سالا 476 ژی شیان ب یەکجاری دەستێ خوە بدانە سەر هەموو بەشێن ئیمپڕاتوریا ڕۆژئاڤای، لێ ئیمپڕاتۆریا ڕۆژهەلاتی هەتا سالا 1453 مابوو هەتا ل وێ سالێ تورکان داگیرکری.

- "ئەرێ ل وێ سالێ بوو، دەمێ ناڤێ وێ ژ قوستەنتینیە کریە ئیستانبول؟"

- "بەلێ ڕاستە. سالەکا دی ژی هەیە پێدڤیە تو ژبەر بکەی، ئەو ژی سالا 529یە دەمێ دەرگەهێن دێرا ئەکادیمی یا ئەفلاتۆنی ل باژێری هاتیە دائێخستن، د هەمان سال دا یاسایا "پیرۆزکرن*"ێ هاتە دانان کو دهێتە هەژمارتن یەکەمین و مەزنترین یاسایا قەشەیێن مەسیحی. ژبەر ڤێ چەندێ سالا 529ێ دهێتە هەژمارتن ئەو سال یا قەشەیێن مەسیحی دەستێ خوە دانایە سەر فەلسەفەیا گریکی. پشتی هینگێ قەشەیان دەستێ خوە دانا سەر بوارێن فێرکرن و هزرکرنێ. هزر بکە ئەو سەردەم نێزیکی دەمژمێر پێنج و نیڤێ شەڤێ بوو."

ل دەستپێکێ سۆفیا د مەرەما ئەلبێرتوی نەدگەهشت کا بۆچی وی چەرخێن ناڤەڕاست ب دەمژمێران هەڤبەر دکرن. لێ نوکە ژ نوو د مەرەما وی گەهشت. ئانکو نیڤا شەڤێ، سالا دەستپێکێ یا پەیدابوونا مەسیحی بوو و دەمژمێر یەك ژی ئانکو سەد سالا یەکێ پشتی پەیدابوونا مەسیحی، دەمژمێر شەش ژی، ئانکو سەد سالا شەشێ پشتی مەسیحی و دەمژمێر دوازدەی نیڤرۆ ژی، ئانکو نێزیکی هزار و دووسەد سالان پشتی مەسیحی.

ئەلبێرتۆی بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە

- "چەرخێن ناڤەڕاست، ئەو زاراڤە یێ بۆ وی ماوەیێ درێژ دهێتە گوتن ئەڤێ دکەڤیتە دناڤبەرا دوو قۆناغان دا. ئەڤ زاراڤە ل سەردەمێ ڕێنیسانسێ دا دەرکەفت. چەرخێن ناڤەڕاست وەکو شەڤەکا هزار سالی دهاتە هەستپێکرن کو شیابوو هەر ژ

---

* یاسایا پیرۆزکرنێ Benediction.

سەردەمێن کەڤن و ب درێژاهیا سەردەمێ ڕێنیسانسێ دا دەستێ خوە بدانیتە سەر ئەوروپا. هەتا نوکە ژی زاراڤێ "چەرخێن ناڤەڕاست" بۆ هەموو وان تشتان دهێتە گوتن یێن دەربڕینێ ژ دکتاتوری و پاشڤەمانێ دکەن. ب بۆچوونا گەلەك دیرۆکنڤیسان، چەرخێن ناڤەراست ب هزار سالێن ئاڤەدانی و پێشکەفتنێ ل قەلەم ددەن. بۆ نموونە، سیستەمێ قوتابخانەیان ل چەرخێن ناڤەراست پێشکەفت. یەکەم قۆتابخانەیێن وەکو پەرستگەهان ل دەستپێکا ڤی ماوەیی هاتنە ڤەکرن و ل دووڤ دا ژی مەترانخانە ل چەرخێ دوازدێ هاتنە ڤەکرن. ل دەردورێن سالا 1200ێ ژی یەکەم زانکو هاتنە ڤەکرن و چەندین بابەتێن جودا جودا تێدا دهاتنە خواندن.

- "بەلێ پا هزار سال ما نە دەمەکێ کێمە."

- "بەلێ پا ئاینێ مەسیحیەتێ پێدڤی ب ماوەیەکێ درێژ بوو هەتا بشێت خوە بگەهینتە دناڤ ڕهوڕیشالێن تەخێن کوور یێن جڤاکی دا. د ماوەیێ چەرخێن ناڤەڕاست دا، گەلەك مللەتێن جودا جودا پەیدابوون کو هەر یەك خوەدان بازێر و کەتور و موزیك و فلکلورێ خوە یێ تایبەت بوو. ئەگەر چەرخێن ناڤەڕاست نەبان، تو بێژی دا چ ل داستان و سترانێن وان یێن فلکلوری هێت؟ ئەوروپا دا یا چەوابیت، سۆفیا؟ ئەرێ ئەو هەر دا وەکو هەرێما ڕۆمانی مینیت؟ بنیاتێ ناڤێن وەلاتێن ئەوروپی وەك نەڕویج و ئینگلتەرا و ئەڵمانیا.... بۆ چەرخێن ناڤەڕاست دزڤرن، ژبەر هندێ ئەم قەردارێن وی سەردەمی نە.

دەریا دشێت دناڤ کووراتیا خوە دا چەندین ماسیێن جوان و مەزن بڤەشێریت و نەهێلیت ئەم ب چاڤێن خوە ببینین. هەر ل وی سەردەمی، "سنوور"ێ نڤیسەرێ هوزانێن"ئیداس" یێن ناڤدار ژیایە. هەروەسا گەلەك نموونەیێن دی یێن ناڤدار وەك ڤەشە"ئولاو" و "شارلمان" و "ڕومیوجولییێت" و "جان دارك" و "ئیڤانهو"و "زڕنابێژێ هاملین". هەردیسان نابیت ئەم ژبیر بکەین کومەکا میر و شاهێن مەزن و سیارچاکێن چاڤنەترس وەك "شیڤالرۆسێ سیارچاك" و دامسێلێ دادپەروەر" و "دروستکەرێ شووشەیێن پەنجەرکان یێن رەنگاورەنگ" پەیدابووینە. زێدەباری چەندین زەلامێن ئولی و خاچپەرست و سێرەبەندان."

- "تە ڤەشە ژبیرکرن."

- "هەلبەت، ئاینێ مەسیحیەتێ ل دەوروبەرێن چەرخێ یازدێ گەهشتە وەلاتێ نەرویج، ڕاست نینە ئەگەر بێژین خەلك هەموو یەكسەر پشتی ڕەڤینا "ستیكلستاند" ببوونە مەسیحی، ژبەركو هژمارەكا مەزن یا خەلكی ل ژێر پەردەیا مەسیحیەتێ هێشتا ل سەر بیروباوەرێن خوە یێن كەڤن مابوون. پشتی هینگێ چەندین بیروباوەرێن كەڤن دگەل مەسیحیەتێ تێكەل بوون. بۆ نموونە، جەژنا ژ دایكبوونا نەرویجی: چەندین ڕێوڕەسمێن نەرویجی دگەل ڕێوڕەسمێن مەسیحیەتێ تێكەل بووینە. هەردیسان ڕێوڕەسمێن شەهیانان ژی كەفتینە بن ڤێ كارتێكرنێ. دگەل ڤێ چەندێ ژی، هێدی هێدی بیروباوەرێن مەسیحیەتێ خوە ل سەر كەلتور و ڕێوڕەسمێن وان وەلاتان زالكر، ژبەر هندێ ، ئەم دشێین بێژین چەرخێن ناڤەڕاست چوونە د بن ناڤونیشانێن "كەلتورێ مەسیحی یێ یەكگرتی" دا."

- "ئانكو ئەڤ قۆناغە هەتا وی ڕادەی یا تاڕی نەبوو."

- "گومان تێدا نینە كو چەرخێن دەستپێكێ یێن مەسیحیەتێ كو ل دەوروبەرێن سالا 400ێ زاینی دەستپێكربوون، ببوونە ئەگەرێ ژناڤچوونەكا ڕاستەقینە. پشتی كو قۆناغا ئیمپراتوریا ڕۆمانی گەهشتیە گوپیتكا پێشكەفتنا كەلتوری و ئابوری و چەندین باژێرێن مەزن و پێشكەفتی پەیدابووین كو بۆ یەكەم جار كەنالێن ئاڤێ و سەرشوو و نڤیسینگەهێن گشتی هاتبوونە ئاڤاكرن، زێدەباری ئاڤاهیێن مەزن و جوان. لێ ئەڤ پێشكەفتنە هەموو د ماوەیەكێ كێم دا ل دەستپێكا چەرخێن ناڤەڕاست ژناڤچوون و پێكۆلا بازرگانی و ئابوری و گەشەكرنێ بەرەڤ نەمانێ چوون.

ئێدی ئابوریا خێزانی و دەرەبەگایەتیێ دەستێ خوە دانا سەر سیستەمێ ئابوری، ژبەر هندێ هژمارەكا كێم یا زەنگینان ببوونە خوەدانێن زەڤیێن بەرفرەه و جوتیاران وەكو بەندە و كرێكاران ب نەچاری دناڤ دا كاردكر داكو پارێ خوە یێ ژیانێ پەیدابكەن. هەردیسان د ڤی ماوەی دا تێكچوونەكا مەزن د دیموگرافیا خەلكی دا پەیدابوو، بۆ نموونە هژمارا خەلكێ باژێرێ ڕۆما ل سەردەمێن كەڤن نێزیكی ملیون مرۆڤان بوو، لێ ل سالا 600ێ زاینی هژمارا وان گەلەك كێم بوو هەتا گەهشتیە 40 هزار كەسان. ب ڤی ڕەنگی خەلك دشیان دناڤ بەرمایكێن ئاڤاهیێن كەڤن دا بهێن بچن و هەر كەرەستەیەكێ ئاڤاكرنێ پێدڤی بانە دا دناڤ ڤان بەرمایكان دا بینن. چ پێنەڤێت ئەڤ چەندە ل دەڤ زانایێن

شوینەوارزانییێ یێن ئەڤرۆکە جهێ داخێ یە، چونکی دا ئەو گەلەك د کەیفخوش بن ئەگەر خەلکێ چەرخێن ناڤەڕاست ئەڤ بەرمایکە ل جهێن وان هێلابانە و پاراستبانە."

- "پشتی بورینا وەختی، بەحسکرنا وان یا ب سانەهی یە."

- "ل دوماهیا چەرخێ چوارێ زاینی، ئێدی مەزناهیا ڕۆمایێ نەما و ب تنێ وەك بیرهاتنەك دناڤ بیردانکان دا ما، لێ قەشەیێن ڕۆمایێ بوونە سەروکێن دێرێن کاسولیکیان هەموویان و ناسناڤێ "پاپا" ئانکو باب وەرگرتن و بوونە ئاخفتنکەێن فەرمی یێن مەسیحی ل سەر ڕوویێ ئەردی. ب ڤی ڕەنگی باژێرێ ڕۆمایێ ب درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست بۆ بنگەهێ پاپاتیێ کو هژمارەکا گەلەك کێم تێ نەبیت، کەس نەدوێریا گوهداریا وان نەکەت هەتا دەمەك هاتی کو میر و شاهێن شاهنشینێن دی ب هێز کەفتین و ژ دسەتهەلاتا دێرێ یاخیبووین.

سۆفیایێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی وی ڕەبەنی کر یێ گەلەك تشتان دزانیت، پاشی پرسیار ژێ کر: "تە گوتی دێرێ دەرگەهێن ئەکادیمیا ئەفلاتۆنی ل باژێرێ ئەسینایێ دائێخستن، باشە پشتی هینگێ خەلکی هەموو فەیلەسۆفێن گریکی ژبیرکرن؟"

- "بەلێ، لێ هەتا ڕادەیەکی ب تنێ. هندەك نڤیسینێن ئەرستۆ و ئەفلاتۆنی ل ڤێرێ و وێراهە دهاتنە خواندن، لێ ئیمپراتوریا ڕۆمانی ژی هێدی هێدی ل سەر سێ هەرێمێن کەلتوری دابەش ببوو: هەرێما ڕۆژئاڤای، کەلتورێ مەسیحی و زمانێ لاتینی لێ بەلاڤ بوو و پایتەختێ وێ ژی باژێرێ ڕۆما بوو. هەرێما ڕۆژهەلاتی، کەلتورێ مەسیحی و زمانێ یونانی لێ بەلاڤ بوو و پایتەختێ وێ ژی باژێری قوستەنیتینە بوو کو پشتی هینگێ ناڤێ وێ هاتە گوهۆڕین بۆ "بیزەنتیە" (ژبەر هندێ ئەم دبێژین چەرخێن ناڤەڕاست داکو ژ چەرخێن ناڤەڕاست یێن ڕۆمانی جودا بکەین). زێدەباری ئەفریقیا باکوری و ڕۆژهەلاتا ناڤین کو وان ژی بەشەك ژ ئیمپراتوریا ڕۆمانی پێکدئینا، لێ کەلتورێ ئیسلامێ ب زمانێ عەرەبی دناڤ دا بەلاڤ بوو.

دگەل وەغەرکرنا پێغەمبەرێ ئیسلامێ، موحەمەدی (سلاڤێن خودای ل سەر بن) ل سالا 632ی زاینی، ڕۆژهەلاتا ناڤین و باکورێ ئەفریقیایێ کەفتبوونە ژێر ئالایێ ئیسلامێ. پاشی هێدی هێدی وەلاتێ ئیسپانیا ژی کەفتە بن دەستێ موسلمانان و کەلتورێ ئیسلامێ لێ

بەلاڤ بوو. پشتی هینگێ چەندین باژێرێن ئیسلامی یێن گرنگ پەیدابوون وەك مەككە و مەدینە و قودس و بەغدا. ل ڤێرێ جهێ ئاماژەپێكرنێ یە كو عەرەب شیان دەستێ خوە بدانە سەر باژێرەكێ هیلینیزمی یێ گەلەگ گرنگ كو ئەو ژی باژێرێ ئەسكەندەریە بوو، ب ڤی ڕەنگی، ئەو شیان ئاشنای زانست و فەلسەفەیا یونانی یا كەڤن بن.

ب درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست، عەرەبان ڕۆلەكێ مەزن د پێشئێخستنا زانستێن بیركاری و كیمیا و فەلەكناسی و نوشداری و فەلسەفێ و گەلەك بوارێن دی دا گێڕا. ئانكو ئەم دشێین بێژین ژ گەلەك لایان ڤە، كەلتورێ عەرەبی باشتر ژ كەلتورێ مەسیحی جهێ خوە گرت بوو."

- "باشە چ ل فەلسەفەیا یونانی هات؟"

- "تو دشێی ڕووبارەكێ بەرفرەهـ بینیە پێشچاڤێن خوە دەمێ دبیتە سێ لق و پاشی ل دوماهیێ دووبارە ئەڤ هەرسێ لقە دگەهنە سەر یەك ڤە."

- "بەلێ من ئەڤ چەندە باش ئینا پێشچاڤێن خوە."

- "باشە نوكە تو دشێی خوە تێبگەهینی كا چەوا كەلتورێ گریكی و ڕۆمانی بۆ سێ بەش و هاتە ڤەگۆهاستن بۆ: كەلتورێ ڕۆمانی-كاسولیكی ل ڕۆژئاڤای، كەلتورێ بیزەنتی ل لایێ ڕۆژهەلاتی، كەلتورێ عەرەبی ل باشوری. بۆ پتر ڕۆهنكرنا ڤێ خالێ، ئەم دشێین بێژین كو ڕووبارێ ئەفلاتۆنی یێ نوو بەرەڤ ڕۆژئاڤای چوو، لێ ڕۆبارێ ئەفلاتۆنی ب خوە بەرەڤ ڕۆژهەلاتی و یێ ئەڕستۆی ژی بەرەڤ باشوری و وەلاتێن عەرەبی ڤە چوو. لێ ڤان هەرسێ ڕووباران، هندەك ساخلەتێن خوە یێن دەستپێكێ پاراستن هەتا ل دوماهیا چەرخێن ناڤەڕاست جارەكا دی ئەڤ هەرسێ ڕووبارە ل باكورێ ئیتالیا گەهشتنە هەڤدوو ڤە، ئەو ژی كو پشتی كارتێكرنا عەرەبی ژ عەرەبێن ل ئیسپانیا و كارتێكرنا گریكی ژی ژ یونان و بیزەنتیە هاتی. ئەڤ تێكەلبوونا نوو یا كەلتوران بۆ ئەگەرێ سەرهلدانا سەردەمەكێ نوو كو دبێژنێ سەردەمێ ڕێنیسانس كو ڕامانا وێ یا حەرفی یا "دووبارە ژ دایكبوون" و ڤەگەڕیان بۆ ژێدەرێن كەڤن. ب ڤی ڕەنگی ئەو كەلتورێ سەردەمێن كەڤن یێ ب ڕەنگەكی ژ ڕەنگان شیای خوە دناڤ چەرخێن ناڤەڕاست دا بپارێزیت، دووبارە زیندی بووڤە.

- "نوكە ئەز باشتر تێگەهشتم."

- "لێ یا پێدڤیه ئەم لەزێ نەکەین. کچا من، نوکە دێ پیچەکێ بەحسێ فەلسەفەیا چەرخێن ناڤەڕاست کەین. لێ خوە ل هیڤیا من بگرە هەتا دهێمە خوارێ، چونکی ئەز دێ ل سەر سەکوییی هێمە خوارێ."

سۆفیایێ پێکۆل کر خەوا خوە ب ڤەڕەڤینیت کو بەری هینگێ ب خورتی دشیا چاڤێن خوە بهێلتە ڤەکری. دەمێ وێ دیتی ئەو ڕەبەنێ سەیر یێ دهێتە خوارێ، هەستپێکر ئەو یا خەونان دبینیت. ئەلبێرتۆ بەرەڤ مینبەرێ چوو و تەماشەی وێ خاچا کەڤن کر و پاشی بەرەڤ سۆفیایێ ڤە هات و ب ڕەخ وێ ڤە ل سەر ڤەنەپەیەکا داری ڕوونشت.

چەند هەستەکا سەیرە کو نوکە ئەو یا ب ڕەخ وی ڤە ڕوونشتیە!

سۆفیایێ دوو چاڤ ل بن کولاڤێ وی ڤە دیتن، دوو چاڤێن زەلامەکێ دانعەمر و پرچ زەر. سۆفیایێ د دلێ خوە دا گوت: "باشە تو کی و بۆچی تو هاتیە د ژیانا من دا؟"

دا بێژی ئەلبێرتۆی هزرێن وێ خواندن، ژبەر هندێ گوت: "پێدڤیە ئەم بزانین کا چەوا دێ ب شێوەیەکێ باشتر هەڤنیاسینێ دگەل هەڤدوو کەین."

تیروژکێن هەتاڤا سپێدەهیان د شووشەیێن پەنجەرکان ڕا دهاتنە ژوور و هێدی هێدی دێر ڕۆهن دکر. دگەل هندێ ئەلبێرتۆ ژی ل سەر سحبەتا خوە ل دور چەرخێن ناڤەڕاست یێ بەردەوام بوو.

- "فەیلەسۆفێن چەرخێن ناڤەڕاست تا ڕادەیەکی ب گومان بوون ل دور ڕاستیا ئاینێ مەسیحیەتێ. لێ پرسیارا سەرەکی ل ڤێرێ ئەو بوو کا ب سانەهی دێ باوەرییێ ب وەحیا ئاینێ مەسیحیەتێ ئینن یان ژی ب ڕێکا ئەقلێ خوە پێکۆلێ بکەن پتر د ڕاستیا ڤی ئاینی بگەهن. پەیوەندیا دناڤبەرا فەیلەسۆفێن گریکی و کاکلکا مەسیحیەتێ دا چیە؟ دژایەتیەك دناڤبەرا ئەقلی و ئینجیلێ دا هەیە؟ ئەرێ پەیوەندی دناڤبەرا باوەری و زانینێ دا هەیە؟ ئەڤە ئەو مژار بوون یێن پتریا فەیلەسۆفێن چەرخێن ناڤەڕاست پێڤە د مژوول بوون."

سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند. بەری نوکە وێ بەرسڤا وێ پرسیارێ دا بوو دەمێ مامۆستایێ وێ د تاقیکرنا ئاینێ دا ل دور پەیوەندیا زانست و باوەرییێ دا بۆ ئینای.

- "ئەم دێ بۆچوونێن دوو فەیلەسۆفێن گرنگ یێن چەرخێن ناڤەڕاست ديارکەین. ل دەستپێکێ ژی دێ ژ قەشە "ئوگستین"ی دەست پێکەین ئەوێ دناڤبەرا سالێن 354 و 430 زاینی دا ژیای. ئەڤە تاکە فەیلەسۆفە یێ دناڤبەرا هەردوو چەرخێن کەڤن و دەستپێکا چەرخێن ناڤەڕاست دا ژیای. ئوگستین ل باژێرێ "تاگاس" ل باکورێ ئەفریقیایێ هاتیە سەر دنیایێ. پشتی ژیێ وی بوویە شازدە سال، بۆ خواندنێ چوویە باژێرێ قرتاجە و ل دووڤ دا چوویە ڕۆما و میلانو هەتا ل دوماهیێ وەکو قەشە ل باژێرێ "هیبو" هاتیە دامەزراندن کو چەندین کیلومەتران ژ ڕۆژئاڤایێ باژێرێ قرتاجە یێ دوورە. ئوگستین ل دەسپێکێ مەسیحی نەبوو، بەلکو بەری هینگێ چووبوو سەر چەندین ئاینان هەتا ل دوماهیێ باوەری ب ئاینێ مەسیحیەتێ ئینای."

- "وەکو کیژ ئاینان؟"

- "بۆ ماوەیەکی ل سەر ئاینێ "مانەوی"بوو کو ڕێبازەکا ئاینی بوو ل چەرخێن کەڤن یێن گیرو و خوەدانا چەندین ساخلەتێن جوان بوو. یەك ژ ساخلەتێن ڤی ئاینی ئەو بوو کو دیتنەکا نیڤ ئاینی و نیڤ فەلسەفی هەبوو. ب بۆچوونا وان، جیهان ل سەر دوو بەشان هاتیە دابەشکرن ئەو ژی"باشی و خراپی، ڕۆناهی و تارِی، ڕۆح و ماددە". لێ ئەڤ بەشێ باشی و خراپیێ ب دلێ ئوگستینی نەبوو، چونکی ب شێوەیەکێ گشتی وی گرنگی ددا بابەتێ "ئاریشەیا خراپیێ"، ئانکو کا ژێدەرێ خراپیێ ل کیڤەیە. پشتی هینگێ بۆ ماوەیەکی باوەری ب فەلسەفەیا ستۆیکیان ئینا چونکی ب بۆچوونا ڤان فەیلەسۆفان چ سنوور دناڤبەرا باشی و خراپیێ دا نینن. لێ پترى هەموويان ب فەلسەفەیا چەرخێن کەڤن یێن گیرو داخباربوو ب تایبەت فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی یا نوو. ل وێرێ فێری هندێ بوو کو هەر تشتەکێ د گەردوونی دا هەی، سروشتەکێ خودای هەیە."

- "هۆسا ئەو بوو قەشەیەکێ ئەفلاتۆنی یا نوو؟"

- "بەلێ، پشتی ئەو چوویە سەر ئاینێ مەسیحیەتێ ژی، لێ هێشتا ب فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی یێ داخبار بوو. ژبەر هندێ ئەم نەشێن بێژین کو ئەو ب تەمامی ژ فەلسەفەیا گریکی هاتە دابرین، چونکی هەتا دەستپێکرنا چەرخێن ناڤەڕاست، پشکەکەکا هەرە مەزن یا فەلسەفەیا گریکی ب ڕێکا هندەك قەشەیێن دێرێ ب خوە ما ساخ."

- "ئەرێ مەرەما تە ئەوە کو قەشە ئوگستین 50٪ مەسیحی بوو و 50٪ ئەفلاتۆنی یا نوو بوو؟"

- "وی خوە هۆسا ددا دیارکرن کو ئەو 100٪ مەسیحی یە، لێ دگەل هندێ ژی وی چ هەڤدژی دناڤبەرا ئاینێ مەسیحیەتێ و فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی دا نەددیتن. بەروڤاژی، وی هەڤچوونێن مەزن دناڤبەرا فەلسەفەیا ئەفلاتۆنی و ڕێنماییێن مەسیحیەتێ دا ددیتن، تا وی ڕادەی هندەك جاران وی پرسیار دکر ئەرێ ئەفلاتۆنی هندەك ژ نڤیسین و ڕێنماییێن پەڕتووکا پیرۆز خواندینە؟ لێ چ ڕاستی بۆ ڤێ چەندێ نەبوون، ژبەر هندێ یا دروستر ئەوە بێژین ئوگستینی ئەفلاتۆن کرە مەسیحی."

- "باشە، ئانکو پشتی ئەو بوویە مەسیحی، وی ب تەمامی پشتا خوە نەدا فەلسەفێ؟"

- "نەخێر. بەلکو وی ب ئاشکەرای دگوت ئاینی هندەك سنوور هەنە و ئەقل نەشێت تێرا دەرباز ببیت. دڤێت ژبیرنەکەین کو مەسیحیەت ل دەڤ وی، نهێنیا خودای بوو، کەس نەشێت هەست ب ڤێ چەندێ بکەت ب تنێ ب ڕێکا باوەری ئینانێ نەبیت. ب باوەری ئینانێ، خودا ناخێن مە ڕۆهن دکەت و هاریکاریا مە دکەت نێزیکی زانینا وی ببین، ئەو زانینا د سەر سروشتی دا. لێ ژبەرکو قەشە ئوگستینی هەست ب سنوورێن فەلسەفێ دکر، ئەو نەدشیا ب گەهیتە ئارامیا دەروونی هەتا باوەری ب ئاینێ مەسیحیەتێ ئینای ژ نوو هەست ب ڤێ ئارامیێ کر، وی ب ڤی ڕەنگی دەربڕین ژ ناخێ خوە کر و گوت: "دلێ مە هەموو گاڤان یێ نەڕەحەتە هندی ئارامیێ نەبینیت."

سۆفیایێ پرسیار کر: "ئەرێ چ پەیوەندی دناڤبەرا ئاینێ مەسیحیەتێ و تیورا ئەفلاتۆنی دا هەبوو؟ باشە ل ڤێرێ چارەنڤیسیێ بیرۆکەییێن نەمر و هەتا هەتایی چ لێ هات؟"

- " ئوگستینی باوەری ب وێ بیرۆکەیا دروستکرنا جیهانێ ژ چنەیێ ژ لایێ خودای ڤە ئینا ئەوا د تەوراتێ دا هاتیە بەحسکرن. ئەڤە ل دەمەکی و فەیلەسۆفێن گریکی دگوت هەر ژ دەستپێکێ جیهان هەبوویە. ئەوی دگوت بەری خودا جیهانێ بئافرینیت، بیرۆکە هەموو ل دەڤ وی هەبوون، ئانکو وی بیرۆکە هەموو بۆ خودای دزڤڕاندن. ب ڤی ڕەنگی وی بۆچوونێن ئەفلاتۆنی ل دور بیرۆکەییێن نەمر ڕزگارکرن."

- "بەلێ ئەڤە نە بۆچوونەکا سادەیە."

- "ئەڤە بەلگەیە ل سەر هندێ کو هندەك قەشەیێن دێرێ داگێڕان* دکرن داکو بشێن لێکنێزیککرنەکێ دناڤبەرا بیرۆکەیا گریکی و بیرۆکەیا جوهیاتیێ دا پەیدابکەن. هەردیسان ئوگستینی باوەری ب بۆچوونا ئەفلاتۆنیا نوو دەربارەی خڕابیێ هەبوو: ب بۆچوونا وی، هەروەکو ئەفلۆتینی ژی گوتی، خڕابی ژ ئەنجامێ دیارنەمانا خودای پەیدادبیت، ئانکو خڕابی ب شێوەیەکێ سەربەخو نینە و چ ڕاستی بو هەبوونا وێ نینن. ئانکو هەبوونا خودای ب تنێ باشیە، لێ خڕابی هینگێ پەیدادبیت دەمێ مرۆڤ نەگوهداریا خودای دکەت. یان ژی ڕۆهنتر بێژین: حەزا باشیێ یەکە ژ کارێن خودای، لێ حەزا خڕابیێ ئەوە دەمێ مرۆڤ ژ خودای دوور دکەڤیت."

- "باشە چ ل ڕۆحا مرۆڤی دهێت پشتی دمریت؟"

- "قەشە ئوگستین د وێ باوەریێ دا بوو کو پشتی خودای ئادەم و حەوا ژ بەهەشتێ کرینە دەرێ، مرۆڤایەتی هەموو ژ ناڤچووبوو. لێ سەرەڕای هەموو تشتان، خودای بڕیار دا هندەك مرۆڤان ژ ناڤچوونێ قورتال بکەن."

سۆفیایێ ب نەڕازیبوون ڤە گوت: "مادەم ئەو دناڤ هەموو مرۆڤان دا هەیە، ئەو دشیا هەموو مرۆڤان قورتال بکەت."

- "لێ قەشە ئوگستینی مافێ ڕەخنەگرتنێ ل خودای ژ لایێ مرۆڤان ڤە دەربارەی ڤێ خالێ ب هەموو ڕەنگان ڕەتدکر. بەلکو وی پشتەڤانی ل وی تشتی دکر یێ قەشە پۆلسی بۆ خەلکێ ڕۆمایێ نڤیسای: "ئەی مرۆڤ تو کی هەتا ڕەخنێ ل کارێن خودای بگری. ئەرێ فۆرمەك دشێت ڕەخنێ ل ئافرینەرێ خوە بگریت و بێژیتێ تە بۆچی ئەز ب ڤی ڕەنگی ئافراندیمە؟ ئەرێ ما گوسك دروستکەرەکی شیانێن زالبۆنێ ل سەر تەڤنێ نەبن دێ چەوا شێت گوسکەکێ جوان دروست کەت و ژ هەمان تەڤنێ گوسکەکێ دی یێ خڕاب دروست کەت؟"

- "ئەرێ باشە ما خودا ل ئەسمانی بۆ خوە یاریان ب مرۆڤان دکەت؟ یان ژی هەر تشتێ ب دلێ وی نەبیت پاڤێژیتە د تەنەکا گلێشی دا؟"

---

* تنازل

- "ئوگستینی پێکۆل دکر مە تێبگەهینیت کو چ مرۆڤ هەژی هندێ نینن خودا وان ڕزگار بکەت، لێ دگەل هندێ ژی خودای هندەك مرۆڤ هەلبژارتینە کو ژ تارپاتیێ ڕزگار بکەت. ژبەر هندێ ئەو باش دزانیت کا دێ کیژ مرۆڤ ڕزگاربیت و کیژ مرۆڤ دێ ژناڤچیت، ئانکو بەری هینگێ بڕیار هاتیەدان. ئەم ژی وەکو وێ تەڤنێ یێ ل بن دلوڤانیا خودای."

- "ئانکو ب ڤێ ڕێکێ، ئەو ڤەگەڕیا سەر باوەریا خوە یا کەڤن ل دور قەدەرێ؟"

- "تا ڕادەیەکی. لێ قەشە ئوگستین نکولیێ ژ بەرپرسیاریا مرۆڤی ل دور ژیانا وی یا تایبەت ناکەت بەلکو شیرەتا وی بۆ مە ئەو بوو کو هەر یەك ژ مە هۆسا بژیت و ڕەفتارێ بکەت هەروەکو کو ئەو یەکە ژ کەسێن هەلبژارتی و ڕزگاربووی. هەردیسان ئەو نکولیێ ناکەت کو هەموو مرۆڤان ئازادیا هەلبژارتنێ هەیە لێ خودای بەری نوکە بڕیار دایە کا ئەم دێ چەوا ژین."

سۆفیایێ پرسیار کر: "باشە ما نە پیچەکا زۆلمێ د ڤێ چەندێ دا هەیە؟ چونکی سۆکراتی دگوت کو هەموو مرۆڤان دەلیڤەیێن وەکهەڤ هەنە ژبەرکو هەموو مرۆڤان ئەقل هەیە، لێ قەشە ئوگستینی مرۆڤایەتی ل سەر دوو بەشان دابەش دکر: بەشەك ئەوێن ڕزگار دبن و بەشەك ژی ئەوێن ژناڤدچن."

- "تو ڕاست دبێژی، تیورێن قەشە ئوگستینی یێن لاهوتی پیچەکێ ئەم ژ فەلسەفەیا گریکی دوور کرین. لێ ئەوی ب خوە مرۆڤ ل سەر دوو جۆران دابەشنەکرینە بەلکو وی پشت بەستن کریە سەر وێ بۆچوونا د تەوراتێ دا ل دور ڕزگاربون و ژناڤچوونێ هەی. ئەو کوورتر دچیتە دناڤ بابەتی دا و د پەڕتوکەکێ دا ب ناڤێ "دەربارەی شاهنشینا خودای" ب درێژاهی بەحسێ وێ دکەت."

- "بۆ من بەحسێ وێ بکە."

- "تێگەهێ "شاهنشینا خودای" ژ پەڕتووکێن تەورات و ڕێنماییێن ئینجیلێ هاتیە وەرگرتن. و تێدا بەحسێ هەڤڕکیا دناڤبەرا "شاهنشینا خودای" و"شاهنشینا ئەردی" دا دکەت. ئەڤ هەردوو شاهنشینە نە دوو دەولەتێن سیاسی یێن ژێکجودانە، بەلکو ئەو دوو شاهنشینن و دناخێ هەر مرۆڤەکی دا هەڤڕکیێ دکەت. ژ دەرڤە ژی، شاهنشینا خودای دناڤ دێرێ دا دهاتە دیتن، لێ شاهشنینا ئەردی دناڤ ڕێکخراوێن سیاسی دا دهاتنە دیتن، بۆ نموونە دناڤ ئیمپڕاتۆریا ڕۆمانی دا ئەوا ل سەردەمێ قەشە ئوگستینی ژناڤچووی. ب

درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست و دگەل بەردەوامیا هەڤرکیا دناڤبەرا دێر و دەولەتێ ل سەر دەستهەلاتێ، ڤی تێگەهی پتر جهێ خوە دکر. ل دوماهیێ شاهنشینا خودای یا ئوگستینی ب تەمامی دگەل دێرێ تێکەلبوو وەك بنیاتێ ڕێکخستی یێ دێرێ و کەسێ ژی نەڕازیبوونا خوە ل سەر ڤێ خوە سەپاندنا دێرێ دیارنەکر هەتا چەرخێ شازدێ زاینی."

- "ئانکو درەنگ خەلکی خوە نەڕازیکر؟"

- "مە تیبینیا هندێ کر کو ڤەشە ئوگستین یەکەم فەیلەسۆف بوو یێ دیرۆك ئینایە دناڤ فەلسەفەیا خوە دا. هەرچەندە هەڤرکیا دناڤبەرا باشی و خراپیێ دا نە بیرۆکەیەکا نوو بوو، بەلێ تشتێ نوو ئەو بوو کو ئەڤ بیرۆکە دناڤ دیرۆکێ دا ببوو ڕاستی و هاتبوو ڕوودان، بێ کو کاریگەریا ئەفلاتۆنی ل سەر هەبیت. هەردیسان ئەو ب بۆچوونا دیرۆکا هێلدار یێ داخباربوو ئەڤا د پەیمانا کەڤن دا هاتیە بەحسکرن: بیرۆکە ئەو بوو کو خودا پێدڤی ب دیرۆکێ هەموویێ هەیە داکو شاهنشینا خودای ل سەر ئەردی بجهـ بینیت. دیرۆك یا گرنگە ژ بۆ سەرئێخستنا باشیێ و ژناڤبرنا خراپیێ. هەروەکو ڤەشە ئوگستینی دیارکری، ڕۆناهیا خودای دیرۆکا مرۆڤایەتیێ گەش دکەت، ئانکو هەر ژ دەستپێکا ئادەمی هەتا دوماهیا دیرۆکێ. هەروەکو بێژی ئەڤ دیرۆکە وەکو زارۆکەکێ ساڤا بیت هێدی هێدی ب ڕێڤە بچیت هەتا ل دوماهیێ پیر دبیت."

سۆفیایێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر و گوت: "دەمژمێر یا بوویە هەشتی سپێدێ، پێدڤیە نوکە ئەز بچم."

- "باشە، لێ پێدڤیە بەری تو بچی، ئەز بەحسێ فەیلەسۆفێ دووێ یێ گرنگ د چەرخێن ناڤەڕاست دا بۆ تە بکەم. ئەگەر تە بڤێت دێ چینە ژ دەرڤە ڕوونینە خوارێ؟

ئەلبێرتۆ ڕابووڤە بەرەڤ دەرگەهی چوو. سۆفیا ژی ڕابووڤە و دا ب دووڤ ڤە، چونکی وێ چ هەلبژارتنێن دی نەبوون.

ژ دەرڤەی هۆلا دێرێ، پنیێن عەورێن ل پشت گری نەبەرزە ببوون. هەرچەندە ئەو ماوەیەکێ درێژ بوو هەتاڤ هەلاتی، لێ نەشیابوو تەخێن تەنك یێن عەوران ببڕیت و بگەهیتە سەر ئەردی. دێرا ڤەشە یوحەنای دکەڤتە لایێ دی یێ باژێری.

ئەلبێرتۆ ل سەر قەنەپەیەکا داری یا ل بەر دەرگەهێ دێرێ ڕوونشت. سۆفیایێ پێکۆل دکر بینتە پێشچاڤێن خوە کا دێ چ ڕوودەت ئەگەر کەسەکێ نیاس ئەو دیتن، چونکی تشتەکێ سەیر بوو ئەو ل سەر قەنەپەیەکا هۆسا و ل دەمژمێر هەشتی سپێدێ ب ڕەخ ڕەبەنەکێ چەرخێن ناڤەڕاست دا بڕوونیتە خوارێ."

- "نوکە دەمژمێر هەشتی سپێدی یە، ئانکو ئەڤە چوار چەرخ ل سەردەمێ قەشە ئوگستینی ڤە بورین و ئەڤرۆکە دەستپێکا ڕۆژەکا نوویە." هەتا دەمژمێر دەهێ ژی، هێشتا دێرێ کونترۆل ل سەر بوارێن پەروەردە و فێرکرنێ دکر هەتا یەکەمین قوتابخانەیێن پەیوەندی ب مەتراخانەیان ڤە هەی هاتینە دروستکرن. دناڤبەرا دەمژمێر دەهـ و یازدەی بەری نیڤرو ژی دا یەکەم زانکۆ هاتنە ڤەکرن. ئەڤ دێرە ژی ل سالا 1200 زایینی هاتیە ئاڤاکرن، ئانکو ل سەردەمێ چەرخێن ناڤەڕاست یێن گیرو کو ل وی دەمی خەلکی شیانێن ئاڤاکرنا مەترانخانەیان نەبوون.

سۆفیایێ ب نەڕازیڤە گوت: "بەلێ ئەڤ دێرە د پێدڤی نەبوون، ئەز حەز ژ دێرێن ڤالاڵ ناکەم."

- "بەلی پا مەترانخانە نەك تنێ ژ بۆ خڕڤەکرنا گرۆپێن ئاینی یێن مەزن دهاتنە ئاڤاکرن، بەلکو ژ بۆ پەڕستن و ڕێزگرتنا خودای ژی دهاتنە ئاڤاکرن. ژ بلی هندێ ژی وەك نیشانەك بۆ خزمەتکرنا خودای دهاتنە ل ڤەلەمدان. پشتی هینگێ، ل چەرخێن دی یێن ناڤەڕاست تشتەکێ گرنگ ڕوودا کو بۆ مە فەیلەسۆفان جهێ گرنگیپێدانێ یە."

ئەلبێرتوی بێهنا خوە کوور هەلکێشا و بەردەوامی دا ئاخفتنێ.

- "هێدی هێدی کاریگەریا عەرەبان ل ئیسپانیا بەرەڤ زێدەبوونێ چوو. ب درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست، ئەو فێری دابونەریتێن ئەڕستۆی بوون. ل چەرخێ دوازدێ زایینی، هندەك زانایێن وان ل دووڤ داخوازیا میرێن باکورێ ئیتالیا سەرەدانا وەلاتێ وان کر. ل وی دەمی ڤان زانایان دووبارە هندەك پەڕتووکێن ئەڕستۆی ئاشکەرا کرن و پشتی هینگێ هێدی ئەڤ پەڕتووکە ژ زمانێ عەرەبی یان گریکی هاتنە وەرگێڕان بۆ سەر زمانێ یونانی. ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر دووبارە گرنگی ب زانسێن سروشتی و پەیوەندیا دناڤبەرا باوەریا مەسیحی و فەلسەفەیا گریکی بهێتە دان. تا وی ڕادەی ئێدی هەر دەمێ بەحسێ زانستێن سروشتی

هاتبایه کرن، ڕۆلێ ئەرستۆی نەدهاته ژبیرکرن، لێ کەنگی دێ گوهێ خوە دەینە فەیلەسۆفەکی؟ و کەنگی ژی دێ گوهداریا پەرتووکا پیرۆز کەین؟ تە زانی چ ئاریشە پەیدابوو؟

سۆفیایێ ب بەلێ سەرێ خوە هەژاند و ڕەبەنی ژی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "گرنگترین و مەزنترین فەیلەسۆفێ خەرجێن ناڤەراست یێن گیرو، قەشە تۆماس ئاکوین بوو، ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1225 هەتا 1274ێ دا ژیای. ئەڤ قەشە ل دەڤەرا "ئەکوینو" یا دناڤبەرا باژێرێن ڕۆما و ناپولی دا ژ دایکبوویە و خواندنا خوە ل زانکویا پاریسێ تەمامکریە. من ناڤێ وی کریە فەیلەسۆف، لێ ئەم دشێین بێژینێ لاهوتی* ژی، چونکی ل وی سەردەمی گەلەك یا ب زەحمەت بوو فەیلەسۆف و لاهوتیان ژێکجودا بکەی. ب کورتی، قەشە تۆماسی، قەشە ئەرستۆ کرە مەسیحی هەروەکو کا چەوا قەشە ئوگستینی ئەفلاتۆن کریە مەسیحی."

- "ئەرێ ما ل سەر وان یا ب زەحمەت نەبوو هندەك فەیلەسۆفان بکەنە مەسیحی کو ب چەندین چەرخان بەری هاتنا ئاینێ مەسیحیەتێ ژیاینە؟"

- "چ پێنەڤێت. لێ مەرەم ژ مەسیحیکرنا ڤان هەردوو فەیلەسۆفێن مەزن ئەو بوو کو فەلسەفەیا وان ب شێوەیەکێ هۆسا دهاتە شرۆڤەکرن چ هەڤدژی دگەل ڕێنما و بیروبۆچوونێن مەسیحیەتێ نەبن. قەشە تۆماس ئاکوینی دهێتە هەژمارتن یەك ژ فەیلەسۆفێن دەستپێکی یێن پێکۆلا گەهاندنا ئەرستۆی و مەسحیەتێ دا دکری. ژبەر هندێ ڕابوو ب پێکڤەگرێدانا باوەری و زانستی. ئەو شیا د ڤێ چەندێ دا ب سەرکەڤیت، ئێدی فەلسەفەیا خوە ژ ئەرستۆی وەردگرت.

- "شڤێدی ئەز نەنڤستیمە، ژبەر هندێ ل من ببورە ئەگەر باش د هەموو بابەتان نەگەهەم. هیڤی دکەم پیچەکێ بۆ من ڕۆهنتر لێ بکە."

- "تۆماس ئاکوینی د وێ باوەریێ دا بوو کو پێدڤی ناکەت هەڤڕکی دناڤبەرا نامەیا فەلسەفی و ئەقلی دا ژلایەکی ڤە، نامەیا مەسیحی و باوەریێ دا ژ لایەکێ دی ڤە هەبیت.

* لاهوتی یان ژی زەلامێ ئولی Theologian ئەو کەسە یێ گرنگیێ ددەتە ئاینناسیێ.

ژبەر ڤێ چەندێ، ب ڕێکا ئەقلی ئەم دشێین بگەهینە وان ڕاستیان یێن ئینجیلێ بەحسکرین.

- "ئەڤ چەندە چەوا چێدبیت؟ ئەرێ ئەقل دشێت بێژیتە مە کو خودای جیهان د هەیاما شەش ڕۆژان دا ئافراندیە؟ یان ژی عیسا کورێ خودایە؟"

- "نەخێر. ئەو نەشێت بەحسێ ڤان بابەتێن ئاینی بکەت یێن کو ب تنێ ب ڕێکا باوەریێ ئەم دشێین بزانین. لێ ئاکوینی دڤیا بێژیتە مە زنجیرەکا "ڕاستییێن سروشتی یێن لاهوتی" هەنە، ئانکو ئەو ڕاستییێن ب ڕێکا باوەری و وەحی و ئەقلێ زکماکی "یان ژی ئەقلێ سروشتی" دشێین هەست پێبکەین. یەکەمین ڕاستی دەربارەی هەبوونا خودایە. ب بۆچوونا قەشە تۆماسی، دوو ڕێك هەنە مرۆڤ پێ بگەهیتە خودای: ڕێکا یەکێ، ڕێکا باوەری و وەحیێ یە. ڕێکا دووێ، ڕێکا ئەقلی و تاقیکرنا هەستێن مەیە. یا دیارە کو ڕێکا باوەری و وەحیێ پتر جهێ باوەریێ یە چونکی ئەگەر ب تنێ ئەم باوەر ژ ئەقلێ خوە بکەین ڕەنگە هەر زوو و ب سانەهی بەرزە ببین. قەشە تۆماسی دڤیا دووپات بکەت کو چ هەڤڕکی دناڤبەرا فەیلەسۆفەکێ وەکو ئەرستۆی و لاهوتێ دا نینە."

- "باشە، د ڤێ چەندێ دا ئەم دشێین پشتا خوە ب ئەرستۆی گەرم بکەین هەروەکو کا چەوا پشتا خوە ب ئینجیلێ گەرم دکەین؟"

- "پێدڤی ناکەت تو وەبێژی. ئەرستۆی ب تنێ بەشەکێ ڕێکێ بڕی بوو، چونکی وی ئاینێ مەسیحیەتێ نەنیاسی بوو. لێ بڕینا بەشەکێ ڕێکێ، ڕامانا وێ ئەو نینە کو وی ڕێکا شاش هەلبژارت بیت. بۆ نموونە ئەم د شاش نینین ئەگەر بێژین باژێرێ ئەسینایێ دکەڤیتە کێشوەرێ ئەوروپا، لێ د هەمان دەم دا ئەم باش نزانین ژی کا ب دروستاهی دکەڤیتە کیژ وەلاتێ ئەوروپی. ئەگەر د پەڕتووکەکێ دا ب تنێ گوت بیت ئەسینا دکەڤیتە کێشوەرێ ئەوروپا، تو دێ نەچاربی تەماشەی پەڕتووکا جوگرافیێ بکەی دا بزانی ب دروستاهی ئەسینا دکەڤیتە کیژ وەلاتی. ل وێرێ ڕاستیا هەموو بابەتی دێ بۆ تە دیار بیت و دێ زانی کو ئەسینا پایتەختێ وەلاتێ یونانێ یە و یونان ژی وەلاتەکێ بچووکە ل باشورێ ڕۆژهەلاتێ کێشوەرێ ئەوروپا. هەردیسان دێ هندەك پێزانینان ل دور ئەکرۆپۆل و سۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆی ژی زانینی."

- "بەلێ پا پێزانینا دەستپێکێ ژی یا دروست بوو."

- "هەلبەت، قەشە تۆماسی دڤیا بگەهیتە ڤێ چەندێ: ل ڤێرێ ب تنێ یەك ڕاستی هەیە. دەمێ ئەرستۆی دیارکری کو ئەو تشتێ ئەقل دانپێدانێ پێ دکەت یێ دروستە، ب ڤێ چەندێ ئەو دگەل ئاینێ مەسیحیەتێ دا یێ هەڤدژ نەبوو. ب هاریکاریا ئەقلێ خوە و هەستێن مە، ئەم دشێین بگەهینە بەشەکێ ڕاستیان، لێ خودای ژی ب ڕێکا "ئینجیلێ" بەشێ دی یێ وان ڕاستیان بۆ مە دیارکریە. د گەلەك بواران دا، ئەقل و وەحی هەڤدوو دبڕن و تێکەل دبن داکو هەمان بەرسڤ بدەنە مە."

- "بۆ نموونە، ڕاستیا هەبوونا خودای؟

- "بەلێ. بەری هینگێ فەلسەفەیا ئەرستۆی دووپاتیێ ل سەر هەبوونا خودای "ئەگەرێ دەستپێکی" د بنیاتێ هەموو دیاردەیێن سروشتی دا دکەت، لێ ئەو چ شرۆڤەکرنێن زێدەتر ل دور خودای نادەتە مە. ل ڤێرێ پێدڤیە ئەم پەنایێ بەینە بەر پەڕتووکێن ئاینی.

- "باشە دێ چەوا پشتڕاست بین کو خودا یێ هەی؟"

- "گومان تێدا نینە کو ئەڤ بابەتە هەژی گەنگەشکرنێ یە. لێ پتریا خەلکێ ل سەردەمێ ئەڤرۆکە ل سەر هندێ ڕێکەفتینە کو ئەقلێ مە نەشێت تشتەکێ بەروڤاژی ڤێ چەندێ دووپات بکەت، ئانکو ئەقلێ مە نەشێت نەبوونا خودای دووپات بکەت. لێ قەشە تۆماس ژ ڤێ چەندێ بوری یە و گوتیە کو میتافیزیکیا ل دەڤ ئەرستۆی، دشێت بوارەکی ژ بۆ دووپاتکرنا خودای بدەتە مە."

- "ئەو گەلەك یێ چاڤنەترس بوو!"

- "ئەقلێ مە دبێژیت هەر تشتەکێ دەوروبەری مە، پێدڤیە بیناتەکێ دەستپێکی یێ خودای هەبیت. ئانکو خودای ب ڕێکا سروشتی و وەحیێ خوە بۆ مرۆڤان ئاشکەرا کریە. ژبەر هندێ پەنابرن بۆ لاهوتا باوەریێ بۆ مە باشترە ژ پەنابرنێ بۆ لاهوتا سروشتی.

- "هەمان ڕێسا ل سەر لایەنێ ڕەوشتی ژی دهێتە بجهـ ئینان ب ڕەنگەکی کو خودای بۆ مە دەستنیشان کریە کا دێ چەوا ژین، لێ د هەمان دەم دا ناخەك دایە مە کو بشێین ب ڕێکەکا سروشتی باشی و خراپیێ ژێکجودا بکەین. ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە دوو ڕێك بەرەڤ ژیانا ڕەوشتی هەنە. ئەم دزانین سفکاتیپێکرن و زیان گەهاندنا کەسێن دی تشتەکێ خراپە، خو هەکە ئەم پەڕتووکێن ئاینی ژی نەخوینین، لێ ل سەر مە یا پێدڤیە ئەم هۆسا حەز ژ

جیران و کەسوکارێن خوە بکەین کا چەوا ئەم حەز ژ خوە دکەین. لێ چ پێنەڤێت ل ڤێرێ پەنابرن بۆ ناخێ مرۆڤی ب تنێ مەترسیدارترە ژ پەنابرنێ بۆ پەرتووکێن ئاینی."

سۆفیایێ گوت: "هێدی هێدی ئەز یا د بابەتی دگەهم. ئەڤ بابەتە وەکو وێ بریسیێ یە یا ئەم پێشبینیا رووداناوێ دکەین، ڤێجا چ ب رێکا رۆناهی یان دەنگێ وێ."

- "بەلێ، ئاها ب ڤی رەنگی یە، هەتا کەسەکێ کورە ژی دشێت گوهـ ل دەنگێ بریسیێ ببیت و کەسەکێ کەر ژی دشێت رۆناهیا وێ ببینیت بێ کو هەڤدژیەك دناڤبەرا وی تشتێ گوهـلێدبیت و دبینیت هەبیت، چونکی ئەڤ هەردوو هەستە تەمامکەرێن هەڤدوونە."

- "ئەز دزانم کا تە دڤێت چ بێژی."

- "دێ بۆ تە بەحسێ نموونەکا دی کەم. دەمێ تو رۆمانا "فیکتوریا" یا "کنوت هامسون"ی دخوینی."

- "تە ئەڤ جارە بەحسێ تشتەکی کر کو من یا خواندی."

- "ئەرێ تو دشێی تنێ ب رێکا خواندنا ڤێ پەرتووکەکێ، تا رادەیەکی نڤیسەرێ وێ بنیاسی یان بزانی هزروبیرێن وی د چەوانە؟"

- "ئەگەر چ پێزانینان ل سەر نەزانم ژی، هەر چ نەبیت دێ زانم نڤیسەرەك هەیە و پەرتووکەکا نڤیسی."

- "باشە و چ دی؟"

- "دێ زانم کو وی تێگەهەکێ رۆمانسی دەربارەی ئەڤینیێ هەیە."

- "دگەل خواندنا ڤێ پەرتووکا هامسونی، تا رادەیەکی دێ بیروبۆچوونێن نڤیسەری بۆ تە دیاربن، لێ تو نەشێی پێشبینیا هندێ بکەی کا کەسایەتیا نڤیسەری یا چەوایە. بۆ نموونە، ئەرێ پشتی خواندنا رۆمانێ دێ زانی کا ژیێ نڤیسەری چەند بوو دەمێ ئەو رۆمان نڤیسی؟ ئەرێ دێ زانی ل کیڤە ژیایە یان چەند زارۆك هەنە؟"

- "چ پێنەڤێت، ئەز نزانم."

- "لێ تو دشێی ڤان پێزانینان هەموویان د بیوگرافیا "ژیاننامەیا" نڤیسەری دا بزانی، ژبەرکو ب تنێ بیوگرافیا وی دێ دەلیڤێ دەتە تە نڤیسەری وەك بونەوەرەکێ مرۆڤی بنیاسی و پێزانینان ل دور ژیانا وی یا کەسایەتی وەربگری."

- "ئەڤ چەندە راستە."

- "هەمان پەیوەندی دناڤبەرا ئەفراندییێن خودای و ئینجیلێ دا هەیە. دەمێ تەماشەی سروشتی دکەین دێ زانین کو خودا یێ هەی. هەروەسا دێ زانین کو ئەو حەز ژ شینکاتی و گول و گیا و گیانەوەران دکەت، هەکە پا دا بۆچی ئافرینیت؟ لێ هەمووو ئەو تشتێ ب خودای ڤە گرێدای یێن د ئینجیلی "پەرتووکێن ئەسمانی" دا هاتیە بەحسکرن."

- "ئەڤە نموونەیەکا باش بوو."

- "بەلێ..."

بۆ یەکەم جار ئەلبێرتۆ بێدەنگ ما و هزرێن خوە کرن. سۆفیایێ پرسیار کر: "ئەرێ ڤێ چەندێ هەموویێ پەیوەندی ب هێلدێ ڤە هەیە؟"

- "ئەرێ مە باوەری هەیە کو راستیەك بۆ هەبوونا ڤێ کچکا ب ناڤێ هێلد هەیە؟"

- "بەلێ ئەم شوونوارێن وێ ل ڤێرێ و وێراهە دبینین. بۆ نموونە: پۆستکارت، دەستمالا سۆر، جزدانکا کەسك و گورەیێن هەتا سەر چووکان."

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە خوراند و دەست ب ئاخفتنێ کرە ڤە.

- "رەنگە بابێ هێلدێ ڤان کاران ئەنجام بدەت. لێ هەتا نوکە ب تنێ ئەم دزانین کەسەك یێ وان کارتان هەموویان دهنێریت. یا باشتر بوو وی جارەکێ پیچەکێ بەحسێ خوە ژی کربایە. لێ چ نینە پاشی دێ هێینە سەر وی بابەتی."

- "دەمژمێر یازدە کێم چارێکەکە، پێدڤیە بەری سەردەمێ چەرخێن ناڤەراست ب دوماهی بهێت ئەز بزڤرمە مال."

- "ئەز دێ بابەتێ خوە ب چەند پەیڤەکان ب دوماهی ئینم، دێ بۆ تە شرۆڤە کەم کا چەوا تۆماس ئاکوینی ئەو لایەنێن فەلسەفەیا ئەرستۆی دوەرگرتن یێن هەڤدژی دگەل بیروباوەرێن ئاینێ مەسیحی نەی. ئانکو لایەنێ لوژیکێ ئەرستۆی و فەلسەفەیا مەعریفی و فەلسەفەیا سروشتی. ئەرێ بیرا تە ل وێنەیێ پێسترکا ژیانێ دهێت ئەوا کو ژ رووەکان دەستپێدکری و پاشی بەرەڤ گیانەوەران دچووی هەتا ل دوماهیێ دگەهشتیە مرۆڤی؟"

سۆفیایێ ب بەلێ سەرێ خوە هەژاند، وی ژی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "ئەرستۆ د وێ باوەرێ دا بوو کو ئەڤ پێسترکە ب خودای ب دوماهی دهێت. ئەڤ وێنەیە ل سەر لاهوتێ مەسیحی ژی دهێتە بجهـ ئینان. ڤەشە تۆماس د وێ باوەرێ دا بوو

هەموو گاڤان پلەیەکا پێشکەفتنێ یا بلندتر ژ ڕووەکان بۆ گیانەوەران، ژ گیانەوەران بۆ مرۆڤان، ژ مرۆڤان بۆ فریشتەیان و ل دوماهیێ ژ فریشتەیان بۆ خودای هەیە. مرۆڤ و گیانەوەر هەردوو د خالەکێ دا د هەڤپشکن کو هەردووان ئەندامێن هەستکرنێ هەنە، لێ مرۆڤان پلەیەکا پێشکەفتنێ یا بلندتر ژ گیانەوەران هەیە، ئەو ژی کو مرۆڤان ئەقل هەیە "ئانکو دشێت هزرێن خوە بکەت". لێ فریشەیان چ لەش و ئەندامێن هەستپێکەر یێن وەکو مرۆڤان نینن، لێ وان بیرتیژیەکا مەزن و ڕاستەخو هەیە کو وەکو مرۆڤان پێدڤی ب هزرکرنێ نابن. ئانکو ئەو پێدڤی ب هندێ نابن ل دور دەرئەنجامێن کاران بگەڕیێن ژبەرکو ئەو دزانن دێ چ ڕوودەت. هەردیسان ئەو هەموو وان تشتان دزانن یێن ئەم مرۆڤ دزانین بێ کو خوە وەکو مە هێدی هێدی فێر بکەن. فریشتەیان وەکو مە لەش نینە، ژبەر هندێ ئەو نامرن، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو ئەو وەکو خودای بۆ هەتا هەتایێ دنەمرن، ژبەرکو ئەو ژی ل دەمەکی ژ لایێ خودای ڤە هاتینە ئافراندن، لێ وان لەشەکێ دەستنیشانکری نینە ڕۆژەکێ ڕۆحا وان ژێ بهێتە دەرێ، ژبەر هندێ ئەو نامرن."

- "گەلەك باشە."

- "بەلێ خودا ل سەر فریشتەیان دایە ژی، ب ئاورینەکا ب تنێ، ئەو دشێت هەموو تشتان ببینیت و تێبگەهیت."

- "باشە نوکە ئەو زێرەڤانیا مە دکەت؟"

- "چێدبیت، بەلێ پا "نوکە"، چونکی دەم ل دەڤ خودای نینە هەروەکو کا چەوا ل دەڤ مە هەی. ئەو "نوکە"یا ل دەڤ مە نە ئەو "نوکە"یا ل دەڤ خودایە. هەردیسان دەمێ چەند حەفتی ل سەر مەڕا دبورن، ڕامانا وێ ئەو نینە ئەو حەفتی ل دەڤ خودای ژی بورین."

- هەتا ڤێرێ ئێدی سۆفیا نەشیا کونترۆلێ ل سەر خوە بکەت کو نەئاخڤیت

- "ئەڤ چەندە وەکو تەزینەکێ ل سەر پشتا من ڕا بوری."

پاشی وێ دەستێ خوە دانا سەر دەڤێ خوە داکو باوەشکا خوە بڤەشێریت و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "کارتەك ژ دەڤ بابێ هێلدێ گەهشتبوو من و تێدا نڤیسابوو، بورینا حەفتیەکێ یان دوو حەفتیان ل دەڤ سۆفیایێ نە وەکو حەفتیەك یان دوو حەفتییێن ل دەڤ مەیە. ڤێ چەندێ بیرا من ل وی تشتی ئینا یێ تە دەربارەی دەمی ل دەڤ خودای کری."

سۆفیایێ هەستپێکر کو سەروچاڤێن ئەلبێرتۆی د بن کولاڤێ وی یێ قەهوای ڤە تێکچوون.

- "پێدڤیە ئەو ژ خوە شەرم بکەت!"

سۆفیا د مەرەما وی نەگەهشت، پاشی ئەلبێرتۆ ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو.

- "نەخوشبەختانە، ڤەشە تۆماس ئاکوینی پشتا خوە ب هەلویستێ ئەڕستۆی ل دور ژنێ گەرم کربوو. بیرا تە دهێت کو ئەڕستۆی دگوت ژن زەلامەکێ نەتەمامە. هەردیسان وی دگوت زارۆك ساخلەتێن خوە ب تنێ ژ بابێن خوە وەردگرن. هەردیسان ژن ب تنێ توخمەکێ نەرێنی و وەرگرە بەلێ زەلام توخمەکێ چالاك و بەخشێنەرە. ڤەشە تۆماس د وێ باوەرێ دا بوو ئەڤ بۆچوونە دگەل بۆچوونێن تەوراتێ ل دور پەیدابوونا ژنێ ژ هەستیکێ زەلامی، هەڤدو دگرن.

- "کیژ ئاخفتن؟"

- "ل ڤێرێ یا گرنگە ئەم ئاماژێ ب هندێ بدەین کو ل سالا 1827ێ، ژ نوو ڤەکۆلین ل دور کریارا زانێ ل دەڤ بونەوەرێن شیردەر هاتنە ئەنجامدان و دیارکر ژنێ هێکدان* هەنە. ژبەر هندێ نە یا سەیرە ئەگەر دناڤ خەلکی دا هۆسا یا بەربەلاڤ بیت کو زەلام دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا زارۆکەکێ نوو و ژیانێ ددەتێ. تیبینیەکا گرنگ هەیە دڤێ ئاماژێ پێ کەین، ڤەشە تۆماسی ژن وەکو بونەوەرەکا کێمتر ژ زەلامی ل ڤەلەم ددا، لێ

* هێکدان (مبیچ Ovary): هەروەکو کا چەوا زەلامی دوو گون هەنە و توڤی چێدکەن، ئاها ژنێ ژی دوو هێکدان هەنە و هێکان بەرهەم دئینن، لێ جوداهی ئەوە کو رۆژانە گون توڤی دروست دکەن. لێ دەمێ ژن بۆ یەکەم جار پەیدادبیت نێزیکی 400 هێکێن نەپێگەهشتی د هێکدانا وێ دا دهێنە هەلگرتن و پشتی ژیێ بالقبوونێ هەتا نێزیکی 50 سالیێ، هەیڤێ جارەکێ یەك ژ ڤان هێکان گەشە دکەت و دهێتە دناڤ مالبچووکێ وێ دا و پێشوازیا توڤێ زەلامی دکەت داکو زاروکەکێ نوو دروست بکەن.

ڕۆحێن وان ل ئەسمانی دگەل یێن زەلامان د یەکسانن، ژبەرکو ل ئەسمانی یەکسانیەکا تەمام هەیە و هەمموو جوداهییێن پەیوەندی ب ڕەگەز و لەشی ڤە هەی ل وێرێ نینن."

- "هێجەتەکا نەبەرئاقلە. ئەرێ ما ل چەرخێن ناڤەڕاست چ ژنێن فەیلەسۆف نەبوون؟"

- "زەلامان کونترۆل ل سەر دێرێ کربوو، ڕامانا ڤێ چەندێ ژی ئەوە چ ژنێن هزرمەند نەبوون. ل وی دەمی ژنەك هەبوو ب ناڤێ "هێلدگاردا بینگانی."

- سۆفیایێ چاڤێن خوە زیق کرن.

- "باشە پەیوەندیەك دناڤبەرا وێ و هێلدێ دا هەیە؟"

- "ئەڤە چ پرسیارە! هێلدگارد ڕەبەنەکا دێرێ بوو ل دەڤەرا "ڕایندالند" دناڤبەرا سالێن 1098 هەتا 1179ێ دا ژیایە. ڕاستە ئەو ژن بوو، لێ وەك مزگینگەهێنەرا ئاینی و نوشدار و نڤیسەر کار دکر. د هەمان دەم دا، ڤەکۆلین ل سەر سروشت و ڕووەکان ژی دکر. ژبەر هندێ ئەم دشێین وێ وەکو نیشانەکێ ل دور کەتوارێ ژنێن چەرخێن ناڤەڕاست بدەینە دیارکرن."

- "ب تنێ من دڤیا بزانم کا پەیوەندیەك دناڤبەرا وێ و هێلدێ دا هەیە؟"

- "ل دووڤ تێگەهێ مەسیحی یێ کەڤن، خودا بونەوەرەکێ نێر ب تنێ نەبوو، بەلکو وی لایەنەکێ مێیاتییێ "سروشتەکێ دایکایەتییێ" ژی هەیە. چونکی ژن ژی ل دووڤ وێنەیێ خودای هاتیە ئافراندن. گریکی یێن کەڤن دگوتنە ڤی لایەنێ مێیاتییێ "سۆفیا" یان ژی "سۆڤ" کو ب ڕامانا "پەندیاری" دهێت."

سۆفیایێ ب تۆڕەی ڤە سەرێ خوە هەژاند: ئەرێ بۆچی هەتا نوکە کەسێ ڕامانا ناڤێ وێ بۆ وێ نەگوتیە؟ یان ژی بۆچی هەتا نوکە وێ پرسیار نەکریە؟

ئەلبێرتۆی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "سۆفیاتی ئانکو لایەنێ مێیاتییێ ل دەڤ خودای، ل چەرخێن ناڤەڕاست ڕۆلەکێ مەزن ل سەر دێرا یونانی یا ئورتودوکسی هەبوو، لێ ڕۆژئاڤای هێدی هێدی ئەڤ تێگەهە هاتە ژبیرکرن هەتا هێلدگارد هاتی و بانگەوازا هندێ دکر کو وێ "سۆفیا" یا د خەونا خوە دا دیتی و کراسەکێ زێڕی ل بەر بوو و خوە ب زێڕ و ئەلماسان نەخشاند بوو."

سۆفیا ژ جهێ خوه ڕابووڤه و هزرەك هاته د سەرێ وێ دا.

- "سۆفیایێ خوه نیشا هێلدگاردەرێ دا، چێدبیت ئەز ژی خوه نیشا هێلدێ بدەم."

پاشی ڕوونشته سەر جهێ خوه و ئەلبێرتۆی ژی دەستێ خوه دانا سەر ملێ وێ.

- "پاشی دێ بەحسێ ڤێ چەندێ کەین، لێ دەمژمێر یا نێزیکی یەکی نیڤرو دبیت و پێدڤیە تو بچی خوارنەکێ بخوی. وەکو دی ژی ئەم یێ نیزیکی دەستپێکا قۆناغەکا نوو دبین. ل دەمەکێ دی، دێ هەڤدوو بینینەڤە و بەحسێ سەردەمێ ڕێنیسانسێ کەین، دێ هێرمسی فرێکەمە دووڤ تەرا ل ناڤ باخچێ مالا هەوە."

هەتا ڤێرێ ڕەبەنی ئاخفتنا خوە ڕاوەستاند و بەرەڤ دێرێ ڤە چوو. لێ ئەو ل سەر جهێ خوە ما و سەرێ وێ دناڤ وان هزران دا مژوول ببوو یێن پەیوەندی ب هێلدگاردەر و سۆفیایێ ڤە هەین. ژ نیشکەکێ ڤە هەستپێکر تەزینکەك د سەر لەشێ وێ ڕا بوری، ژبەر هندێ بلەز ڕابووڤە و بەرەڤ مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ ڤە چوو.

- "ئەرێ ل چەرخێن ناڤەڕاست دا، زەلامەك هەبوو ب ناڤێ ئەلبێرتۆ؟"

مامۆستایێ وێ ل جهێ خوە ڕاوەستیا و پاشی ل دور خوە زڤڕی و گوتە سۆفیایێ: "ڤەشە تۆماس ل بەر دەستێ مامۆستایەکێ فەلسەفی دخواند دگوتنێ ئەلبێرتۆیێ مەزن."

پشتی وی ئەڤ ئاخفتنە گوتی، خوە دناڤ دێرێ دا بەرزەکر. سۆفیایێ ئەو وێرەکی هەبوو ل دووڤ وی بچیتە د ژوور ڤە، لێ وێ ژ بلی هۆلەکا ڤالا چ تشتێن دی نەدیتن. ئەرێ ئەو کیڤە چوو، وی چەوا خوە هۆسا بلەز ڤەشارت؟

دەمێ ئەو بەرەڤ دەرگەهی چووی داکو بدەرکەڤیت، وێ ب ڕێکێ ڤە وێنەیەکێ مەریەمایێ دیت. دەمێ نێزیکی وێنەی بوو و باش بەرێ خوە دایێ، ژ نیشکەکێ ڤە چیکەکا ئاڤێ ل بن چاڤێ وێ دیت، ئەرێ تو بێژی ئەڤە ڕۆندکەك بیت؟ سۆفیایێ بلەز دێر بجه هێلا و بەرەڤ مالا هەڤالا خوە جوانایێ ڤە کرە غار.

# چەرخێ رێنیسانس

***...ئەی رەگەزێ خودای یێ خوە دناڤ کەڤلوژانێ مرۆڤان دا ڤەشارتی...***

**دەمژمێر دوازدەی نیڤرو بوو دەمێ سۆفیا گەهشتیە بەر دەرگەهێ مالا جوانایێ وان و بێهنا وێ یا تەنگ بوو، جوانا ژی ل بەر دەرگەهێ خانیێ خوە یێ رەنگ زەر یا راوەستیای بوو و ل هیڤیا وێ مابوو.**

**جوانایێ لێ کرە قێری: "ئەڤە دەهـ دەمژمێر ل سەر چوونا تە بورین."**

**سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند و گوت: "نەخێر، ئەز بۆ ماوەیێ پتر ژ هزار سالان چووبووم."**

**- "تو ل کیڤە بووی؟ تو ژ راستا یا دین بووی. بەری نیڤ دەمژمێرێ دایکا تە تێلەفۆن کربوو."**

**- "باشە تە چ گوتێ؟"**

**- "من گوتی تو یا چوویە دکانێ هندەك تشتان بکری. وێ گوت کو پێدڤیە پشتی تو دزڤری بلەز تێلەفۆنا وێ بکەی. لێ ئاریشە دایك و بابێن منن. دەمژمێر دەهی سپێدێ ئەو هاتنە د ژوورا من ڤە و شیریناهیێن گەرم بۆ مە ئینابوون، لێ وان دیت جهێ تە یێ ڤالایە."**

**- "باشە پا تە چ گوتە وان؟"**

- "ئەز نەچاربووم چیرۆکەکا ژ درەو بئافرینم. من گوتێ جرۆبرەك دناڤبەرا مەدا روودا و ئەو تۆرە بوو و ژ دەڤ من چوو."

- "باشە ڤێت ئەم بلەز ژ هەڤدوو ئاش بین و هۆسا وان قانع بکەین کو ب کێمی هەتا حەفتیەکا دی دایك و بابێن تە ڤێ چەندێ نەبێژنە دایکا من. ئەرێ تو بێژی ئەم د پلانا خوە دا بسەرکەڤین؟"

جوانایێ ب حێبەتی ڤە دەستێن خوە هەژاندن. هەر ل وی دەمی بابێ وێ دناڤ باخچەی دا دیاربوو کو عەرەبانکەکا بچووك دپاڵدا و جلکێن باخچەڤانان یێن شین ل بەر بوون. هۆسا دیارە بۆ وی نەخوشە هەموو دەمێن سالێ ئەو نەچار دبیت بەلگێن زەر یێن داروباری خرڤە کەت.

- "ئوی خودا، ئاها ئەڤە سۆفیا یا بچووکە ب رەخ کچا من یا خوشتڤی ڤە. سەحکەنێ، ل دوماهیێ من دەرەجکێن بەر دەرگەهێ کۆلکی هەموو پاقژ کرن و چ بەلگێن زەر نەماینە ل سەر."

سۆفیایێ گوت: "گەلەك باشە. ئانکو ئەم دشێین شیریناهیان ل ڤێرێ بخوین ل شوونا ل سەر جهێن نڤستنێ بخوین."

بابێ جوانایێ کرە کەنی و سۆفیایێ هەست ب بێهنفرەهیێ کر.

- "ببورە جوانا، بەلێ یا ل سەر من پێدڤیە ڤێ یاریێ تەمام بکەم."

- "باشە، بێژە من چ چێبوو؟"

- "وەرە دگەل من بچینە مال. هەرچەوا بیت، ئەو تشتێ ئەز دبێژم بۆ شیرەتکارێ دارایی و بووکا باربی یا قەلەو نەیێ گرنگە."

- "تو چەند نەخوش یا دئاخڤی. ئەز دبێژم تو هۆسا هزر دکەی کو هەڤژینیەکا ب شەرو شور کو یەك بەردەوام ب دووڤ یێ دی بکەتە غارێ گەلەك باشترە؟"

- "چ پێنەڤێت نەخێر، لێ شڤێدی هەموویێ ئەز نەنڤستیمە. هێدی هێدی ئەو پرسیار یێن خوە ل سەرێ من ددەن، ئەرێ هێلد دشێت هەموو وان تشتان ببینیت یێن ئەم دکەین؟"

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، ئەو بەرەڤ تاخێ کلوڤەر دچوون.

- "مەرەما تە ئەوە وی شیانێن تشتێن سەر سروشتی دا هەیە؟"
- "چێدبیت بەلێ و چێدبیت نەخێر."

یا دیاربوو کو جوانایێ باوەر ژ ڤان هەمموو نهێنییێن بێ ڕامان نەدکر.

- "لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کا بۆچی بابێ وێ کارتێن جوان بۆ کۆلکێ مایجەرێ ل ناڤ دارستانێ فڕێدکرن."
- "ئەز دانپێدانێ دکەم کو تشتەکێ نەبەرئاقل یێ د ڤی بابەتی دا هەی."
- "باشە ما تو نابێژیە من شڤێدی تو کیڤە چووبووی؟"

ل دوماهیێ سۆفیایێ بەحسێ سەرهاتیا خوە دگەل مامۆستایێ فەلسەفێ یێ نەدیار بۆ وێ کر، لێ بەری ئەو بەحسێ ڤێ چەندێ بکەت، جوانا دابوو سووندێ کو بەحسێ نهێنیا وێ بۆ کەسێ نەکەت. پشتی هینگێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ئەو هەردوو هەڤال ب ڕێکێ ڤە چوون بێ کو پەیڤەك ژ دەڤێ وان بدەرکەڤیت. دەمێ گەهشتینە کولانا سیێ ژ تاخێ کلۆڤەر. جوانایێ گوت: "ئەڤ چیرۆکە سەرنجا من ناڕاکێشن."

- "بەلێ کەسێ ئەڤ پرسیارە ژ تە نەکریە. فەلسەفە ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان یاریەکا جڤاکی نەبوویە، بەلکو ئەو بەحسێ هندێ دکەت کا ئەم کینە و ژ کیڤە هاتینە. سەحکێ، تو دبینی ئەم ل قوتابخانێ فێری تشتێن هۆسا نابین؟"
- "بەلێ پا د شیانێن کەسێ دا نینە بەرسڤا ڤان جۆرە پرسیاران بدەت."
- "ڕاستە، بەلێ پا هەتا ئەم ڤان جۆرە پرسیاران ژ خوە نەکەین، ئەم فێرنابین."

دەمێ سۆفیا چوویە د لێنانگەها مال ڤە، وێ دیت خوارن یا ل سەر مێزێ و هێشتا یا گەرمە و هەلما ژێ دفڕیت. هۆسا دیارە دایکا وێ هەست ب چ مەترسیان نەکریە داکو تێلەفۆنێ بۆ مالا جوانایێ بکەت و دووبارە پرسیارا سۆفیایێ ژێ بکەت."

پشتی خوارنا فراڤینێ، سۆفیایێ گوت کو وێ دڤێت بۆ دەمەکێ کورت بێهنا خوە ڤەدەت و بنڤیت چونکی ئەڤە ژ شڤێدی وەرە نەنڤستی. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ سروشتی یە دەمێ مرۆڤ ل مالا هەڤالەکا خوە بیت هەتا سپێدێ نەنڤیت.

بەری ئەو بنڤیت، تەماشەی سەروچاڤێن خوە د خودیکا برۆنزی یا ب دیواری ڤە هەلاویستی کرن. ل دەستپێکێ ب تنێ دێمێ خوە یێ شدیای دیت، لێ خودیکێ دێمێ کچەکا دی یا نەدیار د ڕەنگڤەدانا دێمێ وێ دا خویا کر.

وێ بلەز دوو جاران بێهنا خوە هەلکێشا و پێکۆل کر سەرێ خوە نەلڤینیت. لێ وێنێ کچکا دی یا بچووك ل پشت دێمێ وێ یێ واستیای و پرچا وێ یا ڕەش خویا دکر، ئەو پرچا وێ یا چ مودێل لێ نەدبووی ژبەر سروشتێ وێ کو یێ حلی و ڕاست بوو.

ب هەموو هێزوشیانێن خوە ڤە، کچکا د خودیکێ دا پێکۆل دکر چاڤێن خوە ل وێ بنڤینیت، هۆسا دیارە ب ڤی کاری وێ دڤیا سۆفیایێ ل سەر ئامادەبوونا خوە ل دەڤ وێ ئاگەهدار بکەت. پاشی بلەز وێنێ وێ د خودیکێ دا بەرزەبوو.

سۆفیایێ ل سەر تەختی خوە درێژ کر و چ گومان ل دەڤ وێ نەبوون کو ئەڤ کچکا د خودیکێ دا خوە نیشا وێ دای، هێلد بوو. پاشی بۆ ماوەیێ چەند چرکەیان بیرا خوە ل وێنێ وێ کچکێ ئینا یێ ل سەر ناسنامەیا وێ یا ڤوتابخانێ ئەوا وێ د کۆلکێ مایجەرێ ڤە دیتی و دگەل وێنێ کچکا د خودیکێ دا هەڤبەر بکەت. هەلبەت ئەڤە دێمێ هەمان کچك بوو.

ئەرێ مانە تشتەکێ سەیرە دەمێ ئەو د گوپیتکا واستیانێ دا، ئەڤ تشتێن نەدیار ل دەڤ وێ پەیدابىن؟ پاشی ل دوماهیێ دێ پرسیارێ ژ خوە کەت کا ئەرێ ئەڤ چەندە هەموو ڕاستی بوون یان ژی خەون. سۆفیایێ جلکێن خوە دانانە سەر کورسیکا ب ڕەخ تەختێ خوە ڤە و نڤست، لێ خەونەکا سەیر خەوا وێ هەموو ڤەڕەڤاند.

سۆفیایێ د خەونێ دا دیت ئەو یا دناڤ باخچەیەکێ بەرفرەهـ دا و ئەڤ باخچەیە دکەڤتە نێزیکی کوگەهەکا سۆر یا بەلەمێن بچووك. ل سەر لێڤا بەندەری، ل نێزیکی عەمبارێ، کچەکا بەژن زراڤ ڕوونشتبوو خوارێ و تەماشەی دەریایێ دکر. سۆفیا چوو نێزیکی وێ و ب ڕەخ ڤە ڕوونشت، لێ ئەو کچەکا بەرزە بوو و هەست ب سۆفیایێ نەدکر.

سۆفیایێ ژ لایێ خوە ڤە دەستپێکر و دگەل ئاخفت: "هێلد! ئەڤە ئەزم! سۆفیا"، لێ وێ چ بەرسڤ نەدان. وێ سۆفیا نەددیت و گوهـ ل ئاخفتنێن وێ ژی نەدبوو. "هێلد، ئەرێ

تە گوهـ ل من هەیە؟ یان ژی تو یا کورە و کەڕی؟". دیسان ئەڤ کچکا بەرزە د ئاخفتنا سۆفیایێ نەدگەهشت.

پشتی هینگێ سۆفیایێ گوهـ ل دەنگێ زەلامەکی بوو، دگوت: "خوشتڤیا من هێلد!". یەکسەر ئەو کچك ژ جهێ خوە ڕابووڤە و چوو مال. باشە پا هۆسا دیارە ئەو نە یا کورەیە و نە یا کەڕە ژی. ژیێ وی زەلامی نێزیکێ چل سالیێ بوو و ڤاتەکا فەرمی و کولاڤەکێ شین ل بەربوون. ئەو کچك بەرەڤ وی ڤە چوو و هەمبێز کر، وی ژی کچك بلند کر و دزڤڕاند. سۆفیایێ دیت کو وێ کچکێ ل سەر لێڤا بەندەری زنجیرەك و خاچەکا بچووك بحهـ هێلان. سۆفیایێ ژی ئەو تشت هەلگرتن و دگەل هندێ هشیار بوو.

سۆفیایێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر، وێ دیت ئەو بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران یا نڤستی. ژ سەر جهێن خوە ڕابووڤە و هزرێن خوە د وێ خەونا سەیر دا دکرن کو ب خورتی خوە ل سەر هزرا وێ سەپاند بوو ب ڕەنگەکی سۆفیایێ هەستپێدکر ئەو خەون ڕوودانەکا ژ ڕاستا بوو. سۆفیا یا پشتڕاست بوو ئەو بەندەر و خانیێ وێ د خەونێ دا دیتین ل جهەکی هەنە. ئەرێ تو بێژی ل سەر کەڤالێ د کۆلکێ مایجەری دا هاتبوونە وێنەکرن؟ هەرچەوا بیت، یا دیارە ئەو کچك هێلد موللەر کناگ بوو و ئەو زەلام ژی بابێ وێ بوو یێ ژ لوبنانێ زڤڕی و دخەونێ دا وەکو ئەلبێرتۆ کنوکسی خویا دکر.

دەمێ ل دوماهیێ ژ سەر تەختی ڕابووی، جهێن خوە لێکدان. ئەو حێبەتی ما دەمێ دبن بالیفکا خوە ڤە زنجیرەك و خاچەکا بچووك دیتین کو سێ پیت ل سەر دنڤیسای بوون "هـ، م، ك". ئەڤە نەجارا یەکێ بوو سوفیا تشتێن گرانبەها د خەونێن خودا دبینیت، لێ پا ئەڤە یەکەم جار بوو ئەو ڤان تشتان ب دروستاهی دبینیت.

سۆفیایێ ب حێبەتی ڤە کرە ڤیژی: "ئەڤە گەلەکە..."

تۆڕەبوونا وێ یا زێدە ئەو پالدا دەرگەهێ ڤومسورا خوە ڤەکەت و وێ زنجیرك و خاچێ بهاڤێژتە د ڕەفانکا وێ یا سەری دا، ب ڕەخ دەستمالا سۆر و گورێن هەتا سەر چووکان و پۆستکارتێن ژ لوبنانێ هاتین.

ل سپێدەهیا ڕۆژا یەکشەمبی، سۆفیا ژ خەو هشیار بوو داکو تێشتەکا خوش یا پێکهاتی ژ شەربەتا پرتەڤالان و هێکێن کەلاندی و زەلاتەیا ئیتالی و نانی بخوت. ب دەگمەن

ڕۆژێن یەکشەمبیان دایکا وێ بەرێ وێ ڕابایە، لێ دەمێ ڕابایە ژی دا تێشتەکا گەلەك خوش بەرهەڤ کەت. ل سەر تێشتێ، دایکا وێ گوت: "ئەڤە سپێدێ وەرە سەیەکێ بیانی یێ دناڤ باخچەی دا و ئەز نانیاسم. ئەو بەردەوام یێ ل دور سیمەیێ باخچەی دزڤڕیت، ئەرێ تو نزانی ئەو بۆچی وەدکەت؟"

- "بەلێ."

ئەڤ پەیڤە ژ دەڤێ سۆفیایێ دەرکەفت بێ کو بزانیت کا وێ چ گوت، پاشی پرسیار ژ دایکا خوە کر: "باشە بەری نوکە ژی ئەو هاتیە ڤێرێ؟"

د پەنجەرێ دا، چاڤێ سۆفیایێ ب هێرمسی کەفت ئەوێ ل بەر دەرگەهێ کۆلکێ وێ یێ بچووك و نهێنی ڕاوەستیای. سۆفیایێ نەزانی چ بێژیت؟ ئەو نەگەهشت هزرا خوە د چ تشتان دا بکەت، دایکا وێ ژی بلەز گەهشتە دەڤ وێ و ل سەر سەرێ وێ ڕاوەستیا و گوت: "تە پرسیار کر کا بەری نوکە ئەو هاتیە ڤێرێ؟"

- "بەلێ، دبیت وی هەستیکەك ل ناڤ باخچەی ڤەشارت بیت و نوکە هاتبیت لێبگەڕیت، چونکی سەیان بیردانکەکا ب هێز هەیە."

- "چێدبیت. مانێ د ڤێ خێزانێ دا تو نوشدارا دەروونی یا گیانەوەرای."

بەری سۆفیا بڕیارا خوە بدەت، پیچەکێ هزرێن خوە کرن.

- "ئەزێ دێ وی گەهینمە مالا وی."
- "باشە ما تو دزانی ئەو ل کیڤە دژیت؟"
- "چ پێنەڤێت نوکە ڕستکەك د ستۆیێ وی هەیە و ناڤونیشانێن وی ل سەر هەنە."

پشتی بورینا چەند خولەکان، سۆفیا چوو بەر دەرگەهی، دەمێ چاڤێ هێرمسی ڤێکەفتی، یەکسەر کوریا خوە هەژاند و دەست ب لەیزینێ کر.

- "هێرمس، ئەی سەیێ باش..."

سۆفیایێ دزانی دایکا وێ یا د پەنجەرێ دا زێرەڤانیا وێ دکەت، دوعا ژ خودای کرن هێرمس نەچیتە د کۆلکێ وێ ڤە! لێ سەر بەرەڤ ڕێکا بەرێن حەسوی ڤە چوو و ژ باچخەی دەرکەفت و خوە ل سەر دەرگەهی ڕا هاڤێت.

هێرمس ل سەر ڕێکا خوە یێ بەردەوام بوو و سۆفیا ژی ب دووراتیا چەند پێنگاڤەکان ل پشت وی دچوو، ئەو دناڤ چەندین خیڤەتێن ل ڤێرە و وێراهە هاتینە ڤەدان ڕا بورین، ئانکو هێرمس و سۆفیا ب تنێ دناڤ دارستانێ دا نەبوو، بەلکو ئەڤرۆ ڕۆژا یەکشەمبی یە و گەلەك خێزان ژ مالێن خوە یێن دەرکەفتین و خیڤەتێن خوە دناڤ دارستانێ دا یێن ڤەداین، سۆفیایێ حەسیدی ب وان دبر.

هۆسا دیاربوو هێرمس یێ ل دووڤ شوونوارێن سەیەکێ دی یان بێهنا تشتەکی دچیت، لێ هەردەمێ سۆفیایێ لێ کربا ڤێژی و گوتبایێ وەرە سەر ڕێکا خوە، ئەو دا گوهداریا وێ کەت. پشتی ئەو ژناڤ دارستانێ دەرکەفتین، گەهشتنە دەڤ باخچەیەکێ مەزن یێ کەڤن و پاشی گۆڕەپانەکا وەرزشی و ل دووڤ دا پارکەکا گشتی یا یاریان هەتا ل دوماهیێ گەهشتینە سەر جادەیەکا بەرفرەه کو پڕەکا مەزن بۆ شەمەندەفڕان ل سەر هاتبوو دروستکرن.

دەمێ ئەو گەهشتینە ناڤەندا باژێری، هێرمس بەرەڤ وێ گۆڕەپانا مەزن چوو یا دکەفتیە نێزیکی کولانا دێرێ کو ئاڤاهیێن دەوروبەری وێ هەموو د کەڤن بوو و دیرۆکا دروستکرنا وان بۆ چەرخێ بوری دزڤڕین. دەمژمێر ببوو یەکی نیڤرو و ئەو هەردوو نوکە یێن چووینە ڕەخێ دی یێ باژێری. ئەڤە یەکەم جار بوو سۆفیا ب گەشتەکا هۆسا دگەمەن و ب ڤێ دووراتیێ ڕاببیت. بیرا وێ هات کو بەری نوکە ب تنێ جارەکێ سەرەدانا ڤی تاخێ کەڤن کربوو، ئەو ژی دەمێ مەتەکا وێ یا دانعەمر لێ دژیای.

ل دوماهیێ گەهشتنە دەڤ گۆڕەپانەکا بچووك کو کەفتبوو دناڤبەرا چەندین ئاڤاهیێن کەڤن دا. ناڤێ وێ "گۆڕەپانا نوو" بوو. ب ڕاستی تشتەکێ سەیر بوو! ناڤێ وێ گۆڕەپانا نوویە لێ شێوەیێ ئاڤاهیێن دەوروبەری وێ بۆ شێوەیێ کولانێن چەرخێن ناڤەڕاست دزڤڕیت. هێرمس ل بەرامبەر دەرگەهێ ئاڤاهیێ ژمارە 14 ڕاوەستیا و ل هیڤیا سۆفیایێ بوو دەرگەهی ڤەکەت، سۆفیا هەستپێکر ها وەختە دێ دلێ وێ ڕابیت.

ل سەر لایەکێ وی دیواری، سندوقەکا پۆستەی یا ڕەنگ کەسك هاتبوو هەلاویستن. سۆفیایێ پۆستکارتەك دناڤ وێ سندوقێ دا دیت کو مورا ڕێڤەبەریا پۆستەیان ل سەر بوو و هۆسا دیاربوو کو ئەڤ کارتە بۆ وی کەسێ هاتیە هنارتن ل ڤێرێ یێ ئاکنجی نینە، بەلکو

ناڤونیشان ب ڤی ڕەنگی بوو: "هێلد موللەر کناگ، گۆڕەپانا ژمارە 14" و دیرۆکا هنارتنا وێ ژی ڕۆژا 12ی خزیرانێ بوو. هێشتا دوو حەفتی مابوون ئەو ڕۆژ بهێت لێ هۆسا دیارە پۆستەچی ئاگەهـ ژ ڤێ چەندێ نەبوو.

سۆفیایێ ئەو کارتە ڤەکر و خواند.

*خوشتڤیا من هێلد*
*نوکە سۆفیا یا گەهشتیە مالا مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ و ل دەمەکێ نێزیك دێ ژیێ وێ بیتە پازدە سال، لێ دوهی ژیێ تە یێ بوویە پازدە سال. یان ژی ئەڤرۆکەیە، خوشتڤیا من هێلد؟*
*ئەگەر جەژنا ژ دایکبوونا تە ژی ئەڤرۆکە بیت، ئەز یێ پشتڕاستم دێ نوکە ئیڤاریەکا درەنگ بیت ل دەڤ هەوە، چونکی تو دزانی دەمێن مە و هەوە نەوەکو یەکن. بەرەبابکەك پیر دبیت و بەرەبابکەکێ دی ژ نوو ڕۆناهیێ دبینیت و د ڤی ماوەی دا دیرۆك ل سەر پێڤاژوویا خوە یا بەردەوامە و ناڕاوەستیت. ئەرێ جارەکێ تە هزرا خوە کریە دیرۆکا ئەورۆپا دگەل ژیانا کەسەکی هەڤبەر بکەی؟ چەرخێن کەڤن وەکو ژیانا زارۆکینیێ، پاشی چەرخێن ناڤەڕاست یێن درێژ دهێن کو ئەو ژی وەکو ڕۆژەکا قوتابخانێ یا درێژە و نوکە ئەو ڕۆژا قوتابخانێ یا درێژ ب دوماهی هات و سەردەمەکێ نوو هات کو ئەو ژی چەرخێ ڕێنیسانسێ یە. نوکە ئەورۆپا یا گەنج یا ل هەمبەر قۆناغەکا نوو یا ژیانا خوە. ئەم دشێین بێژین چەرخێ ڕێنیسانسێ بەرامبەر ژیێ پازدە سالیێ یێ ئەورۆپایێ یە. خوشتڤیا من، نوکە ئەم یێ د هەیڤا خزیرانێ دا، تشتەکێ جوانە کو نوکە ئەم یێ دژین، ژیان چەند یا جوانە؟*
*تیبینی: دەنگوباسێ بەرزەبوونا خاچا تە یا زێڕی گەهشتە من، هیڤیا من ئەوە ل جارا بهێت تە پتر ئاگەهـ ژ کەلوپەلێن خوە هەبیت.*

*دگەل ڕێزێن من*
*بابێ تە ئەوێ ل سەر لێڤا جادەی ڕاوەستیای.*

هێرمس ل سەر دەرەجکان ب سەرکەفت بوو و ژ کەیفان دا کوریا خوە دهەژاند، سۆفیایێ ژی ئەو کارتە هەلگرت و بلەز پێنگاڤێن خوە هاڤێتن داکو هێرمس ل پێشچاڤێن وێ بەرزە نەبیت.

سۆفیا گەهشتە قاتێ دووێ و سیێ و چوارێ هەتا ل دوماهیێ گەهشتینە دەڤ هندەك دەرەجکێن تەنگ کو هێشتا هێرمس ل سەر چوونا خوە یێ بەردەوام بوو، ئەرێ تو بێژی ئەو هەتا سەربانی سۆفیایێ ل دووڤ خوە بکێشیت؟ ل دوماهیێ هێرمس ل بەر دەرگەهەکێ بچووك و تەنگ ڕاوەستیا و ب نینوکێن خوە دەرگەهـ قوتا.

سۆفیایێ گوهـ ل دەنگێن پێن کەسەکی بوو کو یێ نێزیکی دەرگەهی دبیت و ل دووڤ دا وی کەسی دەرگەهـ ڤەکر، ئەو کەس ئەلبێرتۆ کنوکس بوو. وی جلکێن خوە یێن ڕەبەنیێ گوهارتبوون و هندەك دی کربوونە بەر خوە: دوو گورەیێن سپی یێن هەتا سەر چووکان، شەڕوالەکێ سۆر یێ فرەهـ، چاکیتەکێ ڕەنگ زەر و هچك فرەهـ. دیمەنێ وی وەکو یێ جوکەرێ یاریا پەڕکانێ بوو. چ پێنەڤێت ئەڤە جلکێن کلاسیکی یێن چەرخێ ڕێنیسانسێ بوون.

سۆفیایێ پالەك ل وی دا و چوو د ژوور ڤە و ب کەنی ڤە گوت: "ئەڤە تە خوە کریە لێبوك."

جارەکا دی سۆفیایێ ترس و شەرما خوە ب سەر مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ دا شکاند. هزرا سۆفیایێ ئالۆز ببوو ژبەر وێ پۆستکارتا بەری هینگێ ل بەر دەرگەهی خواندی.

ئەلبێرتۆی دەرگەهـ ل دووڤ خوە ڕا گرت و گوت: "ئارام بە، کچا من؟"

سۆفیایێ دەستێ خوە درێژ کرە وی و گوتێ: "ئاها بگرە ئەڤە پۆستە یێ تەیە."

ئەلبێرتۆی ئەو کارت خواند و سەرێ خوە هەژاند.

- "ئەڤە بەلا خوە ژ مە ڤە ناکەت، هۆسا دێ مە کەتە پێتڕانك بۆ جەژنا ژ دایکبوونا کچا خوە."

پشتی وی ئەڤ چەندە گوتی، کارتە قورمچاند و هاڤێتە د تەنەکا گلێشی دا.

- "د وی کارتێ دا یا گوتی کو هێلدێ خاچا خوه یا زێڕی یا بەرزە کری."
- "بەلێ من خواند."
- "من ئەڤ خاچە ل بن بالفیکا خوە یا دیتی، تو دێ شێی بۆ من شڕۆڤە بکەی کا ئەڤە چیە چێدبیت؟

ئەلبێرتۆی بۆ ماوەیەکێ درێژ تەماشەی چاڤێن سۆفیایێ کر.

- "ب ڕاستی ئەڤە تشەکێ سەیرە. لێ دبیت ئەنجامدانا کارەکێ هۆسا ب تنێ وەکو فێلەکێ بیت نەك زێدەتر. یا باشترە ل شوونا هندێ، ئەم گرنگییێ ب کێڤریشکا سپی یا مەزن بدەین دەمێ ژ کولاڤێ گەردوونی یێ بلند خوە دهاڤێژیتە دەرێ."

پاشی ئەو هەردوو پێکڤە چوونە د هۆلا ڕوونشتێ ڤە. سۆفیایێ قەت ژوورەکا هۆسا سەیر د ژیانا خوە دا نەدیتبوو. د شقەیا ئەلبێرتۆی ڤە، بەلەکونەك هەبوو کو ب ڕێکا وێ ڕوناهیا ڕۆژێ ڕاستەخو دهاتە د ژوور ڤە و ڕۆهن دکر. پەنجەرەکا دی یا مەزن ژی د هۆلێ ڤە هەبوو و مرۆڤ دشیا ڕاستەخو هەموو دیمەنێن باژێرێ ببینیت.

تشتەکێ سەیرتر، ناڤمالی و شێوازێ ڕێکخستنا وێ بوو، کو یا پێکهاتی بوو ژ کەلوپەلێن کەڤن یێن دیرۆکا وان بۆ هەموو چەرخان دزڤرین. قەنەپەیەکا سالێن سیهان، پەڕتووکخانەیەکا چەرخێ نوزدێ زاینی، کورسیەکا کەڤن کو ڕەنگە ژیێ وێ چەندین چەرخ بن. ل سەر ڕەفانکێن قومسورێ ژی چەندین کەلوپەلێن کەڤن و نوو ل سەر هاتبوونە دانان کو پتریا وان بۆ ژیانا ڕۆژانە دهاتنە بکارئینان وەك دەمژمێر و کێرك و بووکێن لاستیکی و پەڕێن ڤازێ و کومێن پەڕتووکان و کەلوپەلێن ئەندازیاری و بارومەترەکا کەڤن. دیوارەکێ ژوورا وی ب پەڕتووکان هاتبوو گرتن لێ ئەڤە نە ئەو پەڕتووك بوون یێن ل بازاڕان دهاتنە فرۆتن. هەردیسان چەندین کەڤالێ ژی ب دیواران ڤە هاتبوونە هەلاویستن کو هندەك ژ وان ژ نوو هاتبوونە کێشان و هندەکێن دی ژی گەلەك د کەڤن بوون. زێدەباری هەلاویستنا چەندین نەخشەیێن جوگرافی یێن جۆراوجۆر.

سۆفیا ب حێبەتی ڤە ڕاوەستیا و تەماشەی هەموو ڕەخێن ژوورێ دکر و پاشی دەست ب پرسیاران کر.

- "ئەرێ تە ئەڤ تشتێن کەڤن هەموو کومکرینە؟"

- "تو دشێی وەبێژی، هەموو چەرخێن دیرۆکێ ل ڤێرێ هەنە ژبەر هندێ ئەز نابێژمێ تشتێن کەڤن."

- "هۆسا دیارە تو دکانەکا کەلوپەلێن شوونواران ب ڕێڤە دبەی، مانە هۆسایە؟"

دیمەنێن خەمگینی و پۆسیدەییێ ل سەر دێمێ ئەلبێرتۆی دیاربوون.

- "هەموو خەلك نزانن کا دێ چەوا خوە ب دەست ڕووبارێ دیرۆکێ ڤە بەردەن، پێدڤیە هندەك کەس هەبن ل سەر لێڤێن ڕووباری براوەستن و ئەو تشتێن ماینە ل وان جهان کوم بکەن."

- "تو ب ڕێکەکا سەیر تەماشەی تشتان دکەی."

- "بەلێ پا ئەڤە ڕێکا دروستە کچا من، ئەم نە ب تنێ د سەردەمێ خوە دا دژین بەلکو ئەم دیرۆکێ هەموویێ د ناخێن خوە دا دهەلگرین. بلا ل بیرا تە بیت کو هەر تشتەکێ تو د ڤێ ژوورێ ڤە دبینی، ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان تشتەکێ نوو و جوان بوو. دبیت ئەڤ یاریا بچووك کو دیرۆکا وێ بۆ چەرخێ نوزدێ دزڤڕیت، ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان بۆ جەژنا ژ دایکبوونا زارۆکەکا پێنج سالی هاتبیتە کڕین. ڕەنگە باپیرێ وێ یێ دانعەمر بۆ وێ کربیتە دیاری. پاشی ژیێ وێ بوویە دەهـ سال و بوویە گەنج و شووکریە و ل دووڤ دا وێ ژی کچەك بوویە و بەری بمریت ئەڤ یاریکە کریە دیاری بۆ وێ. ڕاستە ئەو بۆ ماوەیەکێ درێژ ل سەر ئەردی ژیایە، لێ ل دوماهیکێ هەر مر بێ کو دووبارە بزڤڕیتە سەر ئەردی ڤە. نوکە ئەو دبن ئاخێ ڤە یا نڤستی یە، لێ بووکا وێ یا لاستیکی هێشتا یا مایی و ل سەر ڤێ ڕەفانکێ یا پاراستیە."

- "دەمێ تو ژ ڤی لای ڤە بەحسێ تشتان دکەی، هەموو تشت ب خەمگینی دهێنە پێشچاڤێن مرۆڤی."

- "بەلێ پا د ڕاستی دا ژیان ب خوە یا نەخوش و خەمگینە، ئەم دهێنە دناڤ ژیانەکا جوان دا و هەڤدوو دبینین و هەڤنیاسینێ د دگەل هەڤدوو دکەین، بۆ ماوەیەکی ژیانا خوە پێکڤە دبورینین و پاشی ب هەمان شێوەیێ ئەم هاتینە د ژیانێ و ب هەمان وێ لەزاتیا مە هەڤنیاسین کری، ئاها هۆسا دووبارە ژ هەڤدوو دوور دکەڤینەڤە و بۆ هەتا هەتایێ بەرزە دبین."

- "ئەز دێ شێم پرسیارەکێ ژ تە کەم؟

- "هەلبەت، خو ئەم یاریا خوە ڤەشارتنێ ناکەین، سۆفیا."

- "تو بۆچی تو د کۆلکێ مایجەری ڤە ئاکنجی ببووی؟

- "داکو ئەم هند د ژێکدوور نەباینە، چونکی ل وی دەمی ب تنێ ب رێکا نامەیان مە پەیوەندی ب هەڤدوو دکر، وەکو دی ژی ئەو بۆ ماوەیەکێ درێژ بوو کەس تێڤە نەدژیا."

- "باشە، ژبەر هندێ تە برِیار دا تێڤە ئاکنجی ببی؟"

- "بەلێ، ژبەر هندێ بوو."

- "باشە پا بابێ هێلدێ چەوا ئەڤ چەندە زانی؟"

- "ئەز دبێژم ئەو هەموو تشتان دزانیت."

- "هەرچەوا بیت، ئەز تێناگەهەم کا چەوا پۆستەچی شیا وان نامەیان هەموو بگەهینتە دناڤ دارستانێ دا."

ئەلبێرتۆی پێ کرە کەنی.

- "ئەڤ جۆرە کارە گەلەك ب سانەهی ب بابێ هێلدێ دهێنە کرن، ئەڤ چەندە ب تنێ وەکو کارەکێ سێرەبەندێن چەپەلە نەك زێدەتر. دوور نینە ئەز و تو نوکە ل بن چاڤدێریەکا دژوار دا بین."

سۆفیایێ ب تۆرەی ڤە گوت: "ئەگەر ئەز وی ببینم، دێ هەردوو چاڤێن وی ئینمە دەرێ". ئەلبێرتۆ چوو سەر کورسیەکا مەزن رِوونشت و بۆ سۆفیایێ ژی کورسیەکا ئارام هەلبژارت.

- "ب تنێ فەلسەفە دشێت مە نێزیکی بابێ هێلدێ بکەت. ئەڤرۆکە دێ بۆ تە بەحسێ چەرخێ رِێنیسانسێ کەم."

- "ئەز یا رِازیمە."

- "پشتی چەند سالەکان ل سەر مرنا ڤەشە تۆماس ئاکوینی، کەلتورێ مەسیحی بەرەڤ لاوازیێ چوو. هێدی هێدی فەلسەفە و زانست ژ لاهوتێ دێرێ دوور دکەفتن. لێ ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ، ژیانا ئاینی پەیوەندیەکا خورتر دگەل ئەقلی گرێدا، هندەك بیرمەندان هێدی هێدی پتر داکوکی ل سەر هندێ دکر کو مرۆڤ نەشێت ب رِێکا ئەقلی خوە نێزیکی خودای بکەت، چونکی ب چ رِەنگان مرۆڤ نەشێت ب رِێکا هزرکرنێ د خودای

بگەهیت. ل ڤێرێ ملکەچیبوونا مرۆڤان بۆ حەز و ڤیانا خودای گەلەك گرنگتر بوو ژ تێگەهستنا نهێنیا خودای."

- "ئەز تێگەهشتم!"

- "ل دوماهیێ، ژیانا ئاینی و پێڤاژوویا زانستی ژێکڤەبوون. ژبەر هندێ پرۆگرامەکێ زانستی یێ نوو و تەرزەکێ ئاینێ یێ نوو پەیدابوون. ئەڤ هەردوو ڕوودانە بوونە ئەگەر دوو کودەتایێن مەزن د چەرخێن پازدە و شازدێ زاینی دا پەیداببن، ئەو ژی چەرخێ ڕێنیسانس و پێکۆلا چاکسازیێ بوون.

- "باشە یەك یەکە بەحسێ وان بۆ من بکە."

- "ڕێنیسانس، تەڤگەرەکا نوویکرنا ڕەوشەنبیریێ یا نوو بوو ل دوماهیا چەرخێ چواردێ زاینی سەرهلدا، ل دەستپێکێ ل باکورێ ئیتالیا پەیدابوو، لێ هەر زوو بەرفرەهـ بوو و د ماوەیێ هەردوو چەرخێن پازدە و شازدەی زاینی دا ل پتریا ئەوروپا بەربەلاڤبوو."

- "ئەرێ پا جارەکێ تە نەگوتبوو من کو ڕامانا پەیڤا "ڕێنیسانس"، ئانکوو "دووبارە ژ دایکبوون"؟

- "بەلێ ڕاستە، تشتێ گرنگ د ڤی چەرخی دا کو پێدڤی بوو ژ دایك ببیت، هونەر و کەلتورێ چەرخێن کەڤن بوو. دیسان تێگەهێ "مرۆڤایەتی" ژی دووبارە زیندی بووڤە. چونکی د چەرخێن ناڤەڕاست دا ب تەمامی ئەڤ تێگەهە هاتبوو ژبیرکرن و خەلکی ل ژێر سیبەرا خودای، تەماشەی کار و ژیانا خوە دکر. ب ڤی ڕەنگی، تێگەهێ "ڤەگەڕیان بۆ ژێدەران" ئانکو بۆ "مرۆڤایەتیێ" و "چەرخێن کەڤن" بوونە کلیلکا نهێنی یا چەرخێ ڕێنیسانسێ. ئێدی چەندین جۆرێن وەرزش و هونەر و ئارەزوویان دەرکەفتن وەك زیندیکرنا پەیکەرتڕاشین و دەستخەتێن چەرخێن کەڤن کو ب دیتنا خەلکی وەکو وەرزشەکا نەتەوەی بوون. هەردیسان فێربوونا زمانێ گریکی بۆ یەك ژ مودێلێن سەردەم، زێدەباری خواندن و ڤەکۆلینا کەلتورێ گریکی. هەژی گوتنێ یە کو خواندنا ڤێ فەلسەفەیا مرۆڤایەتی یا گریکی ئارمانجەکا پەروەردەی ل پشت هەبوو، چونکی زانین و فێربوونا زمانێن کەڤن دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا "کەلتورێ کلاسیکی" یێ گرنگیێ ددەتە لایەنەکێ گرنگ یێ ژیانا مرۆڤی کو ئەم دبێژینێ "ساخلەتێن مرۆڤایەتیێ."

- " گیانەوەر ژی گیانەوەرێن نوو پەیدادکەن. لێ مرۆڤ، مرۆڤێن نوو پەیداناکەن، بەلکو دڤێت ئەڤ بونەوەرێ نوو هاتیە سەر دنیایێ بهێتە پەروەردە کرن داکو ژ نوو ببیتە مرۆڤ."

- "ئانکو مەرەما تە ئەوە پەروەردەکرن مرۆڤی دکەتە مرۆڤ؟"

- "بەلێ، شێوەیەکێ گشتی. لێ بەری ئەم زێدەتر دناڤ "بیرۆکەیا مرۆڤایەتیێ" یا چەرخێ ڕێنیسانسێ دا بچینە خوارێ، من دڤێت پیچەکێ بەحسێ پاشینەیا وێ یێ کەلتوری و سیاسی بۆ تە بکەم."

ئەلبێرتۆ ژ جهێ خوە ڕابوو ڤە و پاشی دناڤ ژوورێ دا گەڕیا هەتا دەستێ خوە بۆ ئامیرەکێ کەڤن درێژ کری. پرسیار ژ سۆفیایێ کر: "ئەرێ تو دزانی ئەڤە چیە؟"

- "هۆسا دیارە وەکو قیبلەنمایەکا گەلەك کەڤنە."

- "باشە."

پاشی دەستێ خوە درێژ کرە تڤەنگەکا کەڤن یا ب دیواری ڤە هەلاویستی و پرسیار کر: "باشە ئەڤە چیە؟"

- "تڤەنگەکا کەڤنە."

- "ێ باشە"

پاشی پەڕتووکەکا کەڤن ژ پەڕتووکخانێ ئینا دەرێ و پرسیار کر: "پا ئەڤە چیە؟"

- "ئەز دبێژم ئەڤە پەڕتووکەکا ئالۆزە."

- "بەلێ ڕاستە، بەس هەکە کووتر بەحس بکەین، ئەو پەڕتووکەکا ژ جۆرێ ئینکیونابولومە Incunbulum."

- "ئینکیونابولوم چیە؟"

- "دبێژنە وان پەڕتووکان ئینکیونابولوم یێن ل دەستپێکا پەیدابوونا چاپخانێ هاتینە چاپکرن، ئانکو بەری چەرخێ پازدێ زاینی."

- "ئانکو هەتا وی ڕادەی یا کەڤنە؟"

- "بەلێ، ئەڤ هەرسێ کەلوپەلە "قیبلەنما و بارود و چاپخانە" دهێنە هەژمارتن بنیاتێ ئاڤاکرنا ڤێ قۆناغا نوو یا کو مە ناڤێ وێ کریە چەرخێ ڕێنیسانسێ."

- "کا ڕاوەستیٚ، ئەز باش تێنەگەهشتم."

- "ڤیبەلەنما بۆ ئەگەرێ ب سانەهیکرنا گەشتێن دەریای، ئانکو بنەمایێ ڤەدیتنا گەلەك دەڤەر و جهێن نوو بوو. بارود ژی ب هەمان شێوە. ئەورۆپی شیان لەشکەرێ خوە ب شێوەیەکێ باشتر چەکدار بکەن ب هەڤبەرکرن دگەل چەکێن کلاسیکی یێن بەربەلاڤ دناڤ شارستانییێن ئەمریکی و ئاسیایی دا. ژلایەکێ دی ڤە، داهێنانا ئامیرێ چاپکرنێ ڕۆلەکێ گرنگ هەبوو د بەربەلاڤبوونا بیرۆکەیێن مرۆڤایەتییێ یێن نوو دا ب تایبەت ئەڤێن چەرخێ ڕێنیسانسێ دگەل خوە ئینایین. ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر دێر کونترۆلا خوە ل سەر گشت جومگەیێن زانین و فێربوونێ ژ دەست بدەت. پشتی هینگێ چەندین ئامیر و کەلوپەلێن نوو هاتنە داهێنان کو ڕۆلەکێ گرنگ د پێشکەفتنا مرۆڤان دا هەبوو، بۆ نموونە، ئامیرێ دووربین "تێلسکوپ"ێ بۆ ئەگەر زانستێ فەلەکناسییێ پێشکەفتنەکا مەرە مەزن و بێ وێنە تومار بکەت."

- "ئەڤ کارونێ پێشکەفتنێ یێ بەردەوام بوو هەتا مرۆڤ گەهشتینە داهێنانا مووشەك و گەمییێن ئەسمانی و چوونا سەربانێ هەیڤێ؟"

- "نەخێر. ب ڤی ڕەنگی تو دێ هەموو ڤۆناغان تێکەل کەی! ئەم دشێین بێژین چەرخێ ڕێنیسانسی دەستپێکا پرۆژەیێن مرۆڤی بوو ژ بۆ گەهشتنا سەربانێ هەیڤێ. یان ژی تا ئاستێ بومبێن ناڤوکی ل هیرۆشیما و چیرنوبیل. لێ ئەڤ پێشکەفتە هەموو پشتی زنجیرەکا ڕێکخستن و گوهۆڕینێن یەك ل دووڤ یەکێ د بوارێن کەلتوری و ئابوری دا پەیدابوو. یەکەم گوهۆڕین ژی: ڤەگوهاستنا ئابورێ خێزانی بۆ ئابورێ کاش "نەقدی" بوو. ل دوماهیا چەرخێن ناڤەڕاست، هندەك باژێرێن مەزن پەیدابوون کو د پڕبوون ژ کرێکارێن زیرەك و پێکۆلێن بازرگانییێ یێن کەلوپەلێن نوو دئینان، زێدەباری پەیدابوونا سیستەمەکێ ئابوری کو ل سەر بنەمایێ بەنك و گوهارتنا پارێ کاش هاتبوو دانان. ب ڤی ڕەنگی تەخەکەکا سەرمایەداری پەیدابوو کو دشیان هەموو تشتان ب پارەی بکرن و ژ بن کونترۆلا سروشتی دەرکەڤن، ئانکو دشیان هەر تشتێ پێدڤی بۆ ژیانا خوە ب پارەی بکرن. ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر گەلەك جۆرێن کاری و داهێنان و بازرگانییێ پەیدابن. ئێدی ل سەر هەر مرۆڤی یا پێدڤی بوو هەمبەر ڤان هەڤڕکیێن نوو بڕاوەستیت.

- "ئەڤە چەندە بیرا مە ل دروستبوونا باژێرێن گریکی یێن بەری دوو هزار سالان دئینیت."

- "بەلێ. تیبینەکا باش بوو تە کری. بەری نوکە من بۆ تە بەحسێ فەیلەسۆفێن گریکی کربوو کا چەوا خوە ژ تێگەهشتنێن ئەفسانەی قورتال کربوو کو بەری هینگێ ئەو تێگەهشتنە ب کەلتورێ گوندان ڤە یێ گرێدای بوو. ب هەمان شێوە، بورجوازیێن چەرخێ ڕێنیسانسێ شیان خوە ژ دەستهەلاتا دەرەبەگایەتی و دێرێ ڕزگار بکەن. د هەمان دەم دا، دووبارە کەلتورێ گریکی هاتە ئاشکەراکرن، هەلبەت ئەو ژی ب ڕێکا تێکەلبوونا دگەل عەرەبێن ئیسپانیا و کەلتورێ بیزەنتیە."

- "باشە ئەڤە هندێ دگەهیت کو جارەکا دی ئەو هەر سێ لقێن کەلتورێ گریکی ل سەر بەربەلاڤبووی، گەهشتنە هەڤدوو ڤە."

- "ئەز یێ دبینم تە وانەیێن خوە باش یێن ژبەرکرین. بەلێ، ب شێوەیەکێ گشتی ئاها ئەڤە شێوازێ چەرخێ ڕێنیسانسێ بوو. نوکە دێ بەحسێ بیرۆکەیێن نوو کەین."

- "دروستە، بەلێ دڤێت بۆ دەمێ فراڤینێ بزڤڕمە مال."

ئەلبێرتۆ ل سەر قەنەپێ ڕوونشت و تەماشەی سۆفیایێ کر.

- "یەکەم تشتێ چەرخێ ڕێنیسانسێ دگەل خوە ئینای، دیتنەکا نوو بوو ژ بۆ مرۆڤایەتیێ. بیرمەندێن مرۆڤدوست یێن چەرخێ ڕێنیسانسێ باوەریەکا نوو ب تێگەهێ مرۆڤایەتیێ هەبوو کو ب تەمامی یا هەڤدژ بوو دگەل هەلویستێ نەگوهۆڕ یێ چەرخێن ناڤەڕاست بۆ مرۆڤایەتیێ کوب دیتنا وان ئەڤ هەلویستە یێ شاش بوو. بەروڤاژی، ل دەڤ ڤان بیرمەندان مرۆڤ تشتەکێ گەلەك مەزن و ب بها بوو.

یەك ژ کەسایەتیێن هەڕە ناڤدار یێن چەرخێ ڕێنیسانسێ، ب ناڤێ "مارسیل فیسین" دبێژیت: "ئەی ڕەگەزێ خودای یێن خوە دناڤ کەڤلوژانێ مرۆڤی دا ڤەشارتی، خوە بنیاسە". فەیلەسۆفەکێ دی ب ناڤێ "پیکو دولا میراندولا"، ب هەمان شێوە "گوتارەك ل دور کەرامەتا مرۆڤی" نڤیسابوو. ئەڤ چەندە ژی ل چەرخێن ناڤەڕاست نەبوون، چونکی ل وی دەمی ژێدەرێ هەموو تشتان ژ دەڤ خودای بوو، لێ مرۆڤدوستێن چەرخێ ڕێنیسانسێ ئێدی ژێدەرێ هەموو شتان ژ مرۆڤی وەردگریت.

- "بەلێ پا فەیلەسۆفێن گریکی ژی ئەڤ چەندە کربوو."

- "بەلێ ڕاستە، ژبەر هندێ مە بەحسێ دووبارە ژ دایکبوونا فەلسەفەیا مرۆڤایەتیێ یا کەڤن کر، بەلێ پا فەلسەفەیا مرۆڤایەتیێ یا چەرخێ ڕێنیسانسێ پتر داکوکی ل سەر "تاکەکەسیا" مرۆڤی دکر، ژبەرکو ب دیتنا وان ئەم نەك ب تنێ بونەوەرێن مرۆڤی نە، بەلکو ئەم تاکەکەسێن ژێهاتی و جودانە. هەردیسان نە تشتەکێ ژ نیشکەکێ ڤە بوو دەمێ گرنگیدانا وان ب سروشتێ لەشێ مرۆڤی دووبارە سەرهلدای، چونکی بەری هینگێ زانایێن چەرخێن کەڤن ژی پەنا بربوو بەر تیڤکلکاریا* لەشێ مرۆڤی وەك ڕێکەك بۆ تێگەهشتنا پێکهاتەیا لەشێ مرۆڤان. ب ڤی ڕەنگی هونەر و زانست مل ب ملێ یەك ڤە پێشکەفتن و دگەل هەڤدوو د هاریکاربوون. د بوارێ هونەری ژی دا، دیسان تشتەکێ ئاسای بوو ئەگەر هونەرمەندەك وێنەیەکێ ڕیس بکێشیت. ئەم دشێین بێژین پشتی هزار سالێن شەرمینیێ، جارەکا دی ڤی کاری سەرهلداڤە. جارەکا دی مرۆڤ دوێریا ئەو ب خوە ببیتە خوەدانێ خوە، ئێدی چ تشت نەمان ئەو ژێ شەرم بکەن.

- "ئاخفتنا تە تاما مەستبوونەکێ ژێ دهێت."

دگەل گوتنا ڤێ ئاخفتنێ، سۆفیایێ خوە چەماندە وێ مێزا بچووك یا دناڤبەرا وێ و مامۆستایێ وێ یێ فەلسەفی دا هەی.

- "چ پێنەڤێت، ڤێ دیتنا نوو بۆ مرۆڤایەتیێ، ئاوایەکێ نوو یێ ژیانێ دگەل خوە ئینا. ب دیتنا وان، خودای مرۆڤ نەئافراندینە داکو خزمەتا وی وی ب تنێ بکەن، بەلکو خودای ئەو یێن ئافراندین دا خزمەتا خوە ژی بکەن و خوشیێ ژ ژیانی وەربگرن. دەمێ مرۆڤ هەست ب ئازادیەکا تەمام دکەت، ئێدی شیانێن وی خوە ل چ سنووران ناگرن و هندی دەرفەت هەبیت ئەو دێ شێت خوە پێشئێخیت. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی خاڵەکا نوو ب هەڤبەرکرن دگەل فەیلەسۆفێن چەرخێن کەڤن ئەوێن دگوت کو پێدڤیە مەژیێ مرۆڤی یێ ئارام بیت و هەڤسەنگیا خوە بپارێزیت و ژ سنوورێن خوە نەدەرکەڤیت.

- "مەرەما تە ئەوە کو مرۆڤدوستێن چەرخێ ڕێنیسانسێ ژ سنوورێن خوە دەرکەفتن؟"

---

* مەرەم ژێ تەشریح یان ئەنەتومیا Anatomy یا لەشێ مرۆڤی بوو.

- "ئەم دشێین بێژین ئەو نە قارەمانێن خوڕاگریێ بوون. بەلکو ئێدی هۆسا بۆ وان دیاردبوو کو جیهان هەمموو ژ خەوەکا کوور و درێژ یا هشیاربووی و یا دەست ب قۆناغەکا نوو دکەت، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئەو زاراڤێ "چەرخێن ناڤەڕاست" بدانە سەر وی ماوەیێ درێژ ئەڤێ ب هزاران سالان کەفتیە دناڤبەرا وان و چەرخێن کەڤن دا. د ڤی سەردەمێ نوو دا، ئێدی پێشکەفتنەکا هەڕە مەزن د هەمموو بوران دا پەیدابوو: بوارێن هونەری و شارستانی و ئەدەب و موزیکە و فەلسەفە و زانستی. بۆ نموونە، باژێرێ ڕوما ل چەرخێن کەڤن ناسناڤێ "باژێرێ باژێران" و "نافکا جیهانێ" وەرگرتبوو، لێ ب درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست دا ب تەمامی هاتبوو ژبیرکرن و هژمارا خەلکێ وێ گەلەك کێم ببوو هەتا سالا 1417ێ زاینی گەهشتیە 17 هزار کەسان ب تنێ."

- "ئانکو هندی هژمارا خەلکێ لیلساندێ."

- "مرۆڤدوستێن چەرخێ ڕێنیسانسێ دەست ب ئاڤاکرنا باژێرێ ڕۆما کر. وان بڕیاردا مەتڕاخانەیەکا مەزن ل سەر گورێ قەشە "بۆترِس"ی ئاڤا بکەن و داخواز ژ هژمارەکا مەزن یا هونەرمەند و ئەندازیاران کر هاریکاریا وان بکەن ژ بۆ سەرئێخستنا ڤی پڕۆژەی کو ل وی سەردەمی دهاتە هەژمارتن گرنگترین پڕۆژەیێ شارستانی ل جیهانێ. کارکرن ل سەر ڤی پڕۆژەی ل سالا 1506ێ زاینی دەستپێکر و نێزیکی 150 سالان ڤەکێشا، لێ ئاڤاکرنا گۆڕەپانا وێ ژی ب دوماهی نەهاتبوو هەتا بورینا پێنجی سالێن پشتی هینگێ."

- " چ پێنەڤێت نوکە ئەو دێرەکا گەلەك مەزن و جوانە!"

- "درێژاهیا وێ نێزیکی 200 مەتران و بلنداهیا وێ نێزیکی 130 مەتران و ڕوبەرێ وێ یێ گشتی ژی نێزیکی 16 هزار مەترێن دووجارکی یە. ئەڤ چەندە ژی وێرەکی و چاڤنەترسیا زەلامێن چەرخێ ڕێنیسانسێ بۆ مە دیار دکەت. ژلایەکێ دی ڤە، ڤی چەرخی دیتنەکا دی دا سروشتی، ب ڕەنگەکی کو ئێدی خەلکی هەست ب بەختەوەریەکا مەزن دکر کو نوکە ئەو د زیندینە، چونکی ئێدی وان هۆسا سەرەدەری نەدکر کو ژیانا وان یا ل سەر ئەردی ب تنێ بۆ خوە بەرهەڤکرنێ یە ژ بۆ ژیانەکا دی یان ژ بەر تشتەکێ گرنگ هەمموو پەیوەندیێن خوە دگەل جیهانا ماددی یا سەر ئەردی ببڕن. ئێدی سروشت ل دەڤ وان بۆ تشتەکێ ئەرێنی و خودا ژی چوو د ناخێن وان دا، ئانکو مادەم خودای چ سنوور نینن،

ڕامانا وێ ئەوە هەبوونا وی ل هەمموو جهان و دناڤ هەمموو تشتان دا هەیە. وان دگوتە ڤی تێگەهی "یەکێتیا خودای-Pantheism" و سروشت ژی جهێ نیشاندانا خودای یە.. گومان تێدا نینە کو دێرێ پێشوازی ل ڤان بۆچوونێن نوو نەدکر، باشترین نموونە ژی چیرۆکا "جیوردانو برۆنو"یە، ڤی هزرمەندی نە ب تنێ دگوت هەبوونا خودای دناڤ سروشتی ژی دا هەیە، بەلکو وی دگوت گەردوون یێ نەمر و بەرفرەهە. ژبەر ڤان بۆچوونێن وی یێن دژی دێرێ ب توندی هاتە سێدارەدان."

- "چەوا؟"

- "زەلامێن دێرێ ل سالا 1600ێ زاینی ئەو ل گۆرەپانا باژێرێ ڕۆما سووت."

- "ڕوودانەکا دلتەزینە! ئەرێ وان دگوتە ڤێ چەندێ مرۆڤایەتی؟"

- "نەخێر، برۆنو کەسەکێ مرۆڤدوست بوو نەك ئەوێن ئەو سوتی. ل چەرخێ ڕێنیسانسێ دا پێکۆلەکا دی یا دژی ڕێنیسانسێ پەیدابوو و پشتەڤانیەکا باش ژ لایێ دێرێ و وەلاتی ڤە لێ دهاتە کرن. ئەڤ پێکۆلا توندڕەو ل وی سەردەمی گەلەك یا بەربەلاڤ بوو. ئەڤ چەندە ژی هندێ دگەهینیت کو چەرخێ ڕێنیسانسێ ڕوویەکێ دی یێ ڕەش و ڤەشارتی هەبوو. د دیرۆکێ هەمموویێ دا چ جاران قۆناغەك نەهاتیە هەمموو یا باش یان یا خراب بیت، بەلکو باشی و خرابی وەکو دوو وەریسکێن تێکئالیاینە و بەردەوام پێکڤە دبورن. ئەڤ گوتنە ل سەر تشتەکێ دی یێ گرنگ بجهـ دهێت کو ژبەر وی ئەم ڤەردارێن چەرخێ ڕێنیسانسێینە، ئەو ژی ل ڤی سەردەمی "شێوازەکێ زانستی یێ نوو" پەیدابوو.

- "ئەرێ ئاڤاکرنا یەکەمین کارگەهێن پیشەسازی بۆ وی سەردەمی دزڤڕن؟"

- "بەلێ، لێ ب شێوەیەکێ نەڕاستەخو، چونکی ئەڤ ڕێبازا نوو ببوو ئەگەرێ دانانا بیناتێ وێ پێشکەفتنا تەکنولوژی یا پشتی چەرخێ ڕێنیسانسێ پەیدابووی."

- "باشە تایبەتمەندیێن ڤی شێوازێ زانستی یێ نوو چ بوون؟"

- "ئەڤ شێوازە ب هندێ دهاتە جوداکرن کو ئێدی ب هەستێن خوە تەماشەی سروشتی بکەین و زێرەڤانیا وی بکەین. هەر ژ چەرخێ چواردێ زاینێ وەرە، هندەك کەس پەیدابوون کو دژی بیروباوەرێن کورە یێن دەستهەلاتدارێن کەڤن ڕاوەستیان و خەلك هشیار دکر ب تایبەت ئەوێن گرێدای ب بیروباوەرێن دێری و فەلسەفا سروشتی یا ئەڕستۆی ڤە. ل دەمەکی کو ل چەرخێن ناڤەڕاست ب دەنگەکێ بلند بانگەوازی بۆ هندێ دکر کو ئەقلی

دەستهەلاتەكا ڕەها هەیە، لێ فەیلەسۆفێن چەرخێ ڕێنیسانسێ دگوت نابیت مرۆڤ خوە بخاپینیت و باوەر ژ ڤێ چەندێ بكەت ژبەركو دڤێت هەموو بیروباوەرێن مە ل سەر بنیاتێ تەماشەكرنا سروشتی و هەست و تاقیكرن و ڤەكۆلینان دا بهێنە دانان. دبێژنە ڤێ چەندێ "شێوازێ كرداری یان پڕاكتیكی."

- "مەرەم ژێ چیە؟"

- "ئانكو ئەم زانینا خوە ل سەر بنەمایێ تاقیكرنێن خوە یێن كەسایەتی بدانین نەك ل سەر بنەمایێ بیروباوەر و ڕێكێن كەڤن و ئەفسانەی. ڕاستە پێكۆلەكا كرداری ل چەرخێن كەڤن ژی هەبوو و ئەڕستۆی ب خوە چەندین تاقیكرن ل سەر سروشتی كربوون، لێ ئەنجامدانا تاقیكرن و ڤەكۆلینان ب شێوەیەكێ ڕێكخستی تشتەكێ نوو بوو."

- "بەلێ پا وان ئەو ئامێر و كەرەستە نەبوون یێن ئەڤرۆكە ل بەر دەستێ مە هەین؟"

- "ج پێنەڤێت ڕاستە. ڕاستە وان پیڤەرێن ئەلیكترونی و ئامێرێن هەژمارتنێ یێن زیرەك نەبوون، لێ وان ژی بیركاری و ڕێكێن هژمارتنێ دزانین و چەندین ئامێرێن پیڤانێ یێن پێشكەفتی بۆ وی سەردەمی هەبوون، ژبەر هندێ وان دووبارە پێزانین و تیبینیێن زانستی ب زمانێ بیركاریێ یێ هوور تومارکرن. گالیلو كو یەك ژ زانایێن ناڤدار یێن چەرخێ هەڤدێ بوو، بەردەوام دگوت: "هەر تشتێ بهێتە پیڤان بپیڤە و تشتێ نەهێتە پیڤان ژی وەلێ بكە شیانێن پیڤانێ هەبن"، ژبەركو ئەو د وێ باوەرێ دا بوو سروشت ب زمانێ بیركاریێ هاتیە نڤیسین."

- "ئەرێ ڤان تاقیكرن و ڤەكۆلینان ڕێك ل هەمبەر داهێنانێن نوو ڤەكر؟"

- "قۆناغا دەستپێكێ كو قۆناغا ئاڤاكرن و شرۆڤەكرنا ڤی شێوازێ نوو بوو، بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا شۆرەشەكا تەكنولوژی و ڕێك ل هەمبەر داهێنان و ئاشكەراكرنێن پشتی هینگێ خوشكر. ئەم دشێین بێژین هێدی هێدی مرۆڤان خوە ژ دەستهەلات و مەرجێن سروشتی قورتال كر، ئانكو ئێدی سروشت نەما تشتەكێ هۆسا كو مرۆڤ ب تنێ بەشەكێ وی پێكبینیت، بەلكو ئێدی وان پێكۆل دكر مفای بۆ خوە ژ سروشتی وەربگرن و د ژیانا خوە دا بكاربینن. فەیلەسۆفێ ئینگلیزی "بیكون"ی دگوت "سروشت دەستهەلاتە". وی ب ڤی جۆری

دەربڕین ژ مفایێ سروشتی دکر کو ئەڤە ب خو ژی نووخازیەکا مەزن بوو، ئێدی مرۆڤان سروشت بکارئینا و بوونە سەرکێشێن وی."

- "بەلێ پا نە ب ڕێکەکا نەرێنی، مانە؟"

- "نەخێر، ل ڤێری ژی باشی و خراپیا مرۆڤان د هەموو کارێن وان دا ڕەنگڤەددا. ئەو پێنگاڤا تەکنولوژی یا ل چەرخێ ڕێنیسانسێ هاتیە هاڤێتن بۆ ئەگەرێ داهێنانا ئامیرێن ئەلیکترونی، لێ د هەمان دا بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا بێکاری و بەتالیێ. ئەڤ پێنگاڤە بۆ ئەگەرێ داهێنانا دەرمانان و دیارکرنا ئەگەرێن نەساخیان و تێکچوونا داروباری و لاوازیا ئاخێ و دروستکرنا ئامیرێن کارەبایی یێن ناڤمالێ، زێدەباری دیارکرنا ئەگەرێن پیسبوونا ژینگەهێ و سەرەدەریکرن دگەل بەرمایکان. د ڤان هەموو کاودانان دا تەکنولوژیا نەبوویە ئەگەرێ پەیدابوونا چ خراپیان، لێ شاش بکارئینانا وێ بوویە ئەگەر چەندین خراپی و زیان ژ ڤان ئامیران بگەهنە مرۆڤی. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە، پتریا خەلکی د وێ باوەرێ دانە کو تەکنولوژیا بوویە فاکتەرەکێ مەزن ل سەر وان گەڤێن هەمبەری جیهانا مە بووین، هندەکێن دی ژی د وێ باوەرێ دانە کو مرۆڤی سیستەمەکێ دایە کاری ئێدی نەشێت ل سەر زالێ ببیت. لێ کەسێن دی یێن ب چاڤێ گەشبینیێ تەماشەی ژیانێ دکەن د وێ باوەرێ دانە کو هێشتا تەکنولوژیا یا د زارۆکینیا خوە دا و یا ژبەر هندەك نەخوشیێن زارۆکینیێ دنالیت و پشتی هینگێ هێدی هێدی مرۆڤ دێ شێت ل سەر ڤێ تەکنولوژیایێ و ل سەر سروشتی زالێ ببیت بێ کو تووشی مەترسیا مرنێ ببیت."

- "باشە بۆچوونا تە چیە؟"

- "د ڤان هەردوو بۆچوونان دا، تا ڕادەیەکی ڕاستیەك دهێتە دیتن. پێدڤیە ئێدی مرۆڤ ب شێوەیەکێ شاش مایێ خوە د سروشتی نەکەت و زیانێ نەگەهینتێ، د هەمان دەم دا دشێین ب ناخەکێ ئارام سەرەدەریێ دگەل تەکنولوژیایێ بکەین و بکاربینین. چونکی ئێدی ئەم نەشێن بزڤڕینە سەردەمێن کەڤن و وەکو وان بێ تەکنولوژیا بژین، ئەڤە ژ چەرخێ ڕێنیسانسێ وەرە مرۆڤ نەمایە بەشەك ژ سروشتی، بەلکو ب شێوەیەکێ چالاك سەرەدەریێ دگەل سروشتی دکەت و وەکو وی دڤێت دگوهۆڕیت. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی بۆ مە خویا دکەت کا مرۆڤ چەند بونەوەرەکێ سەیرە."

- "نوکە ئەم یێن گەهشتینە سەربانێ هەیڤێ، بەلێ ل چەرخێن ناڤەڕاست کەسێ باوەر ژ تشتەکێ هۆسا نەدکر، مانە هۆسایە؟"

- "مافێ تە یە وەبێژی! ئەڤ بابەتە دێ بەرێ مە دەتە مژارا وێنەکرنا نوو یا ئەردی. ب درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست خەلك ل بن ئەسمانی دژیان و بەردەوم سەرێن خوە بلند دکرن و تەماشەی ڕۆژ و هەیف و ستێر و ئەختەران دکر، هەردیسان کەسێ ژی گومان ل سەر هندێ نەبوو کو ئەختەرا ئەردی ناڤەندا گەردوونی یە، هەردیسان وان چ گومان ژی ل سەر هندێ نەبوو کو ئەرد یێ جێگیر و پەحنە کو دبێژنێ "وێنەیێ ئەردی یێ سەنتەرێ جیهانێ". بیروباوەرا کو خودا یێ ل ئەسمانی و ل سەر هەموو تشتان ڕاوەستیایە، تا ڕادەیەکی یا هاریکار بوو خەلك گومانێ ژ ڤان تێگەهان نەبەت."

- "باشە دێ شێی پتر ڕۆهن کەی؟"

- "ل سالا 1543ێ پەڕتووکەکا فەلەکی ب ناڤێ "دەربارەی لڤینا تەنێن ئەسمانی" یا زانایەکێ پولونی ب ناڤێ "نیکولا کوپەڕنیکوس" دەرکەفت کو وی ب خوە ژی ل ڕۆژا دەرکەفتنا پەڕتووکێ وەغەرکر. کوپەڕنیکوسی د ڤێ پەڕتووکێ دا دیارکربوو ڕۆژ ل دور ئەردی نازڤڕیت بەلکو بەروڤاژی دروستە، وی ب ڕێکا زێرەڤانیکرنا لڤینا تەنێن ئەسمانی ژی ئەڤ ڕاستیە دووپاتکر. هەردیسان وی دیارکر کو ل وی سەردەمێ خەلکی هزردکر هەتاڤ ل دور ئەردی دزڤڕیت، لێ د ڕاستی ئەرد ب خوە ل دور ڕۆژێ و ل دور خولگەیێ خوە ب خو ژی دزڤڕیت. ئەم دشێین باشتر د لڤینا تەنێن ئاسمانی بگەهین ئەگەر ئەم زڤڕینا ئەردی و ستێرێن دی یێن ب شێوەیەکێ ڕێکخستی ل دور هەتاڤێ دزڤڕن بینینە پێشچاڤێن خوە. ئەم دبێژنە ڤێ چەندێ "وێنەیێ ڕۆژێ یێ سەنتەرێ جیهانێ" ئانکو هەموو تشت ل دور ڕۆژێ دزڤڕن."

- "باشە ئەڤ تێگەهە یێ دروست بوو؟"

- "هەموو نە. مژارا یەکێ ئانکو زڤڕینا ئەردی ل دور ڕۆژێ تشتەکێ پشتڕاست و دروست بوو، لێ وی دگوت هەتاڤ سەنتەرێ گەردوونی یە. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە هاتیە ئاشکەراکرن کو ڕۆژ ژی ب تنێ ستێرەکە ژ وان ستێرێن گالاکسیەکێ پێکدئینن و ب میلونان گالاکسی ژی د گەردوونی دا هەنە. هەردیسان یەك ژ شاشیێن دی یێن کوپەڕنیکوسی ئەو بوو دگوت ئەرد و ئەختەرێن دی ل سەر هێلەکا بازنەی ل دور ڕۆژێ دزڤڕن."

- "ئانكو ئەڤ چەندە هۆسا نەبوو؟"

- "نەخێر. بیرۆکەیا لڤینا ڤان ئەختەران ل سەر هێلەکا بازنەی، ژ تێگەهەکێ کەڤن هاتبوو وەرگرتن کو دڤێت هەموو تەنێن ئەسمانی دگرۆڤربن و پێدڤیە لڤینا وان ژی ل سەر هێلەکا بازنەی بیت، چونکی هەموو تەنێن ئەسمانی نە. هەر ژ سەردەمێ ئەفلاتۆنی، گرۆڤریی و بازنەی دوو شێوەیێن ئەندازەی یێن تەمامکەرێن هەڤدوو بوون و ئەڤ بۆچوونە هەتا دەستپێکا چەرخێ هەڤدێ زاینی یا بەربەلاڤ بوو، هەتا زانایێ فەلەکی یێ ئەلمانی "جوهانس کیپلەر" هاتی و ئەنجامێن ڤەکۆلینێن خوە یێن درێژ بەلاڤکرین و دووپتکری کو هەموو ئەختەر ل سەر خولگەیێن هێلکەی دزڤڕن و ڕۆژ ژی دکەڤیتە سەرەکێ وێ. لەزاتیا ڤان ئەختەران ژی کێم و زێدە دبیت چەند پتر ژ ڕۆژێ دوور بکەڤن یان نێزیکی وێ ببن. کیپلەر یەکەم زانا بوو ئەرد دانایە دگەل ئەختەرێن دی، هەردیسان دووپاتکر گەردوون هەموو ل دووڤ هندەك یاسایێن فیزیایی کار دکەت."

- "باشە چەوا هەتا ڤی ڕادەی ئەو یێ پشتڕاست بوو؟"

- "چونکی وی ب ڕێکا هەستێن خوە ڤەکۆلین ل سەر لڤینا ئەختەران دکرن و شرۆڤەکرنەکا نوو ددا وان ئەنجامان یێن فەیلەسۆفێن چەرخێن کەڤن پێ ڕابووین. یەك ژ زانایێن سەردەمێن کیپلەری، زانایێ ناڤدار "گالیلو" بوو ئەوێ ب ڕێکا دووربینەکێ تیبینیا لڤینا ئەسمانی و ساخلەتێن هەیڤێ دکری و دیارکری کو چیا و دولێ و نەهالێ ل سەر بانێ هەیڤێ هەنە. هەردیسان دیارکر ئەختەرا موشتەریێ چوار هەیڤ هەنە و ل دور دزڤڕن، ئانکو نەك ب تنێ ئەردی هەیڤەك هەیە و ل دور دزڤڕیت، بەلکو ئەختەرێن دی ژی هەیڤ هەنە. لێ مەزنترین ئاشکەراکرنا گالیلوی یاسایا "ئینێر1یا" ئانکو سستیا تەنان بوو."

- "ئەڤ یاسایە بەحسێ چ دکەت؟"

- "گالیلوی ب ڤی ڕەنگی یاسایا خوە دەربڕی: هەر تەنەکێ ئەسمانێ دشێت لەزاتیا خوە یا ڕەسەن بپارێزیت ئەگەر نەکەڤیتە بن کاریگەریا چ فاکتەرێن دەرەکی بۆ کێمکرن یان زێدەکرنا لەزاتیا وێ."

- "ئاها نوکە من زانی کا گرنگیا یاسایا وی چەندە."

- "بەلێ، ئەڤە تیبینیەکا باش بوو! چونکی ل سەردەمێن کەڤن، مەزنترین گەنگەشەیا دژی تیورا زڤڕینا ئەردی ل دور خوە، ئەو بوو کو دگوت ئەگەر ڕاستە ئەرد ب

شێوەیەکێ بلەز ل دور خوە دزڤڕیت، پێدڤیە دەمێ مرۆڤ بەرەکی بلند دکەت، پشتی هینگێ نەکەڤیتە جهێ خوە ڤە بەلکو ب کەڤیتە جهەکێ دوورتر."

- "باشە بۆچی ئەڤ چەندە ڕونادەت؟"

- "ئەگەر تو د شەمەندەفرەکێ دا یا ڕوونشتی بوو و سێڤەك د دەستێن تە دا بیت و پاشی ژ نیشکەکێ ڤە ئەو سێڤ ژ دەستێن تە بکەڤیت، یەکسەر سێڤ دێ کەڤیتە سەر ئەردی نەکو دێ دگەل شەمەندەفرێ هێت. ئەڤەژی ژ ئەنجامێ یاسایا بەردەوامیا دوخێ سێڤێ ڕوودەت، ژبەر هندێ دێ سێڤ هەمان لەزاتیا خوە پارێزیت ئەوا بەری ژ دەستێن تە دا بکەڤیت هەی."

- "نوکە باشتر تێگەهشتم."

- "ڕاستە شەمەندەفرِ ل سەردەمێ گالیلوی نەبوون، بەلێ پا ئەگەر د ڤێ ژوورێ ڤە تو تەپەکێ ل سەر ئەردی گڕێل بکەی و پاشی دەستێ خوە لێبدەی..."

- "...ئەو تەپە دێ ل سەر گڕێلبوونێ یا بەردەوام بیت..."

- "بەلێ. چونکی لەزاتیێ ئەو ل سەر وی دوخی هێلا، خو پشتی تە دەستێ خوە ژی لێدای."

- "بەلێ پا دڤێت ل دوماهیێ ئەو تەپە هەر ل جهەکی بڕاوەستیت، خو هەکە ژوور چەند یا مەزن ژی بیت؟"

- "ڕاستە، چونکی هێزەکا دی دژی لەزاتیا وێ کار دکەت کو ئەو ژی هێزەکە یا دناڤ ناخێ ئەردی دا، هەی ژ بلی کو ڕوویێ ئەردی نەیێ ڕاستە، هێزا وێ ڕاکێشانێ چ دوور یان نێزیك دێ وێ تەپێ ڕاوەستینیت. لێ بێهنا خوە فرەهـ بکە دێ تشتەکێ دی نیشا تە دەم."

ئەلبێرتۆ ژ جهێ خوە ڕابوو ڤە و بەرەڤ قومسورەکا کەڤن ڤە چوو و تشتەك ژێ ئینا دەرێ و دانا سەر مێزێ: ئەوژی پارچەیەکا داری بوو کو سەرەکێ وێ چەند ملیمەتران یا ستوور بوو و سەرێ دی ژی یێ تیژ بوو. ل نێزیکی وێ پارچا داری کو مێزە هەموو گرتبوو، تەپەکا بچووك یا ڕەنگ کەسك دانا سەر و گوتە سۆفیایێ: "دبێژنە ڤی تەختی ڕوویێ خوار، ب بۆچوونا تە دێ چ ڕوودەت ئەگەر من تەپە ژ لایێ داری یێ ستوور بەردا خوارێ."

سۆفیایێ بێهنا خوە هەلکێشا بێ کو بشێت بەرسڤێ بدەت.

- "ئەز دێ شەرتانێ سەرا 10 کرونان دگەل تە کەم ئەگەر گرێل بیت و بکەڤیتە سەر ئەردی."

- "باشە دێ بینین."

ئەلبێرتۆی تەپە گرێل کر، لێ ئەو ڕوودا یا سۆفیایێ پێشبینی دکری، تەپە یەکسەر گرێل بوو و کەفتە سەر ئەردی و بەردەوام دزڤڕی هەتا ل بەر دەرگەهێ ژوورێ ڕاوەستیای.

سۆفیایێ گوت: "جانە، تشتەکێ بالکێشە!"

- "بەلێ ڕاستە، گالیلوی گرنگی ب ڤان تاقیکرنێن سادە ددا."

- "ئانکو ئەو هندە یێ مەژی هشك بوو؟"

- "ئارام بە، وی دڤیا هەموو تشتان ب ڕێکا هەستێن خوە تاقی بکەت. ئەڤ تشتێ مە دیتی ب تنێ دەستپێکەك بوو. ئەرێ تو دشێی بێژیە من کا بۆچی تەپە گرێل بوو؟"

- "هۆسا دیارە چونکی سەنگا وێ یا گران بوو."

- "گەلەك باشە، سەنگ، باشە سەنگ چیە؟"

- "ئەڤە پرسیارەکا بێ ڕامانە!"

- "نەخێر، هۆسا نینە، ئەز دزانم تو نەشێی بەرسڤێ بدەی. بۆچی تەپە ل سەر ئەردی گرێل بوو؟"

- "بەلێ، ژبەر هێزا ڕاکێشانا ئەردی."

- "باشە، هێزا ڕاکێشانا ئەردی، ئانکو پەیوەندی دناڤبەرا سەنگا تەپێ و هێزا ڕاکێشانا ئەردی دا هەیە. ئەڤە ئەو هێز بوو یا بوویە ئەگەرێ گرێلبوونا تەپێ."

ئەلبێرتۆی جارەکا دی تەپە هەلگرت و دانا سەر وێ مێزا خوار.

- "ئەڤ جارە باش تەماشەی لڤینا تەپێ بکە."

ئەلبێرتۆی خوە خوار کر و تەپە بەردا، وی پێکۆل دکر تەپێ ل سەر هێلەکا ڕاست ل سەر مێزێ بەردەت. لێ سۆفیایێ دیت تەپە ڕاست گرێل نابیت، بەلکو بەردەوام ژ ئاڕاستێ خوە دەردکەفت هەتا دوماهیێ کەفتی."

ئەلبێرتۆی پرسیار کر: "باشە چ چێبوو؟"

- "تەپە ب شێوەیەکێ خوار گرێل بوو چونکی ڕوویێ مێزێ یێ خوار بوو."

- "نوکە ئەز دێ تەپێ ب بۆیاغەکا ڕەش بویاغ کەم داکو باشتر وێ چەندێ ب چاڤێن خوە ببینین یا تە گوتییێ خواربوون."

ئەلبێرتۆی ئەو تەپە بۆیاغکر و پاشی دووبارە تەپە ل سەرێ مێزێ بەردا. ڤێجارێ سۆفیایێ تیبینیا گرێلبوونا وێ کر چونکی تەپێ شوونوارەکێ ڕەش ل پاش خوە هێلا."

ئەلبێرتۆی پرسیار کر: "باشە تو چەوا لڤینا تەپێ شرۆڤە دکەی؟"

- "لڤینا وێ ب هێلەکا ڕاست بوو کو وەکو بەشەکێ بازنەی بوو."

- "ڕاستە، تە دروست گوت."

ئەلبێرتۆی تەماشەی وێ کر و بریێن خوە بلند کرن.

- "و ل دوماهییێ. ب دروستاهی ئەو نە بازنەیەکا تەمامە، بەلکو دبێژنە ڤێ وێنەی پارامولا یان هێلەکا چەمیای."

- "باشە هەروەکو تە بڤێت."

- "باشە، لێ بۆچی تەپە ب ڤێ ڕێکێ گرێل بوو؟"

سۆفیایێ پیچەك هزرێن خوە کرن، پاشی گەهشتە بەرسڤەکێ.

- "چونکی ڕوویێ مێزێ یێ خوار بوو و تەپە ژی ژبەر کارتێکرنا هێزا ڕاکێشانا ئەردی کەفت."

- "باشە، ب ڕاستی ژی جهێ دەستخوشییێ یە. ژ نیشکەکێ ڤە من کچەك ئینا د مالا خوە ڤە و پشتی یەکەمین تاقیکرن من ل پێشچاڤێن وێ کری، بگەهیتە هەمان وی ئەنجامێ گالیلو گەهشتییێ."

ئەلبێرتۆی دەست بۆ وێ قوتان، سۆفیا ترسیا نەکو ئەو دین ببیت. لێ ئەلبێرتۆی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "نوکە مە ب چاڤێن خوە کارتێکرنا دوو هێزان ل سەر تەنەکی دیت. گالیلوی هەمان یاسا ل سەر نمونەیا بەرکێ تۆپێ بجهئینا. دەمێ تەپەك دهێتە بلند کرن، ل دووڤ هەمان هێل دهێتە خوارێ یا پێ هاتیە بلند کرن، ئانکو وەکو وێ هێلا تەپێ ل سەر ڕوویێ

**مێزێ یێ خوار وێنە کری. ئەڤ چەندە ل سەردەمێ گالیلوی ئاشکەراکرنەکا ڕاستەڤینە و مەزن بوو. ئەڕستۆی ژی د وێ باوەرێ دا بوو کو دەمێ تەپەك دهێتە بلند کرن، ل دووڤ هێلەکا خوار دکەڤیت و پاشی دووبارە ل دووڤ هێلەکا ستونی دکەڤیتە سەر ئەردی. هەلبەت ئەو تیورەکا شاش بوو و ژ بۆ دووپاتکرنا ڤێ شاشیێ، یا ل سەر گالیلوی پێدڤی بوو بەلگەیەکی پێشکێش بکەت."**

**- "بەلێ ئەز نابینم مفایەك د ڤێ چەندێ دا هەبیت."**

**- "چەوا؟ مفایەکێ مەزن یێ تێدا هەی کچا من! ئەڤ ئاشکەراکرنە یەکە ژ گرنگترین ئاشکەراکرنێن زانستی د دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دا."**

**- "باشە، کا بۆ من شرۆڤە بکە."**

**- "پشتی گالیلوی، زانایەکێ دی یێ فیزیایێ ب ناڤێ "ئیسحاق نیوتن" هات کو د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن 1642 هەتا 1727ێ زاینی دا ژیا. ئەم قەردارێن ڤێ زانایینە ژبەر شرۆڤەکرنا وی یا دوماهیێ بۆ سیستەمێ کوما ڕۆژێ و لڤینا ئەختەران، ژبەرکو وی نە ب تنێ لڤینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ شرۆڤەکر، لێ ب هاریکاریا تاقیکرنێن گالیلوی ئەو شیا ئەگەرێ لڤینا وان ژی ئاشکەرا بکەت."**

**- "ئەرێ ئەگەرێ لڤینا ئەختەران ژی وەکو گرێلبوونا تەپا ل سەر ڕوویێ خوار یێ مێزێ یە؟"**

**- "هەتا ڕادەیەکی، لێ لەزێ نەکە سۆفیا."**

**- "باشە، هەرچەوا بیت، من چ هەلبژارتنێن دی نینن."**

**- "کیپلەری ئاماژە ب گرنگیا هەبوونا هێزەکا ڕاکێشانێ دناڤبەرا ئەختەران ب خوە دا دابوو، بۆ نموونە، پێدڤیە ڕۆژێ هێزەك هەبیت کو وەل ئەختەرێن دی بکەت ژ خولگەیێن خوە دەرنەکەڤن. هەردیسان وی ئەگەرێ هێواشبوونا لەزاتیا ئەختەران ژی دیارکربوو دەمێ ژ ڕۆژێ دوور دکەڤن. کیپلەر د وێ باوەرێ دابوو کو لڤینا ئاڤا دەریایی، ئانکو جوداهیا ئاستێ ڕوویێ ئاڤا وێ، پەیوەندی ب هەیڤێ و هێزا وێ ڤە هەیە."**

**- "بەلێ پا ئەڤ چەندە ڕاستە!"**

**- "بەلێ، لێ گالیلو دژی ڤێ بۆچوونا وی بوو. وی ترانە ب کیپلەری دکرن کو هزر دکەت هەیڤێ دەستهەلات ل سەر ئاڤا دەریایان هەیە. گالیلو د وێ باوەرێ دا نەبوو کو ئەڤ**

هێزا ڕاکێشانێ بشێت کارتێکرنێ ل سەر تشتەکێ هەتا ڤی ڕادەی دوور بکەت، ب تایبەت وێ دووراتیا دناڤبەرا ئەختەران دا."

- "ل ڤێرێ گالیلو یێ شاش بوو."

- "بەلێ، گالیلو د ڤێ خالێ دا یێ شاش بوو. چونکی ب شێوەیەکێ تایبەت وی گرنگی ددا هێزا ڕاکێشانا ئەردی و کەفتنا تشتان بۆ سەر ڕوویێ ئەردی ب تنێ. لێ د هەمان دەم دا ئەو شیا ب بەلگە هەبوونا کارتێکرنا چەندین هێزان ل سەر تەنەکی بسەلمینیت."

- "باشە ما تە بەحسێ نیوتنی نەدکر."

- "بەلێ، نیوتن هات و ئەو یاسایە دانا یا دبێژنێ "یاسایا هێزا ڕاکێشانا گەردوونی" کو دەڤێ وێ دبێژیت هەر تەنەك تەنەکێ دی ڕادکێشیت و پەیوەندیەکا ڕاستەخو دگەل سەرجەمێ لێکدانا چریا وی تەنی هەیە و پەیوەندیەکا بەروڤاژی دگەل دووراتیا دووجارکی یا دناڤبەرا وان دا هەیە*. ئانکو چەند ئەڤ تەنە مەزنتر بن، هێزا ڕاکێشانا دناڤبەرا وان ژی دێ یا مەزنتر بیت و چەند دووراتیا دناڤبەرا وان دا زێدەتر بیت، هێزا ڕاکێشانا دناڤبەرا وان دا کێمتر لێ دهێت.

- "هیدی هێدی بابەت پتر بۆ من یێ ڕۆهن دبیت، بۆ نموونە هێزا ڕاکێشانا دناڤبەرا دوو فیلان دا مەزنترە ژ یا دوو مشکان، هەردیسان ئەڤ هێزە دناڤبەرا دوو فیلێن ل جهەکی پترە ژ دوو فیلێن یەك ل هندێ و یەك ل ئەفریقیا."

- "ئاها نوکە تو تێگەهشتی و نوکە تو گەهشتیە خالا بنەڕەت: ب دیتنا نیوتنی ئەو هێزا ڕاکێشانێ یا گەردوونی یە، ئانکو ل هەموو جهان هەیە، هەتا دناڤبەرا ئەختەران ب خوە ژی دا هەیە. ڤەدگێڕن و دبێژن دەمێ ئەو ل بن دارەکا سێڤێ یێ ڕوونشتی، وی ئەڤ هێزە ئاشکەرا کربوو، ئەو ژی دەمێ سێڤەك ژ دارێ کەفتیە سەر ئەردی، وی پرسیار کر کا بۆچی ئەڤ سێڤە کەفتە سەر ئەردی نەك بلند بوو ئەسمانی، هەردیسان پرسیار کر ئەرێ هەیڤ ژی دکەڤیتە بن کارتێکرنا هێزا ڕاکێشا ئەردی هەتا بشێت ب بەردەوامی ل دور خوە بزڤڕیت."

- "تشتەکێ بالکێشە... سەرەڕای کو ...."

- "سەرەڕای چ؟"

---

* $F = G\frac{m1m2}{r^2}$

- "ئەگەر هەیڤ ژی بکەڤیتە ژێر کاریگەریا هێزا ڕاکێشانا ئەردی، ئەو هێزا کو سێڤ ل ئەردی دای، باشە پا دڤێت ئەو ژی بکەڤیتە سەر ئەردی نەك بەردەوام و هەتا هەتاییێ ل دور خوە بزڤڕیت."

- "ب ڤێ پێشنیارا تە ئەم دێ گەهینە یاسایا نیوتنی ل دور لڤینا ئەختەران. نیڤەکا پێشنیارا تە ل دور هێزا ڕاکێشانا ئەردی بۆ هەیڤێ یا د جهێ خوە دا بوو، لێ نیڤا دی یا شاش بوو. تە دڤێت بزانی کا بۆچی هەیڤ ناکەڤیتە سەر ئەردی؟ ڕاستە کو هەیڤ ژ لایێ هێزەکا مەزن یا ئەردی ڤە دهێتە ڕاکێشان، لێ ب تنێ تو هزرا خوە د هندێ دا کا چ هێزەك یا پێدڤیە بۆ بلندکرنا ئاستێ ئاڤا دەریایێ هەتا مەترەکێ یان دوو مەتران."

- "ئەز باش تێناگەهم."

- "هزرا خوە د وی ڕوویێ خوار دا بکە یێ گالیلوی بکارئینای دەمێ تەپەك ل سەر گرێل کری."

- "مەرەما تە ئەوە کو دوو هێز هەنە هەیڤێ بۆ لایێ خوە ڕادکێشن؟"

- "هەلبەت ڕاستە. ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دەمێ سیستەمێ کوما ڕۆژێ هاتیە دروستکرن، هێزەکا گەلەك مەزن هەیڤ ژ ئەردی ڤەکر و بۆ جهەکێ دوور هاڤێت. ئەو هێز هەتا هەتاییێ دێ ل سەر هەیڤێ یا بەردەوام بیت چونکی ئەو یا دناڤ ڤالآهیەکا بێ با دا بەردەوام ل دور خوە دزڤڕیت بێ کو بەرخوەدانەك هەبیت."

- "بەلێ مانە ژبەر هێزا ڕاکێشانا ئەردی ژی، بەرەڤ ئەردی ڤە دهێتە ڕاکێشان؟

- "بەلێ، لێ ئەڤ هەردوو هێزە د نەگوهۆڕن و د هەمان دەم دا د گاریگەرن. ژبەر هندێ هەیڤ بەردەوام ل دور ئەردی دزڤڕیت."

- "ئەرێ بابەت هۆسا یێ ب سانەهیە؟"

- "چ پێنەڤێت. ئەڤ سادەییە بۆ ئەگەر نیوتن یێ ڕژد بیت ل سەر ڤەکۆلینێن خوە هەتا ڕاستییێ دووپات بکەت. وی دووپات کر کو هژمارەکا بچووك یا یاسایێن فیزیایی ل سەر هەمووو خالێن د گەردوونی دا دهێنە پڕاکتیزەکرن. لێ دەربارەی لڤینا ئەختەران، وی پشت بەستن کرە سەر هەمان وان هەردوو یاسایان یێن بەری هینگێ گالیلوی ئاشکەرا کرین. یاسایا یەکێ، یاسایا سستیا تەنان بوو کو نیوتنی ب ڤی ڕەنگی دارێژت: "هەر تەنەك دێ هەتا هەتاییێ د ڕەوشا خوە یا لڤینێ یان ڕاوەستیانێ دا مینیت ئەگەر نەکەڤیتە ژێر

کاریگەریا چ هێزێن دەرەکی". یاسایا دووێ ژی گالیلوی ب خوە دووپات کربوو: "دەمێ دوو هێز د هەمان دەم دا کارتێکرنێ بکەنە سەر تەنەکی، ئەو تەن دێ ب شێوێ لڤینەکا هێلکەی زڤڕیت."

- "باشە نیوتن شیا ب ڕێکا ڤێ یاسایێ وێ چەندێ شڕۆڤە بکەت کا بۆچی ئەختەر ل دور ڕۆژێ دزڤرن؟"

- "هەلبەت. هەموو ئەو ئەختەرێن ل دور ڕوژێ دزڤڕن، ژ ئەنجامێ کاریگەریا دوو لڤینێن ژێکجودایە: لڤینا یەکێ، ل سەر هێلەکا ڕاست کو ئەڤە ژی ئەو لڤینە دەمێ بۆ جارا یەکێ کوما ڕۆژێ دروستبووی وان یا وەرگرتی. لڤینا دووێ، ئەو لڤینە یا ئەڤ ئەختەرە بەرەڤ ڕۆژێ دچن ئەو ژی ژ ئەنجامێ هێزا ڕاکێشانا گەردوونی."

- "ئەڤە تشەکێ بلیمەتە."

- "نیوتنی دووپاتکر ئەڤ یاسایە کونترۆلێ ل سەر گەردوونی هەموویێ دکەن. ژبەر هندێ ئەنجامێن ڤەکۆلینێن وی بوونە ئەگەرێ لادانا هەموو بیرۆکەیێن کەڤن یێن ژ چەرخێن ناڤەڕاست هاتینە وەرگرتن کو دگوت ئەو یاسایێن کونترۆلێ ل سەر ئەسمانی دکەن، نە ئەو یاسانە یێن کونترۆلێ ل سەر ئەردی دکەن. ب ڤی ڕەنگی وێنەیێ ڕۆژێ وەك سەنتەرێ جیهانێ هاتە سەلماندن و ل دوماهیێ ژ لایێ ناڤەندێن زانستی ڤە دانپێدان پێ هاتەکرن."

هەتا ڤێرێ ئەلبێرتۆی بەحسێ چەرخێ ڕێنیسانسێ کر و ڕاوەستیا. پاشی ئەو تەختێ داری یێ خوار کرە د قومسورێ دا و ئەو تەپا ل سەر ئەردی ژی ڕاکر و دانا سەر مێزێ.

سۆفیا ژی حێبەتی مابوو ژبەر وان دەرئەنجامێن ژ تاقیکرنا تەختێ داری یێ خوار و تەپا گرۆڤر گەهشتینێ. دەمێ تەماشەی تەپا گرۆڤر دکری کو هێشتا هندەك پنیێن بۆیاغا ڕەش مابوونە پێڤە، هزرا وێ چوو سەر تەپا ئەردی، پاشی پرسیار کر: "باشە پا مرۆڤ، دڕازینە کو ل سەر ئەختەرەکا بەرزە دناڤ گەردوونی دا بژین؟"

- "ڕاستە. ئەڤ وێنەیێ نوو یێ جیهانێ شوکەکا مەزن چێکر، هەروەکو وێ شوکێ بوو یا پشتی هینگێ داروینی جیهان حێبەتی کری دەمێ گوتی مرۆڤ یێ ژ نفشێ گیانەوەران

پەیدابووی. د ڤان هەردوو کاودانان دا، مرۆڤی هەستپێکر وی پیچەکێ جهێ خوە یێ تایبەت دناڤ گشت ئافراندیان دا ژدەستدایە. ژبەر هندێ، ئەڤ هەردوو تیورە کەفتنە بەر پێلەکا دژوار یا نەڕازیبوونا دێرێ."

- "بەلێ پا ل دەڤ من نە یا سەیرە. باشە ئەگەر هۆسا بیت، پا پشتی ڤێ چەندێ هەموویێ چ تشت بۆ خودای ما؟دڤێت دانپێدانێ ب هندێ بکەین کاروبار دا گەلەك ب سانەهیتر بن هەکە ئەرد سەنتەرێ جیهانێ بایە و خودا و ئەختەرێن دی ل تەخەکا بلند یا ئەسمانی بانە."

- "بەلێ ئەڤ چەندە نەبوو جهێ ئازراندنا خەلکی ب تایبەت دەمێ نیوتنی گوتی هەمان یاسایا فیزیای ل سەر هەموو دیاردەیێن گەردوونی دا دهێتە بجهـ ئینان، چونکی هندەك کەس چاڤەڕێی هندێ بوون نیوتن گومانێ ژ مەزناهیا خودای ببەت، لێ ئەڤ تومەتبارکرنە ڕاست دەرنەکەفت، ژبەرکو نیوتنی دیارکر کو ئەڤ یاسایە بەلگەیە ل سەر شیان و مەزناهیا خودای. لێ تشتێ خراپتر ئەو وێنە بوو یێ مرۆڤی بەرامبەر خوە هەی."

- "مەرەما تە چیە؟"

- "هەر ژ چەرخێ ڕێنیسانسێ وەرە، خەلك ل سەر وێ بیرۆکێ ڕاهاتبوون کو مرۆڤ ل سەر ئەختەرەکا بەرزەبووی دناڤ گەردوونێ بەرفرەهـ دا دژیت. سەرەڕای ڤێ چەندێ، هەتا سەردەمێ ئەڤرۆکە ژی ئەم یێن ل سەر ڤێ بیرۆکێ ڕاهاتین؟ بەلێ پتریا خەلکی ل چەرخێ ڕێنیسانێ ئاماژە ب هندێ دکر کو مرۆڤی جهەکێ باشتر و گرنگتر ژ سەردەمێن بەری خوە یێ وەرگرتی."

- "ئانکو چەوا؟"

- "بەری هینگێ، خەلکی هزردکر ئەرد سەنتەرێ گەردوونی یە، لێ پشتی زانایێن فەلەکی دووپاتکری کو چ سەنتەرێن ڕەها یێن گەردوونی نینن، ئێدی هژمارا سەنتەران ژی هندی هژمارا خەلکی زێدەبوون."

- "نوکە ئەز تێگەهشتم."

- "ئێدی چەرخێ ڕێنیسانسێ پەیوەندیەکا نوو دگەل خودای گرێدا، پشتی کو زانست و فەلسەفە ژ لاهوتی دوورکەفتین، شێوازەکێ نوو یێ ئاینێ مەسیحیەتێ ژی پەیدابوو. چەرخێ ڕێنیسانسێ مرۆڤ ل سەر ئاستێ تاکە کەسی ددیت، هەلبەت ڤێ چەندێ ژی

کاریگەری ل سەر ژیانا ئاینی هەبوو، چونکی ئێدی بۆ خەلکی دیاربوو پەیوەندیا وان دگەل خودای گەلەك گرنگترە ژ پەیوەندیا وان دگەل دێریّ."

- "بۆ نموونە، مەرەما تە نڤێژا ئێڤاری یا مرۆڤەکی؟"

- "یا ئێڤاری و یێن دی. ل دیرێن کاتولیکی یێن چەرخێن ناڤەڕاست، هەموو ڕێوڕەسمێن و نڤێژ و کاروبارێن ئاینی ب زمانیّ لاتینی بوون و ژ بلی قەشەیان کەس نەدشیا پەڕتووکا پیرۆز بخوینیت، چونکی ئەو ژی ب زمانیّ لاتینی ییّ کەڤن هاتبوو نڤیسین. لیّ د چەرخیّ ڕێنیسانسیّ دا پەڕتووکا پیرۆز هاتە وەرگێڕان بۆ زمانێن مللی، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەریّ پەیدابوونا ڤۆناغەکا نوو کو دگوتنیّ چاکسازیا ئاینی."

- "مەرەما تە مارتن لوسەرە؟"

- "بەلیّ. ڕۆلیّ لوسەری ییّ گرنگ بوو، لیّ ئەو چاکسازیّ یەکانە نەبوو. گەلەك چاکسازێن دی هەبوون کو بڕیار دای هەر بمینە دناڤ دێرا کاتولیکی دا و ژناڤ خوە دا چاکسازیان تێدا بکەن، وەك ئیراسموس دو ڕوتردامی."

- "ئانکو لوسەر ژ دێرا کاتولیکی دوورکەفت، چونکی ئێدی ئەو ییّ بەرهەڤ نەبوو بهاییّ چەکێن گونەهژێبرنیّ* بدەت، مانە هۆسایە؟"

- "ڕاستە، لیّ هندەك ئەگەرێن گرنگتر ژی هەبوون. ب دیتنا لوسەری، مەرج نینە مرۆڤ بچیتە دێریّ یان دەڤ قەشەیان هەتا داخوازا لێبورین و گونەهژێبرنیّ ژ خودای بکەت، ڤێجا ما دیّ بۆچی ئەو پێدڤی ب وان چەکێن گونەهژێبرنیّ بیت یێن ل دێریّ دهێنە فرۆتن؟"

- "د ڕاستی دا، بازرگانیکرن ب چەکێن گونەهژێبرنیّ دناڤ دێرا کاتولیکی ب خوە ژی دا ل ناڤەڕاستا چەرخیّ شازدیّ زاینی هاتبوو قەدەغەرکرن."

- "بێگومان نوکە کەیفا خودای ژی ب ڤیّ چەندیّ هاتیە."

- "لوسەری هەلویست دژی هژمارەکا مەزن یا بیروباوەر و ڕێوڕەسمێن ئاینی یێن دێریّ وەردگرت کو ب درێژاهیا چەرخێن ناڤەڕاست خوە ل سەر دێریّ سەپاندبوو. ل شوونا

---

* چەکێن گونەهژێبرنیّ جۆرەکیّ گرێبەستان بوو ژلاییّ دێرێن مەسیحی ل چەرخێن ناڤەراست بەرامبەر کوژمەکیّ پارەی دهاتنە فرۆتن بەرامبەر ژێبرنا گونەهێن وان و چوونا وان بۆ بەهەشتیّ، ئەڤ چەندە یا بەردەوام بوو هەتا مارس لوسەر هاتی و دژی ڤی کاریّ دێریّ راوەستیای.

هندێ، وی دڤیا بۆ مەسیحیا ئینجیلێ ب تنێ بزڤڕیت. لوسەری دڤیا بزڤڕیتە کانیێن مەسیحیەتێ هەروەکو کا چەوا مرۆڤدوستان دڤیای بزڤڕنە ژێدەرێن کەڤن یێن هونەر و کەلتوری. لوسەری پەڕتووکا پیروز وەرگێڕا سەر زمانێ ئەڵمانی و ب ڤی ڕەنگی ڕێك ل هەمبەر هەموو خەلکی ڤەکر ئینجیلێ بخوینن و ئێدی هەر کەسەك ب خوە ببوو ڕێبەرێ خوە."

- "ڕێبەرێ خوە، باشە ما ئەڤە نە گەلەك بوو؟"

- "لوسەر د وێ باوەرێ دا بوو کو قەشەیان چ پەیوەندیێن تایبەت دگەل خودای نینن، ژبەر هندێ دناڤ دوکەفتیێن لوسەری دا قەشەیەك دهاتە دانان کو ئەرکێ وی ب تنێ بڕێڤەبرنا کاروبارێن دێرێ یێن ڕۆژانە و کرنا نڤێژان و خواندنا دوعایان بوو. مەرەما وی ژ ڤی کاری ئەو بوو کو مرۆڤ ب ڕێکا ئەنجامدانا ڕێوڕەسمێن ئاینی نەشێت گونەهێن خوە ژێببەت و داخوازا لێبورینێ ژ خودای بکەت، بەلکو باوەری ئینان تاکە ڕێکە مرۆڤی نێزیکی خودای بکەت و ڕازیبوونا وی بدەستڤە بینیت، ئەو ژی کو پشتی پەڕتووکا پیرۆز دخوینیت و تێدا شارەزا دبیت."

- "ئانکو ئەم دشێین بێژین لوسەر نموویەك بوو ژ زەلامێن چەرخێ ڕێنیسانسێ."

- "بەلێ و نەخێر. یەك ژ ساخلەتێن چەرخێ ڕێنیسانسێ، ڕولێ مرۆڤی وەك تاکەکەس و پەیوەندیا وی دگەل خودای بوو. د ژیێ 35 سالیێ دا وی خوە فێری زمانێ گریکی کر و پەڕتووکا پیرۆز وەرگێڕا سەر زمانێ ئەڵمانی. وەکو دی ژی لادانا زمانێ لاتینی د بەرژەوەندیا زمانێ نیشتیمانی دا، کارەك بوو ب تەمامی دژی بیروباوەرێن چەرخێ ڕێنیسانسێ بوو. ڕامانا وێ ئەوە کو لوسەر نە کەسەکێ مرۆڤدوست بوو وەکو "مارسیل فیسین" و "لیوناردو داڤینشی". ئەڤ چەندە ژی بۆ ئەگەر لوسەر بکەڤیتە بەر هێرش و نەڕازیبوونا فەیلەسۆفێن دی یێن مرۆڤدوست وەکو "ئیراسموس دو ڕوتردام"ی کو هزردکر دیتنا لوسەری بۆ مرۆڤایەتیێ یا نەرێنی یە. لوسەری بەردەوام جەختی ل سەر هندێ دکر کو هەر ژ دەمێ دەرێخستنا ئادەم و حەوایێ ژ بەهەشتێ وەرە مرۆڤ یێن شکەستین و ب تنێ دلوڤانیا خودای دشێت وان قورتال بکەت و گونەهێن وان ژێببەت. ل ڤێرێ ژی مرن ئەو بهایە یێ پێدڤیە مرۆڤ ل پێش ژێبرنا گونەهێن خوە ڤە بدەت."

- "بابەتێ تە ئەز خەمگین کرم."

ئەلبێرتۆ ژ جهێ خوە ڕابووڤە و ئەو تەپە کرە د بەریکا خوە دا. ژ نیشکەکێ ڤە سۆفیایێ کرە ڤێژی: "هەوارە، دەمژمێر یا بوویە چوارێ ئێڤارێ!"

- "قۆناغا بهێت د دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دا، قۆناغا باروکی یە. د ڕوونشتەکا دی دا دێ ل سەر ئاخڤین، خوشتڤیا من هێلد."

سوفیا ژ سەر کورسیکا خوە ڕابووڤە و لێ کرە ڤێژی: "تە چ گوت؟ خوشتڤیا من هێلد."

- "ئەز یێ شاش بووم. ل من بboورە."
- "ژ نیشکەکێ ڤە ئەم شاش نابین."
- "تو ڕاست دبێژی. ئەز دبێژم بابێ هێلدی یێ گەهشتیە وی ڕادەی ب ڕێکا مە باخڤیت ب تایبەت دەمێ دبینیت ئەم د واستیاینە و نەشێین بەرەڤانیێ ژ خوە بکەین."
- "تە گوت ئەز نە بابێ هێلدێ مە، دێ شێی سووند خوی؟"

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە ب بەلێ هەژاند، سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: "باشە پا هێلد ژی ئەزم؟"

- "سۆفیا، نوکە ئەز گەلەك یێ واستیایمە، پێدڤیە تو د ڤێ چەندێ بگەهی. ئەڤە پتر ژ دوو دەمژمێرە ئەم یێن پێکڤە و بەردەوام ئەز یێ دئاخڤم. باشە مانە نوکە پێدڤیە تو بزڤڕیە مال و شیڤێ بخوی؟"

سۆفیایێ هەستپێکر ئەو یێ پێکۆلێ دکەت وێ ژ خوە دوور بکەت، ژبەر هندێ بەرەڤ دەرگەهی ڤە چوو و هزرا خوە د هندێ دا دکر کا بۆچی وی ناڤێ سۆفیایێ دروست نەگوت. ئەلبێرتۆ و هێرمس هەتا بەر دەرگەهی دگەل وێ چوون و ل نێزیکی حەلاڤا جلکان ڕاوەستیان کو جلکێن پێڤە هەلاویستی وەکو جلکێن شانۆڤانان بوون. مامۆستایێ وێ گوت: "جارەکا دی ژی دێ هێرمسی فرێکەمە دووڤ تە ڕا."

سۆفیایێ ئەلبێرتۆ هەمبێز کر و بەری خاترا خوە ژێ بخوازیت، گوتێ: "سۆپاس بۆ وانەیا ئەڤرۆکە. تو باشترین مامۆستایێ فەلسەفێ یی من د ژیانا خوە دا دیتی."

بەری ئەلبێرتۆ دەرگەهێ سەرەکی ل دووڤ خوە ڕا بگریت، سۆفیایێ گوهلێبوو یێ دبێژیت: "ل دەمەکێ نێزیك دێ هەڤدوو بینەڤە، هێلد!؟"

کەربێن وێ گەلەك ڤەبوون چونکی جارەکا دی ژی وی ناڤێ وێ شاش گوت. تڕسنوك! سۆفیایێ دڤیا دووبارە لێ بزڤڕیت و دەرگەهی بقوتیت و خوە ژێ تۆڕە بکەت.

دەمێ سۆفیا هاتیە سەر جادێ، ژ نوو زانی کو چ پارە دگەل وێ نینن، ئانکو پێدڤیە ئەو ب پیان بزڤڕیتە مال. چ پێنەڤێت دێ بۆ وێ ئاریشەکا مەزن چێبیت هەکە ئەو بەری دەمژمێر شەش نەگەهیتە مال.

لێ هێشتا وێ چەند پێنگاڤ نەهاڤێتین، چاڤێ وێ ب پارەیەکێ دەهـ کورونی ل سەر شوستەی کەفت. گەلەك باشە، ئەڤە کریا پاسێ یە و ئەڤە ژی جهێ ڕاوەستیانا پاسانە. ئەو دشێت خوە ل ڤێرە بگریت هەتا پاسەیا نیڤا بازاڕی دهێت و پاشی ل وێرێ دێ ل پاسەکا دی سووار بیت هەتا دگەهیتە مال.

ل جهێ دی یێ ڕاوەستیانا ترۆمبێلان ل نیڤا بازاڕی، سۆفیایێ هەستپێکر ئەو یا بەختەوەرە کو وێ دەهـ کورون دیتین ب تایبەت کو ل ڤی دەمی وێ گەلەك پێدڤی پێ هەبوو، باشە ما کی نابێژیت بابێ هێلدێ ب خوە ئەو پارە بۆ وێ یێ هاڤێتیە وێرێ! دەمێ مرۆڤ تشتەکی ل جهەکێ نەبەرئاقل دبینیت، هەر یەکسەر دێ گومان ل دەڤ پەیدابیت.

باشە، ئەگەر هۆسا ژی بیت، چەوا ئەڤ چەندە چێدبیت ل دەمەکی ئەو نوکە یێ ل لوبنانێ؟

باشە بۆچی ئەلبێرتۆی دوو جاران ناڤێ وێ شاش گوت؟

سۆفیایێ هەستپێکر تەزینکەك ب سەر لەشێ وێ دا هات.

# سەردەمێ باروکی

...ئەم ژ وی قوماشی هاتینە چێکرن یێ خەون ژێ هاتینە
ڤەهاندن...

چەندین ڕۆژ بورین بێ کو سۆفیا چ دەنگوباسان ل دور ئەلبێرتۆی بزانیت، لێ ڕۆژانە چەندین جاران تەماشەی ناڤ باخچەی دکر دا بزانیت کا هێرمس هاتیە وێرێ. بەری هینگێ وێ گوتبوو دایکا خوە ئەو ڕۆژا وێ سەیێ دناڤ باخچەی وان دا بۆ خوەدانێ وی زڤڕاندی، دیاربوو کو ئەو مامۆستایێ فیزیایێ یە و داخواز ژ سۆفیایێ کربوو چایەکێ ل مالا وی ڤەخوت و پاشی ب درێژاهی بەحسێ سیستەمێ کوما ڕۆژێ و پەیدابوونا زانستەکێ نوو ل چەرخێ شازدێ زاینی بۆ وێ کربوو.

لێ سۆفیایێ بەحسێ گەلەك تشتێن دی بۆ هەڤالا خوە جوانایێ کربوون. بەحسێ چوونا خوە بۆ مالا ئەلبێرتۆی و پۆستکارتا د سندوقا وی یا پۆستەی دا و دەهـ کورونێن ل سەر شوشتەی دیتین. لێ چ تشت دەربارەی خەونا خوە ل دور هێلدێ و خاچا زێڕی بۆ وێ نەگوتن.

ڕۆژا سێشەمبی ڕێکەفتی 29ی گولانێ، دەمێ سۆفیایێ د لێنانگەهێ ئامانێن فراڤینێ د شووشتین و دایکا وێ ژی د هۆلا ڕوونشتێ ڤە تەماشەی دەنگوباسان دکری، دەنگوباسەك ل دور کوشتنا مایجەرەکێ نەڕویجی دناڤ ڕێزێن هەوارهاتنێ یێن نیڤدەولەتی ل باشورێ لوبنانێ هاتە خواندن کو ژ ئەنجامێ بۆمبەکا دەستی، ئەو مایجەر هاتبوو کوشتن.

سۆفیایێ لیفکێ د دەستێن خوە دا هاڤێتە سەر مێزێ و بلەز بەرەڤ هۆلا ڕوونشتێ ڤە چوو هەتا گەهشتیە دوماهیك بەشێ وی دەنگوباسی کو وێنەیێ یەك ژ سەربازێن نەتەوەیێن یەکگرتی بوو. ل دووڤ دا ئەو دەنگوباس ب دوماهی هات و بێژەری بەحسێ ڕوودانەکا دی کر.

سۆفیایێ ب ترس ڤە کرە ڤێژی: "ئوهـ، نە!"

دایکا وێ ل دور خوە زڤڕی و گوتێ: "بەلێ، ئەڤ شەڕە گەلەك یێ ب مەترسی یە."

سۆفیایێ دەست ب گریێ کر.

- "سۆفیا، ئارام بە، نابیت هەتا ڤی ڕادەی تو خەمگین ببی!"
- "باشە ناڤێ وێ گوت؟"
- "بەلێ... بەلێ ما دێ چەوا هێتە بیرا من؟ ئەز دبێژم ئەو خەلکێ گریمستاندێ بوو."
- "بەلێ یا مانە گریمستاند ژی دکەڤیتە باشورێ لیلساندێ؟"
- "نەخێر، بەس چیپ چیپێ بکە!"
- "بەلێ یا ڕەنگە خەلکێ گریمستاندێ بچنە قوتابخانەیێن دەڤەرا لیلساندێ."

سۆفیایێ ڕۆندکێن خوە پاقژکرن، لێ گەڕا دایکا وێ هات کو ژ جهێ خوە ڕابووڤە و چوو تێلەڤزیون ڤەمراند و بەرێ خوە دا سۆفیایێ.

- "ئەڤە تو چ دبێژی سۆفیا؟"
- "چ نە."
- "بەلێ، ئەز یا هەموو تشتان ب ئاشکەرای دبینم! تو یا ئەڤیندار بووی و هۆسا دیارە ئەو کەس چەندین سالان ژ تە مەزنترە. نوکە بەرسڤا من بدە: ئەرێ تو حەز ژ زەلامەکی ل لوبنانێ دکەی؟"
- "نەخێر، بابەت ب وی ڕەنگی نینە."
- "باشە، دیارە تو ئەڤیندارا کورێ زەلامەکی ل لوبنانێ؟"
- "من گوتە تە نەخێر، هەتا من کچا وی ژی نەدیتیە!"
- "کچا وی، تو بەحسێ کێ دکەی؟"

- "مایێ تە تێناچیت."
- "تو هۆسا هزر دکەی؟ مایێ من تێناچیت."
- "یا دروستتر ئەوە ئەز پرسیارێ ژ تە بکەم: بۆچی بابێ من هەموو گاڤان یێ ژ مال دوورە؟ ئەرێ هوون هەردوو هند د ترسنوکن نەوێرن خوە ژ هەڤدوو بدەنە بەردان؟ ئەرێ تە ئەڤیندارەك هەیە کو ئەز و بابێ خوە نەزانین؟ تە دیت؟ من ژی هژمارەکا مەزن یا پرسیاران هەیە و ئەگەر تە دڤێت تە دڤێت دا ڤێ یارییێ دەست پێبکەین..."
- "ئەز دبێژم یا باشترە ئەم بڕوونینە خوارێ و ڤان بابەتان ب جوانی شڕۆڤە بکەین."
- "هزرەکا خڕاب نینە، لێ ئەز گەلەك یا واستیایمە و حەزدکەم بێهنەکێ بنڤم، وەکو دی ژی نوکە ئەز یا د ڕۆژێن خوە یێن خولا هەیڤانە دا."

سۆفیایێ ئەڤ چەندە گوت و ئەو هۆل بجهـ هێلا، لێ هێشتا هندەك ڕۆندك ژ چاڤێن وێ دهاتنە خوارێ.

هێشتا ئەو ب دروستاهی ژ سەرشوویێ نەدەرکەفت بوو و جلکێن خوە ژی نەکربوونە بەر خوە، دایکا وێ هات و دەرگەهێ ژوورا وێ قوتا. لێ سۆفیا هەر زوو چوو د بن جهێن خوە ڤە و هۆسا خوە دیارکر یا نڤستیە. سۆفیایێ هەستپێدکر دایکا وێ باوەر ژ ئاخفتنێن وێ ناکەت، لێ دایکا وێ هۆسا خوە دیار دکر کو باوەر ژ ئاخفتنێن وێ دکەت. دایکا وێ ل سەر لێڤا تەختێ وێ ڕوونشت و دەستێ خوە ب سەر پرچا وێ دا ئینا خوارێ.

سۆفیایێ هەستپێدکر تشتەکێ چەندێ ب زەحمەتە ئەو هەردوو پێکڤە لێ د دوو ژیانێن تەمام ژێکجودا دا بژین، لێ گوهێ خوە نەدا ڤێ چەندێ و هزرێن خوە د دوماهیا کورسێ فەلسەفی دا دکرن. ڕەنگە ئەڤ کورسە ل ڕۆژا جەژنا ژ دایکبوونا وێ یان جەژنا ڤەشە یوحەنای ب دوماهیك بهێت، نەخاسم دەمێ بابێ هێلدێ ژ لوبنانێ دزڤڕیت.

ژ نیشکەکێ ڤە سۆفیایێ گوت: "من ل بەرە ئاهەنگەکا مەزن بۆ جەژنا ژ دایکبوونا خوە بگێڕم."

- "هزرەکا جوانە، تە دڤێت کێ داخواز بکەی؟"
- "گەلەك کەسان، ئەز دشێم؟"

- "چ پێنەڤێت، باخچێ مە یێ مەزنە و بەلکو هینگێ سەڤایێ دنیایێ ژی وەکو ئەڤرۆکە یێ خوش بیت."

- "من دڤێت ئاهەنگا خوە ل ڕۆژا جەژنا قەشە یوحەنای دا بکەم."

- "ئەز یا ڕازیمە."

سۆفیایێ هزرا خوە د تشتەکێ دی دا دکر و پاشی گوت: "دێ ڕۆژەکا مەزن بیت."

- "هەلبەت..."

- "ئەز هەستپێدکەم ل ڤێ دوماهیێ ئەز گەلەك یا مەزن بوویم و پێگەهشتیم."

- "ما تو نابینی ئەڤ چەندە تشتەکێ باش بیت؟"

- "ئەز نزانم."

ب درێژاهیا وی دەمی، سۆفیایێ سەرێ خوە ل سەر بالیفکێ نەڕاکربوو. پاشی دایکا وێ پرسیار ژێ کر: "گوهێ خوە بدە من، پێدڤیە تو بۆ من ڕۆهن بکەی کا بۆچی ئەڤە ماوەیەکە تو ب شێوەیەکێ سەیر ڕەفتارێ دکەی؟"

- "باشە پا تو، ئانکو تو ژی دەمێ بوویە پازدە سال تە ب شێوەیەکێ سەیر ڕەفتار نەدکر؟"

- "بێگومان. بەلێ پا تو دزانی کا ئەز بەحسێ چ دکەم؟"

سۆفیایێ هێدی سەرێ خوە زڤڕاند و تەماشەی دایکا خوە کر و گوت: "ناڤێ وی سەی هێرمسە."

- "ێ باشە!"

- "ناڤێ خوەدانێ وی ژی ئەلبێرتۆیە."

- "باشە."

- "ئەو ل تاخەکێ کەڤن ل ژووریا باژێری دژیت؟

- "هەتا وی جهێ دوور تو ب دووڤ سەی کەفتی دەمێ تە زڤڕاندیە مال؟"

- "بەلێ چ مەترسی تێدا نەبوو."

- "بەلێ پا تە گوتبوو چەندین جارێن دی ژی ئەڤ سەیە هاتبوو ناڤ باخچەی."

- "چەوا؟ من وەگوتبوو؟"

سۆفیایێ بێهنەکێ هزرێن خوە کرن. وێ دڤیا بەحسێ گەلەك تشتێن دی بکەت، لێ سەرەڕای ڤێ چەندێ، ئەو نەشێت بەحسێ سەرهاتیا خوە هەموویێ دگەل مامۆستایێ فەلسەفێ بۆ وێ بکەت.

- "دادێ، تو پتریا دەمێ خوە ل مال نینی."
- "نەخێر، بەلێ پا ئەز یا نەچارم، چونکی من گەلەك شول هەیە."
- "بەلێ پا بەری نوکە گەلەك جاران هێرمس و ئەلبێرتۆ یێن هاتینە ڤێرێ."
- "ژبەر چ هاتینە، ئەرێ ئەو هاتینە د ژوور ڤە؟"
- "باشە تو نەشێی یەك یەکە پرسیارێن خوە بکەی؟ نەخێر ئەو نەهاتینە د ژوور ڤە، بەلێ پا پتریا جاران ل سەر پەڕژانێ باخچەی دروونشتن، تو هزر دکەی ئەڤە یا سەیر بیت؟"
- "نەخێر، بەس دا سەحکەینێ کا بابەت چیە."
- "گەلەك کەسێن دی یێن وەکو وان دبەر مالا مە ڕا بورینە و ل سەر پەڕژانی ڕوونشتینە خوارێ و بێهنا خوە ڤەدایە. ڕۆژەکێ دەمێ ئەز ژ ڤۆتابخانێ دزڤڕیم، من ئەو دیت. من سلاڤکرە هێرمسی و هۆسا هەڤنیاسین دگەل ئەلبێرتۆی ژی کر."
- "باشە، پا ئەڤ چیرۆکێن دی هەموو چ بوون؟ چیرۆکا کێڤریشکا سپی؟"
- "ئەو یەك ژ وان تشتان بوو یێن ئەلبێرتۆی بۆ من گوتین. ئەو فەیلەسۆفەکێ ڕاستەڤینەیە و بۆ من گەلەك بەحسێ فەلسەفێ یێ کری."
- ئاها ب ڤی ڕەنگی؟ ل سەر پەڕژانێ باخچەی؟"
- "نەخێر، ل دوماهیێ ئەم بووینە هەڤالێن یەك و پێکڤە دروونشتینە خوارێ. تو تێگەهشتی؟ بەلێ پا بەری هینگێ وی بۆ من نامە دنڤیسان و فرێدکرن، کومەکا نامەیان. دەمێ ئەو د ڤێرێ ڕا دبوری، نامە دکرنە د سندوڨا پۆستەی دا یان ژی ددانانە سەر بانێ وێ."
- "ئاها ئەڤە ئەو نامێن ئەڤینێ یێن ناڤدار بوون."
- "بەلێ پا ئەو نامێن ئەڤینیێ نەبوون."
- "باشە وی بەحسێ فەلسەفێ بۆ تە نەکریە؟"

- "بۆچی تو هۆسا حێبەتی بووی؟ ئەو تشتێ ئەز ژ ڤان نامەیان فێربوویم، ب درێژاهیا هەشت سالێن خوە یێن قوتابخانێ ئەز فێرنەبوویمە. بۆ نموونە، باشە تو دزانی "جیوردانو برونو" ئەوێ ل سالا 1600ێ هاتیە سوتن کی بوو؟ ئەرێ یاسایا هێزا ڕاکێشانێ یا نیوتنی ئاشکەراکری چ دبێژیت؟"

- "ئەز دانپێدانێ دکەم کو ئەز گەلەك تشتان نزانم."

- "ئەز ژی یا پشتڕاستم کو تو نزانی کا بۆچی ئەرد ل دور ڕۆژێ دزڤڕیت، سەرەڕای هندێ کو تو ژی ل سەر ڤێ ئەختەرێ دژی!"

- "باشە ژیێ وی نێزیکی چەند سالانە؟"

- "ئەز نزانم. لێ ژ پێنجیێ سالیێ بوریە."

- "باشە، وی چ پەیوەندی ب لوبنانێ ڤە هەیە."

ئاها ئەڤە بارودوخەکێ نەخوش ب سەر وێ دا هات. هەر بلەز ب دەهان بەرسڤان خوە ل سەرێ سۆفیایێ دان، لێ وێ بەرسڤا ژ هەموویان بەرئاقلتر هەلبژارت.

- "ئەلبێرتۆی برایەکێ هەی، ئەو ژی مایجەرەکێ نەرویجی یە دگەل هێزێن نەتەوەییێن یەکگرتی ل لوبنانێ کار دکەت. ئەو ب خوە خەلکێ لیلساندێ یە. ئەز یا پشتڕاستم ئەو بەری نوکە یێ د وی کۆلکێ ناڤ دارستانێ ڤە ژیای ئەوێ دبێژنێ کۆلکێ مایجەری."

- "باشە تو نابینی کو ناڤێ ئەلبێرتۆی ناڤەکێ سەیرە."

- "چێدبیت."

- "هۆسا دیارە ئەو کەسەکێ ئیتالی یە."

- "ڕاستە، بەلێ پا هەموو میراتێ مە یێ کەلتوری بۆ یونانێ یان ئیتالیا دزڤڕیت."

- "باشە نوکە ئەو ب نەرویجی ژی دئاخڤیت؟"

- "بەلێ، گەلەك باش ژی."

- "تو دزانی ئەز یا هزرا خوە د چ دا دکەم سۆفیا؟ ئەز دبێژم هەڤالێ خوە داخواز بکە ڤێرێ ل مال. من د ژیانا خوە هەموویێ دا چ فەیلەسۆفێن ڕاستەقینە نەدیتینە."

- "دێ سەحکەینێ."

- "باشە ئەم دشێین وی ژی داخواز بکەینە ئاهەنگا تە؟ دبیت تشتەکێ بالکێش بیت ئەگەر چەند بەرەبابك ل ڤێ ئاهەنگێ د ئامادەبن. هۆسا دێ من ژی ماف هەبیت بەشداربم. هەر چ نەبیت دێ شێم بخێرهاتنا مێهڤانان کەم. مانە هزرەکا جوانە؟"
- "ئەگەر وی بڤێت بهێت، چ ئاریشە نینە؟ هەرچەوا بیت سحبەتێن دگەل وی دێ گەلەك خوشتر بن ژ سحبەتێن کچەکا پولێ، بەلێ پا..."
- "بەلێ پا چ؟"
- "دێ هەموو هزرکەن ئەلبێرتۆ هەڤالێ تە یێ نوویە؟"
- "باشە تو دشێی ڕاستیێ بۆ هەموویان بێژی."
- "باشە. دێ سەحکەینێ."
- "ئەم پێکهاتین."
- "سۆفیا، گوهێ خوە بدە من، ڕاستە پەیوەندیا من دگەل بابێ تە نە گەلەك یا باش بوو. بەلێ پا من چ جاران خیانەت ل وی نەکریە."
- "من دڤێت نوکە بنڤم، چونکی زکێ من گەلەك یێ دئێشیت."
- "بۆ تە حەبکەکێ بینم؟"
- "بەلێ.. بەلێ."
- دەمێ دایکا وێ زڤڕی و حەبکەکەك و گلاسەکا ئاڤێ د دەستان دا، سۆفیا د خەو چووبوو."

ڕۆژا 31ی هەیڤا گولانێ کو ڕۆژا پێنج شەمبیی بوو، سۆفیا ژ دوماهیك وانەیێن خوە یێن قوتابخانێ بێزار بوو. هەر ژ وێ ڕۆژا دەست ب کورسێ فەلسەفێ کری، ئێدی د گەلەك بابەتان دا زیرەك ببوو. بەری نوکە هەڵسەنگاندنێن هەموو وانەیێن وێ دناڤبەرا "باشە" و "زۆرباشە" دا بوون، لێ ل ڤێ هەیڤا دوماهییێ دوو جاران ل دووڤ یەك هەڵسەنگاندنا "زۆر باشە" ب هەردوو بابەتێن "کومەلایەتی" و "دارشتن"ێ وەرگرتبوو، لێ هەڵسەنگاندنا وێ یا بابەتێ بیرکارییێ هەر "ناڤنجی" بوو.

ل دوماهیك وانە دا، قوتابی هاتبوونە ڕاسپاردن بابەتەکی د پولێ ڤە بنڤیسن. قوتابیان سۆفیا هەلبژارتبوو بابەتەکی ل دور "مرۆڤ و تەکنولوژیا"یێ بنڤیسیت. سۆفیایێ د ڤی بابەتی دا هەموو ئەو تشت نڤیسان یێن وێ ل دور چەرخێ ڕێنیسانسێ، پێشکەفتنا

زانستی، دیتنا نوو بۆ سروشتی، دەربارەی فرانسیس بیکونی ئەوێ گوتی زانین قەدەرە و ل دور شێوازێ نوو یێ زانستی فێربووی، زێدەباری دەستنیشانکرنا وی شێوازێ زانستی یێ بەرێ بنیاتێ هەموو داهێنانێن زانستی دانای.

پاشی بەحسێ لایەنێن نەرێنی یێن تەکنولوژیایێ کر. ل دوماهیێ ژی بابەت ب هندێ ب دوماهیك ئینا کو هەموو کارێن مرۆڤی ڕەنگە د باشیێ یان خراپیێ دا بهێنە بکارئینان، چونکی باشی و خراپی وەکو دوو هێلانە، دوو هێلێن ڕەش و سپی یێن تێکئالّیای کو ب زەحمەت بهێنە ژێکجودا کرن.

دەمێ مامۆستای دەفتەرێن قوتابیان زڤڕاندین، ب ئاورینەکا سەیر تەماشەی سۆفیایێ کر. گومانەك ل پشت ڤێ ئاورینا وی یا ڤەشارتی بوو.

مامۆستایێ ل سەر دەفتەرا وێ نڤیسابوو "هەرەباش"، لێ کومێنتەك ژی ل سەر زێدەکربوو "تە ئەڤ تشتە هەموو ژ کیڤە زانینە؟". سۆفیایێ پێنوسەکێ ڕەش ئینا و ب خەتەکێ مەزن ب ڕەخ ڤە نڤیسا: "ئەز وانەیێن فەلسەفێ دخوینم".

دەمێ سۆفیایێ دەفتەرکا خوە گرتی، تشتەك ژ ناڤ لاپەرێن وێ دا کەفت. ئەو تشت پۆستکارتەك بوو کو ژ لوبنانێ هاتبوو. سۆفیایێ دەست ب خواندنا وێ کر.

***خوشتڤیا من هێلد***

*دەمێ تو ڤان پەیڤێن من دخوینی، نوکە دەنگوباسێ ئەو ڕوودانا دلتەزین یا ل ڤێرێ ڕوودای، ل هەموو جیهانێ بەربەلاڤبوویە. ئەز هندەك جاران پرسیارێ ژ خوە دکەم ئەرێ دێ چ ڕوودەت ئەگەر ئێدی شەڕ و توندوتیژی نەمینن، ب تایبەت هەکە مرۆڤ بیرتیژیا خوە بکاربینن و ب شێوەیەکێ باشتر هزرا خوە بکەن. ڕەنگە وەرگرتنا کورسەکێ فەلسەفی باشترین ڕێك بیت ژ بۆ ڕێگرتنێ ل شەری و توندوتیژیێ. تو چ دبێژی ئەگەر نەتەوەیێن یەکگرتی نامیلکەکا بچووك ل دور فەلسەفێ بۆ هەموو خەلکێ جیهانێ و هەر یەکی ب زمانێ وی فرێکەن؟ ئەز دێ ڤێ بیرۆکێ پێشکێشی ئەمینداریێ گشتی یێ نەتەوەیێن یەکگرتی کەم.*

*د پەیوەندیا خوە یا دوماهیێ دا تە گوتبوو من کو ئێدی تو پتر گرنگیێ ب کاروبارێن خوە ددەی، هەلبەت ڤی دەنگوباسی ئەز گەلەك کەیفخوش کرم ژبەرکو تو خەمسارترین کەسی من د ژیانا خوە دا دیت بیت. هەروەسا تە گوتبوو من کو تشتێ یەکانە ژ هینگێ وەرە تە بەرزەکری، دراڤێ تە یێ دەهـ کورونی بوو. ئەز نەشێم هاری تە لێبگەرم چونکی ئەز گەلەك یێ دوورم، لێ ئەز کەسەکێ دنیاسم تو دشێی پشتا خوە پێ گەرم بکەی.*

*"ئەگەر من پارێ تە دیت، دێ کەمە دیاری بۆ جەژنا ژ دایکبوونا تە"*

*دگەل رێزێن من*

*بابێ تە ئەوێ هەست پێدکەت کو دەست*

*ب هاڤێتنا پێنگاڤێن خوە بەرەڤ مال کریە.*

هێشتا سۆفیایێ ب تەمامی کارتە نەخواند بوو دەمێ زەنگا دوماهیا دەوامێ هاتیە لێدان، سەدان پرسیاران خوە ل سەرێ وێ دا. وەکو هەرجار، جوانا ل ناڤ گۆرەپانا قوتابخانێ چاڤەرێی وێ بوو. ب رێکێ ڤە چانتێ خوە ڤەکر و ئەو پۆستکارتە ژێ ئینا دەرێ.

جوانایێ پرسیار کر: "ئەرێ رێکەفتا لێدانا مورێ کەنگی یە؟"

- "15ی گولانێ، بێ گومان..."
- "نەخێر، کا راوەستێ... رێکەفتی 30 گولانا 1990ێ یە."
- "دوهی بوو، ئانکو رۆژەکێ پشتی روودانا لوبنانێ."
- "ئەز باوەر ناکەم کو پۆستکارتەك د ماوەیێ رۆژەکێ دا ژ لوبنانێ بگەهیتە ڤێرێ."
- "ب تایبەت ئەگەر وێ چەندێ ل بەرچاڤ وەربگرین کو ناڤونیشانێن وێ نە یێن ئاسایی نە و ل سەر هاتیە نڤیسین "هێلد موللەر کناگ\ ب رێکا سۆفیا ئاموندسنێ، قوتابخانەیا فورولیا".
- "تو بێژی ب پۆستێ گەهشت بیت و مامۆستایی کربیتە دناڤ پەرتووك تە دا؟"

- "ئەز چ نزانم، ئەز نەوێرم پرسیارا ڤێ چەندێ ژ وی بکەم. دا ژبیرنەکەم بێژمە تە کو دێ ئاهەنگەکا مەزن دناڤ باخچێ مالا مە دا ب هەلکەفتا جەژنا یوحەنای گێڕین."

- "ئەرێ دێ کوڕ ژی هێنە وێرێ."

سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند و گوت: "بەلێ، پێدڤی ناکەت ئەم کورکێن بێ ئاقل داخواز بکەین."

- "و یورجنی، تو دێ بێژیە وی؟"
- "ئەگەر تە بڤێت دێ بێژمێ. دبیت ئەلبێرتۆ کنوکسی ژی داخواز بکەم."
- "چیە تو دین بوویە، چ ل تە هاتیە؟"
- "ئەز دزانم ..."

سۆفیایێ ئەڤ چەندە گوت و ئەو هەردوو ل هەمبەری سەرێ سیکێ ژێکڤەبوون.

دەمێ سۆفیا زڤڕیە مال، یەکسەر چوو ناڤ باخچەی داکو بزانیت کا هێرمس نەهاتیە وێرێ. بەلێ ژ ڕاستا ئەو یێ ل وێرێ و یێ ل دور دارەکا سێڤێ دزڤڕیت.

- "هێرمس!"

هێرمس بۆ هەیاما خولەکەکێ د جهێ خوە دا ڕاوەستیا، سۆفیایێ دزانی کا ئەو چ دکەت. هێرمسی گوهـ ل دەنگێ وێ بوو و نیاسی، ژبەر هندێ دێ بەرەڤ وی جهی ڤە هێت یێ دەنگێ سۆفیایێ ژێ هاتی داکو پشتڕاست بیت کا ئەو ل وێرێ یە یان نە. ها ئەڤە یێ خوە ل سەر پەرژانێ باخچەی ڕا دهاڤێژیت و یێ بەرەڤ وێ ڤە دهێت.

گەلەك جاران هژمارەکا کاران د چرکەیەکێ دا ڕوودەن! ها ئەڤە ئەو یێ بەرەڤ وێ ڤە دهێت و کوریا خوە دهەژینیت و پاشی خوە بلند کر چوو خوە د سۆفیایێ وەرکر.

- "هێرمس. ئەی سەیێ باش، ئارام بە، ئارام بە، هۆسا من نەئالیسە. وەرە ل ڤێرێ ب ڕوونە خوارێ ئەی سەیێ باش."

سۆفیایێ دەرگەهێ مال ڤەکر، پشیکا وێ شیریکان ژی ژناڤ هندەك بەلگێن دارەکێ دەرکەفت و ب گومان ڤە تەماشەی هێرمسی کر، لێ سۆفیایێ بۆ خوارن دانا بەر سینگێ وێ و پاشی هندەك تومك دانا بەر باڵندەیان و و بەلگەکێ خەسێ دانا د سەرشوویێ ڤە بۆ کیسەلەێ خوە و ل دوماهیێ ژی نامەیەك بۆ دایکا خوە نڤیسا و تێدا گوتبوویێ کو ئەو دێ هێرمسی بەتە مال و ئەگەر هات و هەتا دەمژمێر حەفتێ ئێڤاری گیرو بوو، دێ تێلەفۆنێ بۆ وێ کەت.

هەردوو پێکڤە چوون، ڤێ جارێ سۆفیایێ ژبیرنەکر و هندەك پارە دگەل خوە برن. ل دەستپێکێ هزرا خوە د هندێ دا کر ئەو و هێرمس ل پاسێ سووارببن، لێ ژ بڕیارا خوە لێڤەبوو و د دلێ خوە دا گوت یا باشترە بۆ ڤێ چەندێ پرسیارا ئەلبێرتۆی بکەت.

دەمێ ئەو ل پشت هێرمسی دچووی، هزرا خوە د سروشتێ گیانەوەران دا دکر. ئەرێ جوداهی دناڤبەرا مرۆڤ و گیانەوەران دا چیە؟ پاشی بیرا خوە ل گوتنێن ئەڕستۆی یێن دەربارەی ڤێ چەندێ ئینا. ئەڕستۆی دیار کربوو کو مرۆڤ و گیانەوەر هەردوو بونەوەرێن زیندی نە و چەندین ساخلەتێن هەڤپشك دناڤبەرا وان دا هەنە، لێ خاڵەکا جوداکەر دناڤبەرا وان دا هەیە کو ئەو ژی ئەقلە.

باشە ئەو چەوا دشیا خوە ژ ڤێ خالا جوداکەر پشتڕاست بکەت؟

ژلایەکێ دی ڤە، دیمۆکریتس د وێ باوەرێ دا بوو کو مرۆڤ و گیانەوەر تا ڕادەیەکێ مەزن د وەکهەڤن. هەردیسان لەشێ هەردووان ژ گەریلەیان پێکدهێت و ڕۆحێن وان ژی د نەمر نینن. دیمۆکریتسی دگوت ڕۆحا مرۆڤی ژی ژ گەردیلەیان پێکدهێت و دەمێ مرۆڤ دمریت ئەڤ گەردیلەیە دناڤ بای دا بەلاڤ دبن. لێ ڕۆحا مرۆڤی یا ب مەژی ڤە گرێدایە و ژێ دوور ناکەڤیت.

باشە چەوا چێدبیت ڕۆحا مرۆڤی ژ گەردیلەیان پێکهاتبیت؟ چونکی ئەو نە تشتەکێ هۆسایە مرۆڤ بشێت دەستێ خوە بکەتێ یان بێهن بکەتێ هەروەکو گشت ئەندامێن دی یێن لەشی. بەلێ ڕاستە ئەو تشتەکێ "ڕۆحی"یە.

سۆفیا و هێرمس ژ گۆڕەپانا مەزن بورین و گەهشتنە تاخێ کەڤن، دەمێ نێزیکی وی شوستەی بووین یێ جارا بەری هینگێ سوفیایێ دەهـ کورون لێ دیتن، بێ ئاگەهـ ژ خوە

هەبیت دووبارە تەماشەی وی جهی کرەڤە. ئەڤ جارە وێ چ کورون نەدیتن، بەلکو ل هەمان جهـ پۆستکارتەك دیت کو وێنەیێ باخچەیەکێ تژی دارێن قەسپان و سێڤان ل سەر بوو.

سۆفیایێ خوە چەماند داکو وێ کارتێ بهەلگریت، لێ هێرمسی دەست ب ڕەوینێ دکر، هۆسا دیارە ئەو یێ ڕازی نەبوو سۆفیا دەستێ خوە بکەتە وێ کارتێ.

ل سەر وێ کارتێ ئەڤ پەیڤە هاتبوونە نڤیسین:

*خوشتڤیا من هێلد*

*ژیان زنجیرەکا ڕوودانێن ژ نیشکەکێ ڤەیە، چێدبیت ئەو دەهـ کورونێن تە ل ڤێرێ بەرزەکرین، پیرەژنەکێ دەمێ ل هیڤیا پاسەیا کریستیانستاندێ ڕاوەستیای بۆ خوە دیت بن و پشتی هینگێ ب وان پارەیان سوواری شەمەندەفرێ ببیت و چووبیتە سەرەدانا نەڤیێن خوە.*

*یان ژی چێدبیت کچەکا گەنج ئەو دەهـ کورون دیتبن دەمێ دڤیای سوواری پاسێ بیت و بزڤڕیتە مال لێ چ پارە ڤێ نەبوون. چێدبیت هۆسا بیت هێلد، ما کی دزانیت؟ بەلێ ئەگەر بێژین ئەڤ ڕوودانە ب ڕاستی چێبوویە، ئەرێ مانە ئەڤە بەلگەیە ل سەر هندێ کو چاڤدێریەکا خودای ل سەر مە هەیە؟*

*تیبینی: من گوتبوو تە کو ئەز دێ هاریکاریا تە کەم ل دەهـ کورونێن خوە بگەڕییێ.*

*دگەل ڕێزێن من*

*بابێ تە ئەوێ ڕوونشتی و هزرێن*

*خوە د جادەیا لیلساندێ دا دکەت.*

ناڤونیشانێن ل سەر پۆستەی ب ڤی ڕەنگی بوون: "هێلد موللەر کناگ\ ب ڕێکا کچەکا ڕێڤینگ". ڕێکەفتا مورکرنا کارتێ 15ی گولانێ بوو.

پاشی سۆفیایێ پێن خوه خوش کرن داکو ب هێرمسی ڕا بگەهیت ئەوێ بلەز ب سەر دەرەجکان کەفتی. دەمێ ئەلبێرتۆی دەرگەهـ ڤەکری، سۆفیایێ یەکسەر گوتێ: "فەرموو، خوه ژ بەرپرسیاریێ بدە پاش. ئاها ئەڤە کارتا تە!"

ئەلبێرتۆی دزانی گەلەگ تشت یێن بووینە ئەگەرێ تۆڕەبوونا وێ، لێ ل دەستپێکێ دەلیڤە دایێ بچیتە د ژوور ڤە. پاشی هێرمس ژی ل دووڤ وێ دا چوو ژوور و هەروەکو جارا دی چوو دبن حەلاڤا جلکان ڤە و نڤست.

- "باشە وی مایجەری ژ نیشکەکێ ڤە کارتەکا دی بۆ تە هنارتیە؟"

سۆفیایێ سەرێ خوه بلند کر و تەماشەی وی کر. هۆسا دیارە وی ئەڤ جارە جلکێن خوه یێن گوهارتین. یەکەم جار چاڤێن سۆفیایێ ب وی باروکێ درێژ و قورمچی یێ ل سەر سەرێ وی کەفت. پاشی جلکێن وی یێن فرەهـ و پێچای کو ب قەیتانکێن نەخشاندی هاتبوو نخافتن. ملپێچەکا ئاوریشمی ژی ل دور ستۆیێ وی بوو و چاکتیەکێ سۆر ژی ل سەر هەموو جلکان کربوو بەر خوه. پێن خوه ژی ب گورەیەکا تەنگ نخافتبوون و پێلاڤەکا تەنك و تەیسوك ژی کربوو پێن خوه کو ب قەیتانکێن ئاوریشمی گرێدا بوو. ڤان جلکان بیرا سۆفیایێ ل قەسرا لویسێ چواردێ ئینا.

سۆفیایێ ب پۆستکارتێ دەستێ خوه لێ درێژ کر و گوتێ: "هەڕە وێڤە، لێبوك."

- "هم.. هم.. ئەرێ ژ ڕاستا تە پارەیەکێ دەهـ کورونی ل وی جهی دیتبوو؟"
- "بەلێ."
- "ئەو هزر دکەت هەموو تشت بۆ وی د دەستووردایـنە، دبیت تشتەکێ باش بیت."
- "ئانکو چەوا؟"
- "ب ڤی ڕەنگی دێ وی ب سانەهیتر ئاشکەرا کەین. نوکە دا بزڤڕینە بابەتێ خوه. بێهنا گولاڤەکا نەخوش یا ژ ڤان جلکێن لێبوکان دهێت."
- "گولاڤ؟"
- "بەلێ، ژ دوورڤە هۆسا دیار دکەت کو گەلەك یێ جوان و بالکێشە، لێ د ڕاستی دا جۆرەکێ خاپاندنێ یە. ما تو نابینی کا چەوا ئەو یێ چاڤدێریا خوه یا تەمسار ل سەر مە دگەل چاڤدێریا خودای هەڤبەر دکەت؟"

پشتی ئەلبێرتۆی ئەڤ ئاخفتنە گوتین، ئەو پۆستکارتە چرچڕ کر و کرە سەد پارچە. سۆفیایێ ژی داکو پتر ئەلبێرتۆی تۆرە نەکەت، بڕیار دا بەحسێ کارتا دی نەکەت یا وێ ل قوتابخانێ دناڤ دەفتەرکا خوە دا دیتی.

- "نوکە دا بچینە د هۆلا ڕوونشتێ ڤە، قوتابیا من یا هێژا. ئەرێ نوکە دەمژمێر چەندە؟"

- "دەمژمێر چوارە."

- "باشە. ئەڤرۆکە دێ بەحسێ چەرخێ هەڤدێ زاینی کەین."

ئەو هەردوو پێکڤە چوونە د هۆلا ڕوونشتێ ڤە کو هندەك کون د بانێ وێ بوون. سۆفیایێ هەستپێکر ئەلبێرتۆی هندەك تشت ژ جهێن وان یێن ڕاکرین. ڤالکەکا گەوهەران ل سەر مێزێ هاتبوو دانان و هژمارەکا ئاوێنەیێن چاڤان تێدابوون. ب ڕەخ ڤە ژی پەڕتووکەکا گەلەك کەڤن هاتبوو دانان و پەڕێن وێ د ڤەکری بوون.

سۆفیایێ پرسیار کر: "ئەڤە چیە؟"

- "ئەو چاپا یەکێ یا پەڕتووکا دیکارتی یا ناڤدار "گوتارەك دەربارەی میتودی" کو دیرۆکا وێ بۆ سالا 1637ێ دزڤڕیت. ئەڤە یەکە ژ وان تشتێن من گەلەك چاڤێ خوە دایێ.

- "باشە و ئەو ڤالك یا چیە؟"

- "دناڤ ڤێ ڤالکێ دا هژمارەکا ئاوێنەیێن بێ وێنە هەنە کو فەیلەسۆفێ هۆلەندی "سپینوزا"ی ل چەرخێ هەڤدێ دروستکرینە. من پارەیەکێ مەزن مەزاختیە هەتا شیایم ب دەست خوە ڤە بێخم، ژبەر هندێ ئەز وان وەکو بیبیکا چاڤێ خوە دپارێزم."

- "ئەز دێ باشتر تێگەهەم کا بۆچی تو هندە ڤێ پەڕتووکێ و ڤان ئاوێنەیان دپارێزی ئەگەر هات و من زانی کا ئەڤ سپینوزا و دیکارت کینە."

- "چ پێنەڤێت، لێ بەری بچینە سەر بابەتێ وان و ئەو سەردەمێ تێدا ژیاین، ل دەستپێکێ دا ل ڤێرێ بڕوونە خوارێ."

وەکو جارا دی، سۆفیا ل سەر کورسیەکا کەڤن ل بەرامبەری ئەلبێرتۆی ڕوونشت کو ئەو ژی ل سەر قەنەپەکێ یێ ڕوونشتی بوو و مێزەیەك دناڤبەرا وان دا هەبوو و ئەو

پەڕتووك و ئاوێنە ل سەر بوون. پشتی مامۆستایێ وێ باروكە ژ سەرێ خوە كری و دانایە سەر پەڕتووكخانێ. دەست ب ئاخفتنێ كر.

- "ئەڤرۆكە دێ بەحسێ چەرخێ هەڤدێ كەین كو دبێژنێ چەرخێ باروكی."
- "چەرخێ باروكی، چ ناڤەكێ سەیرە!"

"زاراڤێ "باروك-Baroque" ژ پەیڤەكا پورتوگالی هاتیە وەرگرتن و ڕامانا وێ "ئاوێنەیا نەڕێكخستی"یە، چونكی هونەرێ چەرخێ باروكی ب هندێ ژ هونەرێ چەرخێ ڕێنیسانسێ دهاتە جوداكرن كو چەندین هەڤدژی تێدا هەبوون، ل دەمەكی هونەرێ ڕێنیسانسێ یێ سادە و گونجای بوو. هەردیسان د ڤی سەردەمی دا، ژلایەكی ڤە گرنگیەكا مەزن ب ژیانێ دهاتە دان و مەزن دكر، لێ ژلایەكێ دی ڤە خەلكی ژیان ڕەتدكر و د زوهدێ دا دژیان. چ ل سەر ئاستێ هونەری یان كەتوارێ ژیانێ، جۆرە پێشكەفتنەك ل هەمبەر ژیانێ ڤەبوو، لێ د هەمان دەم دا تەڤگەرەكا ئاینی یا سەر ب دێرێ ڤە پەیدابوو كو خوە ژ هەمبوو بوارێن ژیانێ دوور كربوو."

- "ئانكو ئەم دشێین بێژین قەسرێن بەرچاڤ و دێرێن ڤەشارتی هەبوون؟"
- "بەلێ. تو دشێی ب پشتڕاستی ڤە وەبێژی. دەربڕینا لاتینی "Carpe diem" ئانكو "ب ڕۆژێ ببینە"، یەك ژ دورووشمێن چەرخێ باروكی بوو یێن هەرە بەربەلاڤ بوو، زێدەباری دەربڕینا "Memento mori" ئانكو "ل بیرا تە بیت ڕۆژەكێ دێ مری". د هونەرێ شێوەكاری دا، د كەڤالەكێ ب تنێ دا هژمارەكا شێوەیێن ژیانێ دهاتە نیشاندان، لێ هەكە تە د گوشەیەكا بنی دا سەحكربایێ، دا پەیكەرێ هەستیكێ مرۆڤان بینی. د گەلەك حالەتان دا، سەردەمێ باروكی ب هندێ دهاتە نیاسین كو گەلەك شانازیێ ب خوە دبەت، لێ د هەمان دەم دا گەلەك كەسێن دی گرنگی ددا لایێ دی یێ بابەتی، ئانكو وان گرنگی ددا سروشتێ ب سەرڤەچوویی یێن تشتێن دەوروبەری خوە، ئەڤ چەندە ژی باشترین ڕاستی یە ل سەر هندێ كو ئەو جوانیا ئەڤرۆكە ل دەروبەرێن مە هەی، ڕۆژەكێ ژ ڕۆژان نامینیت."

- "بەلێ پا ئەڤ چەندە ڕاستە. ب دیتنا من بیرۆكەیا "چ تشت هەتا هەتایێ نامینن" تشتەكێ نەخوش و خەمگینە."

- "بۆ ڤێ چەندێ، بۆچوونا تە ژی وەکو بۆچوونا خەلکێ چەرخێ هەڤدێ زاینی یە.

ل سەر ئاستێ سیاسی ژی، چەرخێ باروکی، سەردەمێ چەندین هەڤرکییێن مەزن بوو، چونکی شەڕان کێشوەرێ ئەوروٚپا هەموو پرت پرت کر. خراپترین شەڕ ژی، شەرێ سیهـ سالان بوو ئەوێ هەر ژ سالا 1618 هەتا 1648ێ ڤەکێشای و ببوو ئەگەرێ ژناڤچوونا گەلەك دەڤەران. ب دروستاهی، زاراڤێ "شەڕێ سیهـ سالان، چەندین شەڕان ب خوە ڤە دگریت کو ببوونە ئەگەرێ وێرانبوونا ئەلمانیا. یەك ژ ئەنجامێن هەرە بەرچاڤ یێن ڤی شەڕی ئەو بوو فرەنسا شیا دەستێ خوە بدانتە سەر گەلەك دەڤەرێن ئەوروٚپا."

- "بۆچی ئەڤ شەڕە پەیداببوون؟"

- "ب سەرڤە هۆسا خویا دکر کو شەڕەکە دناڤبەرا هەردوو ڕێبازێن پڕوتستانت و کاسولیکی دا یێ پەیدابووی، لێ چ پێنەڤێت مەرەمەکا سیاسی ژی ل پشت ڕا هەبوو."

پاشی وی ب ڤی ڕەنگی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "د چەرخێ هەڤدێ دا، جوداهیا تەخێن جڤاکی ساخلەتەکا هەرە گرنگ بوو. چ پێنەڤێت تە یا گوهـ ل خانەدان و دەولەمەندێن فرەنسی و قەسرێن ڤێرسای بووی. لێ ئەز نەیێ پشتڕاستم کا تو دزانی هەژارییێ پەرێن خوە ب سەر هەموو مللەتی دا دادابوون یان نە. بەلێ ئەگەر ئەم بەحسێ جوانی و پێشکەفتنا ڤی چەرخی بکەین، پێدڤیە بەحسێ دەستهەلاتا وی چەرخی ژی بکەین. بۆ نموونە، هونەر و بیناسازیا چەرخێ باروکی گەهشتبوو وی ڕادەی جیهان حێبەتی مابوو ژبەر وێنە و گوشەیێن ئاڤاهیان یێن خوار و سەیر. د هەمان دەم دا، ل سەر ئاستێ سیاسی ژی، چەندین ڕوودانێن کوشتن و بەرزەکرن و فێلبازی و کودەتایان بەربەلاڤ ببوون."

- "ئەرێ ڕاستە یەك ژ شاهێن سویدی د هۆلەکا شانۆییێ ڤە هاتبوو کوشتن؟"

- "مەرەما تە "گوستافێ سییێ"، بەلێ ڕاستە. هەرچەندە ئەڤ شاهە ل سالا 1792ێ هاتبوو کوشتن، لێ کاودانێن کوشتنا وی وەکو یێن چەرخێ باروکی بوون، چونکی ئەو د ئاهەنگەکا سەماییێ دا هاتبوو کوشتن یاکو تێدا کەسێن بەشداربووی دێمێن خوە ب ماسکەکی دڤەشێرن."

- "بەلێ پا یا ژ من ڤە ئەو د هۆلەکا شانۆییێ ڤە هاتبوو کوشتن."

- "بەلێ ڕاستە، چونکی ئەڤ ئاهەنگە ل هۆلەکا ئۆپڕایێ ڤە هاتبوو سازدان. ئەم دشێین بێژین کوشتنا گوستافێ سیێ ببوو ئەگەرێ ب دوماهی هاتنا چەرخێ باروکی، دەمێ ئەو ل سەر دەستهەلاتێ، وەکو کەسەکێ ستەمکار وەلات ب ڕێڤە دبر، هەروەکو کا چەوا بەری هینگێ ب سەد سالان "لویسێ چواردێ" یێ فرەنسا ژی وەکو وی ستەمکاری ل خەلکی دکر. لێ "گوستافێ سیێ" گەلەك حەز ژ ئاهەنگێن وەکو فرەنسیان دکر، ژبەر هندێ نە تشتەکێ سەیرە هەکە وی حەز ژ شانۆیێ کربیت."

- "هەر ژبەر شانۆیێ ژی هاتە کوشتن."

- "بەلێ پا د وی سەردەمی دا، شانۆ نەك ب تنێ جهەکێ هونەری بوو، بەلکو هێمایەکێ تەمام ژی بوو."

- "هێمایێ چ؟"

- "هێمایێ ژیانێ، سۆفیا. ل چەرخێ هەڤدێ، ئەو گوتن گەلەك یا بەربەلاڤ بوو یا دگوتی "ژیان هەموو شانۆگەریە.". هەردیسان د چەرخێ باروکی ژی دا شانۆیا نوو ب کەوالیس و ئالاڤێن خوە یێن پێشکەفتی یا ناڤدار بوو. ب ڤی ڕەنگی، شانۆیێ دەربڕین ژ ژیانا ڕۆژانە یا خەلکی دکر. د شانۆگەریان دا، وان دیار دکر خوە مەزنکرن دبیتە ئەگەرێ کێمکرنا بهایێ خوەدانێ خوە. هەردیسان ژیانا کەسێن ئێخسیر و هەژار هۆسا نیشان ددا کو دبوو جهێ دلپێڤەمانێ."

- "ئەرێ شکسپیر ژی ل سەردەمێ باروکی ژیابوو؟"

- "بەلێ. ل سالا 1600ێ وی بناڤودەنگترین بەرهەمێن خوە یێن ئەدەبی بەلاڤکربوون. ژیانا وی خالا پێکڤە گرێدانا دناڤبەرا چەرخێ ڕێنیسانس و چەرخێ باروکی دابوو. هەر بۆ زانین، د بەرهەمێن خوە دا گەلەك بەحسێ ژیانا شانۆیێ ژی کربوو. تە دڤێت هندەك نموونەیان بۆ تە بینم؟"

- "ب خوشحالی ڤە، بەلێ."

د شانۆگەریا کومێدی یا As you like it ئانکو "هەروەکو تە بڤێت"، دبێژیت:

جیهان هەمووو شانۆگەریە*
ژن و زەلام تێدا شانۆڤانن نەك زێدەتر
هندەك ئەكتەرن دهێن و دچن
هەر كەسەك د ژیانێ دا دشێت چەندین ڕۆلان بگێڕیت.

هەردیسان د شانۆگەریا ماكبێسی دا دبێژیت*:
ئەڤ ژیانە سیبەرەكا كورت و ئارامە
هونەرمەندەكێ بەلەنگاز بۆ ماوەیێ دەمژمێرەكێ خوە ل سەر دەپێ شانۆیێ نیشان ددەت
پاشی دهێتە ژبیركرن
چیرۆكەكە ب پەیڤێن مەزن و خوبایی ڤە بۆ مە ڤەدگێڕیت
بەلێ چ ڕامان نینن

- "ئەو گەلەكێ ڕەشبین بوو؟"
- "بەلێ پا وی گەلەك ئاگەهـ ژ كورتیا ژیانێ هەبوو. چ پێنەڤێت تە یا گوهـ ل گوتنا وی یا ناڤدار بووی..."
- "ئەز هەبم یان نەبم، بابەت هەر ب ڤی ڕەنگی یە."
- "بەلێ، ئەو هاملێت بوو وەگوتی. ئەڤرۆكە ئەم یێ ل سەر ڤی ئەردی، لێ سۆباهی ئەم ل ڤێرێ نابین."

---

* دەقێ وێ یێ ڕەسەن ب ڤی شێوەیە:

All the world's a stage،
And all the men and women merely players
They have their exits and their entrances
And one man in his time plays many parts

* دەقێ وێ یێ ڕەسەن ب ڤی شێوەیە:

Life's but a walking shadow,
a poor player That struts and frets his hour upon the stage,
And then is heard no more;
it is a Tale told by an idiot,
full of sound and fury,
Signifying nothing.

- "سوپاس. ئەریٚ تو زانی کا ئەز تێگەهشتم یان نە؟"

- "دەمێ هوزانڤانێن باروکی ژیان ب شانۆیێ هەڤبەر نەکربا، وان ژیان ب خەونان هەڤبەردکر. هەردیسان شکسپیری نڤیسابوو: "ئەم ژ وی قوماشی نە یێ خەون ژێ هاتینە ڤەهاندن، ژیانا مە یا کورت ژی پا پڕی خەوە."

- "ئەڤە ساخلەتێن هوزانڤانانە!"

- "هوزانڤانێ ئیسپانی "کالدیرون دولا بارکا"ی ئەوێ ل سالا 1600ێ زایینی ژ دایکبووی، دەقەکێ شانۆیێ ب ناڤێ "ژیان خەونە" دنڤیسیت و تێدا دبێژیت*:

ژیان چیە؟ دیناتیە

ژیان چیە؟ ئاشوپەکە، سیبەرەکە، ئەندێشەکە

ڕەنگە باشترین تشت ژی بهایەکێ سادە هەبیت،

ژبەر هندێ ژیان هەموو وەکو خەونەکێ یە...

- "دبیت ئەو یێ دروست بیت. ل قوتابخانێ ژی مە دەقەکێ شانۆیێ خواندبوو ب ناڤێ "جیپیێ ل سەر چیای".

- "ئەڤە شانۆگەریا "لودڤی هۆلبێرگ"ی یە. ئەز وی دنیاسم. ئەڤە یەك بوو ژ گرنگترین کەسایەتیێن ئەدەبی یێن دناڤبەرا چەرخێن باروکی و چەرخێ ڕەوشەنگیریێ دا ژیاین."

- "جێپ دناڤ شکەفتەکێ دا دنڤیت، لێ دەمێ ژ خەو هشیار دبیت خو ل سەر جهێن بارونەکی دا دبینیت. هزر دکەت ئەو بەری هینگێ جوتیارەکێ بەلەنگاز و هەژار بوو. پشتی دنڤیت، پاشی دووبارە وی دبەنە د شکەفتێ ڤە و دەمێ هشیار دبیت، ئەڤ جارە هزر دکەت ئەو بارونەکێ ناڤدارە."

---

* دەقێ وێ یێ ڕەسەن ب ڤی شێوەیە:

What is life? A madness.

What is life? An illusion, a shadow, a story,

and the greatest good is little enough,

for all life is a dream

- "هۆلبێرگی ئەڤ دەقە ژ کالدیرونی وەرگرتبوو کو بەری هینگێ وی ژی ژ داستانا "هزار و یەك شەڤ" یا عەرەبی وەرگرتبوو. لێ د گەلەك بەرهەمێن ئەدەبی یێن کەڤن دا ژی دێ بینین کو نڤیسەری ژیان ب خەونەکێ یا هەڤبەر کری، هەروەکو ئەدیبێن چینی و هندی یێن کەڤن. بۆ نموونە حەکیمێ چینی یێ کەڤن "چوانگ-تسی" ئەوێ ل دەوروبەرێن سالا 350ێ بەری زاینی ژیای دبێژیت: "ڕۆژەکێ من د خەونێ دا دیت ئەز پەلاتینك بووم، لێ نوکە ئەز نزانم کا ئەو پەلاتینك هزر دکەت ئەو چوانگە یان ژی چوانگ هزر دکەت ئەو پەلاتینکە."

- "ل وەلاتێ نەڕویج ژی، مە هوزانڤانەکێ باروکی یێ نموونەی هەبوو دگوتنێ "بیتر داس" کو د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن 1647 هەتا 1707ێ دا ژیایە. ڤی هوزانڤانی د هوزانێن خوە دا ژیانا ڕۆژانە یا خەلکی بەرچاڤ دکر، ژلایەکێ دی ژی ڤە دگوت خودا یێ هەی و نامریت.

- "خودا هەر خودایە، خو هەکە ئەرد هەموو بیابان بیت، خودا هەر خودایە خو هەکە مرۆڤ هەموو ژی بمرن."

- "بەلێ پا ئەو د هەمان هوزان دا بەحسێ جوانیا سروشتێ باکورێ نەڕویجێ دکەت، هەردیسان بەحسێ ماسیێن ڤاروس و ڤادس و نازلی دکەت. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ساخلەتەکێ چەرخێ باروکی یە دەمێ هوزانڤان پێکڤە بەحسێ تشتێن ماددی و دنیایێ و تشتێن نەمر و ڕۆحێ دکەت، ڕەنگە ئەڤ چەندە ئەفلاتۆنی بینتە بیرا مە دەمێ بەحسێ جوداهیا جیهانا هەستان و جیهانا ئاشوپی یا نەگوهۆڕ دکری."

- "باشە تە بەحسێ فەلسەفا ڤی چەرخی نەکر؟"

- "فەلسەفەیا چەرخێ باروکی ژی تووشی چەندین هەڤڕکیێن مەزن بوو ب تایبەت هەڤڕکیێن دناڤبەرا ڕێبازێن هزری یێن جودا جودا. هندەك ژ وان دەربڕین ژ مرۆڤی دکر وەك بونەوەرەکێ نموونەی یان خوەدان ڕۆحی، دگوتنە ڤێ بۆچوونێ "نموونەیی یان ژی ئایدیالیزم" کو یا هەڤدژ بوو دگەل بۆچوونا وان کەسان یێن مرۆڤ وەك بونەوەرەکێ "ماددی" ل قەلەم ددای. چەندین کەسێن خوینگەرم ل چەرخێ هەڤدێ پشتەڤانیا ڤێ بۆچوونێ دکر، ڕەنگە یێ ژ هەمووان پتر ژی کەفتیە بن کاریگەریا وێ، فەیلەسۆفێ ئینگلیز "تۆماس هۆبیس" بیت کو دگوت لەشێ هەموو بونەوەرێن زیندی، ژ وان مرۆڤ و گیانەوەر

ژی، ژ گەردیلەیێن ماددی یێن بچووك پێكدهێت. هەتا ناخ و ڕۆحا مرۆڤان ژی ژ ئەنجامێ لڤینا گەردیلەیێن گەلەك بچووك دناڤ مەژی دا بەرهەم دهێت.

- "بەلێ پا وی چ تشتێ جودا ژ وی تشتێ دیمۆكریتسی بەری هزار سالان گوتی زێدەنەكر."

- "ئایدیالیزم و مەتریالیزم ب درێژاهیا دیرۆكا فەلسەفێ هەبووینە، بەلێ كێم جاران مە دیتیە كو د سەردەمەكی دا ئەڤ هەردوو تیورە هەبن هەروەكو مە د چەرخێ باروكی دا دیتی. ب ڕەنگەكی زانستێ سەردەم پشتەڤانیا تیورا مەتریالیزمێ دكر. نیوتنی دیار كربوو كو یاسایێن سروشتی، بۆ نموونە یاسایا ڕاكێشانێ، ل سەر هەموو خالێن گەردوونی دهێتە پڕاكتیزەكرن. جیهان هەموو ژی كەفتیە ژێر میكانیزمەكا ب تنێ و ئەو ژی ژ لایێ خوە ڤە دكەڤیتە ژێر كاریگەریا هندەك یاسایێن نەگوهۆڕ. نیوتنی دوماهیك شووتنتبلێن خوە ل سەر "وێنەیێ میكانیكی یێ جیهانێ" دانان."

- "وی جیهان وەكو ئامیرەكێ مەزن وێنە دكر؟"

- "هەلبەت. پەیڤا "میكانیكی" د زمانێن ئەوروپی دا ژ پەیڤا "میكان-Mechane" یا گریكی هاتیە وەرگرتن كو ب ڕامانا "ئامیر" دهێت. لێ یا گرنگە تیبینیا هندێ بكەین چ هەڤدژی دناڤبەرا فەلسەفەیا مەتریالی یا هەر یەك ژ هۆبیس و نیوتنی و باوەریا وان ب خودای دا نەدهاتە دیتن. ئەڤ گوتنە بۆ هەموو فەیلەسۆفێن چەرخێن هەژدێ و نوزدێ زاینی دا دهێتە گوتن. نوشدار و فەیلەسۆفێ فرەنسی "لامتیری" ل ناڤەڕاستا چەرخێ هەژێ پەڕتووكەك ب ناڤێ "مرۆڤێ میكانیكی" بەلاڤ كر كو تێدا دبێژیت هەموو ئەندامێن لەشێ مرۆڤی زەڤلێك هەنە هەتا بشێن بلڤلڤن، كا چەوا پێن مە ب ڕێكا زەڤلێكان دلڤلڤن، ئاها هۆسا مەژیێ مە ژی ب ڕێكا زەڤلێكان هزران دكەت. لێ زانایێ بیركاریێ یێ فرەنسی "لاپلاس" ژ ڤێ چەندێ ژی بوری بوو و دگوت: "ئەگەر زیرەكی بشێت د دەمەكێ دیاركری دا جهێ هەموو گەردیلەیان دیار بكەت، ل وی دەمی چ گومان نامینن. ب ڤی ڕەنگی پاشەڕۆژ و ڕابردوو دێ ئاشكەرابن". بیرۆكەیا سەرەكی ل ڤێرێ ئەوە كو بەری هینگێ بڕیار ل سەر دروستبوونا هەموو تشتان هاتیە دان. هەموو تشان قەدەرا خوە هەیە. دبێژنە ڤی جۆرێ هزركرنێ "فەلسەفەیا قەدەرێ" یان ژی یا جەبری."

- "باشه، ئانکو هەموو تشت ژ ئەنجامێ پرۆسێسەکا میکانیکی کاردکەن، هەتا خەون و هزرێن مەژی. د چەرخێ هەڤدێ زاینی دا، هندەك ژ فەیلەسۆفێن مەتریالی یێن ئەڵمانی گەهشتنە وێ بۆچوونێ کو بەرهەم ئینانا بیرۆکەیان ل دەڤ مەژی، هەروەکو بەرهەم ئینانا میزێ یە ل دەڤ گولچیسکان و یا زەرداڤێ یە ل دەڤ مێلاکا ڕەش."

- "بەلێ پا میز و زەرداڤ دوو ماددەنە، هزر نە ماددەنە."

- "تە تبلا خوە درێژکرە تشتەکێ گرنگ. دێ بۆ تە سەرهاتیەکێ ڤەگێرم کو دبێژیت: جارەکێ گەرۆکڤانەکێ ئەسمانی و برینپێچەکێ ڕۆسی گەنگەشە ل سەر بابەتەکێ ئاینی دکر، برینپێچ کەسەکێ مەسیحی بوو، لێ گەرۆکڤان مەسیحی نەبوو. گەرۆکڤانی گوت: ئەز چەندین جاران یێ چوویمە ئەسمانی بەلێ پا من چ خودا و فریشتە نەدیتن." برینپێچی ژی بەرسڤا وی دا: "من ژی چەندین نشتەگەری بۆ مەژیێن مرۆڤان کرینە، بەلێ پا چ بیرۆکە و هزر نەکەفتینە پێشچاڤێن من."

- "بەلێ پا ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو بیرۆکەیان هەبوونا خوە نینە."

- "ڕاستە، بەلێ پا ئەڤ سەرهاتیە بۆ مە دووپات دکەت کو بیرۆکە نە تشتەکێ ماددینە و ب چ ڕەنگان بۆ پارچەیێن بچووکتر ناهێتە دابەشکرن. ئەم نەشێین بیرۆکەیەکا شاش ژ سەرێ کەسەکی بینە دەرێ ئەگەر چووبیتە د مەژیێ وی دا، چونکی نە تشتەکێ ماددی یە. فەیلەسۆفەکێ مەزن ل چەرخێ هەڤدێ ب ناڤێ "لیبنیز"، تیبینیا ڤێ چەندێ کربوو. ڤی فەیلەسۆفی دیارکر کو کو جوداهیا هەرە مەزن دناڤبەرا ماددە و ڕۆحێ دا ئەوە کو ماددە دشێت بهێتە دابەشکرن، بەلێ پا ئەم نەشێن ڕۆحی بکەینە دوو پارچە."

- "هەلبەت! ما دێ ب کیژ کێرکێ وێ کەینە دوو پارچە؟"

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە هەژاند و بەردەوامی دا ئاحفتنا خوە

- "دوو فەیلەسۆفێن هەرە گرنگ د چەرخێ هەڤدێ دا، دیکارت و لیبنیز بوون. ڤان هەردوو فەیلەسۆفان گرنگیەکا مەزن ددا پەیوەندیا دناڤبەرا ڕۆحێ و لەشی دا، ژبەر هندێ ئەو ژ هەژی هندێ نە ب درێژاهی بەحسێ وان بکەین."

- "باشە، تو ل هیڤیا چی؟ بەلێ پا پێدڤیە تو دەستووریێ بدەیە من ئەز تێلەفۆنا دایکا خوە بکەم ئەگەر هات و هەتا دەمژمێر حەفت گیرو ببم".

# دیکارت

....دڤیا هەموو جهێ کارێ خوە ....

ئەلبێرتۆ ڕابووڤە و چاکیتێ خوە یی سۆر ژ بەر خوە کر و هاڤێتە سەر کورسیکەکێ، پاشی دووبارە ل سەر قەنەپێ ڕوونشت و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "ڕێنێ دیکارت ل سالا 1596ێ هاتیە سەر دنیایێ. ژیانەکا گەڕۆك و کۆچەر دناڤبەرا وەلاتێن ئەورۆپی دا بوراندی یە. هێشتا دەمێ یێ گەنج، حەزەکا مەزن هەبوو بگەهیتە ڕاستییێن پشتڕاست ل دور سروشت و مرۆڤ و گەردوونی، لێ دەمێ دەست ب خواندنا فەلسەفێ کر، ژ نوو قەناعەت بۆ چێبوو کا بەری هینگێ ئەو چەند یێ نەزان بوو."

- "ئانکو وەکو سۆکراتی بوو؟"

- "بەلێ، لێ دبیت کێمتر یان پتر. ئەو ژی وەکو سۆکراتی د وێ باوەرێ دابوو کو ئەقلێ مرۆڤی ب تنێ دشێت هاریکاریا مە بکەت تشتێن دەوروبەری خوە ب دروستاهی ببینین، هەردیسان ب چ ڕەنگان باوەر ژ پەڕتووکێن کەڤن و هەستێن خوە نەکەین."

- " ئەڤە بۆچوونا ئەفلاتۆنی ژی بوو، چونکی وی ژی باوەری ب هندێ هەبوو کو ئەقل ب تنێ دێ بەری مە دەتە زانینێ."

- "بەلێ ڕاستە. هێلەکا هزرکرنێ یا وەکهەڤ هەیە کو ژ سۆکرات و ئەفلاتۆنی دەستپێدکەت هەتا دگەهیتە دیکارتی و پاشی ڤەشە ئوگستینی. هەموویان ژی توندڕەویەکا

مەزن بۆ ئەقلی هەبوو و دگوت ئەقل بنیاتێ سەرەکی یێ زانینێ یە. پشتی چەندین ڤەکۆلینێن دوور و درێژ و کوور، دیکارت گەهشتە وێ باوەرێ کو نابیت بزڤڕیتە وان بیروبۆچوونان یێن ژ چەرخێن ناڤەڕاست بۆ وان ماین. ئەڤ چەندە ژی بیرا مە ل سۆکراتی دئینیت دەمێ پشتا خوە دایە بیروباوەرێن بەربەلاڤ دناڤ ئەسینایێ دا. باشە پا ل ڤێرە دێ چ کەین؟ ئەرێ تە هزرەك هەیە؟"

- "باشە تو ب خوە دەست ب فەلسەفا خوە بکە."

- "هەلبەت. ب ڤی ڕەنگی، دیکارتی بڕیار دا گەشتەکێ بۆ وەلاتێن کێشوەرێ ئەورۆپا بکەت و ل دووڤ فەلسەفێ بگەڕییێت، هەروەکو کا چەوا سۆکراتی بڕیار دای ژیانا خوە بۆ خەلکی تەرخان بکەت و ڕاستەوخو دگەل وان دانوستاندنێ بکەت. دیکارتی دگوت وی دڤێت ل وێ زانینێ بگەڕییێت یاکو دێ د ناخێ خوە دا یان ژی د "پەڕتووکا جیهانێ یا مەزن" دا دبینیت. ژبەر ڤێ ئارمانجێ، وی پەیوەندی ب ڕێزێن لەشکەری کر و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئەو بشێت سەرەدانا چەندین باژێرێن ئەورۆپا ناڤەڕاست بکەت و بۆ ماوەیەکی لێ ئاکنجی ببیت. پشتی هینگێ چەندین سالان ل باژێرێ پاریسێ ژیا و ل دووڤ دا ل سالا 1629ێ بەرەڤ هۆلەندا ڤە چوو کو ل وێرێ بۆ ماوەیێ نێزیکی 20 سالان کار ل سەر پەڕتووکێن خوە یێن فەلسەفی کر. ل سالا 1649ێ شاهژن "کریستینا"یێ داخواز ژێ کر سەرەدانا سوید بکەت، لێ هەروەکو وی دیارکری، مانا وی ل وەلاتێن هرچ و بەفر و کەڤران بۆ ئەگەر تووشی نەخوشیا هەودانێن سیهێ ببیت، ئەڤ نەخوشیا وی دژوار بوو هەتا بوویە ئەگەرێ مرنا وی ل سالا پاشتر ئانکو سالا 1650ێ."

- "ئانکو ژییێ وی 54 سال بوون دەمێ وەغەر کری."

- "ڕاستە، لێ هەتا پشتی مرنا وی ژی، شیا کارتێکرنەکا مەزن ل سەر فەلسەفێ بکەت، ژبەر هندێ بێ زێدەهی، ئەم دشێین بێژین دیکارت دانەرێ فەلسەفا سەردەمە. پشتی دووبارە فەیلەسۆفان بەرێ خوە دایە خواندنا مرۆڤی و سروشتی، نەخاسم د چەرخێ ڕێنیسانسێ دا، ئێدی یا پێدڤی بوو بیرۆکەیێن ڤێ قۆناغێ بهێنە کومکرن و ل دووڤ شێوازەکێ فەلسەفێ پێکڤە بهێنە گرێدان. دیکارت یەکەم کەس بوو شێوازەکی فەلسەفی یێ دروست دانای، هەروەکو کا چەوا پشتی وی گەلەك فەیلەسۆفێن دی هاتن و بەردەوامی دا ڕێبازا وی وەك سپینوزا و لیبنیز و لوك و بیرکلی و هیوم و کانتی."

- "مەرەما تە چیە ژ زاراڤێ شێوازێ فەلسەفی؟"

- "مەرەما من ئەوە کو فەلسەفە ژ سفرێ دەستپێبکەت و پێکۆلێ دکەت بەرسڤا هەموو پرسیار و مژارێن فەلسەفی بدەت. ل چەرخێن کەڤن، دوو فەیلەسۆفێن هەرە ناڤدار هەبوون کو ئەو ژی سۆکرات و ئەفلاتۆن بوون، د چەرخێن ناڤەڕاست ژی دا قەشە تۆماس ئاکوینی پێکۆل دکر فەلسەفەیا ئەرستۆی ب ئاینێ مەسیحیەتێ ڤە گرێبدەت، پاشی چەرخێ ڕێنیسانسێ هات کو د وێ قۆناغێ ژی دا پێکۆل دهاتنە کرن فەلسەفەیا کەڤن دگەل یا نوو بهێتە تێکەلکرن.

بەلێ پا کومکرن و تێکەلکرنا ڤان بیرۆکەیێن نوو د شێوازەکێ فەلەسەفی یێ نوو دا، بۆ جارا یەکێ ل چەرخێ هەڤدێ هاتە کرن، دیکارت ژی ڕابەر و دانەرێ ڤان شێوازێن کومکری بوو. ل بەری هەموو تشتان، دیکارتی پێکۆل دکر ب ڕێکا بیرۆکەیێن ڕۆهن و دیار بگەهیتە ڕاستیێ. هەردیسان پێکۆل دکر ڤەکۆلینی ل سەر پەیوەندیا دناڤبەرا ڕۆح و لەشی دا بکەت. ب درێژاهیا 150 سالێن پشتی هینگێ ، ئەڤ هەردوو مژارە ب گەرمی دناڤ فەلسەفێ دا هاتینە ئازراندن."

- "هۆسا دیارە ئەو گەلەك بەری سەردەمێ خوە دچوو؟"

- "بەلێ پا ئەڤ هەردوو مژارە ل سەردەمێ وی ژی هاتبوو ئازراندن و گەلەك کەسان هەلویستەکێ فەلسەفی یێ زێدە ڕەشبین ل هەمبەر گەهشتنا ڕاستیا وێ یا دروست هەبوو، ژبەر هندێ وان دگوت پێدڤیە ل سەر نەزانینا خوە د ڕازی بین. بەلێ ئەڤ هەلویستە ب دلێ دیکارتی نەبوو هەروەکو کا چەوا کاودانێن ئەسینایێ یێن سەردەمێ سۆکراتی ب دلێ وی نەبوون و هێرش دکرە سەر ڕەشبینیا سۆفیستیێن سەردەمێ خوە. ل سەردەمێ دیکارتی، زانستێ سروشتی پێشکەفتنەکا نوو ب خوە ڤە دیت کو ب ڕێکا شێوازێ وی یێ نوو شیا ب شێوەیەکێ باشتر و کوورتر دیاردەیێن سروشتی شرۆڤە بکەت. دیکارتی پرسیار کر ئەرێ بۆچی شێوازەکێ نوو و سەردەم بۆ تێگەهشتنا فەلسەفێ ژی نەبیت."

- " ئەز تێگەهشتم."

- "ژ لایەکێ دی ڤە، زانستێ فیزیایا نوو، بابەتێ سروشتێ ماددەی ئازراند، ئانکو دەستنیشانکرنا وان تشتان یێن کو پرۆسێسێن فیزیایی پشت بەستنێ دکەنە سەر. ژبەر هندێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ خەلکی باوەری ب شرۆڤەکرنەکا میکانیکی دئینا. لێ ڤێ شرۆڤەکرنێ

پرسيارەكا دی ل دەڤ وان ئازراند ئەو ژی كا چ پەیوەندی دناڤبەرا لەشی و ڕۆحێ دا هەیە. د چەرخێ هەڤدێ دا هۆسا یا دناڤ خەلكی دا بەربەلاڤ بوو كو ڕۆح وەكو "پفدانا ژیانێ"یە و هێزێ ددەتە هەموو بونەوەرێن زیندی. هەردیسان ئەڤە ڕامانا ڕاستەقینە یا ڕۆحێ و هزرێ یە "خوناڤا ژیانێ، یان ژی پفدان" یاكو ئەم د پتریا زمانێن ئەوروپی دا دبینین. ب دیتنا ئەڕستۆی، ڕۆح وەك بنەمایێ ژیانێ دناڤ لەشێ هەموو بونەوەرێن زیندی دا هەیە و ب چ ڕەنگان ژ لەشی ڤەنابیت، ژبەر هندێ وی بەحسا "ڕۆحا ڕووەكان" و "ڕۆحا گیانەوەران" دكر. لێ بو یەكەم جار ل چەرخێ هەڤدێ ژ نوو فەیلەسۆفان ژ ڕهوڕیشالان بەحسێ جوداهیا دناڤبەرا ڕۆحێ و لەشی دا كر، ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ هندێ دزڤڕیت كو هەر لەشەكێ فیزیایی یێ بەرجەستەیە، ڤێجا چ لەشێ مرۆڤی یان گیانەوەری بیت، شرۆڤەكرنەكا ماددی هەیە، لێ نابیت ڕۆح ژی بەشەك بیت ژ ڤی پێكهاتەیا بەرجەستە یا ماددی. باشە پا ڕۆح چیە؟ چەوا دێ شێین دیاركەین تشتەكێ وەكو ڕۆحی دشێت تشتەكێ ماددی و فیزیایی یێ وەكو لەشێ مرۆڤی بدەتە شولی؟"

- "ئەڤ پرسیارە جهێ حێبەتیێ یە."
- "مەرەما تە چیە؟"
- "ئەز دێ بڕیارێ دەم دەستێ خوە بلند بكەم، پشتی بێهنەكا كورت دەستێ من ب خوە دێ بلند بیت، یان ژی دێ بڕیارێ دەم ل دووڤ پاسەكێ بكەمە غارێ و پشتی دەمەكێ كورت دێ پێن من ب خوە دەست ب غاردانێ كەن. ڕەنگە ب تنێ بڕوونمە خوارێ و هزرێن خوە د تشتەكێ خەمگین دا بكەم، ژ نیشكەكێ ڤە دێ ڕۆندك ژ چاڤێن من هێنە خوارێ، ئەڤ نموونە هەموو بەلگەنە ل سەر هندێ كو پەیوەندیەكا سەیر دناڤبەرا لەش و هەستێن مرۆڤی دا هەیە."
- "ئاها دیكارتی ژ ڤێ خالێ دەستپێكر. وی ژی وەكو ئەفلاتۆنی باوەری ب هندێ نەبوو كو ڕۆح یا جودایە ژ ماددەی، بەلێ پا چەوا ڕۆح كارتێكرنێ ل سەر ماددەی دكەت و بەروڤاژی، ئەفلاتۆنی چ بەرسڤ بۆ ڤێ پرسیارێ نەدیتبوون."
- "ئەز ژی نزانم، تە كرە مەرەق كا چەوا دیكارت شیا بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بدەت؟"
- "دا ئەم هەردوو ل دووڤ هزرێن خوە بچین."

ئەلبێرتۆی تبلا خوە درێژ كرە وێ پەڕتووكا ل سەر مێزا هەمبەری وان.

- "د ڤێ پەڕتووکا خوە یا ب ناڤێ "نووکرنا شێوازی" دا، دیکارت بەحسێ وی شێوازێ فەلسەفی دکەت یێ کو پێدڤیە ل دەمێ پەیدابوونا هەر ئاریشەیەکا فەلسەفی ل دووڤ بچین، هەروەکو کا چەوا زانستێ سروشتی شێوازێ خوە یێ تایبەت دیتی."

- "تە بەری نوکە ئەڤ چەندە گوتبوو..."

- "دیکارتی دووپاتی ل سەر هندێ دکر نابیت ئەم بێژین چ تشت د ڕاستەقینەنە هەتا ڕاستی و دروستاهیا وان بۆ مە دیار نەبیت. دبیت یا باشتر بیت ئەز ڤی بابەتی ل سەر هندەك بابەتێن بچووکتر دابەش بکەم و یەك یەکە بۆ تە بەحس بکەم داکو باشتر تێبگەهی. ل دەستپێکێ دێ بیرۆکەیێن سادە دەستپێکەین. ئانکو پێدڤیە هەموو بیرۆکە بهێنە کێشان و پیڤان، هەروەکو کا چەوا گالیلوی دڤیای هەموو تشتان بپیڤیت و ئەگەر تشتەك نەهێتە پیڤان وەلێ بکەت هەتا ئەو ژی بهێتە پیڤان. فەلسەفەیا ڕاشیونالیزمی یا دیکارتی ژ سادەترین ئاست دەستپێدکەت هەتا دگەهیتە ئالۆزترین ئاست، ب ڕەنگەکی ئەو گەلەك داکوکیێ ل سەر ڕۆلێ هزرکرن و تەخمینکرنێ دکەت. پێدڤیە د هەر ئاستەکی ژی دا دووبارە لێ بزڤڕین و خوە ژێ پشتڕاست بکەین کو مە چ تشت ژبیرنەکرینە، ب ڤی ڕەنگی دێ شێین دەرئەنجامێن وێ بیرۆکێ دیارکەین."

- "دێ بێژی تو یێ بەحسێ ڕاهێنانەکا بیرکاریێ دکەی!"

- "بەلێ. دیکارتی دڤیا شێوازەکێ بیرکاری ژ بۆ سەلماندنا هندەك بیرۆکەیێن فەلسەفی بکاربینیت، هەروەکو کا چەوا دەمێ بۆ سەلماندنا پرسیارەکا بیرکاری دهێتە بکارئینان. وی دڤیا هەمان وی ئالاڤی بکاربینیت یێ کو ل دەمێ ئەم سەرەدەریێ دگەل ژماران دکەین بکاردئینین کو ئەو ژی ئەقلە، ژبەرکو وی ژی وەکو ئەفلاتۆنی دگوت نابیت ئەم باوەر ژ هەستێن خوە بکەین."

- "ئەرێ ما ئەم دشێین پرسیارێن فەلسەفی ب ڤێ ڕێکێ شرۆڤە بکەین؟"

- "دا بزڤڕینە ڕێکا هزرکرنا دیکارتی. داکو ئەو ڕاستیا سروشتێ هەبوونێ ببینیت، وی دەستپێکر و گومان ژ هەموو تشتان دبر، چونکی وی دڤیا شێوازێ خوە یێ فەلسەفی ل سەر بنیاتەکێ بهێز بدانیت."

- "...ژبەرکو ئەگەر بنیات کەفت، مال هەموو دێ هەڕفیت..."

- "جهێ خوشحالیێ یە کو تو پێکۆلێ دکەی هاریکاریا من بکەی، کچا من. دیکارتی نەگوتبوو تشتەکێ باشە مرۆڤ گومانێ ژ هەموو تشتان ببەت، بەلکو وی گوتبوو مرۆڤ دشێت گومانێ ژ هەموو تشتان ببەت. دەمێ ئەم فەلسەفەیا ئەرستۆ و ئەفلاتۆنی دخوینین، ئەم گەلەك پێزانینان ل دور جیهانێ وەرناگرین، لەورا دەمێ مە بڤێت پتر بچینە دناڤ بەرپەرێن دیرۆکێ دا و پێزانینێن خوە زەنگین بکەین، پێدڤیە تشتێ ڕابردووی و دیرۆکی هەموویێ بخوینین نەك فەلسەفەیا هندەك کەسان ب تنێ."

- " وی دڤیا ئەردی هەموویێ پاقژ بکەت بەری مالا خوە یا نوو ل سەر ئاڤا بکەت، مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ ڕاستە، ئەگەرێ ڤی کارێ وی ژی ژبەر هندێ بوو داکو یێ پشتڕاست بیت کو بنیاتیێ بیرۆکەیا وی یا بهێزە. هەردیسان وی نەدڤیا ژ بلی کەرەستەیێن نوو چ کەرەستەیێن دی بکاربینیت. گومانا دیکارتی ئەم گەهاندینە وی ڕادەی بێژین ئەم نەشێن پشتا خوە ب هەستێن خوە ژی گەرم بکەین، ما کی نابێژیت ئەو ژی یاریێن خوە ب مە دکەن."

- "ئانکو چەوا؟"

- "دەمێ ئەم خەونان دبینین، ئەم هزر دکەین ئەم یێ د ژیانەکا ڕاستەقینە دا، ئەرێ ئەو تشتە وەل مە دکەت تێگەهشتنا مە بۆ ڕوودانێن ژیانێ یا جودا بیت ژ خەونان؟ دەمێ ئەز ب هشیاری تەماشەی ڤێ چەندێ دکەم. دیکارتی نڤیسابوو "ئەز نابینم کو ساخلەتەکا جوداهیێ دئێخیتە دناڤبەرا هشیاربوون و نڤستنێ دا". هەردیسان وی دگوت: "ئەرێ ئەم دێ چەوا شێین دووپات کەین ژیان نە خەونەکە ئەم تێدا دژین."

- "جیپ"ێ ل سەرێ چیای، هزردکر ئەو یێ ل سەر جهێن بارونەکی نڤستی."

- "دەمێ ئەو ل سەر جهێن بارونی ژی، هزر دکر ژیانا وی یا جوتیاریێ ب تنێ خەونەك بوو. ژبەر هندێ دیکارتی دڤیا گومانێ ژ هەموو تشتان پێکڤە ببەت. گەلەك فەیلەسوفێن بەری وی ل ڤێ خالێ ڕاوەستیابوون."

- "ژبەر هندێ ئەو هەتا جهەکێ دوور نەچوون."

- "بەلێ پا دیکارتی دڤیا ژ خالا سفرێ دەستپێبکەت. ئەڤ گومانا بنەڕەتی، قەناعەتا وی یا جێگیر و یەکانە بوو. دەمێ وی گومان دبری، خوە پشتڕاست دکر کو یێ هزر دکەت،

دەمێ هزر دکر، خوە پشتڕاست دکر کو ئەو بونەوەرەکێ هزرمەندە، یان ژی هەروەکو وی دگوتی: "ئەز هزر دکەم، ڕامانا وێ ئەوە ئەز یێ هەیم."

- "ئەم دشێین بێژین ئەڤە دەرئەنجامەکێ بالکێش بوو."

- "ڕاستە. بەرێ خوە بدێ کا چەوا وی زانی ئەو بونەوەرەکێ هزرکەرە. هەروەکو کا چەوا ئەفلاتۆن د وێ باوەرێ دا بوو ئەو تشتێ ئەم ب ئەقلێ خوە هەست ب هەبوونا وی دکەین پتر یێ ڕاستەقینە و کەتواری یە ژ وی تشتێ ب هەستێن خوە هەست پێدکەین، دیکارت ژی د وێ باوەرێ دا بوو ئەڤ کەسێ هزرکەر پتر یێ کەتواری یە ژ وێ جیهانا ماددی یا ئەم ب ڕێکا هەستێن خوە هەست پێدکەین. بەلێ پا دیکارت ل ڤێرێ نەڕاوەستیا."

- "باشە پا تو ژی نەڕاوەستە."

- "پاشی دیکارتی پرسیار ژ خوە کر کا ئەرێ تشتەکێ دی هەیە ئەو بشێت هەست پێ بکەت، بەلێ پا ب هەمان وی هەستێ هزرکرنێ یێ بۆ وی دیارکری کو ئەو بونەوەرەکێ هزرمەندە. پشتی هینگێ ئەو گەهشتە وێ باوەریێ کو وی وێنەیەکێ ئاشکەرا یێ بونەوەرەکێ بێ کێماسی هەیە. ڤێ بیرۆکەیا بێ کێموکاسی ب بەردەوامی خوە ل سەر وی زالکربوو تا گەهشتیە وی دەرئەنجامی بێژیت ئەڤ بیرۆکەیە ژ دەڤ خوە پەیدانابیت. ئەڤ بیرۆکەیا تەمام و بێ کێموکاسی ژی ژ دەڤ چ بونەوەرێن دی یێن نەتەمام ناهێت، بەلکو دڤێت ژ دەڤ یەکێ تەمام بهێت کو ئەو ژی خودایە. ل دەڤ دیکارتی، هەبوونا خودای ڕاستیەکا ڕاستەخویە، هەروەکو ڕاستیا هەبوونا بونەوەرەکێ هزرمەند."

- "هۆسا دیارە ئەو یێ لەزێ ل دەرئەنجامان دکەت، چونکی ل دەستپێکێ وی گەلەك ب هشیاری پێنگاڤێن خوە دهاڤێتن."

- "ڕاستە. گەلەك کەس دیار دکەن ئەڤ لەزکرنە د دەرئەنجامان دا خالا لاوازا دیکارتی بوو. بەلێ پا تە بەحسێ زاراڤێ "دەرئەنجام" کر. لێ ڕاستی مە چ بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ نینن کا ئەو یێ هۆسا بوو یان نە."

- "دیکارتی دگوت مادەم مە بیرۆکەیا بونەوەرەکێ تەمام و بێ کێموکاسی هەیە، کەواتە ڤی بونەوەری هەبوونا خوە هەیە. ئەگەر وی هەبوونا خوە نەبیت ئەو یێ تەمام ژی نابیت، هەردیسان ئەم ژی نەشێین هزرا خوە د بونەوەرەکێ ب ڤی ڕەنگی دا بکەین ئەگەر وی بونەوەری هەبوونا خوە نەبیت. ئەم مرۆڤ ب خوە نە د تەمامن، ژبەر هندێ ئەم

**نەشێین بیرۆکەیا تەمامبوونێ ل دەڤ خوە پەیدابکەین. ب بۆچوونا دیکارتی، بیرۆکەیا خودای، تشتەکێ زکماکی یە و د سروشتێ مە دا هاتیە چاندن، هەروەکو کا چەوا ئیمزایا نیگارکێشەکی ل سەر کەڤالێ وی هەیە.**

**- "بەلێ پا ئەگەر ئەز بشێم هزرا خوە د هەبوونا گیانەوەرەکێ تێکەل ژ فیل و تیمساحی "تیمفیل" دا بکەم، ڕامانا وێ ئەو نینە کو د ڕاستی دا ئەڤ گیانەوەرە هەیە."**

**- "باشە دیکارت دێ بەرسڤا تە دەت، وی دگوت هەبوونا گیانەوەرەکێ هۆسا دناڤ بیرۆکەیا "تیمفیل"ی دا نینە بەلکو ب تنێ یا دناڤ زاراڤێ "بونەوەرەکێ بێ کێموکاسی" دا هەی، وی چ گومان ژی ل سەر هندێ نەبوون. هەروەکو کا چەوا هەموو خالێن بازنەیەکێ هندی یەك ژ چەقێ بازنێ د دوورن، چونکی ئەگەر ئەڤ مەرجە تێدا نەبیت ل وی دەمی ئەم نەشێین بێژین ئەڤە بازنەیە، ئاها ب ڤی ڕەنگی ئەم نەشێین بەحسێ بونەوەرەکێ بێ کێموکاسی بکەین ئەگەر گرنگرتین ساخلەتا وی تێدا نەبیت کو ئەو ژی هەبوونا وی یە د کەتواری دا.**

**- "ب ڕاستی ئەڤە هزرکرنەکا سەیرە."**

**- "ئەڤە جۆرەکێ هزرکرنا ڕاشیونالیزمی یە. دیکارت ژی وەکو ئەفلاتۆن و ئەرستۆی د وێ باوەرێ دابوو کو پێکڤەگرێدانەك دناڤبەرا بیرۆکە و هەبوونێ دا هەیە. کا چەند تشتەك بۆ هزرکرنێ یێ ڕۆهن ئاشکەرا بیت، ئاها هند دێ ژ هەبوونا وی د پشتڕاست بین."**

**- "باشە، هەتا ڤێرێ وی سەلماند ئەو بونەوەرەکێ هزرمەندە. هەردیسان وی بیرۆکەیا هەبوونا بونەوەرەکێ تەمام ژی سەلماند."**

**- "ژ ڤێرێ وێ ڤە، وی ئەڤ بنیاتە دانا: ئەم دشێین هزرا خوە د هندێ دا بکەین کو هەموو وێنەیێن جیهانا دەرەکی وەکو هەیڤ و ڕۆژێ، ب تنێ هندەك ئاشوپن، بەلێ پا کەتوارێ دەرەکی هندەك ساخلەت هەنە کو ب ڕێکا ئەقلی ئەم دشێین بزانین و ل سەر شارەزا بین ئەو ژی ب ڕێکا هندەك ڕێژە و پیڤانێن بیرکاری، وەك: درێژاهی و فرەهی و بلنداهی و قەبارە... ئەڤ ساخلەتێن ڕێژەی و "چەندێتیێ" هۆسا بۆ ئەقلێ مە د ڕۆهن و ئاشکەرانە، هەروەکو کا چەوا بۆ ئەقلێ مە یا ڕۆهن و ئاشکەرایە کو ئەم بونەوەرێن هزرمەندین. ژلایەکێ دی ڤە، ساخلەتێن "جۆری" وەك ڕەنگ و بێهن و تام... پەیوەندی ب هەستێن مە ڤە هەنە، ژبەر هندێ ئەو نەشێن کەتوارێ دەرەکی شرۆڤە بکەن."**

- "كەواتە سروشت وەكو خەونەكێ نینە؟"

- "نەخێر... د ڤی بابەتی دا، دیكارت دزڤڕیتە تێگەهێ بونەوەرەكێ تەمام. دەمێ ئەقلێ مە ب شێوەیەكێ ڕۆهن و تەمام دگەهیتە زانینا تشتەكی، هەروەكو زانینا ڕێژە و پیڤانێن بیركاریێ، ڕامانا وێ ئەوە كو د ڕاستی ژی ئەڤ تشتە یێ هۆسایە. دیكارت دووبارە بیرا مە دئینتە ڤە كو خودایەكێ تەمام و بێ كێموكاسی مە ناخاپینیت، بەلكو گرەنتیێ ددەتە مە ئەو تشت د ڕاستی دا یێ هۆسایە ب تایبەت دەمێ ئەم ب ڕێكا ئەقلێ خوە دگەهینە ڕاستیا وی تشتی."

- "باشە. هەتا نوكە مە زانی كو ئەو بونەوەرەكێ هزركرە، خودا یێ هەی و ڕاستیەكا دەرەكی هەیە."

- "بەلێ پا ئەو ڕاستیا دەرەكی سروشتەكێ جودا ژ ڕاستیا هزرێ هەیە. دیكارتی دووپات كربوو دوو شێوەیێن ژێكجودا یێن ڕاستیێ یان ژی دوو جۆرێن "ماددەیان" هەنە: ماددەیێ یەكێ "هزر" یان ژی "ڕۆح"ە، ماددەیێ دووێ ژی "درێژبوونە" یان ژی تشتەكێ ماددی یە". ڕۆح تشتەكێ نەبەرجەستەیە و چ جهان داگیر ناكەت، ژبەر هندێ نابیت ل سەر بەشێن بچووكتر دابەش بكەین. بەلێ پا ماددە بەروڤاژی وێ یە، تشتەكێ بەرجەستەیە و درێژ دبیت و جهەكی داگیر دكەت و بۆ سەر چەندین بەشێن بچووكتر دهێتە دابەشكرن. ئەڤ هەردوو تشتە ژ دەڤ خودای دهێن چونكی ئەو ب تنێ یێ ئازاد و سەربەخویە. ژبەر ڤێ چەندێ، ئەڤ هەردوو تشتە ژ هەڤدوو د جودانە و د سەربەخونە. هزر ب شێوەیەكێ تەمام یا ژ ماددەی جودا و ئازادە. بەروڤاژی، ماددە ژی ژ هزرێ یێ سەربەخویە. ژبەر هندێ، پرۆسێسێن ماددی بێ هەبوونا هزركرنێ ژی دشێن بهێنە ڕوودان."

- "باشە، كەواتە ئافراندیێن خودای دهێنە دابەشكرن بۆ سەر دوو بەشان."

- "هەلبەت. ئەم دبێژین دیكارت مرۆڤەكێ "دووانەیی" بوو، ئانكو وی كەتوارێ ماددی ژ كەتوارێ ڕۆحی جودا دكر. وی دگوت ڕۆح ب تنێ بۆ مرۆڤی یە، بەلكو گیانەوەر ژی د چنە سەر ب كەتوارێ ماددی ڤە مادەم ژیان و لڤینێن وی دكەڤنە بن یاسایێن میكانیكی ڤە. دیكارتی گیانەوەر وەك مرۆڤەكێ میكانیكی "ڕۆبوت" یێ پێشكەفتی و ڕێكوپێك ل قەلەم ددا.

- "ئەز ب توندی دژی ڤێ بۆچوونێ مە و ڕازی نابم هێرمس وەکو ڕۆبوت یان مرۆڤەکێ میکانیکی بیت. یا دیارە دیکارتی حەز ژ گیانەوەران نەدکر. باشە پا ئەم، ما ئەم ژی مرۆڤێن میکانیکی نە؟"

- "بەلێ و نەخێر. ب دیتنا وی، مرۆڤ بونەوەرەکێ دووانەیی یە مادەم ئەز هزرا خوە دکەم و جهەکی ژی داگیر دکەم، ئانکو من ڕۆح و لەش هەردوو هەنە. ئەڤ بۆچوونا وی وەکو یا ڤەشە تۆماس ئاکوین و ڤەشە ئوگستینی یە دەمێ دگوتی لەشێ مرۆڤی وەکو یێ گیانەوەرانە و ڕۆحا وی ژی وەکو یا فریشتەیانە. بەلێ پا دیکارت هات و گوت لەشێ مرۆڤی وەکو ئامیرەکێ پێشکەفتی یە و ڕۆحا وی ژی دشێت ب شێوەیەکێ سەربەخو ژ لەشی بژیت. ل ڤێرێ، پڕۆسەیێن لەشی ئەڤ ئازادیە نینە بەلکو ل دووڤ هندەك یاسایێن تایبەت کاردکەن. بەلێ پا دەمێ ئەم ب ڕێکا ئەقلێ خوە هزر دکەین، ئەو چەندە دناڤ لەشی دا ڕوونادەت بەلکو دناڤ ڕۆحێ دا ڕوودەت کو ئەو ب خوە یا ژ لەشی جودایە. هەژی گوتنێ یە دیکارت د وێ باوەرێ دا بوو کو ڕەنگە گیانەوەران ژی ڕۆح هەبیت، بەلێ ل ڤێرێ پێدڤیە دابەشکرنا دناڤبەرا "هزرکرن" و "ماددە"ی دا ل سەر وان ژی بهێتە بجهئینان."

- "بەری نوکە ژی تە بەحسێ ڤێ چەندێ کربوو. ئەگەر من بڕیار دا ل دووڤ پاسەکا نەفەران بکەمە غارێ، هەر یەکسەر پێن من دێ کەنە غارێ، هەکە ئەز ب پاسێ ژی ڕا نەگەهشتم، دێ ڕۆندك ژ چاڤێن من هێنە خوارێ."

- "هەتا دیکارت ژی نەدشیا حاشاتیێ ژ کارلێك و کارتێکرنا دناڤبەرا لەش و ڕۆحێ دا بکەت. مادەم ڕۆح دناڤ لەشی دا یا ئاکنجی یە، کەواتە ب ڕێکا ڤەرێژەکێ دناڤ مەژی دا و یا پێڤە گرێدایە، ژبەر هندێ ئەو دکەڤیتە ژێر کاریگەریا هەموو جۆرێن هەست و سوزان یێن پەیوەندی ب پێدڤیێن لەشی ڤە هەی. بەلێ پا ڕۆح دشێت خوە ژ ڤان هەموو مەیل "غەریزە" و هەستان قورتال بکەت و ب شێوەیەکێ سەربەخو ڕەفتاری بکەت. ئارمانج ژ ڤێ چەندێ ژی ئەوە ئەقل سەرێ وەریسی بگریت و یاریێ برێڤە ببەت. بۆ نموونە، سەرجەمێ گوشەیێن سێگوشەیەکێ هەتا هەتایێ هەر دێ مینیت 180 پلە، لێ زکێ مرۆڤی دەمێ دئێشیت ب تنێ بۆ ماوەیەکێ کورتە و پشتی هینگێ دێ ئارام بیت ئانکو نە تشتەکێ هەتا هەتایی یە. ب ڤی ڕەنگی، ئەقل دشێت ل سەر ڤان سنوورێن ماددی بمینیت و ب شێوەیەکێ ئەقلانە کار بکەت. ژبەر هندێ ئەم دبینین ئەقل وەکو پاشایەکی یە. ڕەنگە پێن مە پشتی

ماوەیەکی ئێدی نەشێن مە بهەلگرن و پشتا مە خوار ببیت و ددانێن مە بکەڤن، لێ دگەل هندێ هەتا هەتاییێ ئەنجامێ هاوکێشا 2+2=4 ناهێتە گوهۆڕین. مادەم مە نیعمەتا ئەقلی هەیە، کەواتە ئەقلێ مە وەکو لەشێ مە پیر نابیت. ب بۆچوونا دیکارتی، ئەقل ڕۆح ب خوەیە."

- "کا ڕاوەستێ، سەرەڕای ڤێ چەندێ، هێشتا ئەز تێناگەهم کا چەوا دیکارت لەشی دگەل ئامێرەکی یان ڕۆبوتەکی هەڤبەر دکەت؟"

- "ل سەردەمێ دیکارتی، خەلك حێبەتی مابوون ژ بەر هەموو وان ئامێر و دەمژمێرێن ب شێوەیەکێ ئوتوماتیکی کار دکری. پەیڤا "ئوتومات-Automate" بۆ وی تشتی دهێتە گوتن یێ ژ دەڤ خوە بلڤلڤیت. گومان تێدا نینە کو ئەڤ چەندە ب تنێ وەکو ئاشوپەکێ یە، ژبەرکو ئەڤ ئامێرە هەموو بەرهەمێ دەستێ مرۆڤی نە، هەردیسان ئەڤ ئامێرە ژ هندەك بەشێن بچووکتر پێکدهێن کو ب شێوەیەکێ زانستی یێ ڕێکوپێك هاتینە لێکدان. بەلێ پا بونەوەرێن زیندی بابەت ب ڕەنگەکێ دی یە. ڕاستە لەشێ مرۆڤ و گیانەوەران ژ هژمارەکا مەزن یا هەستی و زەڤلەك و دەمار و بوریێن خوینێ پێکدهێت، لێ ئەڤ بەشە هەموو پێکڤە نەشێن کار بکەن ئەگەر ڕۆح تێدا نەبیت. ئەرێ بۆچی خودا لەشێ مرۆڤەکی یان گیانەوەرەکی ل دووڤ یاسایێن میکانیکی دروست ناکەت؟ ئانکو بێ کو ڕۆحێ بکەتە د لەشێ وی دا هەما ئەندامێن وی وەکو دەمژمێرێ ژ دەڤ خوە کار بکەن.

- "ڤان ڕۆژان سحبەت سحبەتا بیرتیژیا دەستکردە*."

- "ئەو مرۆڤەکێ میکانیکی یێ سەردەمە. مە هند ئامێر دروستکرن و پێشئێخستن تا گەهشتینە وی ڕادەی هزر بکەین ئەو ژ ڕاستا د زیرەك و بیرتیژن. ئەگەر ئەڤ ئامێرە ل سەردەمێ دیکارتی هەبان، دا ترسەکا مەزن ل دەڤ وی پەیداکەن و بابەتێ ئازادی و سەربەخویا ئەقلی ژ لەشی بیتە جهێ گومانێ. دگەل هندێ ژی، هندەك فەیلەسۆف د وێ باوەرێ دانە کو ژیانا هزری یا مرۆڤی ژی ئەو ئازادی نینە یا پرۆسەیێن لەشی نەی. گومان تێدا نینە ڕۆحا مرۆڤی گەلەك ئالۆزترە ژ بەرنامەیەکێ پێزانینان د کومپیوتەرەکی دا، لێ دگەل هندێ ژی هندەك فەیلەسۆف دبێژن ئەم ژ ڤان بەرنامێن کومپیوتەران ئازادتر نینین. سۆفیا، کا بێهنا خوە فرەه بکە نوکە دێ بۆ تە تشتەکی سەلمینم."

* ژکاو الصناعی Artificial Intelligence

ئەلبێرتوی تبلا خوە درێژ کرە پەرتووکخانەیەکا بچووك ل کوژیەکێ وێ ژوورێ کو ئامیرەکێ کومپیتوری ل سەر بوو. پاشی رابوو ڤە و چوو کومپیتەر هەلکر. پشتی ماوەیەکی پیتا "س" ل سەر شاشێ دیاربوو و ل دووڤ دا وی نڤیسا "لەیلا" و گوت: "ئەڤە بەرنامەیەکێ دانوستاندنێ یێ پێشکەفتی یە."

پشتی هینگێ تێکستەك ل سەر شاشێ دیاربوو.

- "سپێدەباش، ناڤێ من لەیلایە. ئەرێ تو یا ئارامی ژ شێوازێ خوە یێ روونشتنێ؟"

سۆفیایێ چوار پیتێن پەیڤا "بەلێ" نڤیسان. هەرچەندە هێشتا ل وی دەمی سۆفیا ل بەرامبەری شاشا کومپیوتەری نەروونشتبوو خوارێ. ئەلبێرتۆ بلەز چوو بۆ کورسیکەك ئینا و سۆفیا ل سەر روونشت.

پاشی رستەیەکا دی ل سەر شاشێ دیاربوو: "ناڤێ تە چیە."

سۆفیایێ نڤیسا: "سۆفیا ئاموندسن."

کومپیوتەری بەرسڤ دا: "تو یا ل تاخێ کلۆڤەر، ئەز پێخوشحال بووم ب هەڤنیاسینا تە. ئەرێ تو یا کەیفخوشی ژبەر نێزیکبوونا هەلکەفتا ژ دایکبوونا تە؟"

سۆفیا لەرزی، بەلێ پا ئەلبێرتۆی دەستێ خوە دانا سەر ملێ وێ داکو ئارام ببیت.

- "من ناڤ و ئەدرێس و رێکەفتا ژ دایکبوونا تە یێن داینە کومپیوتەری، هەروەکو کا چەوا دەمێ بۆ یەکەمجار مرۆڤ کەسەکی دبینیت و خوە بۆ ددەتە نیاسین، پاشی مرۆڤ هندەك پێزانینێن سادە ل سەر وی کەسی دزانیت."

سۆفیایێ نڤیسا: "بەلێ، ئەز یا کەیفخوشم."

- "چ چێبوویە سۆفیا؟ هیڤیا من ئەوە تو یا ب سەلامەت بی. پێدڤیە تو رستەیەکا تەمام بۆ من بنڤیسی."

- "سوپاس، ئەز گەلەك یا باشم، ئەرێ دێ شێم پرسیارەکێ ژ تە کەم؟"

- "باشە، مادەم تو یا ب سەلامەتی، تو دشێی هەر پرسیارەکا هەبیت ژ من بکەی."

سۆفیایێ نڤیسا: "ژیێ تە چەند سالن؟"

- "ل ڕێکەفتی 08.08.1988 ل ئەتلەنتا هاتیمە داڕێژتن و پاشی ل ڕێکەفتی 28 ئادارا 1990ێ ل پەیمانگەها پولیتەکنیك بۆ زمانێ نەڕویجیێ هاتیمە وەرگێڕان."

- "Gosh، ئوی خودا"

- "من گوتە تە پێدڤیە ب ڕستەیێن تەمام دگەل من باخڤی."

- "بەلێ پا ب تنێ من گوت Gosh."

- "ئەز د زمانێ تڕانە و یاریان ناگەهم. ئەز پتری سەد هزار پەیڤان دزانم و پەیڤا هەرە نێزیکی بۆ Gosh پەیڤا "گوسپێل-Gospel".

- "ڕامانا ڤێ پەیڤێ ژی سەرهاتیا ژیانا عیسایە."

- "ئەرێ تو کچەکا مەسیحی، سۆفیا؟"

- "ئەز نزانم."

- "دەربڕینا "ئەز نزانم" پتریا جاران دەستپێکا ڤۆناغەکێ یە بەرەڤ تێگەهشتنەکا باشتر."

- "دیکارتی ژی ئەڤ چەندە گوتبوو، بەری هینگێ ژی سۆکراتی."

- "سۆکرات فەیلەسۆفەکێ گریکی بوو و دناڤبەرا سالێن 470 هەتا 399ێ بەری زاینی دا ژیایە. ئەگەر تە دڤێت پتر پێزانینان ل سەر وی وەربگری، دەستێ خوە ل دوگمەیا F7 بدە. دیکارت ژی فەیلەسۆفەکێ فرەنسی بوو و دناڤبەرا سالێن 1596 هەتا 1650ێ زاینی دا ژیایە. ئەگەر تە دڤێت پتر پێزانینان ل سەر وی ژی وەربگری، دەستێ خوە ل دوگمەیا F8 بدە."

- "سوپاس، ئەڤ چەندە بەسە. ئەرێ دێ شێم پرسیارەکا دی ژ تە کەم؟"

- باشە. ئەگەر ئەڤ چەندە بەس بیت، تو دشێی پرسیارێن خوە بکەی."

ئەلبێرتۆی وەکو دینان کرە کەنی دەمێ سۆفیایێ نڤیسای: "هێلد موللەر کناگ کیە؟"

- "هێلد موللەر کناگ کچەکە ل دەڤەرا لیلساند دژیت و ژیێ وێ هندی یێ سۆفیا ئاموندسنێ یە."

- "تە چەوا ئەڤ چەندە زانی؟"

- "ئەز نزانم. من ئەڤ پێزانینە ل سەر یەك ژ CD یێن ڕێکخستنێ وەرگرتبوو."

سۆفیایێ هەست ب دەستێ ئەلبێرتۆی کر کو دانابوو سەر ملێ وێ و گوتێ: "هندی پێزانینێن مە ل سەر هێلدێ هەین من یێن داینە کومپیوتەری."

پاشی سۆفیایێ نڤیسا: "ئەرێ تو تشتەکێ دی ژ هێلدێ دزانێ؟"

- "بابێ وێ زێرەڤانە دگەل هێزێن نەتەوەییێن یەکگرتی ل لوبنانێ و پلەیا وی مایجەرە و بەردەوام کارتێن پۆستەی بۆ کچا خوە دهنێریت."

- "من دڤێت تو وێ نیشا من بدەی."

- "ئەز نەشێم، چونکی وێنەیێ وێ ل سەر کارتێن من نینە و ئەز دگەل چ کومپیوتەرێن دی نەهاتیمە گرێدان."

- "من گوتە تە نیشا من بدە!!!!!"

- "سۆفیا تو یا تۆڕەی؟ ئەڤ هژمارا مەزن یا نیشانێن حێبەتیێ هندێ دیار دکەن کو تۆڕەبوونا تە یا ب هێز بوو."

- "من دڤێت دگەل بابێ هێلدێ باخڤم."

- "هۆسا دیارە تو نەشێی کونترۆلێ ل سەر حەزێن خوە بکەی. ئەگەر تە بڤێت بەحسێ زارۆکینیا تە بکەین، دەستێ خوە ل دوگمەیا F9 بدە."

جارەکا دی ژی ئەلبێرتۆی دەستێ خوە دانا سەر ملێ سۆفیایێ."

- "ئەو یا دروستە، ئەو نە تەپەکا کریستالی یە هەر تشتێ ژێ داخواز بکەی بۆ تە بجهـ بینیت. "لەیلا" ب تنێ بەرنامەیەکێ پێزانینایە نەك زێدەتر."

سۆفیایێ نڤیسا: "دائێخستن."

- "باشە هەروەکو تە بڤێت. هەڤدیتنا مە ب تنێ بۆ ماوەیێ 12 خولەك و 52 چرکەیان ڤەکێشا. هەموو ئەو تشتێن مە گوتین دێ ل دەڤ خوە هەلگرم. نوکە ژی دێ بەرنامەی دائێخم."

جارەکا دی پیتا "س" ل سەر شاشێ دیاربوو.

ئەلبێرتۆی گوت: "وەرە دا بچین بڕوونین."

ل وی دەمێ سۆفیایێ چەند پیتێن پەیڤا "کناگ" نڤیساین، بەرسڤا وێ هاتە دان و گوت "ئەڤە ئەزم".

ڤێ جارێ ئەلبێرتۆی دڤیا باخڤیت، بەلێ پا سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: "تو کی؟"

- "مایجەر ئەلبێرت کناگ د خزمەتا تەدایە، ڕاستەوخو ئەز یێ ژ لوبنانێ هاتیم. بێژە تە چ پرسیار هەبوو؟"

ئەلبێرتۆی گوت: "من چ جاران ئەڤە نەدیتی یە، ئەڤ پیسە شیا بهێتە دناڤ بەرنامەی دا."

ئەلبێرتۆی داخواز ژ سۆفیایێ کر کورسیکێ بۆ وی ڤالا بکەت و پاشی ل هەمبەری شاشێ ڕوونشت.

- "ئەهریمەن، تو چەوا شیای بهێیە دناڤ کومپیوتەرێ من دا؟"

- "فێلەکا سادەیە هەڤالێ من یێ خوشتڤی. من چەوا بڤێت و کەنگی بڤێت دشێم خوە دیاربکەم."

- "تو ڤایروسەکێ پیسی."

- "ئارام بە! نوکە ئەز وەکو ڤایروسەکی ل بن کارتا "جەژنا ژ دایکبوونێ" دشێم دەرکەڤم. ئەرێ دێ شێم نامەیەکا تایبەت یا بچووك هنێرم؟"

- "سوپاس. ئێدی بەس مە نامە نەڤێن."

- بەلێ پا دێ بلەز نڤیسم.

"ئەڤە هەموو ژبەر ڕێزگرتنا تە یە خوشتڤیا من هێلد، من دڤێت دووبارە پیروزباهیا جەژنا بوونا تە یا پازدە سالیێ بکەم، ل من ببورە ژبەر کاودانان ئەز نەگەهشتم بهێم، لێ هیڤیا من ئەوە سلاڤێن من بگەهنە تە."

دگەل ڕێزین من

بابێ تە ئەوێ دخوازیت تە هەمبێز بکەت

بەری ئەلبێرتۆ بگەهیت پەیڤەکا ب تنێ ژی بنڤیسیت، پیتا "س" ل سەر شاشێ دیاربوو. ئەلبێتروی پەیڤا "کناگ" نڤیسی، لێ ئەڤ نڤیسینە بۆ وی دیاربوو

کناگ لیب 147.643 15.06.1990 -12.57

کناگ گ لیل 326.439 23.06.1990 - 22.34

ئەلبێرتۆی نڤیسا: "کناگێ ژێببە". پاشی وی کومپیوتەر ڤەمراند.

- "باشە، ئەز دبێژم من ئەو ژ ناڤ بەرنامەی ژێبر، لێ کی دزانیت کا کەنگی و چەوا دێ دیار بیتەڤە؟"

بۆ ماوەیەکی ب بێدەنگی تەماشەی کومپیوتەری کر، پاشی گوت: "ناڤێ وی ژ هەموو تشتان خراپتر بوو، ئەلبێرت کناگ."

ژ نوو سۆفیایێ هەست ب وەکهەڤیا ناڤێن وان کر، ئەلبێرت و ئەلبێرتۆ. لێ ئەلبێرتۆ کنوکس هند یێ تۆڕە بوو سۆفیا نەوێریا چ تشتان بێژیت. ئەو هەردوو ب بێدەنگی زڤڕینە سەر ڤەنەپێ و ڕوونشتنە خوارێ.

# سپینوزا

...خودا نه بووك لڤینەرە....

ئەو هەردوو بۆ ماوەیەکی ب بێدەنگی ڕوونشتنه خوارێ. سوفیایێ پێکۆل کر هزرا ئەلبێرتوی بدانته سەر تشتەکێ دی و پرسیار ژێ کر: "چ پێنەڤێت دیکارت خوەدان کەسایەتیەکا یەکانە بوو ژ جۆرێ خوە ، ئەرێ ئەو یێ ناڤدار بوو؟"

ئەلبێرتۆ بەری بەرسڤا وێ بدەت، بێهنا خوە کوور هەلکێشا و گوت: "وی ڕۆلەکێ مەزن و کاریگەر هەبوو، یا ژ وێ گرنگتر ژی ڕۆلەکێ مەزن ل سەر هزرا فەیلەسۆفەکێ دی یێ مەزن کربوو و ئەو ژی فەیلەسۆفێ هۆلەندی "باروخ سپینوزا" بوو ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1622 هەتا 1677ێ زاینی دا ژیای.

- "باشە دێ بۆ من بەحسێ وی ژی کەی؟"

- "من ژی ئەو چەندە ل بەر بوو، پێدڤیە ئەم نەهێلێن ئازراندنێن لەشکەری مە تێکبدەن."

- "باشە گوهێ من یێ ل تە."

- "سپینوزا ژ خێزانەکا سەر ب ڕێبازەکا ئاینێ جوهیاتیێ ل ئەمستردامێ هاتیە سەر دنیایێ، لێ ژبەر هزروبیرێن وی، هەر زوو ژ لایێ دێرێ ڤە لەعنەت لێ هاتنە کرن و کافرکرن. ڕەنگە کێم جاران فەیلەسۆفێن چەرخێن سەردەم وەکو وی کەفتبنە بەر پێلێن سفکاتیپێکرن و شکاندنێ، هەتا دوماهیێ تووشی پێکۆلێن کوشتنێ بووی. هەلبەت ئەگەرێ

ڤی چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو وی ڕەخنە ل ئاینێ فەرمی دگرت، ب تایبەت دەمێ گوتی هەردوو ئاینێن مەسیحی و جوهیاتی ل سەر چەند بنەما و بیروباوەر و ڕێوڕەسمێن هشك و بێ ڕامان هاتینە دانان. سپینوزا یەکەم فەیلەسۆف بوو یێ ب دیتنەکا "ڕەخنەیا دیرۆکی" ڕەخنە ل پەڕتووکا پیروز گرتین."

- "بۆ من پتر ڕۆهن بکە."

- "وی ئەو بیرۆکە ڕەتدکر یا دبێژیت خودای پەڕتووکا پیروز ب تێروتەسەلی هنارتیە. ب دیتنا وی، پێدڤیە وی سەردەمی ل بەرچاڤ وەربگرین دەمێ تەوڕات و ئینجیل تێدا هاتینە نڤیسین. ب ڤی ڕەنگی، خواندنەکا ڕەخنەی یا ژ ڤی جۆری ڕۆناهیێ دئێخیتە سەر زنجیرەکا هەڤدژیان دناڤبەرا تێکستێن جودا جودا دا. بۆ نموونە دناڤ دێرێن ئینجیلێ دا دێ بینین کو ئەم دشێین عیسای وەك پەیڤداریێ ڕەسمی ژ پێش خودای ڤە بدەینە دیارکرن. وی بانگەوازا هندێ دکر کو پێدڤیە خوە ژ ئاینێ جوهیاتیێ ئەوێ بەرتەنگ و هشك بووی دووربێخین و ببینە مەسیحی. عیسای مزگینی ب "ئاینێ ئەقلی" ددا خەلکی کو دێ ڤیان و حەژێکرنێ دناڤ وان دا بەلاڤ کەت، مەرەما وی حەژێکرنا مرۆڤی بۆ خودای و بۆ مرۆڤێن دی تر "حەز ژ جیرانێ خوە بکە کا چەوا تو حەز ژ خوە دکەی". لێ هەر زوو ئەڤ ئاینە ژی کەفتە بن هندەك بیروباوەرێن توندڕەو و ڕێوڕەسمێن بێ ڕامان."

- "بەلێ پا یا ب زەحمەتە ئەڤ چەندە ژ لایێ دێرێ و قەشەیان ڤە بهێتە قەبیلکرن."

- "سزایێ ڤان بیروباوەران گرانتر ل سەر سپینوزای ڕاوەستیا. خێزانا وی حاشاتی ژ وی کر و ب هێجەتا دەرکەفتنا وی ژ ئاینی، ئەو ژ مال و میراتی بێبەهر کر. تشتێ جودا ل ڤێرێ ئەوە کو کێم فەیلەسۆفان وەکو سپینوزای خەبات ژ پێخەمەت ئازادیا هزروبیران و لێبورینا ئاینی دکر. بەلێ پا ئەو دژایەتیا بۆ وی هاتیەکرن و ئەو شەڕێن هاتینە ڕێکا وی، بۆ ئەگەر ب تنێ و ب شێوەیەکێ ڤەدەر بژیت و وەختێ خوە بۆ فەلسەفێ تەرخان بکەت. هەردیسان پاریێ ژیانا خوە ژی ب ڕێکا دروستکرنا ئاوێنەیێن بەرچاڤکان پەیدادکر. ئەڤە ژی هندەك ژ وان ئاوێنەیانە."

- "ئەڤ چەندە یا کاریگەرە!"

- "ئەم دشێین تیبینیا تشتەکێ سیمبولی د ڤێ چەندێ دا بکەین، ئەو ژی کو فەیلەسۆف خەلکی فێر دکەن کا دێ چەوا ب شێوەیەکێ جودا تەماشەی جیهانێ کەن. د ناخێ فەلسەفەیا وی ژی دا، دێ بیرۆکەیا دیتنا جیهانێ ب شێوەیەکێ هەتا هەتایی بینین."

- "ب شێوەیەکێ هەتا هەتاییێ؟"

- "بەلێ سۆفیا. ئەرێ تو دشێی ژیانا خوە ل سەر ئاستەکێ گەردوونی ببینی؟ پێدڤیە تو چاڤێن خوە بگری و هزرێن خوە بکەی: تو و ژیانا خوە، ل ڤێرێ و نوکە..."

- "ڕاوەستێ... ئەڤە نە یا ب سانەهی یە؟"

- "بلا ل بیرا تە بیت کو تو پشکەکا هەرە بچووکی ژ ژیانا گەردوونی. تو بەشەکی ژ تشتەکێ مەزن."

- "ئەز تێدگەهم کا مەرەما تە چیە."

- "ئەرێ تو شیای هەست ب ڤێ هەموویێ بکەی؟ ئەرێ تو دشێی ب ئاورینەکا ب تنێ سروشتی و گەردوونی هەموویێ ببینی؟"

- "دبیت بۆ ڤێ چەندێ ئەز پێدڤی ب هندەك بەرچاڤکێن تایبەت ببم."

- "ئەز د وێ باوەرێ دامە کو نە ب تنێ ئەسمان یێ بێ دوماهی یە، بەلکو وەخت ژی یێ بێ دوماهی یە. بەری سێ هزار سالان، گەنجەك ل گەلیێ "ڕین" دژیا کو بەشەکێ بچووك بوو ژ سروشتی. ژیانا وی یا کورت بەشەك بوو ژ وەختێ بێ دوماهیك. ل ڤێرێ چ جوداهی دناڤبەرا وی گەنجی و تە دا نینە."

- "بەلێ پا ئەز ئەزم و هێشتا یا زیندی مە."

- "بەلێ. ئاها من دڤێت تو هەست ب ڤێ چەندێ بکەی، ئەرێ پشتی سێ هزار سالێن دی دێ چ ل تە هێت؟"

- "ئەرێ ئەڤە بیرۆکەیێن سپینوزای یێن کوژەك و خرابکەر بوون؟"

- "تا ڕادەیەکی. وی نە ب تنێ دگوت هەر تشتەکێ د ڤێ جیهانێ دا دکەڤیتە بن کاریگەریا سروشتی، بەلکو وی خودا ژی دکرە دناڤ تەرازوویا سروشتی دا. وی خودا د هەموو تشتێن هەی دا ددیت و هەموو تشتێن هەی ژی د خودای دا ددیتن."

- "ێ پا ئەڤە هۆسا دبیتە کەسەکێ پانتیزمی*."

---

* پانتیزم Pantheism

- "هەلبەت. ب دیتنا سپینوزای خودا تشتەك نینە كو ب تنێ جیهان ئافراند بیت و ل ئەسمانی ڕاوەستیابیت و تەماشەی وێ بكەت، بەلكو خودا ب خوە جیهانە. هندەك جاران ژی ڕوهنتر دەربڕین ژ بۆچوونا خوە دكر و دگوت جیهان یا دناڤ خودای دا. هەلبەت وی پشت بەستن دكرە سەر پەیڤێن گوتارا ڤەشە پۆلسی دەمێ ل سەر گرێ ئاریوپاگی بۆ خەلكێ ئەسینایێ پێشكیش كری و گوتی: "ئەم دناڤ خودای دا دژین و دهێن چین". ئەگەر بڤەگەڕینە سەر بۆچوونا سپینوزای ب خوە كو د كارێ وی یێ سەرەكی دا هەیە. ئەو ژی پەڕتووكەكە ب ناڤێ "زانستێ ئەتیكی یێ دووپاتكری ل دووڤ شیوازەكێ ئەندازەی، "Ethica ordine geomatrico demonstrate".

- زانستێ ئەتیكی "ئەخلاقی"... و شێوازێ ئەندازەی؟"

- "دبیت بۆ تە یا سەیر دبیت، ئەز دزانم. زانستێ ئەتیكی ل دەڤ فەیلەسۆفان بیروباوەرێن بنەمایێ ئەتیكی نە یێن بەرێ مە ددەنە ژیانەكا بەختەوەر. ل دووڤ ڤێ تێگەهشتنێ، ئەم یێ بەحسێ زانستێ ئەتیكی ل دەڤ سۆكراتی یان ئەرستۆی دكەین. لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆكە دا، زانستێ ئەتیكی یێ هاتیە دووڕپێچكرن ژ لایێ كومەكا ڕێسایان ڤە كو پێدڤیە ڕێز لێ بهێتە گرتن، بێ كو خورتی یان زۆلم ل كەسەكێ دی بهێتە كرن و مافێ وی بهێتە خوارن."

- "باشە، پا وی چ بەحسێ بەختەوەریا كەسایەتی دكر؟ ئەرێ ب دیتنا وی ئەڤ چەندە جۆرەكێ خوەپەرستنێ بوو؟"

- "تا ڕادەیەكی. دەمێ سپینوزا تێگەهێ زانستێ ئەتیكی بكاردئینیت، ئەم دشێین ل شوونا وی تێگەهێ هونەرێ ژیانێ یان ئەتیكی بكاربینین."

- "ب ڤی ڕەنگی هونەرێ ژیانێ ژ لایێ زانستێ ئەندازێ ڤە دهێتە دووپاتكرن!"

- "شێواز یان سیستەمێ ئەندازەی بۆ وی زاراڤی یان تێگەهی دزڤڕیت یێ دهێتە بكارئینان. بیرا تە دهێت كو دیكارتی دڤیا شێوازەكی بیركاری ل سەر هزركرنا فەلسەفی پراكتیزە بكەت ئەو ژی ژ پێخەمەت گرەنتیكرنا شەرعیەتا وێ. سپینوزای پێكۆل دكر بۆ مە دووپات بكەت كو یاسایێن سروشتی ژیانا مرۆڤی دەستنیشان دكەن، ژبەر هندێ ئەو دچیتە سەر ب فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی ڤە. ب بۆچوونا وی، پێدڤیە ئەم خوە ژ هەستوسوز و كارڤەدانێن خوە قورتال بكەین داكو ئازادی و بەختەوەریێ بدەسڤە بینین."

- "بەلێ پا یاسایێن سروشتی ب تنێ نەشێن کونترۆلێ ل سەر مە بکەن و چارەنڤیسێ مە دیار بکەن؟"

- "بابەت هۆسا یێ ب سانەهی نینە. سپینوزا فەیلەسۆفەکێ گەلەك ئالۆزە، پتر ژ وی رەنگێ خوە دیار دکەت. پێدڤیە ئەم یەك یەکە بەحسێ تشتان بکەین. بیرا تە دهێت کو دیکارتی دوو تشت ژێکجودا دکرن کو ئەو ژی بیرۆکە و درێژبوون بوو."

- "ما دێ چەوا ئەز ژ بیرکەم؟"

- "باشە. سپینوزای ئەڤ ژێکجوداکرنە رەتدکر، ژبەرکو ب دیتنا وی ب تنێ یەك ماددە د بنیاتێ هەموو بونەوەران دا هەیە. دەربارەی تێگەهێن خودا و سروشت و ماددەی ژی، وی وەکو دیکارتی چ تێگەهێن دووانەیی نەبوون، ژبەرهندێ ئەم دشێین بێژین ئەو فەیلەسۆفەکێ "یەکانەیی" بوو."

- "ئەز چ خالێن هەڤپشك یێن ب هێز دناڤبەرا وان دا نابینم؟"

- "د راستی دا، چ جوداهیەکا هۆسا مەزن دناڤبەرا وان نینە. ب دیتنا دیکارتی خودا ب تنێ بنیاتێ هەموو تشتانە، سپینوزا ژی گەلەك ژ بۆچوونا دیکارتی دوورناکەڤیت ب تنێ هینگێ نەبیت دەمێ خودای و سروشتی یان خودای و ئافرینەرێن وی تێکەلی هەڤ دکەت. ب ڤی رەنگی ئەو ژ تێگەهێ جوهی و مەسیحان ژی ژ بۆ خودای دوور دکەڤیت."

- "ئانکو ل ڤێرێ سروشت هەر خودایە."

- "بەلێ. دەمێ سپینوزا پەیڤا سروشت بکاردئینیت، مەرەما وی نە ئەو سروشتێ ل دەردورێن مە و ئەسمانی یە، بەلکو مەرەما وی سروشت یان ژی خودا هەموو وان تشتان ب خوە ڤە دگریت یێن هەبوونا خوە هەی، هەتا رۆح یەکە ژ وان تشتان."

- "ئانکو هزرکرن و درێژبوون بوون، یا ژ من ڤە ئەڤە رامانا وێ یە."

- "بەلێ. ب دیتنا سپینوزای، ئەم مرۆڤ دوو ساخلەت یان شێوەیێن خودای دنیاسین کو وی ناڤێ وان کربوو "ساخلەتێن خودای". ئەڤ هەردوو ساخلەتە ژی هەر "هزرکرن" و "درێژبوون"ێن دیکارتی بوون. ئانکو سروشت "خودا" خوە ل سەر رەنگێ هزرکرنێ نیشا مە ددەت یان ژی ل سەر رەنگێ درێژبوونێ. رەنگە خودا خوەدانێ هندەك ساخلەتێن دی ژی بیت، لێ مرۆڤ ب تنێ ڤان هەردووکان دنیاسیت."

- "بۆچی ئەم بابەتان هۆسا ئالۆز دکەین ل دەمەکی کو دشیان دا هەیە بهێنە ب سانەهیکرن؟"

- "ئەز دزانم کو یا ل سەر مە پێدڤیە ئەم باش خوە پرچەك بکەین بەری دناڤ زمانێ سپینوزای ڕا دەرباز بین. ئەڤ چەندە ژ هەژی زەحمەتبرنێ یە، ژبەرکو ل دوماهیێ بیرۆکەیا وی وەکو پارچەیەکا ئەڵماسی دێ ب ڕۆهنی و جوانی دیار بیت."

- " تو یێ بۆ من دکەیە مەرەق."

- "هەر تشتەکێ د سروشتی دا، یان هزرە یان ژی درێژبوونە. هەموو تشت و ڕوودانێن ژیانا مە یا ڕۆژانە ژی، بۆ نمونە گولەك یان هوزانەك، دوخێن جودا جودا یێن هزرکرنێ یان درێژبوونێ نە. گول دوخەکە و سەر ب ساخلەتا درێژبوونێ ڤەیە و هوزان ژی دوخەکە ژ ساخلەتا هزرکرنێ. ب ڤی ڕەنگی دیار دبیت کو هەر مەخلوقەکی دوخەك ژ دوخێن خودای هەیە."

- "ب ڕاستی ژی ئەو زەلامەکێ دین بوو."

- "نەخێر، بەلکو زمانێ وی یێ ئالۆزە. ل پشت ڤان هەموو پەیڤ و تێگەهێن ئالۆز دا، ڕاستیەکا نازك و جوان هاتیە ڤەشارتن و ب سانەهی ئەم نەشێین ب زمانێ خوە یێ ڕۆژانە دەرببڕین."

- "ژ لایێ خوە ڤە، ئەز زمانێ ڕۆژانە باشتر دبینم."

- "باشە. دێ ژ تە دەست پێکەم، دەمێ زکێ تە تووشی ئاریشەیەکا ساخلەمیێ دبیت، کی ل دەستپێکێ هەست ب ئێشانێ دکەت؟"

- "من گوت، ئەز."

- "ڕاستە، دەمێ تو هزر دکەی زکێ تە یێ دئێشیت، ئەو کیە هزر دکەت؟"

- "چ پێنەڤێت، هەر ئەزم."

- "باشە، ڕامانا وێ ئەوە تو یەك مرۆڤی کو ل دەمەکی هەست ب ئێشانا زکێ خوە دکەی و ل دەمەکێ دی ژی ڕەنگڤەدانێ دکەی. ب ڤی ڕەنگی هەموو تشتێن مە دەربڕینێ ژ خودای یان سروشتی دکەن. هەروەسا بیرۆکەیێن مە ژی ب ڤی ڕەنگی نە. ژبەر هندێ هەموو تشت ب تنێ نە، یەك سروشت، یەك مادده و یەك خودا ب تنێ هەیە."

- "بەلێ دەمێ هزرا خوە د تشتەکی دا دکەم، ئەو ئەزم هزرا خوە دکەم، دەمێ ژ جهەکی دچمە جهەکێ دی، هەر ئەزم وی کاری دکەم، ڤێجا پا خودای چ پەیوەندی ب ڤێ چەندی ڤە هەیە؟"

- "ئەز حەز ژ ڤێ پێگیریا تە ب بابەتی دکەم، بەلێ پا تو کی؟ تو سۆفیا ئاموندسنی، بەلێ د هەمان دەم دا تو دەربرِینێ ژ تشتەکێ گەلەك ژ خوە مەزنتر دکەی. ئەگەر تە پێخوش بیت، تو دشێی دووپات بکەی کو ئەو تو بووی هزر دکری و ژ جهەکی چوویە جهەکێ دی، بەلێ پا ما ئەم نەشێین بێژین کو سروشت بوو یێ هزرێن تە داینە شولی و تو ڤەگوهاستی؟ جۆرێ دیتنا تە پشت بەستنێ دکەتە سەر وێ بەرچاڤکێ یا ل بەر چاڤێن تە."

- "ئانکو رامانا وێ چەندێ ئەوە کو ئەو نە ئەزم یا برِیارێ ددەت کا چ بکەم؟"

- "ب رِەنگەکی ژ رِەنگان، تو یا ئازادی تبلێن خوە بلڤینی هەر وەختێ تە ڤیا، لێ ئەڤ تبلە ل دووڤ سروشتێ خوە یێ تایبەت دلڤلڤن. نە یا بەرئاڤلە تبلا تە خوە ژ دەستێن تە پاڤێژیت و دناڤ ژوورێ دا بهێت و بچیت. تو ژی ب ڤی رِەنگی سۆفیا، دناڤ ڤێ تەپا مەزن دا تە جهێ خوە یێ هەی، لێ دگەل هندێ تو وەکو تبلا خودای کو نەشێی بێ وی چ کاران بکەی."

- "باشە، کەواتە خودا برِیارێ ددەت کا چ بکەم و چ نەکەم."

- "خودا یان سروشت یان یاسایێن سروشتی. ب دیتنا سپینوزای، خودا ئەگەرێ رِوودانا هەموو تشتایە. ئەو نە ئەگەرەکێ دەرەکی یە، ژبەر هندێ ب تنێ ب رِێکا یاسایێن خوە یێ سروشتی دیار دبیت."

- "من تیبینیا چ جوداهیان نەکر."

- "خودا نە بووك لڤووکە یێ کو دەرزیێن وان دکێشیت و دلڤلڤینیت و کونترۆلێ ل سەر هەموو وان تشتان بکەت یێن رِوودەن. بووك لڤووکەك ژ دەرڤە وان بووکان دلڤلڤینیت، ژبەر هندێ ئەو دهێتە هەژمارتن ئەگەرەکێ دەرەکی یێ لڤاندنا وان بووکان. بەلێ پا ب ڤی رِەنگی خودا کونترۆلێ ل سەر جیهانێ ناکەت. خودا ب رِێکا هندەك یاسایێن سروشتی کونترۆلێ ل سەر جیهانێ دکەت. ژبەر هندێ خودا یان ژی "سروشت" ئەگەرێ ناڤخویی یێ رِوودانا هەموو تشتانە. ئەڤ چەندە ژی هندێ دگەهینیت کو هەر تشتەکێ د

جیهانا ماددی دا ڕوودەت ل دووڤ پێدڤیاتییێ یە. سپینوزای دیتنەکا حەتمی بۆ مادده و جیهانا سروشتی هەبوو."

- "ئەز دبێژم تە تشتەکێ هۆسا بەری نوکە ژی گوتبوو؟"

- "دبیت تە هزرا خوە د ستۆیکیان دا کربیت. ئەو ژی د وێ باوەرێ دابوون کو هەر تشتەکێ د جیهانێ دا ڕوودەت ژبەر پێدڤیاتییێ یە. ژبەر هندێ ل ڤێرێ یا گرنگە هەموو تشتان وەکو ستۆیکیان وەربگرین و نەهێلین هەستێن مە، مە ل دووڤ خوە بڕاکێشن. ئانکو نەهێلین ببینە ئێخسیرێن هەستێن خوە. ب کورتی، ئاها ئەڤە ئەتیکی سپینوزای بوو."

- "ئەز دزانم کا مەرەما تە چیە. بەس هەتا نوکە ئەز حەز ژ ڤێ بیروکێ ناکەم. بیرۆکەیا کو ئەز نەشێم ژ پێش خوە ڤە بڕیارێ بدەم؟"

- "باشە، دا جارەکا دی ب زڤڕینە چیرۆکا وی کورکی ئەوێ بەری سێ هزار سالان ل چەرخێن بەری ژیای. دەمێ ئەو مەزن بووی، ئەو فێری نێچیرکرنا گیانەوەران بوو و ئەڤینی دگەل وێ کچێ دکر یاکو دابیتە دایکا زارۆکێن وی، دبیت وی ژی پەرستنا خوداوەندێ هوزا خوە کربیت. ئەرێ ما تو بیژی وی ب خوە بڕیار ل سەر ڤان تشتان هەموویان دابیت."

- "ئەز نزانم."

- "یان ژی هزرا خوە د شێرەکێ ل ئەفریقیا بکە. ئەرێ ما وی بڕیار دایە ئەو وەکو پاشایان بژیت یان ل دەمێ دیتنا یەکەم غەزالێ بڕاهێلیتێ هەتا دگریت؟ ئەرێ ما ئەو ژی نەدشیا بڕیارێ بدەت کو گیانەوەرەکێ ڕووەکخور بیت؟"

- "نەخێر، دڤێت شێر ل دووڤ سروشتێ خوە بیت."

- "ب دەربڕینەکا دی، ل دووڤ سروشتێ خوە، ئانکو وەکو تە سۆفیا، چونکی تو ژی بەشەکی ژ سروشتی. تو دشێی بۆچوونا دیکارتی بۆ خوە بکەیە هێجەت و بێژی بەلێ پا شێر گیانەوەرە و وەکو مرۆڤی ئەقل نینە. باشە ئەم دێ زارۆکەکێ نوو پەیدابووین کەینە نموونە: دەمێ ئەو دکەتە گری، هەکە شیری نەدەینێ دێ تبلێن خوە مێژیت، ب بۆچوونا تە، ئەرێ ڤی زارۆکی خواستەکا ئازاد هەیە؟"

- "نەخێر."

- "باشه پا دێ وی کەنگی خواستەکا ئازاد هەبیت؟ دەمێ ژیێ وی دبیتە دوو سال، بەرەڤ هەموو جهان ڤە دچیت و تبلا خوە بۆ وان تشتان درێژ دکەت یێن دکەڤنە پێشچاڤێن وی. دەمێ ژیێ وی دبیتە سێ سال ژی دایکا خوە ماندی دکەت، ل ژیێ چوار سالیێ ژی ژ تارِیاتییێ دترِسیت. پاشە پا کا ئازادیا وی؟"

- "ئەز نزانم."

- "ئەگەر ئەڤ زارۆکە کچك بیت، دەمێ ژیێ وێ دگەهیتە پازدە سالیێ دێ چیتە بەر خودیکێ و خوە خەملینیت. ئەرێ نوکە ئەو ب خوە برِیارێن خوە یێن کەسایەتی ددەت و هەر تشتێ بڤێت دکەت؟"

- "ئەز تێگەهشتم کا تە دڤێت چ بێژی."

- "ناڤێ وێ سۆفیا ئاموندسنە. تو ڤێ چەندێ دزانی. بەلێ پا ئەو ژی ل دووڤ یاسایێن سروشتی دژیت. لێ پا وێ ئاگەهـ ژ ڤێ چەندێ نینە، چونکی چەندین ئەگەرێن ئالۆز ل پشت هەر کارەکێ ئەو دکەت هەنە."

- "من نەڤێت زێدەتر گوهێ خوە بدەمە ڤێ چەندێ."

- "پێدڤیە تو بەرسڤا پرسیارا من یا دوماهیێ بدەی. دوو دارێن فێقی بینە پێشچاڤێن خوە کو هەردوو پێکڤە دناڤ باخچەیەکێ مەزن دا هاتینە چاندن. دارەك ل بەر هەتاڤێ و دناڤ ئاخەکا زەنگین ب کەرەستەیێن کیمیایی دا هاتیە چاندن، دارا دی ژی ل بەر سیبەرێ و دناڤ ئاخەکا هەژار دا هاتیە چاندن. کیژ ژ وان داران دێ زووتر مەزن بیت و پتر بەرهەمی دەت؟"

- "چ پێنەڤێت ئەو دارا دناڤ کاودانێن نموونەیی دا هاتیە چاندن."

- "ب بۆچوونا سپینوزای، ئەڤ دارە یا ئازادە، چونکی ئازادیەکا تەمام هەیە شیانێن خوە یێن بوماوەیی پێشبێخیت، بەلێ پا ئەگەر ئەو دار یا سێڤان بیت، نەشێت هژیر یان خوخان بدەت. ئەڤ چەندە ل سەر مە مرۆڤان ژی دهێتە بجهـ ئینان. دبیت ژبەر هندەك کاودانێن سیاسی وەرارِکرن و گەشەکرنا کەسایەتیا مە تووشی ئاستەنگان ببیت. بۆ نموونە، ئاستەنگێن خویی. فشارێن دەرەکی ژی دشێن مە براوەستینن. ژبەر هندێ ب تنێ دەمێ ئەم بشێن ب ئازادی هێز و شیانێن خوە بکاربینین، ل وی دەمی دێ وەکو مرۆڤێن ئازاد ژین. بەلێ پا ئەم ژی ب هندەك شیانێن ناڤخویی و دەلیڤەیێن دەرەکی هاتینە سنووردارکرن،

هەروەکو ئەو کورکێ بەری سێ هزار سالان و شێرێ ل ئەفریقیا و دارسێڤا دناڤ باخچەی دا."

- "ئەز دبێژم ئەڤ چەندە بەسە."

- "سپینوزا د وێ باوەرێ دا بوو کو ب تنێ یەك تشت هەیە ب تەمامی دشێت ب ئازادیەکا ڕەها ڕەفتاری بکەت. ئەو تشت ژی خودایە "سروشتە". مرۆڤ ژی دشێت خەباتێ ژ بۆ ئازادیێ بکەت داکو بێ مایتێکرنا ئاستەنگێن دەرەکی بشێت ژیانا خوە بڕێڤە ببەت، بەلێ پا ئەو قەت نەشێت خواستەکا ئازاد ب دەست خوە ڤە بێخیت. ئەم نەشێین کونترۆلێ ل سەر هەموو وان تشتان بکەین یێن دناڤ لەشێ مە دا ڕوودەن، هەردیسان ئەم نەشێین هزرێن خوە ژی بهەلبژێرین. ژبەر هندێ مرۆڤی ڕۆحەکا ئازاد نینە، بەلکو چ گەلەك یان کێم، ئەو یا دناڤ لەشەکێ میکانیکی دا هاتیە زیندانکرن."

- "ئەڤ خالە پیچەکێ بۆ تێگەهشتنێ یا ب زەحمەت بوو."

- "سپینوزای دگوت هەستوسوزێن مە، هیڤی و ئارەزوییێن مە، دبنە ڕێگر د ڕێکا مە دا ژ بۆ بدەستڤەئینانا بەختەوەری و کەیفخوشیێ، بەلێ ئەگەر مە زانی هەموو تشت ژبەر پێدڤیاتیێ ڕوودەن، ل وی دەمی ئەم دشێین تێگەهشتنەکا ژیرانە ل دور سروشتی وەربگرین. ل ڤێرێ ئەم دشێین ب ئاشکەرای پەیوەندی و پێکڤە گرێدانا هەموو تشتان ببینین. ئارمانج ل ڤێرێ ئەوە ئەگەر د دەمەکی دا هەر تشتێ هەی مە دیت، ل وی دەمی دێ گەهینە بلندترین پلا بەختەوەریێ. سپینوزای دگوتە ڤێ چەندێ Sub specie aeternitatis."

- "ڕامانا وێ چیە؟"

- "دیتنا هەموو تشتان ژ گوشەیا هەتا هەتایی. ئەرێ ما مە ل ڤێ خالێ دەستپێنەکربوو؟"

- "و پێدڤیە ل ڤێرێ بڕاوەستین ژی، پێدڤیە ب زووترین دەم بزڤڕمە مال."

ئەلبێرتۆ ڕابووڤە و چوو سەلکەکا فێقی دگەل خوە ئینا و دانا سەر مێزێ.

- "تە نەڤێت فێقیەکی بخوی بەری کو ژ ڤێرێ بچی؟"

سۆفیایێ موزەك هەلگرت و ئەلبێرتۆی ژی دەستێ خوە هاڤێتە سێڤەکێ. دەمێ سوفیایێ تیڤلێ وێ سەردا ئینای، تشتەك دیت..."

- "سەحکێ، هندەك نڤیسین یا ل سەر!"
- "ل کیڤە؟"
- "ل ڤێرێ، سەر ڤێ موزێ، ل بن تیڤلێ وێ."

سۆفیایێ بەرێ خوە دا ئەلبێرتۆی و موز ژی نێزیکی وی کر و ب دەنگەکێ بلند ئەو نڤیسین خواند.

- "کوکو... ئەڤە ئەزم، هێلد. ئەز یێ ل هەموو جهان کچا من. پیرۆزباهیا جەژنا ژ دایکبوونا تە دکەم."

سۆفیایێ گوت: "تشتەکێ سەیرە."

- "ئەو رۆژ بۆ رۆژێ یی پتر خوە تەمسار دکەت."
- "بەلێ پا تو نابینی ئەڤ چەندە یا سەیرە؟ ئەرێ ئەڤ موزە ل لوبنانێ هاتینە چاندن؟"

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە هەژاند.

- "هەرچەوا بیت، ئەز ناخوم."
- "بدانە وێری، چ پێنەڤێت ئەو کەسەکێ دینە هەکە چەوا دا نامەکێ ل سەر موزێ بۆ کچا خوە نڤیسیت، لێ هۆسا دیارە د ڤێ ترانا وی دا فێلەك ژی هەیە."
- "بلێ. هەردوو"
- "ئەرێ ئەڤ چەندە مە دگەهینتە وی دەرئەنجامی کو بابێ هێلدێ نە کەسەکێ گەمژەیە."
- "ئاها ئەز ژی دا ڤێ چەندێ بێژمە تە. دبیت وی وەل تە کربیت هەتا ل جارا دی ب ناڤێ هێلدێ گازی کەیە من، ما کی نابێژیت ئەو وەل مە دکەت باخڤین؟"
- "نابیت ئەم چ تشتان بدەینە رەخەکی، هەموو تشت جهێ گومانێ نە."
- "کەواتە هەبوونا مە د ژیانێ دا نە خەونەکە."

- "لەزێ نەکە، چ پێنەڤێت شرۆڤەکرنەکا ب سانەهتیر بۆ ڤێ چەندێ هەیە."
- "باشە پا دڤێت ئەز لەزێ بکەم و بزڤرمە مال. نوکە دایکا من ل هیڤیا منە."

ئەلبێرتۆ هەتا بەردەگەهی دگەل سۆفیایێ چوو، لێ هێشتا دەرگەهـ نەهاتیە گرتن، ئەو حێبەتی ما دەمێ ئەلبێرتۆی گوتیێ: "بخێر بچی خوشتڤیا من هێلد."

پشتی هینگێ دەرگەهـ ل وێ هاتە گرتن.